


# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز

بەرگی شەشەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموٚستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی شەشەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت – لبنان

﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ٧٥ قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ
بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا ٧٦ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا
فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥۖ قَالَ لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا ٧٧ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي
وَبَيۡنِكَۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرًا ٧٨ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي
ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ٧٩﴾

---

**ئەم جارەیش دووبارە خضر گێڕایەوە بۆلای مەرج و پەیمانەکەیان، هەروەکو یەکەم جار، ئەم جارەیش ﴿قَالَ﴾ وتی بە موسا: ﴿أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا﴾ ئایا نەم وت بە تۆ کە بێگومان تۆ هەرگیز ناتوانی خۆت بگری لەگەڵ من و لە هاوڕێ یەتی من دا و لەم جارەدا وشەی ﴿لك﴾ ی زیاد کرد، لەبەر زیاد گلەیی لەسەر ئەوەی کە وەسێتەکەی نەگرتە گوێ و خۆگر و دامەزراو نەبوو، بە ئاگادار کردنەوەی یەکەم جار کۆتایی نەهێنا، بەڵکو ئەم جارە بەتین تر بوو لە بێزاری دەربڕین دا، ئینجا حەزرەتی موسا بیری کردەوە کە ئەمە دووجار پێچەوانەی بەڵێنی خۆی جووڵایەوە، ئیتر هیچی تێدا نەمێشتووەتەوە، لەبەر ئەوە ڕێگای لە خۆی بڕی یەوەو ﴿قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا﴾ وتی خضر ئەگەر لە پاش ئەم جارە پرسیارم لێ کردی لە هەر شتێ، واتە هەر کردەوەیەکت کە بەلامەوە ناڕەوا بێت: ﴿فَلَا تُصَٰحِبۡنِي﴾ ئیتر هاوڕێ یەتیم مەکە و ماوەم مەدە شوێنت کەوم ﴿قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا﴾ چونکە بەڕاستی لەلایەن منەوە گەیشتیتە رادەیەك کە عوزر و بەهانەت هەیە لەوەی وازم لێ بێنی و هاوڕێ یەتیم نەکەیت، لە حەدیسێکی سەحیح دا هەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ڕەحمەتی خوا بڕژێ بەسەر ئێمە و بەسەر موساش دا، ئەگەر خۆی بگرتایە، بێگومان شتی سەیرو نایابی ئەبینی، بەڵام شەرم گرتی و مەترسی تانە و لۆمەی کرد لەبەر ئەوە ڕێگای لەخۆی بڕی یەوە و ئەو وتەی وت. ﴿فَٱنطَلَقَا﴾ ئیتر هەمیتر ڕۆیشتن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ﴾ هەتا کاتێ هاتنە لای دانیشتوانی دێ یەك ﴿ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا﴾ کە داوای خۆراکیان کرد لە دانیشتووەکانی، ﴿فَأَبَوۡاْ أَن**

﴿يُضَيِّفُوهُمَا﴾ ئینجا ئەوانیش سەرپێچی یان کرد لەوەی بە میوان وەریان بگرن و میوان داری یان لێ بکەن. ﴿فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾ ئینجا ڕێگایان کەوت لە دیواری خانوویەك لەو دێ یەدا کە خەریك بوو ئەکەوت ﴿فَأَقَامَهُ﴾ خضریش دیوارەکەی ڕاست کردەوەو ڕێك و پێکی کردەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ناپیاوی ئەوانەدا حەزرەتی خضر دیواری بۆ چاك ئەکردنەوە حەزرەتی موسایش کە ئەوەی دی هەمیتر خۆی پێ نەگیرا ﴿قَالَ﴾ وتی بە خضر: ﴿لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ ئەگەر مەیلت بوایە کرێ یەکت وەرئەگرت لەسەر چاك کردنەوەی ئەو دیوارە. واتە تۆ کە بە گوێرەی ناپیاوی و خراپی ئەوان لەگەڵیان ناجووڵێیتەوە دەی هەر هیچ نەبوایە کرێت لێ سەندنایە بۆ ئاو و نان و خواردەمەنی یەکەمان. ئیتر لێرەدا حەزرەتی موسا ڕێگای هیچی نەما و هەر بە پێی بڕیاری خۆیشی مافی هاوڕێ یەتی خضری نەما، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ خضر وتی بە موسا – درودی خوایان لەسەر بێ – ﴿هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ﴾ ئەم کاتە کاتی جیابوونەوەی نێوانی من و تۆیە، ئەم ڕەخنەی دوایی یە هۆی جوێ بوونەوەمانە: ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَلَيْهِ صَبْرًا﴾ هەواڵت ئەدەمێ و ئاگادارت ئەکەم بەدوا ڕۆژ و هۆی ئەو کردەوەو ڕووداوانەی کە تۆ نەت توانی خۆت بگری و بێ دەنگ بیت لەسەریان. هەواڵی دایە بەهۆی هەر سێ کردەوەکەی خۆی کە بە دیمەن و لەپێش چاوی موسا خراپ بوون، بەم جۆرەی کە قورئان یەك بەدوای یەك دا ئەیان فەرموێ: ﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ﴾ واتە هۆی کون کردنی کەشتی یەکە ئەمەبوو: ئەو کەشتی یە هینی چەند کەسێکی هەژاری بێ دەسەڵات بوو، ئیشیان پێ ئەکرد لەو دەریادا و ژیانیان لەسەر ئەوە بوو ﴿فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا﴾ ئینجا منیش ویستم عەیب داری بکەم ﴿وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾ لەکاتێك دا کە لە پێش دەمیان، یان لە دوایانەوە پادشایە هەبوو گوزەریان ئەکرد بەلای دا و هەموو کەشتی یەکی بە زۆر داگیر ئەکرد بۆ خۆی بە مەرجێ کەشتی یەکی ساغ بوایە، واتە منیش عەیب دارو ناساغ کرد بۆ ئەمەی لە پێش چاوی بکەوێ و داگیری نەکات، کەواتە ئەو کون تێ کردنە زیانێکی زۆر بچووك بوو لەچاو داگیر کردنەکەی دا کە زیانێکی وابوو بە تەواوی دەستە پاچە و پەك کەوتووی ئەکردن و هەموو کات بەرگری زیانی گەورە بە زیانی بچووك شتێکی ڕێك و ڕەوایە.

وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا (٨٠) فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا
رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا (٨١) وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ
كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا

---

﴿وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ﴾ **کوڕە بچکۆلەکەیش کە کوشتم بەهۆی ئەوەوە بوو کە خۆی سروشتی لەسەر کوفرو بێ باوەڕی بوو، باوك و دایکی ئیمان دار بوون.** ﴿فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا﴾[1] **ئینجا ئێمەیش زۆر ترساین کە ئەو کوڕە داگیریان بکات و دایان پۆشێ بە سەرکەشی و کوفر، واتە ئەمانزانی ئەو کوڕە بمایە و بە تەواوی پێ بگەیشتایە باوك و دایکی بانگ ئەکرد بۆ کوفر و بێ باوەڕی ئەوانیش لەبەر ئەوەی زۆر خۆشیان ئەویست بە گوێ یان ئەکرد** ﴿فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا﴾ **ئینجا ئێمەیش ویستمان کە خوای پەروەردگاریان لە بریتی ئەوەدا بۆیان بگۆڕێ بە رۆڵەیەکی باشتر لەو لەبابەت پاکی و خاوێنی لە گوناهو خوی بەدەوە، بە سۆز و بەزەیی تر بێ بۆیان و چاکتر بێت دەربارەیان لەو کوڕە کافرەیان. ئەو کوڕە هەرچەند بە دیمەن بە تاوانبار تەماشا نەئەکرا و بە ئاشکرا شتێکی نەبووە کە هۆی کوشتنی بێت، بەڵام بارە نهێنی یەکەی ئاشکرا کرا لەو بەندە زانایە کە ئەو کوڕە بە سروشت سەرکەشێکی کافرە. تۆوی کوفر و سەرکەشی لەدڵ و دەروونی دا بنج بەست بووە و تا بێت بەهێز ئەبێت، ئەگەر بمێنێ باوك و دایکیشی لە ڕێگای خوا لائەدات، لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەوەی بەسەر هێنا لەسەر دەستی ئەو بەندە چاکەی خۆی دا، ئینجا هۆی کردەوەی سێ یەم روون ئەکاتەوە ئەفەرموێ:** ﴿وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ **هۆی چاك کردنەوەو راست کردنەوەی دیوارەکە ئەمەبوو کە ئەو دیوارە هینی دوو کوڕی هەتیو بوون لە شارەکەدا** ﴿وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا﴾ **لەژێری دا گەنجینەیەك هەبوو کە هینی ئەو دووانە بوو** ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا﴾ **باوکیان پیاوێکی سالح بوو** ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا﴾ **لەبەر ئەوە خوای تۆ ویستی کە ئەو دوو کوڕە گەورە بن و بگەنە هێز و بەتینی و ژیریی خۆیان بە تەواوی،**

---

[1] وشەی ﴿ خشينا﴾ ئەگەر وتەی خچر بێت بەو جۆرەیە کە لە تەفسیرەکەدا وترا، خوا رەوای داوە بۆی بەگوێرەی رای خۆی کردەوە بکات و ئەگەر بە وتاری خوا دابنرێ ئەبێ بە مەعنا ﴿ علمنا﴾ بێت. واتە زانیمان.. هتد.

﴿وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا﴾ غەزنەكەیان دەربێنن لەژێر دیوارەكەیان دا، واتە ئەگەر ئەو دیوارەی ڕاست نەكردایەتەوە و بكەوتایە، ئەو كاتە گەنجینەكەیان دەرئەكەوت و ئەو دوانەیش منداڵ بوون و توانا نە ئەبوون بەرگری خەڵكی لێ بكەن لەبەر ئەوە خوا ویستی ئەو گەنجینەیە دەرنەكەوێ تا خۆیان گەورە ئەبن و دەستی خۆیان بكەوێ ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ خوا ئەوەی ویست لەبەر ڕەحم و بەزەیی لەلایەن خوای تۆوە بەو دووانە، ئینجا فەرمویی بە موسا: ﴿وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى﴾ ئەوەی من كردم لە خۆمەوە نەبوو، بە ڕاو هەڵبژاردنێ نەبوو لەلایەن خۆمەوە، بەڵكو لەلایەن خواوە بوو ﴿ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ ئەوەی كە باس كرا ئەوەبوو پاشەڕۆژ و هۆی ئەو كردەوانەی من كە تۆ توانای خۆگرتنت نەبوو لەسەریان، لێرەدا دوایی هات بەسەرهاتی حەزرەتی موسا لەگەڵ ئەو بەندە ساڵحەدا كە بەناوبانگە بە خضر – درودی خوا لە هەردووكیان بێت –.

لەم سەرگوزەشتەیەدا چەند شتێ هەیە بەجوانی ئەزانم ئاگادار كردنەوە لەسەریان:

١- بێگومان هەر سێ كردەوەكەی لەسەر فەرمانی خوا بووە، هۆیەكانیشیان لەسەر فێركردن و پیشاندانی خوا بووە، كەواتە لەبەرچی دەربارەی هۆی یەكەمیان ئەفەرموێ: ﴿فاردت﴾ واتە ویستم، دەربارەی دووەم ئەڵێ: ﴿فاردنا﴾ واتە ویستمان، بۆ سێ یەم ئەڵێ: ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ﴾ واتە خوای تۆ ویستی، پێویستە هۆی ئەو جیاوازی یانە بزانرێ: لەو بارەیەوە زانایان چەند شتێكیان فەرمووە زۆر جوان و بەجێن: لە یەكەم دا: ویستنەكە بۆ خۆی بڕیار ئەدات، چونكە كون كردن و عەیب دار كردنەكە خوا لەسەر دەستی ئەودا كردی و بەدەستی ئەو كرا و بێجگە لەوەش ئەو كردەوە بە دیمەن كردەوەیەكی خراپ و تاوان بوو، كەواتە بێ ئەدەبێ و بێ شەرمی یە بە كردەوەی خوای بداتە قەڵەم. بێگومان پێویستە چاودێریی ئەم جۆرە شتانە، بۆ وێنە ئەبێ بڵێین: خوا هەموو شتێكی دروست كردووە، بەڵام بێ شەرمی یە و ناڕەوایە بە تایبەتی باسی دروست كردنی شتی پیسی بۆ بكەین، بۆ ڕوون كردنەوەی ئەم مەبەستە بەڵگە زۆرن لە قورئان و حەدیس دا، پێویست نی یە بە باس كردنی.

بۆ دووەم فەرموی: ویستمان، چونکە گۆڕانی ئەو کوڕە خراپە بە رۆڵەی باش بە دووشت فەراهەم هات: یەکێکیان: کوشتنی خراپەکە بوو کە بە دەستی خۆی کرا، ئەویتریان کە بریتی بوو لە گۆڕاندنی بە رۆڵەیەکی چاك هیچ دەخلی ئەمی تێدا نەبوو، بەڵکو تەنیا خوا کردی و بێجگە لەوە کوشتنەکە چونکە بە دیمەن ناڕەوا و تاوانە بە کردەوەی بەندە دادەنرێ، تەنیا گۆڕانی بە رۆڵەی چاك کە چاکە و خێری رووتە بەهێنی خوا دائەنرێ. واتە ئەم دووەمە تێکەڵە لەبەر ئەوە فەرموی: ویستمان.

لە سێ یەم دا، چونکە خێرو چاکەی رووتە و هیچ دەخلی خۆی بەهیچ جۆر تێدا نی یە، فەرموی: خوای تۆ ویستی ئەو دووانە گەورە ببن، مانەوەو گەورە بوونیان تەنیا بە خوایە.

٢- لەو شتانەی کە جوانە ئاگادار کردنەوە لەسەری ئەمەیە: لەم بەسەرهاتەدا ئەم پەندو ئامۆژگاری یانەی خوارەوە وەرئەگیرێ:

ا- بنەڕەتی ئەو سێ کردەوەی کە خضر کردی لەسەر ئەوەبوو کە هەر کردەوەیەك زیان و خراپەی بچووکی هەبێ پێویستە بەجێ بێت بۆ بەرگری شتێ کە زیان و خراپەی گەورە تری هەبێ، ئەوە لە هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوادا بە تایبەتی لەم دواترین شەریعەتی خوادا یاسایەکی تێرو تەواوە، لە کتێبەکانی(عیلمی اصولی فیقهدا) بڕیار دراوەو کراوە بە بەند و بڕیارێکی سەربەخۆ.

ب- نابێ مەردوم کەشخە بکات و بە زانینی خۆیەوە بنازێ.

ج- ئەبێ هەر شتێکی بەلاوە خراپ بوو دەست بەجێ ئینکاری بکات و بە ناڕەوای دابنێ بەمەرجێ دژی فەرمانی شەرعی بێت.

د- هەمیشە بەردەوام بێت لەسەر هەوڵ دان بۆ فێربوون و زانین.

هـ- شەرم و ئەدەبی ببێ بەرامبەر کەسێ بەرامبەری وەستا.

و- ئاگادار کردنەوەو ئامۆژگاری تاوان بار، چاوپۆشی کردن و لێ بوردن هەتا روون ئەبێتە گوێ نەگرتن و بەردەوامی تاوان بارەکە. ئەو کاتە پێویستە واز لێ هێنان و دوور کەوتنەوە لێ ی.

ز- بێگومان هەموو موسڵمانێ ئەبێ باوەڕی بەهێزی ببێ کە هەموو کردار و رووداوێ لەمەوپێش و ئێستا و لەمەو پاش هەتا هەتایشە، هەمووی بە خوایش و بڕیاری خوایە، هەموویشی رێك و راست و بەجێ یە و دەست نادات بۆ دەست تێ خستن و

گۆڕاندن، ئەو ڕووداوەی بە پێ‌ی فام و ژیریی ئێمە ڕاست و ڕێکە و ئێمە بێ ئاگاین لەهۆی ڕوودانی هەرکات ئاگادار بکرێن بەسەر هۆی ئەوەی ڕوو ئەدا ئەو کاتە دڵنیا ئەبین کە ڕووداوەکە بەجێ یە و پێچەوانەی ناڕاست و ناڕەوایە. ئەم باوەڕە بەم جۆرە کە وترا پێویستی سەرشانی هەموو کەسە.

جا بۆ بەهێز کردنی ئەم باوەڕە دڵنیایی تەواو و زیادە ئارامی ی دڵ و دەروون لەم بارەدا بۆ ئەم مەبەستە گرنگە ئەم سێ ڕووداوە بەسە بکرێ بە بەڵگە و نموونە. ئەم سێ ڕووداوە کە بە دیمەن و شێوە ئاشکراکەی ناڕاست بوون، تەنانەت لای پێغەمبەرێکی گەورەی وەك حەزرەتی موسا – درودی خوای لەسەر بێت – کەچی لە ڕووی ڕاستی دا و لای خوا شتێکی بەجێ و ڕاست بوون، وەکو بۆمان ڕوون کرایەوە.

٣– ئاگادار کردنەوەی سێ یەم ئەمەیە: ئەم سێ ڕووداوە بە هیچ جۆر ناکرێن بە نیشانە و بەڵگە بۆ دروستی و ڕەوادانی کردەوەی خراپی هیچ کەسی تر لەم جیهانەدا. واتە هەر کەسێ تر هەرچەندە جێگای باوەڕبێ و ڕادە و پلەی بەرز بێت لە چاکی و خواناسیدا هەرکات هەر شتێکی بێ شەرعی لێ بینرا، ئەبێ ئینکاری بکرێ و ئەو کردەوەی بەخراپ تەماشا بکرێ، نابێ بڵێین: ئێمە نازانین و خۆی ئەزانێ و ئەو شتێ ئەبینێ و ئەزانێ ئێمە نایبینین و نایزانین، چونکە:

ا– ئەو ڕووداوانە و پیشاندانی ئەو شتە نهێنی یانە شتێکی تایبەتی بوون لەو شەریعەتەدا خوای گەورە پیشانی حەزرەتی موسای داو تەمێ‌ی ئەوی پێ کرد لەسەر دەستی ئەو بەندەیەدا، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی پرسیاری لێ کرا: ئایا کێ ئەمڕۆ زاناترە لەسەر زەوی؟ ئەویش لە وەڵام دا فەرمووی: من، نەیفەرمو: خوا ئەزانێ، وەکو باس کرا.

ب– ئەگەر تایبەتیش نەبن بێگومان زانینی ئەو جۆرە نهێنی یانە ئەبێ تەنیا لە لایەن خواوە دەست کەوێ، چونکە زانینی شتی نهێنی و غەیبی بە هەوڵ و تێکۆشانی بەندە دەست کەوت نابێ بەڵکو بەس تەنیا بە لوتفی خوایە کە هێندێ لە بەندەیانی خۆی ئاشنا و زانا کردووە بە هێندێ لەو نهێنی و غەیبیانە، ئەو بەندەیانەش ئەبێ پێغەمبەر بن، چونکە تەنیا پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بێت – بەوجۆرە لەلایەن خواوە زانا کراون بەوەی خوا مەیلی بووبێ، ئەو بەندە ساڵحەی کە لەم سورەتەدا باس کرا کوڕ و

جەماوەری پێشەوا و زانایان لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەر بووە، وەکو لەسەر ئەوەن کە بەناوبانگە بە خضر.

ئیتر جگە لەوان هەر بەندەیەکی تر، کە بەهۆی شوێن کەوتنی ئەوانەوە هەر شتێکی کەوتبێتە دڵ، ئەوە زانین نی یە، بەڵکو ئەو جۆرە شتانە کە بۆیان پەیدا ئەبن و، بەناوبانگن بە الهام و کەشف، ئەوانە گومن و باوەڕێکن ناگەنە رادەی زانین و یەقین ئەگەر نا دەستیان نەئەدا بۆ هەڵە و گۆڕان، خۆ بێگومان هەڵە و گۆڕانیش رووبان تێ ئەکات هەر بەپێی فەرمودەی خواناسان و پیاو چاکان خۆیان کە پێ یان ئەوترێ ﴿ئەولیا﴾: خۆیان ئەفەرمون: ﴿الخطأ الکشفی کالخطأ الإجتهادی﴾ [1] کەواتە هەرکەسێ تر جگە لە پێغەمبەران هەر کردەوەیەکیان لێ بینرا کە بە دیمەن بێ شەرعی بێ پێویستە ئینکاری بکرێ و بە خراپ و گوناه دابنرێ.

ج- ئەگەر ئەندازەیە بێینە خوارەوە، باوەڕمان وا بێ کە هێندێ لە بەندەیانی خوا هەن جگە لە پێغەمبەران ئەوانیش لەلایەن خواوە ئاشنا ئەکرێن و زانا ئەکرێن بە هێندێ لە نهێنی و غەیبی یەکانی خوا، وەکو هەندێ لەسەر ئەوەن و ئەڵێن کە ئەم بەندەی هاوڕێ ی موسا خضرە و خضریش یەکێکە لە ئەولیا، پێغەمبەر نەبووە ئەم رایە هەرچەند رایەکی زۆر لاوازە و دوورە لە ژیریی و لەوەی کە وەرئەگیرێ لە ناوەڕۆکی ئایینی پاکی ئیسلامەوە ئەم رایە هەرچەند ئاوا لاوازە، ئەگەر بێت و باوەڕی پێ بکەین و وەری بگرین، لەسەر ئەم رایەش هەر ئەڵێین: هەریەکێکی تر لەوانە هەر کردەوەیەك بکات کە بە دیمەن بێ شەرعی بێت، ئەبێ هەر ئینکاری بکەین و بە هیچ کلۆج رێگا نی یە بۆ رەوادانی، چونکە لەناو بەندەیانی خوادا تەنیا پێغەمبەران معصومن و خوا نایەڵێ خراپە بکەن، ئیتر بێجگە لەوان دەست ئەدەن بۆ هەموو هەڵە و تاوان و خراپەکاری، بێجگە لەوەش پێغەمبەران – دروديان لەسەر بێت – بەهۆی موعجیزەوە روون و ئاشکرا ئەبن کە هەواڵ لە خواوە وەرئەگرن و پێغەمبەرن، کەواتە کردەوەی خراپ ناکەن، هەر بەندەیە کە پێغەمبەر نەبێ – هەرچەندە راست و خواناس بێت لای خوا – ئایا بەچی دا ئێمە بزانین کە راست و کردەوە دروستە لەگەڵ ئەوەدا کردەوەش بە زاهیر

---

[1] واتە هەڵەی کەشف و کەرامەت هەیە بە وێنەی هەڵەی موجتەهیدەکان لە ئیجتهادیان دا.

پێچەوانەی ئاین و شەریعەتی خوا بێت؟ لەم بارەوە هەر وتار و کردارێ کە بڵاو بووەتەوە لەناو خەڵك دا بە دەمار دەم یان لە کتێب دا نووسراوەتەوە دەربارەی ئەولیا، ئەوانە سەرجەم ئەبێ بە درۆ و دەلەسەیان سەیر بکەین کە بۆ ئەو خواناسانە هەڵبەستراون، وەك بە دەم پێغەمبەرانەوە – درودی خوایان لەسەر بێت – ئەو هەموو شتە ناڕەوا هەڵبەستراوە و بڵاو بوونەتەوە لەناو خەڵك دا و لە کتێبیش دا نووسراوە و بڵاوەی کردووە، یان ئەبێ بڵێین ئەوانە هەموو درۆن، یان ئەبێ تەئویلی بکەین و ڕێکی شەرعی بکەین ئەگەر گونجا، یان ئەبێ بڵێین هەڵە و تاوانێکە دووچاری بووە و بەندەیە کە ڕەنگ دروستی نی یە هیچی تر بڵێین دەربارەی ئەو وتارو کردارانەی بەدەم زۆر لە ئەولیاکانەوە ئەکرێن. بە دیمەن پێچەوانەی شەرعن. ئەگەر کەسێ ئەڵێ: ئەی ئایا چۆن حەزرەتی موسا دڵنیا بوو، باوەڕی کرد بە قسەی خضر و ڕەوای کردەوەکانی دا؟ لە وەڵام دا ئەڵێین: خضر پێغەمبەر بووە وەکو کۆڕ و زۆربەی پێشەوا و زانایانی لەسەرە، ئەگەر پێغەمبەریش نەبووبێ هەر پێویست بووە لەسەر حەزرەتی موسا کە باوەڕی پێ بکات و کردەوەکانی بە دروست بزانێ و ڕەوایان بدات، چونکە خوا لە پێشەوە هەواڵی پێدا لەو بارەیەوە، کەواتە ئەگەر پێغەمبەریش نەبووبێ کاری ئەو جیاوازە و کردەوەی هیچ خواناس و وەلی یەکی تر لە ڕێزی ئەو کردەوەی ئەوەدا تەماشا ناکرێ.

د- بێ دەنگ بوون لەو جۆرە کردەوانە و ڕەوادانیان بەناوی ئەمەوە کە خاوەن کردەوە خواناسە و بەرچاوی ڕووناکە و خۆی ئەزانێ چی ئەکات، بێگومان شتی وا قاپی خراپەکاری ئەکاتەوە لە زۆر کەس کە لەژێر پەردە و پۆشاکی خواناسیدا هەموو تاوان و خراپەیەك بکەن، بە هیچ جۆر سام و قودسی یەتی ئاین و شەریعەت ناهێڵێتەوە، خەڵکی بەرە و مەزهەبی باطنیتی ئەبات کە کوفرێکی ئاشکرایە، خوا پەنامان بدات.

٤- ئاگادار کردنەوەی چوارەم ئەمەیە: بڵاو بووەتەوە لەناو خەڵك دا کە لە ئایینی ئیسلام دا دوو جۆر عیلم هەیە: عیلمی زاهیر و عیلمی باطن، ئەم دووانە جیاوازن لە یەکتر بە جۆرێ شتی وا هەیە لە عیلمی زاهیردا قەدەغەیە و تاوانە، بەڵام بەپێی عیلمی باطن ڕاست و ڕەوایە، بۆ وێنە ئەم ڕووداوانە ئەگرن بەدەستەوە کە ڕووی دا لە نێوان خضر و موسادا، – درودیان لەسەر بێت – هەروەها شتێکی بەناوبانگە بەکارهێنانی سێ وشە: شەریعەت و تەریقەت و حەقیقەت، شەریعەت ئەبڕن بەسەر عیلمی زاهیردا و

بەس، تەریقەت و حەقیقەتەکەیش بەسەر عیلمی باطن دا، کەواتە ئەبێ تەریقەت و حەقیقەتیش جیاواز بن لە شەریعەت بەڵکو هەندێ ئەڵێن: مەبەستی راستەقینە شەریعەت نی یە و شەریعەت وەك و توێکڵ وایە ئەوەی کە مەبەستی راستەقینەیە و ناوەڕۆك و ناوکەکەیە بریتی یە لە تەریقەت و حەقیقەت، لەم بارو بابەتەوە قسە وباس و حیکایاتی زۆر و زەبەندە هەن بلاو بوونەتەوە تەنانەت لەلایەن زۆر لەوانەی بە زانا و خواناس ئەژمێررێن، جا کەواتە پێویستە ئەوەی راستە و ڕێکە و ئەگونجێ لەگەڵ ئاییني ئیسلام دا لەم بارەیەوە بەجوانی روون بکرێتەوەو هیچ گەرد و تۆزی بەسەرەوە نەمێلرێت با ئەوەی نەشارەزایە هەڵە نەکات. ئەم باسە هەرچەند زۆر گرنگە و پێویستی هەیە بە درێژە پێدانێکی زۆر و لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی ئەوێ، بەلام شوێنەکە دەست نادات بۆ ئەوە، کەواتە بە کورتی دەست نیشان ئەکەم بۆ چەند نوختە و خاڵێکی گرنگ و هیوادارم ئەو خاڵانە بەس بن بۆ ئەوانەی بەدوای راستی دا ئەگەڕێن:

أ- بێگومان شتێکی ئاشکرایە کە ئاییني پاکی ئیسلام ئاییني‌نێکی تێرو تەواوە و لە هیچ بارو رووییەکەوە هیچ کەم و کوڕی یەکی نی یە، بەرنامەیەکە کە کاروباری هەموو ناوچە و کون و قوشبنی ژیانی روون کردووەتەوە و سنووری هەموو شتێکی دیاریی کردووە.

ب- ئەم ئاییينە تەواوەش بریتی یە لە قورئان و رەوشت و وتار و کرداری پێغەمبەر(ﷺ) و مەبەست بە شەریعەتی ئیسلامیش تەنیا ئەو دوانەیە و بەس.

ج- کەواتە هەر بیرو باوەڕ و کردارێ لەناو چوار چێوەی ئەم شەریعەتەدا بوو راست و رەوایە و هەر جۆگە و رووبارێ لە دەریای پان و فراوانی ئەو هەڵگیرابێتەوە پاك وخاوێنە، بێجگە لەوانە لارە و درۆیە و پیس و بۆگەنە.

د- بێگومان تەریقەت لە بنەڕەت دا شتێکی راست و رەوایە، چونکە ڕێگا و رەوشتی پیاوە خواناسە هەڵکەوتووەکانی ئەم ئوممەتەیە، سەرچاوەکەی ئەم شەریعەتەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، ئەو تەریقەتە راستەی ئەوانە بریتی یە لە ڕوو کردنە خوا بەڕاستی و خۆ رووت کردن و داڕنینی دڵ لە هەموو شتێ جگە لە خوا، یان بریتی یە لە خۆ رازاندنەوە بە خو و رەوشتە شیرینەکانی ئیسلام و خۆ خاوێن کردن لە سیفەت

و ڕەوشتە پیسەکان کە ئیسلام قەدەغەی کردوون، بە کورتی بریتی یە لە بەجێ هێنان و بەدی هێنانی ئامانج و مەبەستەکانی ئیسلام، پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بەڕاستی.

هـ- تەریقەت لە بنەڕەت دا بەم جۆرەیە کە باس کراوە ئەوەش شتێکی فەرزو پێویستە لەسەر شانی هەموو ئیماندارێ، بەبێ ئەو تەریقەتە راستە ئیمانی هیچ ئیماندارێ تەواو نی یە، بەبێ ئەوە قاپی دڵ داخراوە و هەر پیت و فەڕ و کەرامەتێ کە ئیمانداران دەست کەوتیان بووە و دەست کەوتیان ئەبێ هەمووی بەرهەمی ئەو تەریقە راستەیە، بەڵام بەداخەوە ئەو تەریقەتە راستە پاك و خاوێنە هەر لە کۆنەوە لەلایەن نەفام و نەزان و دوژمنانی ئیسلامەوە دەستی پیسی تێ خراوە و چەند شتی پڕو پووچ و بێگانە لە ئیسلام بەناوی تەریقەتەوە بڵاو بوونەتەوە و جێگیر بووە لە دڵ و دەروونی زۆربەی خەڵکی دا، بەڵکو زۆر شت هەیە کە بە ئاشکرا دژو پێچەوانەی ئایینی ئیسلامە و بە هیچ جۆر پینە ناکرێ و نابەسترێ بە ئیسلامەوە، کەچی تێکەڵی تەریقەت کراوە بەناوی ئەوەوە بڵاو بووەتەوە تەنانەت لە زۆر لە کتێبەکانیش دا نوسراونەتەوە و بڵاو بووەتەوە، ئەوەندەش زۆرن نایەنە ژمارە بە ئاسانی، بۆ چارەسەر کردنی ئەم دەردە کوشندەیە، بۆ لابردنی ئەم پەردە پیسانە بەسەر رووی رووناك و شیرینی تەریقەتەوە، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بەراوردی ئەو شتانە بکەین لەگەڵ شەریعەتە نەگۆڕاوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەو ترازووە راستە بیکێشین بۆ ئەمەی هەموو چڵك و چەپەڵی و لەکە و لاری یەك جوێ بکەینەوە و تووڕی بدەین، هەرچەند ئایەت و حەدیسی زۆر و زەبەندە هەیە بیکەین بە دەلیل و بەڵگەی پتەو لەسەر راستی ئەم خاڵانە کە وتمان، بەڵام هیچ ئایەت و حەدیس ناهێنم، بەڵکو فەرمایشتی پێشەواکان و هەڵکەوتووە بەناو بانگەکانی تەریقەت ئەکەم بە دەلیل و بەڵگە بۆ ئەمەی بۆ هەموو شارەزایەك روون بێتەوە کە ئەو خواناسانە دوورن لە شتی پڕو پووچ و ناڕەوا. کەواتە با باش گوێ شل بکەین لە هێندێ لەو فەرمودانە:

شێخی گەیلانی خوای لێ رازی بێت لە کتێبی(الفتح الربانی) دا ئەفەرموێ: ﴿ان كل حقيقة لا تشهد لها الشريعة فهي زندقة﴾ واتە هەرشتێك خەڵکی بەڕاستی بزانێ ئەگەر شەریعەت شایەتی نەدا بۆی ئەوە کافری و زیندیقی یە. ئەفەرموێ هەموو ئەولیاکانی خوا

هـیچ شـتێ وەرنـاگرن لـە فـەرمودەی خـوا و پێغەمبـەرەوە نـەبێ(ﷺ) و هـیچ رەفتـار و کردەوەیەکیان نی یە کە رێك نەبێ لەگەڵ دیمەنی شەرع دا.

شێخ جونەیدی بەغدادی ئەفەرموێ: عیلمی ئێمە بەستراوە بە قورئان و حەدیسەوە و هەرکەس ئاگای لە قورئان و حەدیس نەبێ لەم عیلمی ئێمەدا گوێ ی بۆ ناگیرێ، و پەیڕەوی ناکرێ.

شێخ سەری سەقەتی ئەفەرموێ: هەرکەس ئیدیعای عیلمێکی باطنی بکات کە دژی زاهیری شەرع بێت ئەو کەسە هەڵە و سەر لێ تێك چووە.

شاهی نەقشەبەند ئەفەرموێ:

آنکه نه در شرع محمد را هست          گر پا به سری عرش نهد گومرا هست

ئەبو سعیدی خراز ئەفەرموێ: هەر فەیزێکی باطنی پێچەوانەی شەرع بێت بەتاڵە.

ئیمـامی غـەزالی لـە(احیـاء) دا ئەفـەرموێ: هەرکەسـێ بڵـێ عیلمـی بـاطن جیـاواز و پێچەوانەی عیلمی زاهیرە ئەو کەسە لە کوفرەوە نزیك ترە تا ئیمان.

ئیمامی رەبانی لە نووسراوی(٤٣) لە بەرگی یەکەم دا ئەفەرموێ: کۆمەڵێ هەن ئارەزووی ئیلحاد و زیندیقی یان هەیە، گومانیان وایە کە مەبەستی راستەقینە ئەم شەریعەتە نی یە، بەڵکو شتی ترە لە شەریعەت بەدەرە ئینجا ئەفەرموێ: حاش و کلا دیسان حاشا و کلا. ئێمـە پـەنا ئـەگرین بـەخوا لـە بـاوەڕی وا، شـەریعەت و تەریقـەت بـە قـەدەر سـەری موویـەك جیـاوازی نـی یـە لـە نێوانیـان دا، هەرچی پێچەوانەی شـەریعەت بێـت ئـەوە خـوا نایـەوێ و وەرناگیرێ و هەر شتێ شەریعەت وەری نەگرێ کوفر و زیندیقی یە.

لە نووسراوی(٣٦) بەرگی یەکەم دا ئەفەرموێ: شەریعەت سێ پارچە و بەشە عیلم، عمل، إخلاص، بێ ئەم سیانە شەریعەت بەدی نایەت، کاتێ ئەم سیانە بەدی هات رەزامەندی خوا بەدی دێت، ئەوەیش پلەیەکە لە ژووری هەموو خۆشبەختی هەردوو جیهان دایە، کەواتە شـەریعەت هـەموو مەبەسـتێکی تێدایـە، لـە شـەریعەت بـەدەر هـیچ مەبەسـتێکی تـر نـی یـە، تەریقەت و حەقیقەت خزمەتکاری شەریعەتن و بەشی سێ یەمی کە إخلاصە بەدی ئەهێنن.

لە نووسراوی(٤١) دا بەرگی ناوبراو ئەفەرموێ: عیلمی باطن کە تەریقەت و حەقیقەتی پێ ئەڵێن تەواوکەری شەریعەتە کە پێ ی ئەوترێ زاهیر، ئەو کەسانەی بە رێگای تەریقەت و حەقیقەت دا ئەڕۆن لەو رێگایەدا هەر شتێکیان لێ بینرا کە پێچەوانەی شەریعەت بێت ئەوە

لە بێ هۆشی و مەستی یەوە روو ئەدات، کاتێ هۆشیان کردەوە ئەگەڕێنەوە بۆلای شەریعەت. ئەو زانین و شتە پێچەوانەیان ئامێنێ و هەموو ئەبن بە تۆز و گەردیان ئەچێ بە با، هەر باطنێ راست بێت لە راستی دا باطنی شەرعە، هەر زانین و ناسینێ کە لە تەریقەتەوە دەست کەوت ئەبێ هەمووی هینی شەریعەتە، نەك شتێکی جیاواز کە لە شەریعەت بەدەربێت.

لە کتێبی(معارف الصوفیة) دا ئەفەرموێ: ئەگێڕنەوە لە هەندێ ئەهلی تەریقەتەوە کە وتویەتی: شەریعەت توێکڵە و تەریقەت ناوکە و ناوەڕۆکە! کە بە بێگومان ئەگەر پینە نەکرێ و تەئویل نەکرێ ئەوە وتەیەکی ناڕاستە. پیاوە گەورەکانی تەریقەت بۆ ئەم مەبەستانە ئەوەندە زۆرن نایەنە ژمارە، ئەم ئەندازە بەسە بۆ روون بوونەوەی رێگای راستی تەریقەت و حەقیقەت، ئیتر یارمەتی و خستنە سەر رێگای راست بەدەست خوایە.

ئینجا دەست ئەکات بە سەرگوزەشتەی پێنجەم کە دواترین سەرگوزەشتەیە لەم سورەتەدا، سەرگوزەشتەی کەسێ کە ناوبراوە بە(ذو القرنین) و یەکێکە لەو پرسیارانەی کە ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) کرا ئیتر پێویست نی یە باس و ناسینی پرسیار کەر، چونکە لەم بەسەرهات و سەرگوزەشتانەی کە قورئان ئەیان فەرموێ پەند و ئامۆژگاری تێدایە و ئەمێ یان لێ وەرئەگیرێ، زانین و ناسینی شەخسی(ذو القرنین) و شوێن و جێگا و کات و چەرخی ئەویش عەینی شتە، ئەگەر پێویست بووایە قورئان باسی ئەفەرموو، کەواتە با خەریك نەبین بە شتێکەوە کە لە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێ کراوەوە نەهاتبێ، ئەوەی مێژوو نووسان ئەیڵێن لەم جۆرە بەسەرهاتانەدا زۆربەی گۆترەکاری یە و بە دەم بڕ ئەوترێ، کەواتە با شوێنی قورئانەکە بکەوین بێ زیاد و کەم! بەس ئەمە ئاشکرایە کە ئەم(ذو القرنین) ەی ئێرە کە بەناوبانگە بە ئەسکەندەری ذو القرنین ئەوە نی یە کە لە مێژوودا باس ئەکرێ و بەناوبانگە بە ئەسکەندەری ئیغریقی، چونکە بت پەرست و کافر بووە و ئەمەی کە قورئان باسی ئەفەرموێ: بەندەیەکی ئیمانداری ساڵح بووە و تەنانەت هەندێ ئەڵێن پێغەمبەریش بووە،

وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ قُلۡ سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن
كُلِّ شَىۡءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِى عَيۡنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ
عِندَهَا قَوۡمًاۗ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمۡ حُسۡنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ
ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكۡرًا ﴿٨٧﴾

---

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ﴾ پرسیارت لێ ئەکەن لە هەواڵ و بەسەرهاتی(ذی القرنین). ﴿قُلۡ﴾ لە وەڵامیان دا بڵێ: ﴿سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا﴾ بەڕاستی باسی ئەکەم بۆتان و ئەخوێنمەوە بەسەرتان دا هەواڵێکی باس کراو لە بەسەرهات و هەواڵەکانی، یان لەلایەن خواوە ئەخوێنمەوە بەسەرتان دا هێندێ قورئان کە لەسەر هەردوو راکە ئەمەیە دەست پێ ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلۡأَرۡضِ﴾ بەڕاستی ئێمە هێز و توانا و دەسەڵاتمان پێدا لە زەوی دا کردمان بە پادشا و کاروباری وڵاتمان خستە ژێر دەستی ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَىۡءٍ سَبَبًا﴾ واتە بۆ هەر شتێ کە پێویستی پێی بوایە، بۆ هەموو کار و مەبەستێکی پادشایەتی و رامیاری وڵات هۆی ئەو شتانە و رێگای گەیشتن بەو مەبەستانەمان پێ دابوو لەزانین و دەسەڵات و لەشکر و سوپا و هەر هۆیەکی تر. ئەم پادشایە ویستی بگەڕێ بە وڵاتان دا بۆ نەهێشتنی خراپە و بڵاو کردنەوەی چاکە و دادپەروەری، لە یەکەم جارەوە ویستی بەرە و رۆژئاوا بڕوا ﴿فَأَتۡبَعَ سَبَبًا﴾ ئینجا شوێنی هۆی گەیشتن بەو مەبەستەی کەوت و رێگای دایە بەر و رۆیشت ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ﴾ هەتا گەیشتنە ئاوا بوونی خۆر. واتە گەیشتە ئەوپەڕی ئاوەدانی ئەو کات و چەرخە لە تەرەف رۆژئاوا، گەیشتنە شوێنێ کە لە پێش چاوی وشکانی برایەوە وا دەرئەکەوێ. بەرە و رۆژئاوا رۆیشتبێ هەتا گەیشتبێتە قەراغی دەریا لوشی ئەتلەسی کە لەو کاتەدا ناوبراوە بە دەریای تاریکی و گومان براوە کە بەر و وشکی ئیتر دوایی دێت. لەوێدا ئەبینرا خۆر لە پێش چاو ئاوا ئەبێ، لەبەر ئەوە ئەو شوێنە ناوبراوە بە شوێنی ئاوا بوونی خۆر کە بریتی یە لە شوێنێ کە لە پێش چاو خۆری لێ ئاوا ببێ، ئەوەیش بە گوێرەی گۆڕانی شوێن ئەگۆڕێ:

له وڵاتی چیاو کۆسارا وا ئەبینرێ لە چیاو شاخ و کەژدا ئاوا ئەبێ. لە شوێنی دەشت دا وا ئەبینرێ کە خۆرەکە ئەچێ بەناو زەوی دا، لە کەنار دەریادا وا ئەبینرێ کە ئەچێ بەناو ئاوی دەریاکەدا. ئینجا باوەڕ وایە کە ئەو شوێنە شوێنی تێرژانی رووبار بووبێ، لەو جۆرە شوێنانەدا گژو گیا و قوڕە رەشە پەیدا ئەبێ لەگەڵ چەند چاڵ و گۆمێ کە لە پێش چاو وەکو کانی و چەشمە وان لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ واتە کاتێ گەیشتە ئەو شوێنە خۆری وا دەست کەوت ئاوا ئەبێ لە ئاو و کانی یەك دا کە قوڕە رەشە بە دەرو بەریا هەیە، ﴿وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا﴾ واتە لەلای ئەو کانیاو و قوڕە رەشەیەدا نەتەوە و گەل و کۆمەڵێکی دەست کەوت و رێی لێ یان کەوت، ئەو نەتەوەیە کافرو بێ باوەڕ بوون و بڕیاری خوا دەربارەی ئەو گەلە ئەوە بوو کە بەم فەرمودەیە بۆمان باس ئەکات ﴿قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ﴾ وتمان ئەی(ذو القرنين): ﴿إِمَّا أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا﴾ یان لە رێوە سزایان ئەدەیت بە کوشتن یان کردەوەیەکی جوان و شیرین بەکار ئەهێنی و بڕیار ئەدەیت لەنێوانیان دا، بەم جۆرە بانگیان ئەکەیت بۆ ئایینی خواو رابەری یان ئەکەیت بۆ سەر رێگای راست، واتە ئارەزووی خۆتە هەرکام لەم دوو بارە بەکار ئەهێنی رەوایە بۆت و بەرگری ناکرێت. ئینجا خوا چۆن ئەوەی فەرمو؟ ئایا سروشی بۆ کردو(ذو القرنين) پێغەمبەر بووە؟ یان مەبەست ئەوەیە خوا زاڵی کرد بەسەریان دا، بە جۆرێ مل کەچ و ژێرباری کردن بۆی وەکو پێی بڵێ برۆ بە ئارەزووی خۆت چی ئەکەیت بیکە؟ هەردوو بار هەڵئەگرێ، هیچ بەرگری کەرێ نی یە بۆ باری دووەمیش، ئەوەی گرنگ بێت ئەمەیە کە(ذو القرنين) دەستووری کردەوەی خۆی دەربڕی دەربارەی ئەو وڵاتانەی کە بکەونە ژێر دەستی، بارە باشەکەی بڕیار داو ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿أَمَّا مَن ظَلَمَ﴾ ئەو کەسەی کە من بانگی ئەکەم بۆ سەر رێگای خواو ئەو هەر ستەم بکات لەخۆی و نەیەت بەدەم بانگەوازەکەمەوەو کۆتایی نەهێنێ لە کوفرەکەی ﴿فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ﴾ ئەوە بەڕاستی ئێمە سزای ئەدەین بە کوشتن لەم جیهانەدا ﴿ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُّكْرًا﴾ لە پاشان زیندوو ئەکرێتەوە و ئەگێڕرێتەوە بۆلای خوای خۆی لە رۆژی دوایی دا، ئینجا ئەویش سزای ئەدا بە سزایەك کە وێنەی نەبینراوە و نەناسراوە،

وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا
بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ
خُبْرًا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا
﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ
سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾

---

**﴿وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ ئەو كەسەی کە ئیمانی هێنا و کردەوەی چاکی کرد بە گوێرەی ئیمانەکەی ﴿فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ﴾ ئەوە پاداشتێکی شیرینی بۆ هەیە کە پاداشت ئەدرێتەوە پێی لە هەردوو جیهان دا، بە کورتی ئەو پادشا ساڵحە بڕیاری دا کە چاکان و پاکان چاکەیان دەربارە ئەکرێ، خراپان و تاوان باران تۆڵەی کردەوە ناڕەواکانیان لێ ئەسێنرێ، ئەوەیە دەستووری حوکمڕانی ڕاست، وڵات بەوە دائەمەزرێ و ڕێك و ڕاست ڕاگیر ئەبێ و کردەوەی چاك ئەڕوێ لە وڵات دا و کردەوەی خراپ لە ڕیشە دێت، چونکە هەرکات خەڵکی شتی وای بینی ئەو کاتە چاکان باشتر سوور ئەبن لەسەر چاکە، تاوان باران پەشیمان ئەبنەوە و کۆتایی ئەهێنن، بەڵام کاتێ بینرا کە تاوان باران و دەست درێژیی کەران ئیشیان لە پێشە و ڕێز ئەگیرێن، پیاو چاکان بێ نرخ و ریسوان، بەڵکو بەرگری ئەکرێن و ئەتارێنرێن.. کاتێ ناڕەوایی وا بینرا، ئەو کاتە وڵات وێرانە و ژیانی پیاوەتی و کامەرانی تیادا نامێنێ. ئینجا(ذو القرنين) گەڕاوە لە ڕۆژئاوا، ویستی بگەڕێ و چەرخەیەکیش بکات بۆ ڕۆژهەڵات، ﴿وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا﴾ لە دنیادا هەموو شتێکی بۆ ئاسان ئەکەین و ئەرکێکی ناخەینە سەر شان کە قورس و ناڕەحەت بێت، وەکو بۆمان باس ئەکات و ئەفەرموێ ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا﴾ ئینجا**

رێگا و هۆی گەیشتنی بەو مەبەستە دایە بەر و ڕۆیشت ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ ﴾ هەتا کاتێ گەیشتە شوێنی هەڵاتنی خۆر، واتە گەیشتە یەکەم شوێنی ئاوەدانی کە خۆری لێ هەڵبێت لە تەرەف ڕۆژهەڵاتەوە ﴿وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا﴾ لەو شوێنەدا خۆری بینی هەڵدێتە سەر گەل و نەتەوەیەك کە هیچ پەردە و پەنایەکمان بۆ دانەنابوون بیان شارێتەوە لەخۆر، واتە وڵاتەکەیان دەشت و سارا بوو، بێ بەرزی و نزمی و شاخ و چیا و دار و درەخت ، خانووی هەڵنەئەگرت یان ڕووت و قوت و بێ پۆشاك بوون، بەکورتی(ذو القرنين) بەرەو ڕۆژهەڵات تا گەیشتە ئەوپەڕی ئاوەدانی لەوێدا ڕێگای کەوت لە گەل و نەتەوەیەك لە وڵاتێکی دەشت و سارادا بە بەر خۆرەوە بێ خانوو و بێ دار و درەخت یان ڕووت و قوت ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ واتە کاروباری(ذو القرنين) بەو جۆرە بوو کە باس کرا لەبابەت گەڕان و گەیشتنی بە تەرەفی ڕۆژ ئاوا و ڕۆژهەڵات، لەبابەت هێز و دەسەڵات و پادشایەتی و لەشکرو سامانەوە، یان کار و کردەوەی ناو دانیشتوانی ڕۆژهەڵات دا وەکو ئەوە بوو کە باس کرا دەربارەی ڕۆژ ئاوا ﴿وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا﴾ بێگومان ئێمە ئاگادار بووین و ئەزانین بەو هەموو سوپا و دەسەڵات و ئەو شتانەی کە هەموو پایەی پادشایەتی بوون لای(ذو القرنين)، ئێمە ئاگادار بووین بە هەموو کاروباری ئاشکرا و پەنهانی یەکی، واتە گەیشتبووە رادەیەك هەر لە زانینی خوادا بوو، بۆ کەسی تر باس ناکرێت، لەپاش ئەو دوو گەڕان و گەردشە کە باس کران، ئینجا ویستی گەردشێکی تر بکات بەرەو وڵاتی خواروی زەوی، هۆی گەیشتنی بەو مەبەستەی گرتە دەست و ڕێگای دایە بەر وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا * حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴾ هەتا گەیشتە نێوانی دوو بەربەست، واتە گەیشتە نێوانی دوو شاخ و چیای بەرزی سەخت کە ڕێگای هاتوچۆ نەبوو بە ملیان دا ﴿وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا﴾ کاتێ گەیشتە ئەو شوێنە ڕێگا

کەوت لە گەل و ئوممەتێکی دواکەوتوو لای ئەو دوو چیادا ﴿لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾ لەوانە نەبوون لە قسە و گفتوگۆ تێ بگەن لەبەر نەفامی و تێنەگەیشتنیان، یان لەبەر زۆر جیاوازی زمانەکەیان، جا لەو دیوی ئەو دوو شاخەوە دوو نەتەوەی زۆری بەهێز هەبوون پێ یان ئەوترا ﴿یاجوج و ماجوج﴾ ئەهاتنە سەریان بۆ سزا و تالأن و برۆیان، لە بۆشایی نێوان ئەو دوو شاخەوە ئەهاتنە سەریان، ئینجا کە بینی یان ئەم پادشایە بە دەسەلأت و دادپەروەرە داوایان لێ کرد چارەسەریان بکات، و بەرهەڵستی فەراهەم بێنێ لەنێوان ئەمان و ئەوان دا، لەبەر ئەوە ﴿قَالُوا﴾ وتیان: ﴿يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ﴾ ئەی(ذو القرنين) بەڕاستی ﴿یاجوج و ماجوج﴾ ستەم و خراپەکاریی ئەکەن لە خاکەکەمان دا بە کوشتن و بڕین و وێران کردنی ماڵ و کشتوکاڵمان ﴿فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا﴾ دەی با لەماڵی خۆمان پول و پارەیەکت بۆ بڕیار بدەین ﴿عَلَىٰ أَنْ تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا﴾ لەسەر ئەمەی بەربەستێ فەراهەم بێنی لەنێوان ئێمە و ئەوان دا کە نەتوانن بێنە سەرمان و دەست درێژییمان لێ بکەن، بە کورتی ویستیان لەنێوان خۆیان دا ماڵ و سامانێکی بۆ کۆ بکەنەوە و بیدەنێ بەرامبەر ئەو کردەوە و کرێی ئەوە بێت، ئەویش نەیویست و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ ئەو سامان و دەسەڵاتەی پەروەردگارم پێی داوم و منی جێگیر کردووە تیای دا، ئەوە چاکترە لەوەی کە ئێوە پێم بدەن، واتە پێویستیم بەماڵ و کرێ و سامانی ئێوە نی یە، ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ﴾ ماڵ و سامان مەدەن بەڵکو کۆمەکی و یارمەتیم بدەن بە هێزی دەست و باز و بە کردەوە ﴿أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾ بەرهەڵستێکی بەتین فەراهەم ئەهێنم لەنێوان ئێوە و ئەوان دا. ئەو پادشا ساڵحە تەماشای کرد ئاسانترین ڕێگای ئەو بەرهەڵستە ئەوەیە بۆشایی نێوان دوو چیاکە پڕ بکاتەوە بە جۆرێك ڕێگای هاتوچۆیان نەمێنێ،

ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ
قِطۡرٗا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّىۖ

---

لەبەر ئەوە فەرمووی: ﴿ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ﴾ پارچە ئاسنم بدەنێ و بۆم بێنن، بۆ ئەمەی وەکو خشت ئەو نێوانەی پێ هەڵچنێ، ئەوانیش بۆیان هێنا ئەویش هەڵیچنی ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ﴾ هەتا بۆشایی نەما و ڕێکی کرد لەگەڵ ڕوو و لێواری هەردوو چیاکەدا، و گەیاندی یە سەر لوت و پۆپەیان، ئەو بەینەی بە ڕێکی پڕ کردەوە، ئینجا فرمانی دا کە ئاگر بکەنەوە لەو پارچە ئاسنانەدا و کورە و موشەدەمە و هۆی هەڵگیرساندن ئامادە بکەن، ئینجا ﴿قَالَ ٱنفُخُواْۖ﴾ وتی: دەمەی دەن و فووی پیا کەن بەو کەرەسانە، ئەوانیش بەو جۆرە ئاگرەکەیان تاودا، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا﴾ هەتا ئەو پارچە ئاسنانە سوور بوونەوە و وەکو ئاگریان لێ هات، ئینجا ﴿قَالَ﴾(ذو القرنين) وتی: ﴿ءَاتُونِىٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا﴾ واتە مسی تواوەم بۆ بێنن ئەیکەم بەسەری دا، ئینجا کە کردی بەسەری دا بۆشایی نێوان ئاسنەکانی پڕ کردەوە و هەموو بووە بەیەك پارچە و دیوار و بەرهەڵستێکی ئاسن فەراهەم هات، بە تەواوی ڕێگای ﴿یاجوج و ماجوج﴾ نی بەست و بڕی، وەکو ئەفەرمویٰ: ﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ﴾ ئینجا نەیان ئەتوانی سەرکەون بەسەری دا بەهۆی بەرزی و ساف و لوسی یەوە ﴿وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا﴾ نەیان ئەتوانی کونی تێ بکەن لەبەر ڕەقی و ئەستووری. ئەوەی کە ئەو پادشا ساڵحە کردی شتێ بوو خوا ڕێنموونی کرد بۆی، ئەگەر نا کەس لەو کاتەدا شتی وای بەدڵ دا نەئەهات. تەنانەت پاش ئەو کردەوەی ئەوە چەندەها چەرخ تێپەڕی، ئینجا لەم زانیاری تازەدا ڕێ برا بەوە کە تێکەڵ کردنی بەشێ لە مس لەگەڵ ئاسن دا هێزو ڕەقی و بەرگری ئاسن چەند جارە ئەکاتەوە. ئەو پیاوە چاکە هەڵسا بەو کردەوە زۆر گرنگە کە وێنەی نەبیسراوە لەوەوپێش لەگەڵ ئەمەدا چونکە خواناس بوو هیچ لە خۆی نەگۆڕا و کەشخە و شانازی نەکرد، بەڵکو یادی خوای کرد و ئەو کردەوەی گێڕایەوە لای خوا بەم ڕەنگە ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّىۖ﴾ ئەم بەرهەڵستە، یان فەراهەم هێنانی لەسەر دەستی من دا بەرهەمی ڕەحم و بەزەیی یەکی گەورە بوو، نیعمەتێکی گرنگ بوو لەلایەن پەروەردگارمەوە، چونکە بوو بەهۆی ڕزگار بوونی ئەو کەلە بێ دەسەلاتە لەدەست جەور و ستەمی ﴿یاجوج و ماجوج﴾ ی ستەمکار،

فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا ﴿٩٨﴾ وَتَرَكۡنَا بَعۡضَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ يَمُوجُ فِي بَعۡضٖۖ

﴿فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ﴾ ئینجا کاتێ بەڵێنی خوای من هات بە دەرچوونیان یان بە نزیک کەوتنەوەی ڕۆژی دوایی، ئەو کاتەم ئەم بەربەستە ئەکات بە زەوی یەکی تەخت، واتە ئەیڕوخێنێ و تەختی ئەکات لەگەڵ زەوی دا، ﴿وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا﴾ بێگومان هەمیشە بەدی هاتنی بەڵێنی خوای من ڕاستە و ئەبێ بەدی بێت. لێرەدا ئەم زنجیرەیە دوایی هات لە سەرگوزەشتەی(ذو القرنین) کە نموونەیەکی پاك و خاوێن بوو بۆ کاربەدەستی ساڵحی دادپەروەر کە خوای گەورە ئەو هەموو دەسەلأت و سوپا و سامانەی پێدا تا توانی وڵاتانی گرتە ژێر دەست لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلأت دا، کەچی لەخۆی نەگۆڕا، و جەور و ستەمکاریی نەکرد، گەل و وڵاتی خەڵکی داگیر نەکرد بۆ پێکهێنانی بەرژەوەندی و ئارەزووی خۆی، هیچ جۆرە کردەوەیەکی زۆردارانە و ستەمکارانەی نەکرد لەگەڵ خەڵکی دا، بەڵکو چووە هەر شوێن و وڵاتێ داد و ڕاستی بڵاو کردەوە، کۆمەکی داماو و دواکەوتووانی کرد، بەرگری دەست درێژیی کەرانی کرد، ئەو هێزو دەسەلأتەی کە بووی بەکاری هێنا و بەختی کرد لە ئاوەدان کردنەوەی وڵات و چاك کردن و گۆڕاندنی هەموو خراپە و نالەباری یەك و زاڵ کردن و ڕاست کردنەوەی هەق و ڕاستی. ئینجا ئایا ﴿یاجوج و ماجوج﴾ کێن؟ ئێستا لە کوێن؟ و چی یان بەسەرهات و چی یان بەسەر دێت؟ ئەمانە پرسیارێکن وەلأم دانەوەیان بەڕاستی گرانە، چونکە ئێمە لەو بابەتانەوە هیچ نازانین جگە لەوەی قورئان باسی کردبێ یان لە حەدیسێکی سەحیح دا بیبێت. قورئان لێرەدا لە زمانی(ذو القرنین) ەوە ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا﴾ وەکو باس کرا. لەم فەرمودەیەدا هیچ کات و چەرخێکی دیاریی نەکردووە بۆ ڕووخاندنی ئەو سەد و بەربەستە، کەواتە لەوانەیە بڵێن: ئەو بەڵێنە تێپەڕیوە و رووی داوە. هەروەها لە سورەتی(الأنبیاء) دا ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾ بێ ئەوەی کات و چەرخێ دیاریی بکات بۆ دەرچوونی ئەوانە، نزیك کەوتنەوەی ڕۆژی دوایی لە دەرچوونی ئەوانەوە، کە ئەم ئایەتە ئەیگەیەنێ، هیچ بەرگری ناکات کە ئەو دەرچوون و ڕووخانە ڕوویان دابێت لەمەوپێش و تێپەڕ بووبن، چونکە لە چەرخی هاتنی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕۆژی دوایی بە نزیك دائەنرێ، بەڵکو ڕەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) کراوە بە نیشانەی نزیکی هاتنی ئەو ڕۆژە، کات و چەرخ

و زەمان لە حیسابی خوادا جیاوازە لە حیسابی ئادەمی بە جۆرێ تێپەڕینی ملیونەها ساڵ و چەرخ لای خوا هیچ چاو نادات و بە نزیك دائەنرێ هەرچەندە لای ئادەمی زۆر دوور و درێژ و دوایی نەهاتووە، کەواتە هەڵئەگرێ و ئەگونجێ کە رووخانی ئەو بەربەستە و دەرچوونی ئەوانە رووی دابێ لەمەوپێش، ﴿یاجوج و ماجوج﴾ بریتی بن لە مەغۆل و تەتەر کە هاتن وەکو لافاو دایان بەسەر وڵاتان دا. لەم بارەیەوە حەدیسێکی سەحیح هەیە کە ئیمامی ئەحمەد ئەیهێنێ لە سوفیانی سەوری یەوە تا ئەگاتە زەینەب کە یەکێکە لە دایکی ئیمانداران، ئەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر(ﷺ) لەخەو خەبەری بووەوە و بەجۆرێ رووی بەفەڕی سوور داگیرسابوو، فەرموی هاوار بۆ عەرەب لەخراپە و شەڕێ کە نزیك کەوتووەتەوە لێ یەوە پەنجەی شایەتمان و پەنجە گەورەی کرد بە هەڵقە و فەرموی: کونێکی وا کراوەتە بەربەستەکەی ﴿یاجوج و ماجوج﴾، زەینەب ئەفەرموێ: عەرزم کرد: ئایا ئێمە بەهیلاك دا ئەبرێین و هەرچەند پیاو چاکیشمان تێدا بێت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: بەڵێ: کاتێ خراپە زۆر بوو، زۆری سەند. ئینجا لە ساڵی(٦٥٦) ی کۆچی دا تەتار هات بە سەرۆکایەتی هۆلاکۆ – پەنا بەخوا وڵاتی وێران کرد و خەلافەتی عەباسی رووخاند – و معتصم کە دواترین خەلیفەی عەباسی بوو بەخۆی و نەسەب و تەبەعەیەوە بەرباد کران، لە بەغدادا تا نزیکی ملیۆنێ موسڵمان سەربڕا. بە گوێرەی قسەی مێژوو نوسانی عەرەب و فەرهەنگەکانیش وا دەرئەکەوێ کە ﴿یاجوج﴾ تەتارە و ﴿ماجوج﴾ مەغۆلە. کە هەر لە کۆنەوە باویان وابووە هەر خەریکی شەڕ و شۆڕ و تاڵان و وڵات داگیر کردن بوون، لە چەرخی کۆن دا لە ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتنە خوارەوە، رۆیشتن بۆ ئەوروپا، زۆرجار ئەیاندا بەسەر چین و ئاسیای رۆژئاوادا، ئینجا لەپاش رەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە سنووری وڵاتی خۆیان دا مانەوە هەتا کاتێ(تموجین) هاتە سەر دەور، کە ناوی خۆی نا(جنگیز خان) بە زمانی خۆیان واتە پادشای هەموو جیهان. ئەو ستەمکارە لەسەرەتای چەرخی حەوتەمی کۆچی دا لەسەردا لە شاخ و شوێنە بەرزەکانی ئاسیای ناوەڕاست هاتە خوارەوە لە یەکەم جارەوە چینی شیمالی داگیر کرد، ئینجا رووی کردە وڵاتی ئیسلام دای بە ملی وڵاتی خوارزما، و سوڵتان – قطب الدین – ی کوڕی ئەرمیلانی شکاند و کارێکی بەسەر ئەو دەوڵەتە هێنا وێنەی لە مێژوودا نەبیستراوە. ئینجا لەپاش جەنگیز خان ئەفتای کوڕی لە شوێنی دا دانیشت و لەساڵی ٧١٣ ی کۆچی دا(بانوی) برازای دای بەسەر وڵاتی روس و پۆلۆنیا و مەجەڕا بە وێران کردن و سوتاندن، ئینجا ئەفتای مرد و(جالوك) لە شوێنی دا دانیشت دای

به ملی پادشای رۆم دا، ژێر دەستی کرد و سەرانەی لەسەر دانا، ئینجا مرد و(مەنجۆی) برازای لە شوێنی دا دانیشت، ئینجا مەنجۆ فەرمانی دا بە برازاکانی:(کیلای) و(هۆلاکۆ) کە نەوەستن خەریکی گرتنی ولاتان بن، ئەوانیش پەلاماریان دا، کیلای ولاتی چینی گرت، هۆلاکۆیش کشا بەسەر ولاتەکانی ئیسلام دا و نەوەستا هەتا گەییشتە پایتەختی خەلیفە لە بەغداد، ئەوەی کرد کە کردی. خوێن هەلسا لەکۆلانەکانی بەغدادا، کتێب خانەکانی بەغداد فڕێ درانە ناو دیجلە بەجۆرێ رەنگی ئاوی دیجلە گۆڕا و خەلکی بەسەر بارخانەی کتێبەوە ئەپەڕینەوە لە دیجلە! بە کورتی: وەچە و نەوەی جەنگیزخان هەموو ئاسیا و ئەورووپای شەرقی یان داگیر کرد، بەش بەشیان کرد لەنێوان خۆیان دا، و کردیان بەچوار بەشەوە ولاتی فارس و بەغداد و شام کەوتە ژێر دەستی هۆلاکۆ. ئەمەی کە وترا کورتەیەکە لە – دائرة المعارف و ابن خلدون و ابن موسکویه و رسائل اخوان الصفا – جا وەکو لە پێشەوە وتمان هەلێ ئەگرێ و ئەگونجێ کە ﴿یاجوج و ماجوج﴾ ئەم تەتار و مەغۆلە بن کە کاتی خۆی(ذو القرنین) بەرهەلستی دروست کرد و بەربەستی کردن لەدەست درێژیی تا کاتی خۆی ئەو بەر هەلستە رووخا و ئەوانیش هاتن بە ولاتان دا بەو جۆرەی کە باس کرا، بەلام وەنەبێ ئەوە شتێ بێ تەواوی باوەڕ و دلنیایی لەگەلێ دا بێت، بەلکو زانینی راستەقینە لای خوایە. ئینجا بە بۆنەی قسەکەی – ذو القرنین – ەوە کە فەرموی: بەلێنی خوای من راستە و بەدی دێت، ئیتر مەبەست بەوە بەلێنی هاتنی رۆژی دوایی بێت، یان بەلێنی رووخانی بەر هەلستەکە و دەرچونی ﴿یاجوج و ماجوج﴾ بێت کە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نزیک کەوتنەوەی رۆژی دوایی بە هەرکام زۆر بەجێ یە، بەو بۆنەیەوە باسی پیشاندانی شێوەی هەندێ لە رووداوەکانی ئەو رۆژە،ئەفەرموێ: ﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ﴾ واتە لەو رۆژەدا کە بەلێنی خوا بەدی دێت خەلکی سەرگەردان ئەکەین بە جۆرێ لەبەر سەر لێ شێواوی و نەزری خۆیان ئەکەونە گەڕان و تێکەلێ و پێکەلێ ئەبن و دێن بەیەک دا وەکو شەپۆلی دەریا، ئیتر ئەو بەسەرهاتە کاتی هاتنی رۆژی دوایی و وێران بوونی ئەم جیهانە بێت، یان پاش زیندوو کردنەوە بێت کە بەجارێ هەموو راست ئەبنەوە بە سەرگەردانی یەوە. بەرهەرکام رێکە و ئەگونجێ. لەسەر باری یەکەم: لەسەرەتای وێران بوون لە حەیبەت و سام دا بەو جۆرە سەرگەردان ئەبن و ئینجا هەموو بەجارێ ئەمرن و لەپاش ماوەیەك کە خوا بڕیاری دا هەموو زیندوو ئەکرێنەوە و کۆ ئەکرێنەوە،

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَآءٍ
عَن ذِكْرِي وَكَانُوا۟ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن يَتَّخِذُوا۟ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوْلِيَآءَ
إِنَّآ أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ

---

**وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾ فو ئەکرێ بە سورا. ﴿فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا﴾ بەهۆی ئەوەوە هەموویان زیندوو ئەکەینەوە و کۆیان ئەکەینەوە بۆ کۆکردنەوەیەکی وا کەسی لێ جێ نامێنێ و کەس نابوێرێت، لەسەر رای دووەم ئەم فو کردنەی ئێرە دوای زیندوو کردنەوەیە، بۆ رێزدان و رێك و پێك کردنیانە، جا بەم پێ یە ئەبێ سێ جار فو بکرێ بە سورا: یەکەم بۆ وێران کردن، دووەم بۆ زیندوو کردنەوە، سێ یەم بۆ رێزدان. هەرچەند دووبار بەناوبانگە و لە چەند شوێنێك دا قورئان باسی دووجار ئەفەرموێ. بەڵام وەرئەگیرێ لەم شوێنەدا جاری سێ یەمیش هەیە وەکو لە حەدیسیشەوە وەرئەگیرێ. ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا﴾ لەو رۆژەدا دۆزەخ دەرئەخەین و ئاشکرای ئەکەین بۆ کافرەکان، پیشانیان ئەدەین بە پیشاندانێکی تەواو ﴿ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكْرِي﴾ ئەو کافرانەی کە لەم جیهانەدا چاوەکانیان لەناو پەردەی ئەستووردا بوو بەهۆی ئەوەوە بەرگری کرا بوون لە بینینی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە روونانە کە هۆی ناسین و یادی من بوون بە پەرستن و گوێ رایەڵی بە تاك و تەنیا ﴿وَكَانُوا۟ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا﴾ ئەوانەی کە کاتی خۆی لەم جیهانەدا توانای گوێ گرتن و بیستنی ئایین و بڕیاری منیان نەبوو. واتە ئەوانە لەم جیهانەدا تەماشای ئەو هەموو بەڵگە روونانەیان نەئەکرد و خۆیان کوێر کردبوو لە ئاستیان، گوێچکەی خۆیانیان کەڕ کردبوو لەبیستنی شتی راست، ئەوانە کە لەم جیهانەدا ئاوا بوون، کەواتە لەو رۆژەدا هەر لە یەکەم جارەوە دۆزەخیان لێ ئاشکرا ئەکرێ با لە پێشەو ببینن و گوێ بگرن لەدانە کپە و چەپۆکان و پیشکە و پژمەی دۆزەخ کە لە دوورەوە ئەیکات دەربارەی دۆزەخی یەکان. خوا بە بەزەیی خۆی پەنامان بدات لە سزای دۆزەخەکەی آمین. ئینجا باسی بۆ سوودی ئەو**

پەرستراوانە ئەکات کە خەڵکی پشتیان پێ ئەبەستن لەم جیهانەدا، ئەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِى مِن دُونِىٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ کەسانێ کە کافرن و بەندەیانی منیان گێڕاوە بە پەرستراوی خۆیان وەکو مەلائیکە و عیسا و عوزەیر و کەسانی تر و لە من تێپەڕیون بۆ پەرستنی ئەوان، ئایا ئەوانە گومانیان وا بردووە کە گێڕانی ئەو بەندەیانە بە پەرستراو، بۆ خۆیان هیچ سوودێکیان پێ ئەگەیەنن و بەرگری سزای منیان لێ ئەکات؟ واتە نەخێر شتی وا نابێت و گومانەکەیان بێ جێ یە. ﴿أَوۡلِيَآءَۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا﴾ چونکە ئەوانە کافرن و بەڕاستی ئێمەیش دۆزەخمان ئامادە کردووە و حازر و بزرمان کردووە بە جێ و شوێن بۆ هەموو کافرەکان کە لە ڕێوە بچنە ناوی یەوە وەکو میوان رابوێرن تیای دا، یان سزاکەی بچەژن وەکو ئەو خۆراکەی کە لە یەکەم جارەوە ئەدرێ بە میوان خوا پەنامان بدات، ئەم ئایەتە وا پیشان ئەدات کە جێ و شوێن و سزای تریشیان هەیە، ئەمە لە ڕێوە وەکو بەرکۆڵێ وایە دەی ئاخۆ جێ و شوێن و سزای ئێجگاری و هەمیشەیی یان چۆن بێت؟ ئینجا خەڵکی ئاگادار ئەکاتەوە بە نەزانی و نەفامی کافرەکان، بە رەنجەڕۆیی یان، هەروەها نرخ و نرخی کردەوەو خاوەن کردەوە روون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿قُلۡ﴾ بڵێ: ﴿هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا﴾ ئایا هەواڵتان بدەینێ بەوانەی کە رەنجەڕۆتر و خەسارەت مەند ترن لەبابەت کردەوەکانیانەوە؟ ﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِى ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ ئەوانە کەسانێکن هەر کۆشش و کردەوەیەك کە بە چاکیان زانیوە و کردوویانە لەم ژیانی دونیادا هەمووی ون و زایە و بێ سوود و بێ نرخە لای خوا ﴿وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا﴾ لە کاتێك دا کە خۆیان گومان وا ئەبەن کە ئیشێکی چاك ئەکەن، و کردەوەکانیان بەجێ یە، چونکە لایان وایە لەسەر ڕێگایەکی راستن و نازانن جگە لە ئەرك و ماندوویی هیچی تریان بۆ نامێنێتەوە، چونکە کردەوەکانیان لەسەر فەرمانی خوا نی یە و بنەڕەتی لەسەر ئیمان نی یە، وەکو روونی ئەکاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ﴾ ئەوانە کە کردەوەکانیان ونە و زایەیە کەسانێکن کافرن و باوەڕیان نی یە بە ئایەتەکانی پەروەردگاری خۆیان، باوەڕیان نە بە قورئان هەیە و نە بەو هەموو بەڵگە و نیشانە روونانەی کە خوای گەورە بۆی داناون، تاك و تەنیایی خوا روون ئەکەنەوە و کافرن و باوەڕیان نی یە بە زیندوو بوونەوە و پرسیار و تۆڵە و سزای خوا،

فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا۟ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَرُسُلِى
هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا
حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا
﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا
صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾

---

**﴿فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ﴾ لەبەر ئەوە هەموو كردەوە چاكەكانیان بەتاڵ و زایە ئەبن و هیچ بەرهەمێكیان نابێ بۆ ڕۆژی دوایی ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾ كەواتە هیچ نرخ و ڕێزێ بۆ ئەوان دانانێین، چونكە نرخ و ڕێز بەهۆی كردەوەی چاكەوە ئەبێ، ئەوان كردەوەكانیان هەمووی زایە كردووە، كەواتە هیچ نرخێكیان بۆ دانانرێ، بەڵكو سەرەڕای هەموو سزایەك بێ ئابڕوو و ڕیسوا ئەكرێن. یان مەبەست ئەوەیە تەرازوو و كێشانەی كردەوەیان بۆ دانانرێ، چونكە كردەوەی چاكیان نی یە تا بكێشرێ. لەپاس باسی زایە بوون و بەتاڵ بوونەوەی هەموو كردەوە چاكەكانیان، ئینجا باسی پاشەڕۆژ و تۆڵەیان ئەكات، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ كار ئەوەیە كە دێت ﴿جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ﴾ تۆڵە و پاشە ڕۆژیان دۆزەخە ﴿بِمَا كَفَرُوا۟﴾ بەهۆی كوفرەكەیانەوە ﴿وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَرُسُلِى هُزُوًا﴾ بەهۆی گێڕانی ئایەتەكانی من و پێغەمبەرەكانی من بە شتێكی گاڵتە پێ كراو، واتە بەهۆی ئەوەوە باوەڕیان نەبوو بە پێغەمبەرەكانی من و بەو هەموو موعجیزە و بەڵگە و نیشانە ڕوونانەی كە پیشانیان درا لەلایەن پێغەمبەرەكانەوە جا هەرچۆنێ باوەڕیان نەبوو بەوانە هەروەها لاقرتێشیان پێ ئەكردن. ئینجا باسی نرخ و ڕێزو پاشەڕۆژی ئیمانداران باس ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بەڕاستی كەسانێ كە ئیمان و باوەڕی ڕێكیان هێنا ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ كردەوە چاكەكانیشیان بەجێ هێنا بە گوێرەی ئیمان و باوەڕەكەیان، ﴿كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾ واتە لە زانین و بڕیاری خودا تێپەڕیوە و ڕابوردووە كە بەهەشتەكانی فیردەوس بۆ ئەوانە جێگا و شوێنی ڕێز و ڕابواردنیانە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بە جۆرێ نیشتەجێن تیایان دا هەتا هەتایە بێ بڕانەوە ﴿لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا﴾ داوای لاچوون و گواستنەوە**

ناکەن لەو بەهەشتانەدا، چونکە گومان نابەن و بەدڵیان دا نایەت خۆشتر لەوانە، بەڕاستی ئەم رستەیە ئێجگار سەرنج راکێشەرە، زۆر قوڵە پێویستە بە باشی بیری لێ بکرێتەوە بۆ ئەوەی ئەندازەیە تێ بگەین لەرادەی پلەی خۆشی ئەو بەهەشتانە کە خوا بەجۆرێکی لێ کردوون هەرگیز هیچ جۆرە ناخۆشی و بێزاری یەك روو نادات و هەست ناکرێ پێ یان و هیچ کات ئەو خوا پێداوانە بێ تاقەت نابن و ئەوبارەی کە وان لەسەری لەپێش چاویان ناکەوێ لەگەڵ ئەمەدا خوا لەم جیهانەدا ئادەمی بە جۆرێ دروست کردووە لەسەر بارێ ئارام ناگرێ و بێزار ئەبێ لەسەر تەنیا بارێ و تەنیا جێ و شوێنێك، واتە هەرچەند هەر ئەنداز نیعمەتی فراوان بێت بەپێی ئارەزوو و هەرچەندە جێ و شوێنی خۆش و دڵبەر بێت ئەگەر ماوەیەك کابرا مایەوە لەسەر ئەو بار و حاڵەی ئەو نرخ و خۆشی یەی نامێنێ لەپێش چاوی، ئارەزووی گۆڕان و باری تر ئەکات، بەڵکو بە جۆرێ بێزار و دڵ تەنگ ئەبێت ئەو جێگا و شوێنەی وەکو بەندیخانە سەیر ئەکات، ئەو هەموو ناز و نیعمەتە لەپێش چاوی تاڵ ئەبێت، لەم جیهانەدا خوا ئادەمی بەو جۆرە دروست کردووە و سروشتی لەسەر ئەو بارە دامەزراندووە، ئەم بارەش رێکە لەگەڵ ژیانی ئەم جیهانەدا و ئەم بارە شیاو و گونجاوە لەگەڵ جێ نشینی ئادەمی لەم زەوی یەدا، چونکە ئەگەر سروشتی ئادەمی بەو جۆرە نەبوایە ئەو کاتە تێکۆشانی نەئەکرد بۆ دۆزینەوە و دەست خستنی ئەو هەموو خێر و بێرەی کە خوا دایشاردووە لەم زەوی یەدا، ژیان نەئەگۆڕا و بەرز نەئەبووەوە، کەواتە جێنشینی یەکەی بە رێکی بۆ بەجێ نەئەهێنرا، کەواتە پێویستە لەم جیهانەدا ئادەمی سروشتی بەو جۆرە بێت، بەڵام بۆ ژیانی بەهەشت و ئەو سروشتە پێویست نی یە، چونکە لەوێ بێ تێکۆشان و بێ هیچ ئەرکێك هەموو شت دەست کەوت ئەبێ و ئەوەی ئارەزوو بکرێ حازر و بزرە لایان دا، کەواتە بەهەشتی یەکان نایانەوێ بگۆڕێن لەسەر ئەوبارو حاڵەی کە وان لەسەری. بێجگە لەوەش ئەگەر ئادەمی لە بەهەشت دا ئەو سروشتەی هەبێ کە ئێستا هەیەتی لەم جیهانەدا هەر ئارەزووی گۆڕانی ئەو ژیانەی ئەوێ ناکەن، چونکە خوا شێوە و چۆنی یەتی نازو نیعمەتەکەیان ئەگۆڕێ بەجۆرێ هەموو کات ئەو حاڵ و بارەی کە هەیانە بە شتێکی تازەی تەماشا ئەکەن، کەواتە هیچ وەخت بێزاری روویان تێ ناکات و داوای گۆڕان ناکەن، لە لوتف و بەزەیی یەکەی بەزیاد بێت. ئینجا شێوەی زانینی دوا نەهاتووی بێ سنووری خوا پیشان ئەدات و نزیکی ئەخاتەوە لە تێگەیشتنی کەم و کوڕی سنووورداری دوا هاتووی ئێمەوە، ئەوەش بە گوێرەی باوی قورئان کە بۆ ئەو جۆرە مەبەستانە وێنەیەکی روونی هەست پێ

کراو ئەهێنێتەوە، وەکو لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى﴾ واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەگەر لە مەرجێك دا ئاوی دەریا مەرەكەب بوایە بۆ نووسینی زانراوەكانی خوای من ﴿لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ﴾ بێگومان ئاوی دەریا دوایی ئەهات ﴿قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى﴾ پێش ئەمەی زانراوەكانی خوای من دوایی بێت، واتە بێ ئەمەی زانراوەكانی ئەو دوایی بێت. ﴿وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا﴾ واتە با لە مەرجێك دا ئاوی دەریا هەرچەند هەیە وێنە و ئەندازەی ئەوەمان بهێنایە و بمانخستایەتە سەری بە مەرەكەبی، ئەو كاتەش هەموو ئاوەكە دوایی ئەهات و زانراوەكانی خوا دوایی نەئەهات، چونكە زانراوەكانی خوا بێ سنوورە و دوایی نەهاتووە و ئاوی هەموو دەریاكان با چەند چەندانە بكرێنەوە هەر دوایی دێن و شتی دوایی هاتوو ناگات بە دوایی نەهاتوودا. ﴿قُلْ﴾ بڵێ بەو بت پەرستە بێ باوەڕانە: ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ من هەر ئادەمی یەكم وێنەی ئێوە، واتە من ئیدیعای ئەوە ناكەم كە هیچم بەدەستە، یان هیچ ئەزانم، جگە لەوەی خوا فێرم بكات و بەس ئەوە ئەڵێم: كە من جیاوازیم هەیە لە ئێوە بەوەی خوا كردومی بە پێغەمبەر ﴿يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾ سروش ئەكرێتە لام، ﴿أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ كە خوای ئێوە خوایەكی تاك و تەنیایە و جگە لەو هیچ خوایەكی تر نی یە بۆ ئێوە ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ﴾ كەواتە هەركەس ئومێد و چاوەڕوانی پاداشتی پەروەردگاری خۆی هەیە و بە تەمای پاشە ڕۆژی باشە و ئەیەوێ بە باشی بە حوزووری خوای خۆی بگات، هەركەس ئومێدی ئەوەی هەیە ﴿فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا﴾ ئەبێ با كردەوەی چاك بكات ﴿وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ هیچ كەسێك نەكات بەهاوبەش لە پەرستنی خوای خۆی دا، واتە یەكەم: كردەوەی چاك بكات، دووەم كردەوە چاكەكەش تەنها بۆ خوا بكات و پاك و خاوێنی بكات لە هەموو هاوبەش و شەریكێ بۆ خوا، نە هاوبەشی گەورە و ئاشكرا بە وێنەی كردەوەی بت پەرستەكان، نە هاوبەشی بچووك بەم ڕەنگە ڕووپامایی بكات وەكو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: خۆتان بپارێزن لە بڕیاری هاوبەشی بچووك كە خەڵكیش عەرزیان كرد هاوبەشی بچووك كامەیە؟ ئەویش فەرموی: ڕووپامایی یە، ئەم ئایەتە خولاسە و پاڵفتەی زانین و كردەوەی كۆ كردووەتەوە كە بریتی یە لە: ناسینی خوا بە تاك وتەنیا، گوێ ڕایەڵی تەنها ئەوبەپاك و خاوێنی و بێ ئەمەی بەشی كەسی تری تێدا بێت.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ﴿٣﴾

---

**سورەتی(مريم)**

**مەککەیی یە جگە لە ئایەتی(٥٨) و(٧١)**

**(٩٩) یان(٩٨) ئایەتە**

## بسم الله الرحمن الرحيم

مەبەستەکانی ئەم سورەتە ئەخولێتەوە بە دەوری تاك و تەنیایی خوا و دوور خستنەوەی رۆڵە و هاوبەش لێ ی و بە گرنگی زیندوو بوونەوە ئەگرێ کە ئەوانەش مەبەستێکی بنەڕەت و دیارین لەزۆربەی سورەتە مەککەیی یەکان دا و نزیکەی دوو لەسەر سێ ی ئەم سورەتە سەر گوزەشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەرانە – درودی خوایان لەسەر بێت – و مەبەستی سەر گوزەشتەکان روون کردنەوەی تاك و تەنیایی خوایە و زیندوو بوونەوە و پاکی خوا لە هەموو هاوبەش و رۆڵەیەك، هەروەها بەنامەی چاکان و گومڕایان بە باشی جوێ ئەکاتەوە. ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * كٓهيعٓصٓ﴾ ئەم سورەتە دەست پێ ئەکات بە پێنج پیت لەو(١٤) پیتەی کە پێ بان ئەوترێ:(الحروف المقطعة)، واتە ئەو پیتانە کە پچڕێنراون لە یەك، و ناوەکانیان ئەخوێنرێتەوە، واتە: کاف، ها ، یا ، عین، صاد، هەروەها مەبەست لەو پیتانە بە شێوەیەکی راستی خوا خۆی ئەزانێ، هەروەها هۆی هەڵبژاردنی ئەو(١٤) یە بە تایبەتی و دابەش کردنیان لەو سورەتە تایبەتی یانەدا، جیاوازی دابەش کردنیان لە پیتێکەوە تا دوو و سێ و چوار و پێنج، بە تەواوی خوا ئەزانێ. بەڵام بێگومان لە وتنی هەر کامیانەوە مەبەستێکی زۆر گرنگ وەرئەگیرێ کە بریتی یە لەبەر لێ برینەوەی خەڵکی بە تایبەتی گەلی عەرەب کە یەکەم گەل بوون ئەم قورئانەیان بیست و هاتە سەریان، بە زمانی ئەوانیش هات. بەڵێ بەری لێ برینەوە بەمەی ئەم قورئانە پێك هاتووە لە وێنەی ئەم جۆرە پیتانە کە ئەوان ئەتوانن بیڵێن و وشە و وتاری لێ پێك بێنن، کەچی ناتوانن وتارێ بهۆننەوە کە هاوتا و وێنەی قورئان بێت، تەنانەت ناتوانن بە ئەندازەی بچوکترین سورەتی دنیا دێڕێك بهۆننەوە هەواڵیشی دانێ کە ناتوانن و بە هەموو هێز و

تەقەلایەك هەوڵیان داو خەریك بوون و توانا نەبوون ئەوە بکەن، کەواتە ئەبوایە بە هیچ رەنگ مل پێچی و سەرکەشی یان نەکردایە و باوەڕیان بهێنایە، لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی ئەو زۆردارو سەرکەشانە، هەرچەند ئەیانزانی کە ئەم قورئانە لە تواناى خەڵکی دا نی یە، باوەڕیان نەهێنا و مل کەچ نەبوون بۆی، لەبەر ئەوە عاریان لێ ئەهات، ئەیانزانی ئیمان بێنن سەرۆکی و زۆرداری یەکەیان نامێنێ، لەبەر ئەوە خۆیان بەد بەخت کرد و خۆیان کرد بە سوتەمەنی دۆزەخ. خوا پەنامان بدات لە گومڕایی و سەر لێ شێوان. پاش ئەو پیتانە دەست ئەکات بە یەکەم سەرگوزەشتە، سەرگوزەشتەی دوو پێغەمبەر – سەلامی خوایان لەسەر بێت –: زەکەریا و یەحیا. ئەفەرموێ: ﴿ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ﴾ ئەمەی کە ئەخوێنرێتەوە بەسەرت دا باسی بەزەیی پەروەردگاری تۆیە بە بەندەی خۆی کە زەکەریایە ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا﴾ لەکاتێك دا کە نزاو لاڵەی کرد و هاواری کردە خوای خۆی بەهاوار و لاڵەیەکی نهێنی و پەنهانی نەك لە پێش چاوی خەڵکی، چونکە بێگومان نزاو لاڵەی وا پاك و خاوێن ترە لە رووپامایی، دڵ و دەروون بەو جۆرە ئامادەتر و حازرترە، لەگەڵ ئەوەدا رەنگە شەرمی کردبێ خەڵکی بە داواکەی بزانن، چونکە بەپێی باو و تێگەیشتنی خەڵکی رەنگە شەرمی کردبێ خەڵکی بە داواکەی بزانن، چونکە بەپێی باو و تێگەیشتنی خەڵکی داواکەی بێ جێ و نەگونجاو بوو، پیاوێکی پیری لێ کەوتووە، داوای منداڵ بکات لە کاتێك دا خێزانی نەزۆکیش بوو بێت!! حەزرەتی زەکەریا(علیە السلام) لەپەنهانی خەڵك دا لاڵەی کردە لای خوای خۆی بۆ شتێ کە باری شانی قورس کردبوو، بوو بوو بەهۆی غەم و پەژارەی دەروونی، بێگومان خوا ئاگای لە هەموو شتە و هەموو شت ئەبیستێ و ئەبینێ بێ پێویستی بە نزا و داوا کردن، بەڵام غەمبار و بێ ئارام بە هاوار و نزا باری گرانی سووك ئەبێ و دڵ ئارام ئەبێ، خوای خاوەن بەزەییش بەندەکانی خۆی ئەناسێ و ئاگادارە بە سروشتیان، لەبەر ئەوە پێی خۆشە بەندەکانی نزای لەلا بکەن و شکاتی دڵی خۆیانی لا بکەن. با بەندەکان نزا و لاڵە بکەن بۆ ئارامی دڵ و سووك کردنی باری قورسی دەروونیان، بۆ ئەمەی هەست بکەن بە پەیوەندی یان بە کەسێکەوە کە تەنیا پەنای ئەو کەڵکی هەیە و بەکاری دێت، بۆ ئەمەی رام بن لەسەر یادی کەسێ کە ئارامی دڵ تەنیا بە یادی ئەو دەست کەوت ئەبێ، بێجگە لەمانە نزا کردن مۆخ و ناوەڕۆکی پەرستنە، ئینجا با بزانین زەکەریا داواکەی چی بوو؟ چۆنی نزا کرد؟

قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّي وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾
وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِي
وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ

---

**ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ زەکەریا وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي﴾ ئەی خوای من بەڕاستی من: ﴿وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّي﴾ ئێسکێ کەوا بە منەوە لاواز بووە، جا لەجێ یە ئێسکی لاواز بووبێ کە رەقترین و بەتین ترینی هەموو پارچە و کەرەسەکانی ترە و پایە و کۆڵەکەی لەشە، لەجێ یە ئەو ئاوا بێ ئەبێ ئەو پارچە و کەرەسانەی تر چۆن بن و چی یان بەسەر هاتبێت؟ ﴿وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا﴾ سەرم شوعلە و بریقەی داوەتەوە لەبابەت مووی سپی یەوە، ... پیرو پەك كەوتووم، نزا ئەکەم. ﴿وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا﴾ من هیچ کات لەمەوپێش بە نزا کردنم لە تۆ ئەی پەروەردگارم بێبەش و رەنجەڕۆ نەبووم، واتە لەمەوپێش لەماوەی ژیانم دا و لە کاتی هێزو گەنجیم دا هەر نزایەکم کردبێ وەرت گرتووە و جێ بەجێت کردووە بۆم، کەواتە ئومێدم وایە لەم کاتی پیری و پەك کەوتوویمەدا بێبەشم نەکەیت و نزاکەم وەرگری. ئینجا ئەوەی مەترسی لێ ی هەبوو ئەمەیە کە لەپاش خۆی کەس و کاری هەڵنەسن بە خزمەت و راگیر کردنی ئەو ئایینەی کە خۆی پێ ی هەڵساوەو بە پارێزگاری ئەو شتانەی پێویستە پارێزگاری یان وەکو(مەریەم) کە لە ژێر پەروەردە و چاودێریی ئەم دا بوو، هەروەها بەخت کردنی ئەو ماڵ و سامانەی لەرێگای خێرو چاکەدا ئەوەی مەترسی لێ کرد ئەوەبوو، ئەوەی داوای ئەکرد ئەمە بوو کە خوا رۆڵەیەکی ساڵحی بداتێ هەڵسێ بەو شتانەی کە خۆی پێ یان هەڵساوە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي﴾ بەڕاستی من مەترسیم کرد لە کەس و کارەکەم لەپاش خۆم ﴿وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا﴾ ژنەکەم نەزۆك بووە و منداڵیان نی یە ﴿فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا﴾ کەواتە ببەخشە پێم لەلایەن خۆتەوە و بە بەزەیی خۆت رۆڵەیەکی ساڵح ﴿يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ﴾ کە میراتی و کەلەپووری من وەرگرێ، هەروەها لە بەرەی یەعقوبیشی وەرگرێ، واتە کەلەپوور و میراتی زانین و ئایین و پێغەمبەرێتی نەك ماڵ و سامان، چونکە پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بێت – هەر ماڵ و سامانێکیان بەجێ هێشتبێ خێرو سەدەقە بووە وەکو پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) ئەفەرموێ:﴿نحن معاشرالأنبياء لانورث، ما تركناه صدقة﴾[1].**

---

[1] واتە ئێمە کە کۆمەڵی پێغەمبەرانین میراتی ماڵ و سامانمان وەرناگیرێ، هەرچی بەجێ بێڵین هەر خێرو سەدەقەیە.

وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴿٦﴾ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا
﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا
﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْـًٔا ﴿٩﴾ قَالَ
رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً

---

**﴿وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا﴾ رۆڵەیەکی وام پێ ببەخشە و بیگێڕە ئەی پەروەردگارم بەکەسێ کە تۆ لە وتار و کرداری رازی بیت، نەك بە کەسێکی ستەمکاری دڵ رەقی بێ بەزەیی و کەشخە کەر و چاو برسی، بیگێڕە بە کەسێ کە رازی یە و لێ رازی بوویشە. زەکەریا ئەم نزای کردە لای خوای خۆی و لە نزاکەی دا سێ شتی بەکار هێنا و باسی کردن پێش باسی مەبەستەکەی:**

**١- لاوازی و پەك کەوتوویی خۆی لە دەروون - ناوەوە - و دیمەنی دەرەوەی.**

**٢- دان نانی بە لوتف و منەتی خوا بەسەری یەوە کە نزاکانی لەوەو پێشی وەرگرتووە.**

**٣- وەرگرتنی ئەم نزایەی سوود و بەرژەوەندی ئاییبنی تێدایە.**

**ئینجا خوای خاوەن بەزەییش هەواڵی وەرگرتنی نزاکەی دایە بەم شێوەی کە بۆمان باس ئەفەرموێ: ﴿يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ﴾ واتە خوا فەرمووی: ئەی زەکەریا بەڕاستی ئێمە موژدەت ئەدەینێ بە کوڕێ کە ناوی(یحیی) ئەبێ کە ﴿لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا﴾[1] لەمەوپێش هیچ هاوناوێکمان بۆ دانەناوە و کەسی تر ئەم ناوەی نەبووە. بێگومان حەزرەتی زەکەریا بە هیچ رەنگ گومان و دوو دڵی نەبووە لە راستی بەدیهاتنی ئەو موژدەیەدا، چونکە موژدەدەر خوایە، بەڵام شتەکە زۆر سەر سوڕهێنەرەو پێچەوانەی باوی ئادەمی یە، پیاوێکی پیری پەك کەوتوو خێزانی نەزۆك بێت و لە گەنجی یانەوە تا ئەو کاتە منداڵیان نەبووبێ ئێستا بیان بێت، بەڕاستی زۆر هۆی سەرسوڕمانە، کەواتە پێویستە خۆی دڵ ئارام بکات و**

---

[1] وشەی ﴿ سميا﴾ بە وێنەش لێك دراوەتەوە، واتە وێنەمان بۆ دانەناوە لەم رووەوە کە دایك نەزۆك بووبێ و باوکیش بەو جۆرە پیر بێ لەگەڵ ئەوەدا رۆڵەیان پێ بدرێ، ئەم ناوە هەڵئەگرێ عەرەبی بێت، وەکو ئەگونجێ کە عەرەبی نەبێت، زۆربە لەسەر ئەوەیە کە عەرەبی نی یە، ئەگەر عەرەبی بێت لە ئەسڵ دا فرمانە و کراوە بەناو.

بزانیٚ لە چ روویەکەوە و بە چ هۆیەك ئەو منداڵەی ئەداتیٚ؟ شتەکەش ئەوەندە خۆشە لەوانەیە چاوەڕێی نەکریٚ لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ زەکەریا وتی: ﴿رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ﴾ ئەی پەروەردگارم ئایا من کوڕم بۆ ئەبیٚ ﴿وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا﴾ لەکاتێك دا کە خێزانەکەم هەر نەزۆك بووە و خۆیشم لەپیری دا گەیشتوومەتە ئەوپەڕی وشك بوونەوەی ئێسك و جومگەکانم؟ لێرەدا وەڵامی بۆ هاتەوە کە شتەکە ئاسانە بۆ خوا، وێنەیەکیشی بۆ هێنایەوە کە بە بیر لیٚ کردنەوەی هیچ سەر سوڕمانیٚ نامێنیٚ ﴿قَالَ﴾ خوا فەرموی، یان ئەو فریشتەی کە موژدەکەی هێنا لەلایەن خواوە: ﴿كَذَٰلِكَ﴾ کارەکە بەو جۆرەیە کە بەڵێنت پیٚ دراوە و ئەو موژدەیە بەدی دێت ﴿قَالَ رَبُّكَ﴾ خوای تۆ فەرموی: ﴿هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾ بەخشینی ئەو کوڕەی کە داوات کرد لەسەر من ئاسانە ﴿وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا﴾ بێگومان من تۆم دروست کردووە لەمەوپێش لە کاتێك دا کە تۆ شت نەبوویت و لەهیچ من تۆم کرد بەو ئادەمی یە، کەواتە هیچ سەرت سوڕ نەمێنیٚ لە بەدی هێنانی ئەو بەڵێنەی پێت دراوە، بێگومان دروست کردنی خوا بۆ هەر شتیٚ هیچ خەریك بوونی ناویٚ هەر تەنیا ئەوەی ئەویٚ مەیل و خواهیشی روو بکاتە ئەو شتە ئیتر بیٚ دواکەوتن و خەریك بوون ئەو شتە ئەبیٚ، کەواتە هەرچۆنیٚ وشەی گران بۆ خوا نابیٚ هەروەها وشەی ئاسانیش بە واتا راستەقینەکەی بۆ خوا بەکار ناهێنریٚ، بەکار هێنانی لەم جۆرە جێگایانەدا بۆ تێگەیاندنی ئێمەیە و نزیك خستنەوەی مەبەستەکەیە لە دەروونمانەوە، ئەو ئافرەتەی کە نەزۆکە خوا کردوویەتی بە نەزۆك، ئەو پیرە پەك کەوتووەی کە هێزی نامێنیٚ و منداڵ لە تۆوی پەیدا نابیٚ خوا وای بەسەر هێناوە، دەی هەرچۆنیٚ ئەوەی کردووە ئاسانە نەزۆکی لاببا و بیخاتە تۆوەکەی تا منداڵی لیٚ ببیٚ، ئەگەر کەمیٚ ورد بینەوە ئەمەمان لە پێش چاو زۆر ئاسانتر ئەبێت لە دروست کردنی یەکەم جار و گیان بەبەردا کردنی یەکەم جاری ئەم هەموو گیانلەبەرانە. ئەو موژدەیەی کاتی تایبەتی بۆ دیاریی نەکرابوو، سك پڕ بوونیش لە یەکەم جارەوە شتێکی نادیاریی یە، بە تایبەتی بۆ کەسێك کە لە رێگای سك و بەرەدا نەبیٚ، موژدەکەش ئێجگار مەبەست و خۆش بوو، لەبەر ئەوە حەزرەتی زەکەریا ﴿قَالَ﴾ وتی ﴿رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً﴾ ئەی پەروەردگارم نیشانە و بەڵگەیەکم بۆ دابنیٚ لەسەر کاتی بەدی هاتنی ئەوموژدەیە، تا لە یەکەم جارەوە ئەو کاتە بناسم،

قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ
إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾ يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ وَحَنَانٗا
مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ﴿١٣﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ﴿١٤﴾

---

خوایش ئەم داوایشی وەرگرت و ﴿قَالَ﴾ پێی فەرمو ﴿ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا﴾[1] نیشانە و بەڵگەکەت ئەمەیە: کە سێ شەو لەسەر یەك قسە ناکەیت، واتە ناتوانی گفتوگۆ بکەیت لەگەڵ خەڵك دا، لەکاتێك دا کە ساغ و سەلیمیت، هیچ کەڕی و لاڵیت نی یە، خوای گەورە نیشانەیەکی پێدا زۆر ڕێك و پێك بوو لەگەڵ بارو حاڵی زەکەریادا، چونکە نزای کردە لای خوا بۆ پێك هێنانی ئەو مەبەستە سەر سوڕهێنەرە، خوایش ئەو نزایەی وەرگرت و هەواڵیشی دایە، کەواتە ئەمیش با شان بکات بە سوپاس و یادی خوادا و ببڕێ لە خەڵکی و تەنیا لەگەڵ خوادا بژی. خوا ئەو نیشانەی بۆ فەراهەم هێنا لەکاتێك دا کە لە میحرابەکەی دا بوو کە بریتی بوو لە هۆدەیەکی بچکۆلە کە دروست ئەکرا بە بەرزەوە لەپێش دەمی عیبادەت خانەی گشتی دا، ئەو میحرابە قاپی یەکی تێدا بوو بۆی سەر ئەکەوت بەچەند پلەیەك، ئەو کەسەی کە لەوێدا بوایە خەڵکی لەناو عیبادەت خانەکەوە نەیان ئەبینی، جا خوا ئەفەرموێ: ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ﴾ دوا بەدوای پەیدا بوونی ئەو نیشانەیە زەکەریا لە میحرابەکەی دەرچوو و هاتە خوارەوە بۆلای گەلەکەی ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا﴾ ئینجا تێی گەیاندن کە باسی پاك و خاوێنی خوا بکەن و ئەوە بڵێن، یان نوێژ بکەن بەیانی و ئێوارە، ئیتر بە پەنجە دەست نیشانی بۆ کردن یان بە نووسین تێی گەیاندن؟ چونکە زمانی بەسترابوو لە گفتوگۆی تر وەکو باس کرا، ئەوەیش بۆ ئەمە ئەوانیش وەکو خۆی لەیادی خوادا بژین، سوپاسی بکەن لەسەر ئەو چاکە و نیعمەتەی کە ڕشتی بەسەر خۆی و ئەوانیش دا لەپاش خۆی. لەوەوپێش هەواڵی دابوونێ بەو موژدەی پێی درابوو، ئینجا کاتێ کە قسەی بۆ نەکرا بە دەست نیشان تێی گەیاندن، فەرمانی دا کە خەریکی زیادە خواپەرستی بن ئەو سێ ڕۆژە لەگەڵ خۆی دا، ئینجا قورئان واز لە زەکەریا ئەهێنێ و بەجێی ئەهێڵێ لە

---

[1] لێرەدا فەرموی سێ شەو، لە سورەتی – آل عمران – دا ئەفەرموێ: سێ ڕۆژ تا دەرکەوێ کە ئەو نیشانەیە سێ شەو و سێ ڕۆژ بەردەوام بووە.

خواپەرستی و دەم بەستراوی و لە هەموو شتێکی تر... پەردەیەك ئەمێنێ بەسەری دا و لاپەڕەی ئەو هەڵئەداتەوە و لاپەڕەیەکی تر ئەمێنێتە روو: لاپەڕەی(یحیا) کە ئەو کوڕەیە زەکەریا نزای بۆ کرد و خوایش بەڵێنی دا پێی. ئەم رۆڵە نایابە ئازیزە خوا دای، گەورە بوو تا بوو بە منداڵێکی پێگەیشتوو کە شایانی ئەوە بێت فەرمانی پێدا بدرێ، بەڵام قورئان باسی ئەوانە ناکات، ئەوەیش بەپێی باوی قورئان کە ئەو جۆرە شتانە ئەپێچێتەوە لە گێرانەوەی بەسەرهات و سەرگوزەشتەکان دا، چونکە مەبەستێکی گرنگ نین و بەجۆرێ ئەیان پێچێتەوە وەرئەگیرێن لەناو بەناوی فەرمایشتەکان دا. قورئان باسی لەدایك بوون و پێگەیشتنی(یەحیا) ی نەکرد بەڵکو لەرێوە ئەفەرموێ: ﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖ﴾ خوا ئەفەرموێ: ئەی(یەحیا) تەورات بە توندی و گرنگ و کۆشش بگرە و بەباشی فێری ببە و هەڵسە بە ماف و ئەرکی، ئینجا روونی ئەکاتەوە کە(یەحیا) لەلایەن خواوە ئامادە کرابوو، هۆی بەرێوەبردنی ئەو فەرمان و ئەرکەی پێ بوو کە خرابووە سەر شانی، ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا﴾ فام و لێزانین و کردەوە دروستیمان دابوو بە(یەحیا) لەکاتێك دا کە منداڵ بوو، کەواتە هەرچۆنێ یەکەم کەس بوو لەناو و لە پەیدا بوون دا، هەروەها تاقانە و یەکەم کەس بوو کە هەر لە منداڵی یەوە خاوەن حیکمەت بوو، واتە لێزان و فامدار و کردەوە دروست بوو، ﴿وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا﴾ لەلایەن خۆمانەوە بێ هەوڵ و تێکۆشانی خۆی سۆز و بەزەییمان پێ دابوو، دڵ نەرممان کردبوو دەربارەی باوك و دایکی و خەڵکی تر، کە ئەوە سیفەتێکی زۆر پێویستە بۆ پێغەمبەران بۆ چارەسەر کردن و تیماری نەخۆشی لاری و نالەباری خەڵکی، بە بێ ئەو سۆز و بەزەیی یە ئەو کارە بەجێ نایەت ﴿وَزَكَوٰةٗ﴾ هەم سیفەتی پاکی و خاوێنی لە تاوان و گوناهمان پێدابوو. ﴿وَكَانَ تَقِيّٗا﴾(یەحیا) کەسێکی لەخوا ترس بوو، هەستی ئەکرد بە ئاگا و چاودێریی هەمیشەیی خوا بەسەری یەوە، ﴿وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ﴾(یەحیا) زۆر چاك و چاکە کەر بوو دەربارەی باوك و دایکی ﴿وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا﴾ خۆی بە زل دانەئەنا لە ئاستی هەق و راستی، بەڵکو مل کەچ بوو بۆی، یان خۆی بە گەورە نەئەگرت لەگەڵ خەڵك دا، سەرکێش نەبوو، پێچەوانەی فەرمانی خوای خۆی نەئەجولایەوە. بەم سیفەتانە خوای خاوەن بەزەیی(یەحیا) ی ئامادەکرد هەر لە منداڵی یەوە، بۆ ئەمەی جێگای باوکی بگرێتەوە، جێنشینی بکات لە راگەیاندن و رەفتار کردن بە ئایین و بەرنامەی خوا کە بە میراتی لە باو و باپیرەکانیانەوە لەو هەموو پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیلەوە بۆیان هاتووە. ئینجا لە پاداشتی ئەو هەموو رەوشت و کردەوە شیرینانەدا ئەفەرموێ:

وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿١٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ
أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا
﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا
زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾

---

**﴿وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ﴾ سڵاوی خوا لەسەر(یەحیا) بێت ئەو ڕۆژەی لە دایک بوو، ﴿وَيَوۡمَ يَمُوتُ﴾ ئەو ڕۆژەی کە ئەمرێ ﴿وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا﴾ ئەو ڕۆژەی کە زیندوو ئەکرێتەوە، واتە ڕێز و ڕەحمەتی خوای لێ بێ یەکەم ڕۆژ کە دێتە ئەم دنیاو یەکەم جار ئەم جیهانە ئەبینێ، و یەکەم جار کە بە جێی ئەهێڵێ و یەکەم جار کە پێ ئەنێتە ئەو جیهان و نموونەی ئەو جیهان ئەبینێ و یەکەم جار کە بە تەواوی ئەچێتە ئەو جیهان و بەهەشت و دۆزەخ ئەبینێ. ئەم سێ کاتەی هەڵبژارد، چونکە بەندە لەو سێ کاتەدا لەهەموو کات پەک کەوتوو و بێ دەسەڵات ترە. لێرەدا کۆتایی هێنا بە باسی زەکەریا و یەحیا - دروودی خوایان لەسەر بێت - و لە سەرگوزەشتەی ئەمان دا ئەو شتە سەر سوڕهێنەرەی پیشان دا کە لە نێوان پیاوێکی پیری کەوتەکار و ئافرەتێکی پیری نەزۆک دا خوا(یەحیا) ی فەراهەم هێنا، لەو کاتی نائومێدی یەدا خوا ئەو بەخششە گەورەی دا کە شتێك بوو پێچەوانەی باوی خەڵکی. بەڕاستی نیشانەیەکی روونی گرنگ بوو لەسەر تاك و تەنیایی خواو دەسەڵاتی بێ سنووری. ئینجا بەدوای ئەو بەسەرهاتەدا پلەیەکی تر بەرز ئەبێتەوە ڕووداوێکی زۆر گرنگ تر و سەر سوڕهێنەر تر ئەهێنێ: ڕووداوی پەیدا بوونی عیسا(علیه السلام) لە دایکی تەنیا بێ باوك، بەڕاستی ئەگەر ئێمە ڕووداوی پەیدا بوونی یەکەم کەس لە گرۆی ئادەمی نەهێنینە پێش چاو و بیر لەوە نەکەینەوە کە بە بێ باوك و دایك خوا فەراهەمی هێنا، ئەگەر بیر لەوە نەکەینەوە بەڕاستی مەسەلەی عیسا ئێجگار شتێکی سەیرە. چونکە تاقانە ڕووداوێکە لە مێژووی ئادەمی دا. ئادەمی پەیدا بوونی یەکەم جاری خۆی بەبێ باوك و دایك نەدیوە لەپاش یەکەم کەس کە ئادەمە و باوکی هەمووانە فەراهەم هاتنی ئادەمی بە شێوەی زاو زێ بووە، واتە یەکگرتنی نێرو مێ و چەندەها چەرخ و چین هات و تێپەڕی لەسەر ئەو بارە، بەو جۆرە ئادەمی بەڵکو هەموو گیانلەبەرەکانی تریش هەروەکو ئادەمی وایە، بەڵکو هەندێ گیانلەبەر هەن کە نێرە**

مووکن، واتە جووت توخمن، ئەوانەش لە هەموو یەکێکیان سێلی نێرو مێ کۆ ئەبێتەوە و بەو جۆرە زاوزێ ئەکەن، جا لەبەر ئەوە لە دڵ دا باوەڕ دامەزراوە و جێگیر بوو کە تەنیا لەو رێگە باوە ناسراوە وە ئادەمی پەیدا ئەبێ و پەرە ئەسێنێ. ئینجا خوای گەورە ویستی پەیدا بوونی عیسا بەبێ باوك پیشان بدات تا خەڵکی بزانن توانا و دەسەڵاتی خوا بێ سنوورە و هیچ شتێ یاخی نابێ لێ ی، تا بمێنێتەوە بەڵگەیەکی روون لەسەر ئەوە کە هەرچی خوا بیەوێ هەر ئەوە ئەبێ. ئەو رووداوە نایابە تاقانە ئەوەندە سەرسوڕهێنەر بوو سەری شێواند لە چەند تاقمێ کە ئێستاش هەر بەردەوامن عیسایان لە ئادەمێتی دەرکرد و گەیاندیانە سنووری خوایەتی، چونکە شێوەی پەیدا بوونەکەی لەسەر باوی ئادەمی نەبوو، ئینجا ئەوا قورئان شتەکە بەجوانی روون ئەکاتەوە، بەسەرهات و رووداوەکە بە رێك و راستی ئەگێڕێتەوە، مەبەستەکەش روون کردنەوەی بێ سنووری توانا و دەسەڵاتی خوایە، ئەفەرموێ: بە پێغەمبەر(ﷺ) ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ﴾ باسی سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی مەریەم بکە لە قورئان دا ﴿إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا﴾ باسی بەسەرهاتی ئەو کاتەی کە جوێ بووەوە و کەناری گرت لە کەس و کاری و چوو بۆ شوێنێکی بەرەو خۆرهەڵاتی مزگەوتی قودس، یان ماڵی خۆیان، ئیتر جوێ بوونەوەکەی لەو شوێنەدا بۆ خەڵوەت گرتن بوو یان بۆ هەر ئیشێکی تایبەتی خۆی. ﴿فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا﴾ ئینجا خۆی داشارد لەکەس و کارەکەی، و پەردەیەکی دانا لەنێوان خۆی و ئەوان دا ﴿فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا﴾[1] ئێمەیش جوبرەئیلمان نارد بۆلای ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا﴾ جوبرەئیلیش خۆی بردە وێنە و شێوەی ئادەمی یەکی رێك و پێك بۆی، بەو شێوە خۆی پیشان دا. ئەو فریشتەیە هات بۆلای بۆ هەواڵ پێدان و ئاگادار کردنی بەمەی کە خوا عیسای ئەداتێ بێ باوك، ئەو هەواڵ پێدانە لە پێشەوە ئاگادار نەکرایە و سکی پەیدا ببوایە لەوانە بوو خۆی بکوشتایە لەداخ و مەراق دا، کەواتە هەواڵ پێدانەکە دڵنیا و دڵ ئارامی کرد. ئینجا لە شێوەی ئادەمی دا خۆی پیشان دا تا ئولفەتی پێوە بگرێ و قسەکەی لێ وەرگرێ، ئەگەر لە شێوەی فریشتەیی دا یان لە شێوەیەکی تردا خۆی پیشان بدایە ئەترسا و تار ئەبوو لێ ی، و توانای گوتف و گۆی نەئەبوو لەگەڵیدا. لە یەکەم جارەوە کە بینی وای زانی ئادەمی یە و نامەحرەمە، لەبەر ئەوە

[1] مەبەست بە رۆح حەزرەتی جوبرەئیلە.

لەگەڵ بینی ﴿قَالَتْ﴾ مەریەم وتی: ﴿إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا﴾ گەر تۆ پیاوێکی لەخوا ترس و گوێت هەیە لە پەنا گرتن بەخوا ئەوا من پەنا ئەگرم بەخوا لە تۆ، کەواتە دوور کەرەوە لێم، یان ئەگەر تۆ لەخوا ترس بیت تەمێ خوار ئەبی بەو پەنا گرتنی منە. با هەندێ بیر بکەینەوە لەم بەسەرهاتە، ئافرەتێکی وەکو مەریەم – سەلامی خوای لەسەر بێت – پاك وخاوێن و لەخواترس و لەخانەوادەیەکی ئایینی بەناوبانگ کە هەر لە کۆنەوە جگە لە پاکی و چاکی هیچ شتی تریان لێ نەبینراوە... ئافرەتێکی تازە پێگەیشتووی وا لە شوێنێکی کەناردا خەریك بێت بە ئیشێکی تایبەتی خۆیەوە، لەو کاتە تایبەتی یە و لەو شوێنە چۆڵەدا لە پڕێك دا پیاوێکی رێك و پێکی تەواو بێت بەسەری دا، ئەبێ شەرم و داچڵەکینی ئەو ئافرەتە لە چ رادەیەك دا بووبێ؟ ئەوەبوو لە حەیبەتا پەنای برد بەخوا لێ ی، ئینجا وەرە بیر بکەرەوە کە ئەو پیاوە نەدیو و نەناسراوە، ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ﴾ من هیچ نیم جگە لە فروستادەی خوای تۆ، خوا ناردوومی بۆلای تۆ ﴿لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا﴾ بۆ ئەمەی ببەخشم بە تۆ کوڕێکی پاك و خاوێن لە گوناهو تاوان، واتە ببم بەهۆی ئەو بەخشینە، بەم رەنگە بە فرمانی خوا ئەو فریشتەیە فوی کرد بە یەخەی کراسەکەی دا ئینجا خوایش ئەو منداڵەی فەراهەم هێنا لە سکی ئەو دایکەی دا، چونکە ئەو بەخشینە بەدەست خوایە، ئەو فریشتەیە، کە لە شێوەی ئادەمی یەکی تێرو تەواو بوو ئەوەی پێ ڕاگەیاند بۆ دڵنیا کردن و دڵ ئارامی کە خراپەکار نی یە و ئادەمی نی یە، بەڵکو فریشتەیە و خوا ناردوویەتی، بەڵام ئەو ئافرەتە کتوپڕ چۆن باوەڕ بکات بەو قسەیە؟ چۆن مەترسی ناکات کە ئەوە فێڵێکە فەراهەمی ئەهێنێ و نیازی خراپەکاری هەیە لەپەنای ئەو فێڵەدا بەڕاستی زۆر رووداوێکی سامناکە و دڵ داچڵەکێنەرە، ئەو ئافرەتە خاوێنە داوێن پاکە تا ئەو کاتە بە دڵیا نەهاتووە کە رێگەیەکی تر هەیە بۆ پەیدا بوونی منداڵ جگە لەو رێگای کە باو و ناسراوە، لەبەر ئەوە ﴿قَالَتْ﴾ وتی ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ﴾ چۆن کوڕ بۆ من پەیدا ئەبێت ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ لەکاتێك دا کە هێشتا هیچ ئادەمی یەکم لێ نەکەوتووە بە حەڵاڵی ﴿وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾ هیچ کات من داوێن پیسیش نەبووم؟ واتە منداڵ پەیدا بوون بە یەکێ لەو دوو رێگا ئەبێ کە هێشتا من بە هیچیان دا نەرۆیشتووم.

قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا
مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ
قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ
تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾

---

**له وه‌ڵامیان دا: ﴿قَالَ﴾ فریشته‌كه – كه جوبره‌ئیل بوو – وتی: ﴿كَذَٰلِكِ﴾ كاره‌كه به‌و جۆره‌یه كه پێم وتی و هه‌واڵێكی راسته ﴿قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾ خوای تۆ فه‌رمووی كه ئه‌وه – واته به‌خشینی كوڕێكی وا به بێ باوك – له‌سه‌ر من زۆر ئاسانه، ﴿وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾ ئێمه شتی وا ئه‌كه‌ین بۆ خه‌ڵكی بۆ ئه‌مه‌ی بیگێڕین به نیشانه‌یه‌كی ئاشكرا و به‌ڵگه‌یه‌كی روون له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵات و توانای بێ سنوورمان كه هه‌رشتێكیان ویست ئه‌یكه‌ین ﴿وَرَحْمَةً مِّنَّا﴾ بۆ ئه‌مه‌ی بیكه‌ین به ره‌حمه‌تێ، واته پێغه‌مبه‌رێ كه هۆی ره‌حمه‌ته له‌لایه‌نمانه‌و بۆ ئه‌وانه‌ی باوه‌ری پێ ئه‌هێنن و ئه‌یكه‌ن به رابه‌ری خۆیان ﴿وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا﴾ دروست كردنی كوره شتێكی بڕیار پێ دراو بوو له‌لایه‌ن خواوه له ئه‌زه‌ل دا، یان نووسراو بوو له ﴿لوح المحفوظ﴾ دا، ئینجا حه‌زره‌تی مه‌ریه‌م دڵنیا بوو به‌وه‌ی فریشته‌كه پێ‌ی وت، فریشته‌كه‌ش له نزیكه‌وه یان له دووره‌وه فوی كرد به مه‌ریه‌م دا ﴿فَحَمَلَتْهُ﴾ به‌هۆی ئه‌وه‌وه مه‌ریه‌م ئه‌و رۆڵه‌ی هه‌ڵپێچا و حامیله بوو پێ یه‌وه ﴿فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا﴾ ئینجا مه‌ریه‌م دوور كه‌وته‌وه و به سكه‌كه‌یه‌وه كه‌نار گیر بوو له شوێنێكی دوور له كه‌س و كاری، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شه‌رمی ئه‌كرد كه به‌سك پری ببینن. به‌ڕاستی به‌سه‌رهاته‌كه‌ی دڵی به‌هێزی ئه‌وێ خۆی له‌به‌ردا بگرێ، ئافره‌تێكی وا به گه‌نجی له خانه‌دانی پێغه‌مبه‌ران بێت و به كچی سكی پڕ بێت و له‌و كاته‌ش دا هیچ به‌ڵگه و نیشانه‌یه نه‌بێ له‌سه‌ر پاكی و داوێن پاكی، ئایا چۆن خۆی بۆ راگیر كراو به‌رگه‌ی ئه‌و به‌سه‌رهاته‌ی گرت، ئه‌گه‌ر خوا به به‌زه‌یی خۆی پشتیوان و یارمه‌تی ده‌ر**

نەبووایە؟!! ئینجا ئایا ماوەی سکەکەی بە گوێرەی باوی ئافرەتان بووبێ، یان جیاواز بووبێ و بڕینی ئەو هەموو قۆناغانەی نەویستبێ کە باوی ئافرەتانی ترە، بەڵکو لە یەکەم جارەوە بووبێ بە بێچوو، کەوتبێتە گەورە بوون؟ بەهەرکام لەم دووبارە ئەگونجێ و هیچ بەرگری کەر نی یە، قورئان هیچ بارێکی دیاریی نەکردووە، کەواتە ئێمە بە کورتی ئەڕۆین و هیچ بارێکی تایبەتی دیاریی ناکەین و هەر ئەوە ئەڵێین کە بە خواهیش و بڕیاری خوا ئەو منداڵە لە سکی دایکی دا پەیدا بوو تا کاتی لەدایك بوون ﴿فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ﴾ ئینجا ئێش و بەرەژانی منداڵ بوون مەریەمی داگیر کرد بە چوون بۆلای پەلی دارخورمایە، کە لەو شوێنەدا بوو، یان ساقی دار خورمایەك بۆ ئەمەی خۆی پێ داشارێ، دەستی پێوە بگرێ و خۆی پێ بەهێز بکات: بۆ ئەمەی بە ئاسانی منداڵەکەی ببێ، مەریەمی هەژار بە تاق و تەنیا لەو شوێنە چۆڵەدا بەجارێ ئێش وئازار و شەرم و داخ و غەم دڵ و لەشی داگیر کرد و ئارامی بۆ نەهێشتەوە، لەبەر ئەوە ﴿قَالَتْ﴾ وتی: ﴿يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا﴾ ئای خۆزگە من لەپێش ئەمەدا بمردمایە ﴿وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ من شتێکی واز لێ هێنراوی باس نەکراو بوومایە و بە تەواوی لەبیر بچوومایە. ئینجا خوای خاوەن بەزەیی و فریاد رەس چارەسەری هەموو داخ و ئێش و مەراقێکی بۆ کرد، بەم رەنگە ئەو منداڵە تازە بووەی بۆ هێنایە قسە و دڵخۆشی دایەوە و ئەوەی بۆ ئەو کاتە پێویست بێت رێنموونی بۆ کرد، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ﴾ ئەو منداڵەی بوو، ئینجا خوا هێنایە قسە و بانگی کردە مەریەمی دایکی لەژێر داوێنی دا ﴿أَلَّا تَحْزَنِى﴾ بانگی کرد غەمبار مەبە ﴿قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾ چونکە بێگومان خوای تۆ لەلای خوارووتەوە جۆگەیەك ئاوی بۆ فەراهەم هێناوی ئەوە بۆ ئاو ﴿وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ﴾ پەلی دارخورماکەش راوەشێنە بۆ لای خۆت ﴿تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾ خورمای تەڕ و تازە ئەخات بەسەرت دا کە پێگەیوە و شایانی ئەوەیە بچنرێتەوە، ئەمەیش بۆ خۆراکت، جا خۆراکی شیرین بە تایبەتی خورما باشترین و چاکترین خۆراکە بۆ ئافرەتی زەیسان بە تایبەتی کە تازە منداڵەکەی لێ بووبێتەوە،

فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ
ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ٢٦ فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا ٢٧ يَٰٓأُخۡتَ
هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا ٢٨ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ
فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ٢٩ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا ٣٠

---

**﴿فَكُلِي وَٱشۡرَبِي﴾ ئینجا بخۆ و بخۆرەوە ﴿وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ﴾ دڵ خۆش بەو هیچ دڵ غەمگین مەبە ﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا﴾ ئینجا ئەگەر هەر یەکێکت بینی لە ئادەمی ﴿فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا﴾ پێی بڵێ بەڕاستی من ڕۆژووم نەزر کردووە لەسەر خۆم بۆ خوای خاوەن بەزەیی ﴿فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا﴾ کەواتە هەرگیز ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ ئادەمی یەك دا ناکەم، ئیتر ئەو ڕۆژووە ڕۆژووی قسە نەکردن بووبێ یان باو بووە لەناویان دا لەکاتی ڕۆژوودا قسەیان نەکردووە، بەهەر جۆر بووبێ، مەبەست ئەوەبوو کە کۆتایی بێنێ لە گوفتوگۆی خەڵکی و تەنیا خەریکی خواپەرستی بێت، مەبەست ئەوە بوو کە هیچ دەمە دەمێ نەکات لەگەڵ هیچ کەس دا، چونکە کە خوا حەزرەتی عیسای هێنایە قسە ئیتر هیچی تر پێویست ناکات، بەڵگەی روون و پتە و ئەوەیە و بەسە، کەواتە هەرکەسی دیبێ بە ئیشارەت تێی گەیاندووە کە قسە ناکات، یان مەبەست ئەوەیە دوای ئەو هەواڵە ئیتر هیچ قسەیەکی تر ناکات. پاش ئەوەی خوا لوتفی کرد ئەو کەرامەت و شتە گرنگانەی پیشانی مەریەم دا ئیتر مەریەم شادمانە و پشت ئەستوور، ﴿فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا﴾ ئینجا بە کوڕەکەیەوە هاتەوە بۆلای کەس و کارەکەی ﴿تَحۡمِلُهُۥۖ﴾ بەجۆرێ خۆی کوڕەکەی هەڵگرتبوو، واتە بە شێوەیەکی بێ باکانە و بە سەر بەرزی. بەڵام کەس و کار ئاگایان نی یە لەو بەسەرهاتانە، لەبەر ئەوە کاتێ کە تەماشایان کرد کچەکەیان هاتەوە بە منداڵێکەوە نارەحەت و دڵگران و شەرمەزار بوون ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا﴾ ئەی مەریەم بەڕاستی شتێکی زۆر گەورەت**

کردووه، شتێکی خراپی بێزراو، بێ شوو کردن و بێ مێرد منداڵت هێناوه!! ئینجا به تەشەرەوە پێ یان وت: ﴿يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ﴾ ئەی خوشکی هارون، واتە ئەی کەسێ کە لە چاکی و پاکی دا وەك هارون وای(مەبەست پیاوێکی چاکی بەناوبانگ بووە لەو چەرخەدا)، واتە تۆ لەکوێ و ئەم کارە لەکوێ؟! ﴿مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا﴾ نە باوکی تۆ پیاو خراپی داوێن پیس بوو، نە دایکی تۆ کەسێکی زیناکەری داوێن پیس بوو، واتە کاتێ باوك و دایکت بەوجۆرە پاك و داوێن پاك بوون دەی تۆ بۆ وەکو ئەوان نەبوویت؟ بێگومان تاوانەکەت گەورەترە لە تاوانی خەڵکی تر، چونکە تۆ لە رۆڵە و نەوەی چاکانی. مەریەم هیچ بەدەم وەڵامی نەدانەوە، چونکە بەرۆژووە، وەکو لە پێشەوە باس کرا... ﴿فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ﴾ ئینجا دەست نیشانی کرد بۆلای کورەکەی، بۆ ئەمەی پرسیار لەو بکەن و ئەو وەڵامیان بداتەوە، ئەوانیش بە سەرسامی یەوە ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا﴾ ئایا چۆن ئێمە قسە بکەین لەگەڵ کەسێ کە لە بێشکەدایە و لەکاتێك دا منداڵە؟! یان چۆن قسە بکەین لەگەڵ کەسێ کە دەست کەوتووە لە بێشکەدا لە کاتێك دا منداڵە؟! واتە ئەمەی تۆ دەست نیشانی بۆ ئەکەیت منداڵی بێشکەیە و ناگونجێ بۆ قسە لەگەڵ دا کردن. ئەوان بە سەرسامی و رقەوە ئەوەیان وت، چونکە بە دیمەن وەکو پەنەکەی دابێ و قسەشیان لەگەڵ ناکات و هێشتا لاقرتیشیان پێ ئەکات و نەیان ئەزانی کە راست ئەکات و خوا ئەیهێنێتە قسە تا چوو بە گوێچکەیاندا ئەم چەند نوختە و خاڵانە: ﴿قَالَ﴾ وتی ئەو منداڵە کە حەزرەتی عیسا بوو:

١- ﴿إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی من بەندەی خوام.

٢- ﴿ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾واتەبێگومان کتێبێك کەئینجیلەپێم ئەدات وئەینێرێتەخوارەوە بۆ سەرم.

٣- ﴿وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا﴾ بێگومان ئەمکات بە پێغەمبەر، ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە لەسەر پاکی و داوێن پاکی دایکی، چونکە ناگونجێ پێغەمبەر حەرام زادە بێت، بەڵکو ئەبێ حەڵاڵ زادە بێت.

وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ
يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ
عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ

**٤- ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ﴾ من ئەگێڕیٚ بە پیت و فەڕ پیٚ دراو لەهەر شوێنێك دا بم، واتە زۆر بەسوود ئەبم بۆ خەڵكی و ڕێنموونی یان ئەكەن بۆ ڕێگای ڕاست كە ڕێگای خوایە.**

**٥- ﴿وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾ فەرمانی پیاداوم بە نوێژكردن و بە زەكات دان هەتا مابم و زیندووبم.**

**٦- ﴿وَبَرًّا بِوَٰلِدَتِي﴾ منی گێڕاوە بە ڕۆڵەیەكی چاكی گویٚ ڕایەڵ بۆ دایكم كە چاكە بكەم لەگەڵیٚ دا.**

**٧- ﴿وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾ نەیكردووم بە كەسێكی ستەمكار كە خۆم بەرز دابنێم و سەرپێچی بكەم لە پەرستن و گویٚ ڕایەڵی خوای خۆم. یان سەرپێچی بكەم لە چاكە كردن لەگەڵیٚ دایكم داو بەهۆی ئەوەوە ببم بە شەقاوەت مەند و بەد بەخت.**

**٨- ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾ واتە لەلایەن خواوە سڵاو و ڕێز و ئەمین كردنەوە لەزیانی خەڵكیم بڕژیٚ بەسەردا، ڕۆژیٚ لە دایك بووم، و ڕۆژیٚ كە ئەمرم و ڕۆژیٚ كە زیندوو ئەكرێمەوە، كەواتە هیچ كەس ناتوانیٚ لەم سیٚ كاتەدا هیچ زیانێكم پیٚ بگەیەنیٚ كە بەندە لەو سیٚ كاتەدا لە هەموو كاتیٚ تر داماو ترو پێویست ترە بە یارمەتی دان و پارێزگاری.**

**ئا بەو جۆرە كە وترا حەزرەتی عیسا(علیه السلام) لە یەكەم جارەوە جاڕی بەندەیی خۆی دا بۆ خوای خۆی، كەواتە عیسا خوا نی یە وەكو كۆمەڵیٚ لە مەسیحی یەكان باوەڕیان وایە، یەكیٚ نی یە لە(سیان) كە ئەو سیانە بە هەموویان خوایەكی تەنیان، وەكو كۆمەڵیٚ لەو مەسیحی یانە ئەڵێن، كوڕی خواش نی یە وەكو كۆمەڵێكی تریان ئەڵێن. هەروەها جاڕی دا كە خوا كردوویەتی بە پێغەمبەر نەك بە كوڕ یان هاوبەش، خوا فەرمانی پیاداوە بە پەرستنی**

وەکو بەندەکانی تری، ژیانێکی دیاریی کراوی هەیە لەم دنیایەدا لەپاشان ئەمرێ و زیندوو ئەکرێتەوە، وەکو ئەو هەموو خەڵکی ترە، خوا بڕیاری بۆ داوە کە سەلام و ئەمینی و بێ زیانی بۆ ئەبێ. ئیتر قورئان لێرەدا باسی هیچی تری عیسا پێغەمبەر ناکات(علیه السلام) و نافەرموێ ئەو گەل و کۆمەڵە کە ئەوەیان بینی لە عیساوە چی یان کرد و چی یان وت؟ یان مەریەم چی بەسەرهات؟ یان نافەرموێ عیسا کەی کرا بە پێغەمبەر؟ ئایا هەر لە منداڵی یەوە کرا، یان کاتێ گەورە بوو؟ ئەمانەی هیچ باس نەفەرموو، چونکە لەم شوێنەدا باسی چۆنێتی پەیدا بوون و لەدایك بوونی عیسایە، کەواتە باشترین و ڕێك ترین وتە و وتار کە باسی عیسای پێ دوایی بێنێ ئەم چەند رستەیەیە: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ﴾ ئەوەی کە باس کرا بەو ناو نیشانەوە ئەوەیە عیسای کوڕی مەریەم. کەواتە بەو جۆرە بیناسن و لەو رادە و پلەدا باوەڕتان پێ ی ببێ، نەك وەك جوولەکە – نەفرینی خوایان لێ بێت – کە وەکو باوەڕیان نی یە بە پێغەمبەرێتی یەکەی بە حەرام زادە و جادوبازی دائەنێن، هەروەها نەك وەکو گاورەکانیش کە زیاد لە ئەندازە بەرزی ئەکەنەوە تا رادەی خوایەتی! عیسای کوڕی مەریەم نە ئەوەیە کە جوولەکە ئەیلێن، نە ئەوەیە گاور ئەیلێن، بەڵکو ئەوەبوو کە خوا باسی فەرموو، لە زمانی عیسا خۆیەوە ناونیشانی هەڵ دا، و شتی راستیش ئەوەیە وەکو خوا ئەفەرموێ: ﴿قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ﴾ وتەی راست لە عیسادا و دەربارەی شێوە راستەقینەکەی عیسا من وتومە. ئەو راستەی کە بێ باوەڕەکان گومان و دوو دڵی یان هەیە تیای دا، یان دووبەرەکی و ئاژاوەیان هەیە تیای دا، هەر کۆمەڵێ بارێ ئەڵێن، ئینجا(علیه السلام) بەندەی خوایە و کوڕی مەریەم نەك کوڕی خوایە، چونکە: ﴿مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖ﴾ بە هیچ رەنگ ناگونجێ و شایان نی یە بۆ خوا کە بڕیاری هیچ رۆڵەیەك بدات بۆ خۆی، چونکە پێویستی بە رۆڵە و نەوە بۆ کەسێکە کە خۆی بمرێ و هەڵ نەگرێ بۆ مانەوە و تا بەهۆی رۆڵە و نەوەوە ژیانی کۆتایی نەیەت و بمێنێتەوە و بۆ کەسێکە کە بێ هێز و دەسەڵاتە و پێویستی بە کۆمەکی و یارمەتی یە، خۆ دیارە خوا هەر ئەبێ و دەست نادا بۆ نەمان، هێزو دەسەڵاتی بێ سنووری هەیە و پێویستی بە هیچ کەس و بە هیچ شت نی یە، ئەگەر نا ئەبێ ناتەواو بێ، ئەوەیش لەگەڵ خوایەتیدا ناگونجێ،

سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ
﴿٣٦﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ
يَأۡتُونَنَاۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ
لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا

---

چونكه ﴿سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ﴾ خوا پاك و بێگەردە لە هەموو لەكە و ناتەواوی یەك ﴿إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن﴾ هەركاتێ بڕیاری هەر كارێ بدا هیچ شتێكی ناوێ جگە لەوە كە ئەفەرموێ پێی: ببە ﴿فَيَكُونُ﴾ ئیتر دەست بەجێ بێ دواكەوتن ئەو كارە ئەبێ، كەواتە ئیتر ڕۆڵە و كۆمەك و یارمەتی دەری بۆ چی یە؟ حەزرەتی عیسا فەرمودەكەی لەگەڵ ئەو كۆمەڵەدا كۆتایی پێ هێنا بە جاڕدانی خوایەتی خوا بۆ خۆیشی و بۆ ئەوانیش، بانگ كردنی هەمووان بۆ پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا وەكو قورئان بۆمان باس ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ﴾ عیسا وتی: بێگومان خوایە كە ناوی(الله) یە پەروەردگاری منە و پەروەردگاری ئێوەیشە، ﴿فَٱعۡبُدُوهُۚ﴾ كەواتە ئەو بپەرستن ﴿هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ﴾ ئەمەیە ڕێگای ڕاست. واتە ئەوەی كە بۆم باس كردن و وەسیەتم پێ كرد، یان باوەڕ بە تەنیایی خوا و پەرستن و گوێ ڕایەڵی بۆی: ڕێگای ڕاستە. دیارە ڕێگای ڕاست تەنیا ڕێگایەكە و ناگونجێ زیاد لە یەك ڕێگا بێت، وەكو هێڵی ڕاست ئەبێ تەنیا یەكێ بێت و بە هیچ ڕەنگ دەست نادا ببێ بە دوان، چونكە لە نێوان دوو خاڵی زانراودا ئەتوانین تەنها یەك ڕاستە هێڵ بكێشین. ڕێگای ڕاست كە هۆی ژیانی كامەرانی ئەم جیهانە و هۆی گەیشتنە بە ناز و نیعمەتی نەبڕاوەی ئەو جیهان، ئەو ڕێگا ڕاستە: تەنیا بریتی بوو لەوەی كە عیسا و هەموو پێغەمبەران فەرموویانە – سەلامی خوایان لێ بێت – بەڵێ بەڕاستی تەنیا ئەو ڕێگایە ڕاستە و دوورە لە هەموو ڕەخنە و لەكەو نالەباری و هەرچی خراپە و ناڕەوایی و نالەباری لەم جیهانەدا رووی داوە و روو ئەدا هەمووی بەهۆی لادانە لەو تەنیا ڕێگا ڕاستە. خوا بە بەزەیی خۆی بمانخاتە سەر ئەو ڕێگایە و دامەزراو و نەگۆڕاوە و لانەدراومان بكات لێ ی آمین. لەپاش روون كردنەوەی بارو شێوە ڕاستەقینەكەی حەزرەتی عیسا(علیه السلام)، ئینجا ئاژاوە و نیزاعی تاقم و كۆمەڵەكانی پاش عیسا پیشان ئەدا و

بەکورتی ئەفەرموێ: ﴿ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ ﴾ ئینجا پاش عیسا و گەل و ئوممەتەکەی بوون بە چەند کۆمەڵێ، ئەو گەل و کۆمەڵانە ئاژاوە و خیلافیان بوو لەنێوان خۆیان دا لە بارەی عیساوە، سێ کۆڕی بەناوبانگ گیرا لەلایەن زانا و ئوسقوفەکانەوە بۆ ئەو مەبەستە یەکێکیان ئەو کۆڕە بەناوبانگە بوو کە ئیمپراتۆر قوستەنتین کۆی کردنەوە ئەندامەکانی گەیشتە(دوو هەزار و سەد و حەفتا) ئوسقوف، ئینجا کەوتنە ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی بەتین، هەر کۆمەڵێ رایەکی هەبوو.. هەندێکیان ئەیان وت: عیسا خوایە و لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی، کەواتە بەندەکانی هەندێکی مراندو هەندێکی زیندوو کردنەوە ئینجا بەرز بووەوە بۆ ئاسمان. کۆمەڵێکی تر ئەی وت: کوڕی خوایە، کۆمەڵێکی تر ئەیان وت یەکێکە لەو سێ شتە کە ئەسڵ و بنەڕەتن:(اب، ان و روح القدس) تاقمێ تریان لایان وابوو کە سێ خوا هەیە: الله، عیسا، دایکی، تاقمێکی تر باوەڕی رێك و راستیان هەبوو، ئەمەی قورئان فەرموی باوەڕی وابوو، چەند کۆمەڵێکی تر هەبوون جگە لەمانە هەریەکە شتێکی ئەوت. لەناو ئەو هەموو ئەندامانەدا سێ سەد و هەشت کەسیان یەك کەوتن و بڕیاریان دا لەسەر باریێ، ئینجا ئیمپراتۆر رای ئەم کۆمەڵەی بەدڵ بوو لەبەر ئەوە یارمەتی ئەم سێ سەد و هەشت کەسەی داو ئەوانی تری دەرکرد و دژیان وەستا بە تایبەتی ئەو تاقمەی باوەڕی رێك و راستیان هەبوو بە عیسا بەم جۆرەی قورئان فەرموی، جا ئەوا قورئان ئەم هەڕەشە سامناکە ئەکات لە کۆمەڵی کافرەکان کە لە رێگای عیسا و ئینجیل لایان دا، ئەفەرموێ: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴾ ئینجا سزای سەخت و بەسۆ بۆ ئەوانەی کە کافر بوون لە ئامادەبوون و بینینی رۆژێکی زۆر گەورە کە رۆژی دوایی یە، وەیل و سزای سەخت بۆ ئەو کافرانە لەو رۆژە گەورەدا کە جن و ئادەمی و فریشتە هەموو تیای دا حازر ئەبن لە حوزوری ئەو خوایەدا کە هەموو شتی بەدەستە و ئەو کافرانە باوەڕیان پێی نەبوو لەم جیهانەدا. ئەو کافرانە لەم جیهانەدا گوێچکەیان کەڕە لە بیستنی شتی راست و ئەو ئایین و بەرنامە بێ وێنەی کە خوا بۆی ناردن و چاویان کوێرە لە بینینی ئەو هەموو دەلیل و بەڵگە روونانە کە خوا بۆی داناون و رێنموونی بۆ کردوون، بەڵام لە رۆژی دوایی دا بەم جۆرەن کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَاۖ ﴾ ئای چەندە و چ بیسندە و بینان رۆژێ کە دێنە لای ئێمە!! واتە لەو رۆژەدا هێزی بیستن و تیژی بینینیان لە رادەیەك دان شایانی ئەوەن سەر سوڕبمێنێ لێ یان ئەوەندە بەتینن ﴿ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ بەڵام ئەو ستەمکارانە ئەمڕۆ لەم جیهانەدا

لەناو گومڕایی یەکی روون و ئاشکراداان بیستن و بینایی یەکیان نی یە سوودی ببێ، ئەو بەد بەختانە نابیستن و نابینن کاتێ بیستن و بینین هۆی رێنموونی و رزگارین، بەڵام لە هەموو کەسێ بیسندە و بینا ترن کاتێ کە بیستن و بینین هۆی ریسوایی یە و هۆی داخ و خەفەت و سام و ترسە. ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ). ئەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ﴾ ئەو زاڵمانە یان هەموو کافرێ بە تێکڕایی بترسێنە لە رۆژی داخ و خەفەت، ئەو رۆژەی کە خراپەکار و تاوان بار داخ و مەراق ئەخۆن لەسەر خراپە و تاوانەکەیان، چاکانیش هەر مەراق ئەخۆن لەسەر کەمی خێرو چاکەیان، وەکو لە حەدیس دا ئەفەرموێ: ئەو رۆژە رۆژێکە ئەوەندە داخ و مەراقەکەی زۆرە و کەچی تازە هیچ سوودیشی نی یە، بیانترسێنە ﴿إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ﴾ لەو کاتەی کە کاروباری خەڵکی دوایی پێ ئەهێنرێ، کار لە کارەگا بە تەواوی ئەترازێنرێ بەم رەنگە بەهەشتی یەکان رەوانەی بەهەشت ئەکرێن و دۆزەخی یەکانیش بە ریسوایی و روو رەشی یەوە ئەخرێنە دۆزەخ، ئینجا مردن لە شێوەی بەرانێکی بازوودا ئەهێنرێ و جاڕ ئەدرێ و بانگ ئەکرێتە بەهەشتی و دۆزەخی یەکان، پێ یان ئەوترێ ئەمە ئەناسن؟ ئەوانیش ئەڵێن: بەڵێ ئەوە مردنە. ئینجا لەپێش چاوی هەردوو کۆمەڵەکەوە سەر ئەبڕرێ و بانگ ئەکەنە هەردوو تاقمەکە: ئیتر مردن نەما، هەردوو لاتان بێ بڕانەوە ئەمێننەوە لە شوێنی خۆتان دا جا پەنا بەخوا، ئەبێ رادەی داخ و مەراقی دۆزەخی یەکان لەو کاتەدا چۆن بێ ئای، ئای لەو نائومێدی و بەش براوی یە کە دڵیان داگیر ئەکات!! ئای ئای لەو بەد بەختی و شەرمەزاری یە، خوا پەنامان بدات لێ ی!! بیانترسێنە ﴿وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ﴾ لەکاتێك دا کە ئەوان وان لە بێ ئاگایی دا لەو هەموو بەسەرهاتە کە دووچاریان ئەبێ، کەواتە زۆر پێویستیان هەیە بە ترساندن، بیانترسێنە لەو کات و رۆژە ﴿وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ لەکاتێك دا کە ئەوانە باوەڕیان نی یە بەو رۆژ و کاتە و زیندوو بوونەوەو حیساب و پرسیارە، کەواتە هۆی ترساندن هەیە بیانترسێنە لەو رۆژەی کە بێگومان راستە و بەدی دێت وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا﴾ بەڕاستی زەوی و هەرکەسێ وا بەسەر زەوی یەوە ئێمە بە میراتی وەری ئەگرین، واتە هەمووی ئەبێ بە هینی ئێمە، وەکو میراتی یەك کە تەنها میرات بەرێکی هەبێ هەموو کەلەپوور و میراتی یەکە ئەبێ بە هینی ئەو تەنها میرات بەرە و هیچ کەسی تر مافی پێوە نامێنێ

وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا
لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِيٓ
أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾

---

﴿وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ هەموو ئەگێڕدرێنەوە بۆلای ئێمە، لەم فەرموودەدا دڵخۆشی و دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە، هەروەها هەڕەشە لە بێ باوەڕەکان. لێرەدا باسی لە دایك بوونی عیسا دوایی هات(علیه السلام) و ئەو قسە پڕو پووچ و درۆ و دەلەسەی کە کرابوو لەو بارەیەوە روونی کردەوە ئینجا دەست ئەکات بە زنجیرەیەك لە سەرگوزەشتەی ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه السلام) لەم زنجیرەیەدا درۆ و ناڕەوایی و بێزراوی بیرو باوەڕی بت پەرستی روون ئەکاتەوە ئیبراهیمیش ئەوەیە کە عەرەبەکانی مەککە خۆیان بە نەوەی ئەو دائەنا، خزمەت چی و قاپیەوانی ئەو ماڵە بوون کە ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی دروستیان کرد، کەواتە ئەبوایە لایان نەدایە لە ئایینی ئیبراهیم و بت پەرست نەبوونایە، بەڵکو لەسەر رەوشتی باوکە گەورەیان بڕۆشتنایە و خوا پەرست بوونایە بە تاك و تەنیا وەکو ئەو و لەم زنجیرەیەدا دەرئەکەوێ زۆر لە خو و رەوشتە شیرینەکانی ئیبراهیم لە وتار و کرداری دا، لە بەرەنگاری نەفامی و نەزانی باوکی دا و هەروەها دەرئەکەوێ بەزەیی خوا دەربارەی کە لەباتی ئەو کەس و کارە خراپە خوا ئەو هەموو رۆڵە و نەوە چاکەی پێدا، ئەوەتا هەر پێغەمبەرێ پاش ئیبراهیم هاتبێ لە نەوەی ئەوەو ئەچێتە سەر ئەو، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئیبراهیم بکە لە قورئان دا، لەم سورەتەدا بخوێنەرەوە بەسەر گەلەکەت دا هەندێ لە هەواڵی ئیبراهیم کە چۆن بەرگری بت پەرستی ئەکرد، ئەو ئیبراهیمەی کە ئەم گەلە خۆیان بە نەوەی ئەو ئەزانن، لەمەدا راست ئەکەن، لایشیان وایە لەسەر ئایینی ئەون، بەڵام لەمەدا درۆ ئەکەن ﴿إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا﴾ واتە باسی ئیبراهیم بکە، چونکە بەڕاستی ئیبراهیم زۆر راست و راست گۆ بووە، هەرگیز درۆی نەکردووە، و پێغەمبەر بووە ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم وتی بە باوکی: ﴿يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم ئایا تۆ بۆچی شتێ ئەپەرستی کە نایبیستێ و نایبینێ، کەواتە هیچ ئاگای لە تۆ نی یە، هەر هاوارێکی لێ بکەیت نایبیستێ و هەر کڕنووش و گەردن کەچی یە بکەیت بۆی نایبینێ ﴿وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا﴾ سوودی هیچ شتێکت پێ ناگەیەنێ: نە قازانجت بۆ رائەکێشێ نە بەرگری زیانت لێ ئەکات، ئا بەو جۆرە وتارە شیرینەو بەو شێوە ناسکە لەگەڵ

باوکی دا دوا، ئەیویست ڕێنموونی بکات بۆ ئەو پێت و فەڕەی کە خوا داویەتی بە خۆی، بیخاتە سەر ئەو ڕێگا ڕاستە کە خوا خۆی خستووەتە سەری، لە یەکەم جارەوە خۆشەویستی باوکی دەرئەبڕێ بە وشەیەکی شیرین کە عەرەبیەکەی بریتی یە لە ﴿یا ابت﴾ کە لە زمانی عەرەب دا بەکار ئەهێنرێ بۆ گەیاندنی ڕێز و خۆشەویستی بەسۆز، جا لەبەر ئەوە چەند جارێ ئەو وشە ناسکەی بەکار هێنا، ئینجا لە ڕێوە پێی نەفەرموا تۆ گومڕایت، بەڵکو بە نەرمی و شیرینی تێی گەیاند کە کارێکی بێ جێ ئەکات و بیرو باوەڕێکی ناڕەوای هەیە و بەڵگەی ڕێك و ڕوونیشی لەسەر هێنایەوە زۆر بە نەرمی، بەم ڕەنگە پرسیاری لێ ئەکات لەو شتەی کە پاڵی پێوە ناوە بۆ پەرستنی شتێ کە ژیریی هیچ نرخێکی بۆ دانانێ و بەرگری ئەکات لەوەی دڵی پێوە ببەسترێ، چ جای پەرستنی کە ئەو پەڕی مل کەچی یە، ئەبێ بۆ کەسێ بکرێ کە بەرزتر بێ لە هەموو بارو ڕوویەکەوە لە ئادەمی، ئەو پەرستراوە خاوەن هێزو دەسەڵات و زانین بێت، بێداری کردەوە کە هەموو خاوەن ژیریی یەك ئەبێ هەر شتێکی کرد مەبەستێکی ڕێك و ڕاستی هەبێ، خۆ ئاشکرایشە هیچ سوودێکی نی یە، لە پەرستنی ئەو دارو بەردەدا، کەواتە کۆتایی بێنێت لەوشتە بێ نرخە بێ سوودە. ئینجا داوای لێ ئەکات کە پەیڕەوی بکات و شوێنی بکەوێ تا ڕێنموونی بکات بۆ ڕێگایەکی ڕاست کە لەلایەن خواوە ئەمی پێ ڕەوانە کراوە و باوکی بەشدار نی یە تیای دا، فەرمووی: ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم بەڕاستی هەندێ زانین بۆ من هاتووە کە بۆ تۆ نەهاتووە، واتە چەند من کوڕی تۆم و بە تەمەن لە تۆ بچووکترم، بەڵام من ئاگادارم بەسەر هێندێ شت دا کە تۆ ئاگادار نیت پێی ﴿فَٱتَّبِعْنِيٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا﴾ کەواتە شوێنم بکەوەو پەیڕەویم بکە تا ڕێنموونی و ڕابەریت بکەم بۆ ڕێگایەکی ڕاست کە هیچ خواری و ناڕێکی نەبێ. لەم وتارەیش دا ئەوپەڕی ناسکی و نەرمی بەکار هێنا، ئەوەتا نەیفەرموو تۆ نەزانی و من زانام، بەڵکو بەو جۆرە ناسکە فەرمووی، و خۆی و باوکی وا پیشان دا بە وێنەی دوو هاوڕێ بە ڕێگایەك دا بڕۆن، یەکێکیان شارەزایە و ئەویتر نەشارەزا، دیارە بەم جۆرە و بەو شێوە هیچ کەس بەعار و لەکەی دانانێ شوێن کەوتنی شارەزاکە. لەپاش ئەوەی کە ڕوونی کردەوە کە بت پەرستی ناڕەوایە، دژی ژیریی یە، ئەم زانایە و شارەزای ڕێگای ڕاستە، ئینجا پێی ڕائەگەیەنێ کە ئەو ڕێگایەی ئەو لەسەریەتی ڕێگای شەیتانە و ئەم ئەیەوێ بیخاتە سەر ڕێگای ڕەحمان، بەڵکو دووچاری سزای خوا نەبێ و هاوبەشی شەیتان نەبێ لەو نەفرینەی کە لێ ی کرا،

يَـٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَـٰنَ ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَـٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَـٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ
عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَـٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۖ لَئِن لَّمْ
تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ

---

**فەرموی: ﴿يَـٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَـٰنَ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم شەیتان مەپەرستە، بێگومان بە دیمەن باوکی ئیبراهیم شەیتانی نەئەپەرست، بەڵام پەرستنەکەی بە هاندانی شەیتان بوو، وەکو هەموو گوناهو تاوانێ تر کەواتە پەرستنی بتەکان لە راستی دا پەرستنی شەیتان بوو، پەرستنی شەیتانیش شتێکی زۆر خراپ و ناڕەوایە، ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَـٰنِ عَصِيًّا﴾ چونکە بەڕاستی شەیتان هەر لە کۆنەوە یاخی و سەرپێچی کەرە لەو خوایەی کە زۆر بە بەزەیی یە، واتە گوێ رایەڵی تۆ بە شەیتان زۆر ناڕەوایە، چونکە ئەو سەرپێچی لەخوا ئەکات کە خاوەن چاکە و بەزەیی یە بە تۆ، ئینجا باوکی ترساند لە پاشەڕۆژی بەدی ئەو بارەی لەسەریەتی فەرموی: ﴿يَـٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم بەڕاستی من مەترسی ئەکەم کە سزایەکت لێ کەوێ لەمەوپاش لەلایەن خوای خاوەن بەزەیی یەوە، لەسەر ئەم بت پەرستی و سەرپێچی یەت لە پەرستنی خوا بە تاك و تەنها، واتە ئەگەر نەگەڕێیتەوە بۆلای خوا و تۆبە نەکەیت ﴿فَتَكُونَ لِلشَّيْطَـٰنِ وَلِيًّا﴾ ئینجا مەترسی ئەکەم بەهۆی ئەو سزاوە ببی بە هاوەڵ و هاوسەری شەیتان و ببی بە شوێن کەوتووی شەیتان لە نەفرین و سزادا، واتە ئەترسم هەرچۆینێ لەم جیهانەدا شوێن کەوتووی لە نەفرین و سزادا، حەزرەتی ئیبراهیم بەو شێوە رێك و پێکە هەوڵی دا لەگەڵ باوکی دا، و بانگی کرد بۆ سەر رێگای رزگاری، بەڵام ئەو بانگ کردنی ئەوە بەو جۆرە نەرمی و ناسکی یە و بەو وشە و وتارە شیرینە هیچ کاری نەکرد لە دڵە رەقە بت پەرستەکەی باوکی، بەرپەرچی وتارە شیرینەکانی ئیبراهیمی دایەوە بەم وتارە وشکە رەقە نالەبارە: ﴿قَالَ﴾ وتی ﴿أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ﴾ ئایا تۆ روو وەرنەگێری و پشت ئەکەیتە ئەم پەرستراوانی منە و بێزاری لە پەرستنیان ئەی ئیبراهیم؟ واتە بێزاری دەرئەبری لە بت؟! ئایا تۆ گەیشتیتە ئەو رادەیە کە دژی ئەمانە بیت و بەرگری لە پەرستنیان بکەیت؟ ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ﴾ بەڕاستی ئەگەر کۆتایی نەهێنی لەو بارەی کە لەسەریتی،**

وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ﴿٤٧﴾ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ
وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ
وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا نَبِيّٗا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا
وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا ﴿٥٠﴾

---

**ئەو هەڵوێستە خراپەی خۆت نەگۆڕی بێگومان بەردە بارانت ئەکەم و ئەتکوژم ﴿وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا﴾ واتە برۆ ماوەیەکی زۆر دوور کەرەوە لێم و کەنار گیری بکە لێم ئەگەر ئەتەوێت خۆت نەدەیت بە کوشت. جا وەرە سەرنجی ئەم نەفامی و نەزانی یە بدە، وەرە سەرنجی ئەم وتارە و ئەو وەڵامە رەق و تەق و بێ تام و ناڕەوا بدە، وەرە تەماشای دڵێ بکە کە بە ئیمان و باوەڕی راست پاك و خاوێن بووبێ و بەراوردی بکە لەگەڵ دڵێك دا کە تاریکی کوفر و تروکایی لێ بڕیبێ و سەری لێ تێك دابێ!! ئەو کوڕە هەڵکەوتووە خوا ناسە هێشتا بەوەش رقی هەڵنەسا، سۆز و بەزەیی و بەشەرمی تێك نەچوو دەربارەی ئەو باوکە دڵ رەقەی، هێشتا بەوەش بەم شیرینی یە وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكَ﴾ سلاوت لێ بێ، واتە بە دۆعا وازت لێ ئەهێنم و بەرامبەر بە خراپە چاکە ئەکەم و هیچ زیانێکت لەلایەن منەوە پێ ناگات، ئیتر شتێ ناڵێم پێت سزات بدات بەڵکو ﴿سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓ﴾ داوای لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهەکانت بۆ ئەکەم لە پەروەردگارم.. داوا ئەکەم کە تۆڵەت لێ نەسێنێ لەسەر ئەم گومڕایی وشوێن کەوتنی شەیتانە، بەڵکو بەزەییت لەگەڵ دا بەکار بێنێ و یارمەتیت بدات بۆ ئەمەی بگەڕێیتەوە بۆلای خوا و کۆتایی بێنی لەو بارەی کە وای لەسەری، ئەم داوات بۆ ئەکەم و چاوەڕوانم کە لێم وەرگری، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا﴾ چونکە بەڕاستی پەروەردگارم لەگەڵ من دا هەر وابووە لەمەوپێش زۆر بە لوتف و چاکە بووە بە من، نزاو داوای لێ وەرگرتووم ﴿وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کەنار ئەگرم لە خۆتان و هەموو ئەوانەی ئەیانپەرستن جگە لە خوا و دوور ئەکەومەوە و بەجێتان ئەهێڵم و کۆچ ئەکەم لەم**

ولاتـه. ﴿وَأَدۡعُواْ رَبِّي﴾ پـەروەردگاری خـۆم ئەپەرسـتم ﴿عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا﴾ ئومێـد ئەكەم كە لـە پەرستنی پەروەردگارم دا رەنجەڕۆ و بێ سووم نـەبم بە وێنـەی ئێوە كە وەكو هەموو كۆششتان بێ سوود و بێ هودە ئەڕوا، پاشەرۆژیشتان سزایە، فەرموی: ئومێدم وایـە و چـاوەڕوانی ئەكـەم و بەشێوەی دڵنیـایی نەیفـەرموو لەبـەر شـكاندنی نـەفس كـە بـاوی خواناسانە، ئاگادار كردنەوە لەسەر ئەوە كە وەرگرتن و پاداشت دانەوە شتێ نی یە پێویست بێت لەسەر خوا، بەڵكو بە لوتف و بەزەیی خۆیەتی، بێجگە لەوەش هەموو شتی ئادەمی بەستراوە بە دوای ژیانی یەوە، ئەگەر ئەو كاتەی لەسەر چاكی و خواناسی بڕوا ئەوا بێگومان خـوا هـەموو چاكەیەكی وەرئـەگرێ و ئەگـەر ئـەو كاتـەی لەسـەر خراپـی بـڕوا ئـەوا هەرچی كردەوەی هەیە هـەمووی ئەسوتێ و گەردی ئەڕوا بە با، چۆنی یەتی ئەو دوا دوایـی یـەش نهێنی و(غەیبی) یە خوا خۆی ئەزانێ، كەواتە هەر ئەبێ بڵێین: ئومێد و چاوەڕوانیمان هەیـە، نابێ دڵنیا بین لەسەر وەرگرتنی كردەوەو چاكەكانمان، پاداشت دانەوەیان لەلایـەن خواوەیـە و ئیبراهیمیش لە ئاستی خوا ئـەبێ خۆی هـەر بەو جۆرە پیشان بدا ئیبراهیم(علیه السلام) بڕیارەكەی بەدی هێنا و لەبەر خوا كۆچی كردوو، ئەوەی دڵـی ئادەمی ئارەزووی ئـەكات و بەستراوە پێ یەوە لە كەس و كارو كەل و خاك و نیشتمان هـەمووی واز لـێ هێنا و بەجێی هێشت، دەی با بزانین لەپاش ئەوانە خوا چی دایە؟ ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئینجـا كـاتێ ئیـبراهیم دوور كەوتـەوەو كـەناری گـرت لـە بـاوك و گەلەكـەی و هـەموو ئەوانەی كە ئەیان پەرستن جگە لـەخوا ﴿وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾ [1] ئێمە ئیسحاق و یەعقوبمان پێ بەخشی، واتە كوڕێكی وەكو ئیسحاق و كوڕە زایەكی وەكو یـەعقوبمان پێدا ﴿وَكُلًّا جَعَلۡنَا نَبِيّٗا﴾ هەردووەكـەمان گێڕان بە پێغەمبـەر. ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا﴾ بەخشیمان بـە هەرسێكیان هەندێ لە رەحمەت و چاكەی خۆمان بۆ هەردوو جیهان، وەكو ماڵ و دارایـی پـاك و فراوان و رۆڵە و نەوەی زۆر و بەناوبانگ و پێغەمبەرێتی و سەرۆكایەتی لە ئایین دا... ﴿وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ

[1] بە تایبەتی لەمەوپاش لەم سورەتەدا باسی ئیسماعیل ئەفەرموێ: لەگەڵ چەند سیفەت و ناونیشان دا كەواتـە لێرەدا پێویست نی یە بە باس كردنی.

صِدْقٍ عَلِيًّا﴾ زمانێکی زۆر راست گۆی بڵند و قسە بیسراومان بڕیاردا بۆیان لەناو گەل و کۆمەڵەکەیان دا، یان باس و ناو و ناوبانگێکی راستی بڵندمان بۆ بڕیاردان لە هەموو چەرخەکان دا لەپاش خۆیان، بە جۆرێ سوپاس بکرێن و بە چاکە ناو ببرێن لەناو هەموو خاوەن ئایینەکان دا، ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه السلام) چەند شتێکی تێدا کۆبووەتەوە تەنیا خوا بۆ ئەوی کردووە:

١- لە پێناوی خۆشەویستی خوادا دەستی نا بە هەموو شتێکەوە دوور کەوتەوەو کۆچی کرد لە هەموو خزم و کەس و کاری، خوایش لەباتی ئەوانەدا ئیسماعیل و ئیسحاق و یعقوبی پێدا.

٢- خۆی بەری کرد لە باوکی کاتێ بۆی روون بووەوە کە دوژمنی خوایە، خوایش لە قورئان دا ناوی برد بە باوکی موسڵمانان.

٣- کوڕی خۆی دا بە زەوی دا بۆ سەربڕینی لەبەر گوێ رایەڵی خوا، خوایش ماڵاتێکی گەورەی کرد بە قوربانی و بۆی نارد، بەهۆی ئەوە قوربانی کردنی دامەزرا، هەتا هەتایە لەسەر ئەو خوانی ئەوە خەڵکی بخۆن و بنۆشن.

٤- مل کەچ بوو بە رەزامەندی یەوە بۆ ناو ئاگر لەبەر رەزامەندی خوا، خوایش سەری خست بەسەر گەلەکەی دا، ئەو ئاگرە گەورەی سارد و سەلامەت کرد بۆ ئیبراهیم، ئەوەیش بوو بەهۆی سەربەرزی ئەو و سەرشۆڕی و شەرمەزاری دوژمنانی خۆی و ئایینەکەی.

٥- دڵی سووتا و بەزەیی هاتەوە بەم میللەتەدا و نزای خێری بۆ کردن خوایش پاداشتی دایەوە کە لە هەموو نوێژێك دا ئەم میللەتە داوای سەلات و سەلامی خوای بۆ بکەن.

٦- دوژمنایەتی خۆی دەربڕی لەگەڵ هەموو بت و بت پەرستێك دا، خوایش ئەمی گێڕا بە خۆشەویستی خۆی.

٧- جێ پێی هێشتەوە و پیت و فەرداری کرد و فەرمانی دا کە ئەو جێگا دەستانەی بکرێ بە جێگای نوێژ و نوێژی تێدا بکرێ سەلات و سەلامی لێ بێ.

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥١﴾

ئینجا دێتە سەر باسی موسا و هارون کە دوو پێغەمبەربوون لە نەوە و پەلی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم، ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ﴾ باسی موسا بکە لە کتێبێك دا کە قورئانە و ئەو سیفەت و نیشانانەی کە من بۆت باس ئەکەم لە بابەت موساوە تۆ بیان خوێنەرەوە بەسەر خەڵکی دا:

١- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا﴾ بەڕاستی موسا کەسێ بوو پاك و خاوێن کراو و هەڵبژێرراو.

٢- ﴿وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا﴾ موسا فروستادە و نێرراوی خوا بووە بۆ سەر خەڵکی و هەواڵ وەرگر و هەواڵ دەر بووە پێ یان لەلایەن خواوە. ﴿نبی﴾ لە زمانی شەرع دا ئادەمی یەکە کە ئایینی لەلایەن خواوە سروش لەلا کرابێ، ئیتر فەرمانی پێ درابێت بە راگەیاندنی ئەو ئایینە بە خەڵکی یان نە؟ و ﴿رسول﴾ ئادەمی یەکە کە فەرمانی پێ درابێ بە راگەیاندنی ئەو ئایینەی کە سروشی لەلا کراوە، کەواتە هەموو ﴿رسول﴾ ێك ئەبێ ﴿نبی﴾ بێت، بەڵام پێویست نی یە هەموو ﴿نبی﴾ یەك ﴿رسول﴾ بێت. وەکو ئەو هەموو پێغەمبەرانەی بەنی ئیسرائیلە کە پێویست بوو لەسەریان رەفتار بە تەوراتی موسا بکەن و شتێکی جیاوازی تایبەتی یان بۆ نەهاتبوو رایگەیەنن. کەواتە بە پێی ئەوە کە وترا ئەبوایە وشەی ﴿نبی﴾ لە پێش وشەی ﴿رسول﴾ەوە بوایە بەڵام دوو هۆ هەیە لێرەدا بۆ دواخستنی ﴿نبی﴾:

أ- رێکی و جوانی لەگەڵ دوا دوایی ئایەتەکانی ترا کە پێ یان ئەوترێ(فاصلە) و ئەو رێکی یەش زۆر پێویستە بەپێی رێزمانی هۆنینەوەی وتاری عەرەبی.

ب- ﴿رسول﴾ نێرراوی خوایە بۆ سەر خەڵکی بۆ ئەمەی لەلایەن خواوە هەواڵیان بداتێ، دەی ئاشکرایە هەواڵ پێدانی خەڵکی ئەبێ پاش ناردن بێت بۆلایان، کەواتە هەواڵ پێدانەکەی ئەبێتە هۆی رەوانە کردنەکەی، دەی بەرهەم بۆ هەموو شتێ لەپاش شتەکەوە ئەبێ.

٣- ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ﴾ بانگمان لیْ کرد لەلای ڕاستی کێوی(طور) ەوە، واتە ئەو تەرەفەی کە کەوتبووە دەستە ڕاستی موسا لەو کاتەدا کە لە مەدینەوە گەڕایەوە بەرەو میسر و گفتوگۆمان لەگەڵ کرد و هەواڵمان دایە کە کردوومانە بە پێغەمبەر.

٤- ﴿وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا﴾ ڕادەو پلەی موسامان نزیك خستەوە لە خۆمانەوە لە کاتێك دا بە نهێنی گوفت و گۆی لەگەڵ کردین خۆی بەخۆی بیْ هۆی کەسی تر، واتە نزیکمان خستەوە بۆ ڕادەی قسە لەگەڵ دا کردن، قسەی کەسێکی نزیکی لە شێوەی نهێنی و چپە کردن دا، بێگومان ئێمە باوەڕمان هەیە کە موسا فەرمودەی خوای وەرگرت بە نەفسی خۆی بیْ هۆی فریشتە، یان کەسێکی تر بەڵام ئیتر نازانین ئەو فەرمودەیە چۆن بوو؟ موسا چۆنی وەرگرت؟ ئایا دەنگیْ بوو بە گوێچکە وەری گرت؟ یان بە هەموو لەشی، و لە هەموو لایەکەوە، یان ئەوەی وەری گرت لە جۆری دەنگ و پیت نەبوو؟ یان بە هەموو لەشی، و لە هەموو لایەکەوە، یان ئەوەی وەری گرت لە جۆری دەنگ و پیت نەبوو؟ ئەمەی لەم ئایەتەدا فەرموی وەکو تەمسیل و چیرۆکە بە کەسیْ کە پادشا نزیکی بخاتەوە لەخۆی و هەڵیبژێریْ بۆ هاوڕیْ یەتی خۆی و قسە و مەبەستی نهێنی خۆی لەگەڵ دا بکات، ئەم چیرۆکەش بۆ تێگەیاندنی ئێمەیە و نزیك خستنەوەی مەبەستەکەیە لەفام و تێگەیشتنی ئێمەوە.

٥- ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا﴾ لەبەر بەزەیی و ڕەحمی خۆمان هارونی برایمان پێدا بەجۆری پێغەمبەری، واتە موسا نزای کردە لای خوا کە هاروونی برایشی بکات بە پێغەمبەر لەگەڵی دا بێت بۆ کۆمەکی و یارمەتی، خوایش نزاکەی وەرگرت، ئەو کۆمەکی و یارمەتی هارونەی بۆ پێك هێنا و ئەو مەبەستەیشی پیْ بەخشی. لە درەختی بەفەڕی ئیبراهیم دوو لق پەیدا بوو، ئیسحاق و ئیسماعیل، لقی یەکەمی باس کرد لەگەڵ هەندیْ لە ڕۆڵە و نەوەی دا، ئینجا ئەوا ئەگەڕێتەوە بۆ لقی دووەم کە باوکە گەورەی قورەیشە، بەڵکو بە هیتی هەموو عەرەب دائەنریْ.

وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا
عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئیسماعیل بکە لە قورئان دا، هەندێ لەو ناونیشان و سیفەتەکانی بخوێنەرەوە بەسەر خەڵکی دا:**

**١- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ﴾ بەڕاستی کەسێکی بەڵێن ڕاست بوو هەر بەڵێنێکی بدایە بەدی ئەهێنا، بێگومان هەموو پێغەمبەرێ، بەڵکو هەموو پیاوچاکێ ئەبێ بەڵێنی ڕاست بێ، بەڵام ئیسماعیل لەم بارەیەوە زیاتر بەناوبانگ بووە چەند شتێکی لێ بینراوە لەکەسی ترەوە ئەوانە ڕوویان نەداوە بەسە بۆ بەڵگەکە بەڵێنی دا بە باوکی کە خۆگر و بە ئارام بێت لە ژێر باری سەربڕینی دا، دەی ئەوە بوو ئەو بەڵێنە سەختەی بێ کەم و کوڕی بردە سەر و بەدی هێنا.**

**٢- ﴿وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا﴾ ئیسماعیل فرستادە و نێرراوی خوا بوو بۆ سەر خەڵکی، هەواڵ دەر بوو پێ یان لەلایەن خواوە. لەم فەرمودەیەوە وەرئەگیرێ کە بۆ(رسول) پێویست ناکات خاوەنی شەریعەت و کتێبی تایبەتی بێت، چونکە هەردوو ڕۆڵەکەی ئیبراهیم – درودی خوا لەسەر هەموویان بێت – پەیڕەوی کتێب و شەریعەتی ئیبراهیمیان ئەکرد. ئەوەی پێویست بێت بۆ(رسول) ئەمەیە ڕەوانە کرابێتە سەر گەلێکی تایبەتی و فەرمانی پێ درابێ بە ڕاگەیاندنی ئایینی خوا، دەی ئیسماعیل وابووە، ڕەوانە کراوە بۆ سەر(جرهم) و لەناو عەرەب دا، کە تاکە تاکەیە خواپەرست هەبوو ئەوانە هەموو ئەچوونەوە سەر شوێن کەوتووەکانی باوکە گەورەیان ئیسماعیل(علیه السلام).**

**٣- ﴿وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ﴾[1] ئیسماعیل فەرمانی ئەدا بە ماڵ و خێزانی و کەس و کاری بە نوێژ کردن و زەکات دان ، واتە لەپاش تەواو کردنی خۆی ئینجا گرنگ تر لە هەموو شتێ خەریك بوو بە چاك کردنی نزیك ترین کەسەوە کە منداڵ و خێزان و خزمە**

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست بە(أهل) ئوممەت و گەلەکەیەتی، چونکە پێغەمبەران لە جێگەی باوکن بۆیان.

نزیکەکانە. نوێژ و زەکات دوو پایەی زۆر گرنگن لە ئایین دا، یەکەم هۆی پەیوەندی و رێکی یە لەگەڵ خوادا، دووەم هۆی رێکی و پەیوەندی یە لەگەڵ بەندەکانی خوادا، ئەم دوو شتەش مەبەستێکی بنەڕەتی و راستەقینەن لە هەموو ئایینەکانی خوادا، کەواتە جێی خۆیەتی خەریك بوون و بە گرنگ گرتن و فەرمان دان بە نوێژ و زەکات، بە تایبەتی وەسف و سەناکردنی ئیسماعیل بە خەریك بوونی بەم دووانەوە.

٤- ﴿وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا﴾ ئیسماعیل رەزا لێ بوراو بوو لای پەروەردگاری خۆی، چونکە وتار و کرداری رێك و راست بوون. ئینجا باسی ئەم پێغەمبەرانە دوایی ئەهێنێ بە باسی ئیدریس و زۆر بە کورتی ئەفەرموێ: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِدْرِيسَ﴾ باسی ئیدریس بکە لە کتێبێك دا کە قورئانە.. ئێمە ناتوانین چەرخی ئەم پێغەمبەرە دیاریی بکەین بە شێوەیەك کە دڵنیا بین، بەڵام باوەڕ وایە کە لە پێش نوح پێغەمبەرەوە بووبێ – درودی خوا لەسەر هەموان بێت – ئەڵێن باپیرە گەورەی نوح بووە، یەکەم کەس بووە کە بە قەڵەم نووسیویەتی و فێری زانینی ژمارە و ئەستێرە بووە، یەکەم کەس بووە پۆشاکی دوراوی کردووەتە بەر و دورینی پۆشاکی داهێناوە و یەکەم کەس بووە کە چەکی بەکار هێناوە. و چەند شتی تر وتراوە دەربارەی ئەم پێغەمبەرە هەندێکی ئاشکرایە کە قسەی پڕ و پووچە و بە بێ بەڵگەیەکی بەهێز و چاك، واتە هیچ گوێ نەدرێ بەم قسە و باسانە کە قورئان لێ یان بێ دەنگە و باسی ئەفەرموون. کەواتە با دڵنیا بین تەنها بەمەی کە قورئان دەربارەی ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا﴾ بەڕاستی ئیدریس کەسێکی زۆر راست بووە لە وتار و کرداری دا و هەرگیز درۆی نەکردووە و پێغەمبەر بووە ﴿وَرَفَعْنَـٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ بەرزمان کردووەتەوە بۆ رادە و پلەیەکی بڵند و رێز و نزیکیمان داوەتێ لە خۆمانەوە، ناوبانگمان بەرز کردەوە لەناو خەڵك دا. قورئان ئەو دە پێغەمبەرەی پیشان داین بەو نیشانە و سیفەتە شیرینانەوە تا بەراوردی ئەو کۆمەڵە بەرزە پاك و خاوێنە خواناسە بکەین لەگەڵ ئەو هەموو تاقم و چینە بەدە خراپە تاوان بارانەی کە لە پاش ئەوان بوون بە جێنشینی ئەو و بەراوردیان بکەین تا تێ بگەین لەرادەی جیاوازی ئەمان لەگەڵ ئەوان دا ئەفەرموێ: ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم﴾ ئەوانە کە باس کران کەسانێکن کە خوا چاکە و بەهرەی خۆی رشت بەسەریان دا ﴿مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ﴾ کە بریتین لەو پێغەمبەرانەی کە هەندێکیان لە نەوەی ئادەمن وەکو ئیدریس،

وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ۚ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟
سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ (٥٨) ۞ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا
(٥٩) إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا (٦٠) جَنَّٰتِ عَدْنٍ
ٱلَّتِى وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ

---

﴿وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ﴾ هەندێکی تریان وەکو لە نەوەی ئادەمن، لە نەوەی ئەوانەشن کە لەگەڵ نوح دا لە کەشتی یەکەدا هەڵمان گرتن، ئەوەش وەکو ئیبراهیم کە لە نەوەی(سام) ە ئەو هەشتەکەی تر کە لە نەوەی ئیبراهیمن ﴿وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ﴾ هەندێ تریان لە نەوەی ئیبراهیمن وەکو ئیسماعیل و ئیسحاق و ئەو شەشەکەی تر ﴿وَإِسْرَٰٓءِيلَ﴾ هەندێ تریان لە نەوەی ئیسرائیلیشن وەکو ئەو پێنجەکەی تر: موسا و هارون زەکەریان و یەحیا و عیسا. ﴿وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ﴾ ئەوانە هەموو لەو کۆمەڵەن کە رێنموونیمان کردن و خستنمانە سەر رێگای راست و هەڵمان بژاردن بۆ پێغەمبەرێتی و رێز و شەرافەت، ئەو ە پێغەمبەرە کە ناو نیشانیان ئەوە بوو کە باس کرا کەسانێك بوون ﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ کاتێ کاتێ ئایەتەکانی خوای خاوەن بەزەیی بخوێنرایەتەوە بەسەریان دا ئەکەوتن بە روودا بە سوژدە بردن و گریانەوە، واتە سیفەت و نیشانەی ئاشکرایان ئەمە بوو کە لە خواترس بوون و سام و بیمی خوا لە دڵیان دا جێگیر بوو، هەستیان بە ئاگاداری خوا زۆر بەتین بوو و بە جۆرێ کاری کردبوو لە دڵ و گیان و لەشیان ئەگەر ئایەتەکانی خوایان ببیستایە دەست بەجێ ئەکەوتن بە روودا و بە مل کەچی و زەلیلی و دەستیان ئەکرد بە گریان لە بیم و ترس و سام دا، لەم ئایەتەو لە چەند شوێنێکی ترد ا وەرئەگیرێ کە زۆر پێویستە بیر کردنەوەو تێفکران لە کاتی خوێندن یان بیستنی قورئان و هەوڵدان بۆ کار کردنی هۆش و دڵ، بۆ بەتین و بەهێز کردنی سام و بیم لەخوا، هەروەها پێویستە گریان لەکاتی خوێندن، یان بیستنی قورئان دا،

بەجۆرێ ئەگەر گریان نەئەهات بە ئارەزوو و گریان لەخۆ بهێنرێ وەکو لە حەدیس دا ئەفەرموێ: ﴿اتلوا القرآن و ابكوا فإن لم تبكوا فتباكوا﴾(صالحی مەری) ئەفەرموێ: لە خەودا قورئانم خوێند بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە پاشان فەرموی پێم: سالح ئەمە خوێندنی قورئان، ئەی گریان لە کوێ یە؟ ئەو کۆمەڵە پێغەمبەرە – درودی خوایان لەسەر بێت – کە خوای گەورە رادەو پلەی بەرزی روون کردنەوە لە ئایین و نەژاد و نزیکی یان لە خۆیەوە، ئەو کۆمەڵە پاك و خاوێنە هاتن و رۆیشتن ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ﴾[1] ئینجا لەپاش ئەوان چین و تاقمی خراپ هاتە شوێن ئەوان و بوو بە جێگر و جێنشینی ئەوان، تاقمی دوور لە خوا ﴿أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ کە نوێژیان زایە کرد و وازیان لێ هێنا و باوەڕیان پێ ی نەما ﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ﴾ شوێنی ئارەزواتی نارەوای خۆیان کەوتن و سەریان کردە تاوان و خراپەکاری ﴿فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەوانە هەموو تووشی گومڕایی و خراپە ئەبن، یان دووچاری تۆڵەی سەختی گومڕایی یەکەیان ئەبن لە ئاگری دۆزەخ دا. ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ جگە لە کەسێ کە گەڕابێتەوە بۆلای خوا و ئیمان و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا﴾ ئینجا ئەوانە ئەچنە بەهەشت و هیچ شتێ لە پاداشتی کردەوە چاکەکانیان کەم ناکرێتەوە، کەواتە گوناهو کوفر و گومڕایی یەکە لە پێشەوە بووبێ هیچ زیانی نامێنێ بەهۆی ئەو گەڕانەوە و باوەڕ هێنان و کردەوە چاکانەوە، کە ئەیکەن لە پاش دا، لە لوتف و بەزەیی خوا بەزیاد بێت ﴿جَنَّٰتِ﴾ ئەوانە ئەچنە ناو بەهەشتەکانی ﴿عَدۡنٍ﴾ ناوی قات و تەبەقەیە کە لە قات و تەبەقەکانی بەهەشت، یان بەهەشتانی نیشتەجێ و جێگای مانەوەی هەتا هەتایی ﴿ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ﴾ کە خوای خاوەن بەزەیی فراوان بەڵێنی پێ داون بە بەندە تایبەتی یەکانی خۆی لە پەنهانی دا، پێش ئەوەی ببینن،

---

[1] وشەی(خلف) بە زەنە واتە جێگری بەد و خراپ و(خلف) بە سەرە واتە جێگری چاك.

إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا ﴿٦١﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ
ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴿٦٣﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا
بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾

---

**﴿إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا﴾ بەڕاستی خوا بەڵێنی بەدی دێت یان بەڕاستی ئەوەی خوا بەڵێنی پێداوە، بێگومان بەڵێن پێ دراوەکانی ئەبێت.. واتە ئەو بەهەشتەی کە لێرەدا بەڵێنی پێداوە، بێگومان بەڵێن پێدراوەکان هەموو ئەچنە ناوی یەوە. ئینجا بەکورتی شێوەی بەهەشت و ئەوانەی وان تیای دا پیشان ئەدات:**

**١- ﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا﴾ بەهەشتی یەکان لە بەهەشت دا هیچ وتە و وتارێکی بێ نرخ و بێ سوود نابیستن ، واتە قسەیەك نی یە کە دڵ گەرد بگرێ پێی، بەڵکو ئەوەی ئەبیستن سڵاوکردنی مەلائیکەیە لێ یان، یان سڵاو کردنیان لە یەکتر، یان وتە و وتاری پاك و خاوێنە لە هەموو لەکە و ڕەخنەیەك.. تەنیا ئەوە ئەبیسن.**

**٢- ﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾ بۆ ئەو بەهەشتی یانە هەیە لە بەهەشت دا ڕۆزی خۆیان لە بەیانی و ئێوارەدا، بێگومان لە بەهەشت دا شەو و بەیانی و ئێوارە نی یە، بەڵکو هەمیشە وان لە نوور و ڕووناکی دا، کەواتە مەبەست ئەوەیە بە ئەندازەی بەیانی و ئێوارەی ئەم جیهانە دووجار خۆراك و نان ئەخۆن، یان مەبەست ئەوەیە کە هەمیشە خۆراکیان ئامادەیە بێ ئەرك و غەم. ئەمەی لەم دوو خاڵ و نوختەدا فەرموی پۆپەی هەموو خۆشی ئەم جیهانەیە: دڵی خۆشی بە ئارامی بێ داخ و غەم لەگەڵ خواردن و خواردنەوەی بە ئارەزووی بێ ئەرك، خوا بێبەشمان نەکات لەو لوتف و بەزەیی یە. ئینجا هۆی دەست کەوتنی ئەو بەهەشتە ڕوون ئەکاتەوە، دەست نیشان ئەکات بۆ ڕێگایەك کە بێ گرێ و قۆرت ئەچێ بۆ ئەو بەهەشتە، ئەو بەڵێن پێ دراوانە دیاریی ئەکات کە شایان و خاوەنی ئەو بەهەشتەن، ئەفەرموێ: ﴿تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا﴾ ئەو بەهەشتە گرنگەی کە باس کرا بەهەشتێکە کە لە نێوان بەندەکانمان دا ئەیدەین بە کەسێ کە لە پێشەوە لەم جیهانەدا لە خواترس بووە و بەهۆی ئەوەی کە**

پارێزەر بوون لە تاوان و گوێ ڕایەڵ بووە بۆ خوای خۆی، ئەو بەهەشتەی پێ ئەدەین بە جۆرێ پەشیمان بوونەوەو لێ سەندنەوەی تێدا نی یە، و هیچ کەس ڕێگای نی یە بەرگری بکات، جا هەرکەس ئەو کەلەپوور و میراتی یەی ئەوێ ڕێگا و هۆی دەست کەوتنی روون کراوەتەوە. کە بریتی یە لە پەیرەوی پێغەمبەران سلاوی خوایان لەسەر بێت، ئیتر با بە هیچ رەنگ پەیوەندی نەسەب و نەژادی نەبێ پێ یانەوە، بەڵام هەرکەس ڕێگای ئەوان نەداتە بەر، خۆی بەشدار نەکات لە کەلەپوور و میراتی ئایین و زانینی ئەوان دا ئەو کەسە بێبەشە لە کەلەپووری بەهەشت با کوڕی ئەو پێغەمبەرانەیش بێت!! مەبەستی گرنگ و گەورە لە سەرگوزەشتەی ئەو پێغەمبەرانە لەم سورەتەدا بریتی بوو لە روون کردنەوەی خوایەتی و پەروەردگاری خوا.. جا بەو بۆنەیەوە لەپاش ئەو سەر گوزەشتانە جاڕی دا بۆ ئەم بوونەوەرە گەورە و فراوانە و ئینجا فەرمان ئەدات بە پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا و خۆگری بۆ ئەرکی ئەو پەرستنە. ئەو جاڕەش لەسەر زمانی جوبرەئیل ئەدات(علیه السلام) لە یەکەم جارەوە جوبرەئیل وەڵامی پێغەمبەر(ﷺ) ئەداتەوە وەکو لە چەند ریوایەتی حەدیس دا هەیە یەکێ لەو ریوایەتانە ئەمەیە کە بوخاری ئەیهێنێ لە ئیبن و عەباسەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی بە جوبرەئیل: ئایا چی بەرگریت ئەکات لەوەی کە زۆر تر بێیت بۆلامان ئەویش وەڵامی دایەوە بەمەی کە خوا بۆمان ئەگێڕێتەوە، ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ﴾ ئێمە نایەینە خوارەوە لە ئاسمانەوە بە فەرمانی پەروەردگاری تۆ نەبێ، واتە شتەکە بەدەست من نی یە، من بەندەیەکی فەرمان بەرم: بمنێرن دێم و نەمنێرن نایەم، ناردنی من جارجار و کات کاتە بە پێی لێزانین و حیکمەتی خوایە و بە پێی بەرژەوەندی بەندەکانی خوایە، ئێمە هیچمان بەدەست نی یە ﴿لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ تەنها بۆ ئەو خوایە و خوا ئەزانێ هەموو کاروباری لەمەوپاش و لەمەوپێش و ئێستامان ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ خوای تۆ هیچ کات وازی نەهێناوە لە تۆ، واتە دواکەوتن و نەهاتنە خوارەوەی من لەم ماوەدا لەبەر واز هێنان نەبووە لە تۆ یان لەبەر بێ ئاگاداری نەبووە لە تۆ بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی و حیکمەتێ بووە لەو دواکەوتنەدا، خوای تۆ هیچ کات بێ ئاگا نەبووە لە تۆ و بێ ئاگا نی یە و بە هیچ کلۆج بێ ئاگایی رووی تێ ناکات،

رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ﴿٦٥﴾ وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ
أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾

---

**چونکە ﴿رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ پەروەردگاری تۆ پەروەردگاری هەموو ئاسمانەکان و زەوی یە و هەرچی وا لە نێوانیان دا، دەی کەسێ ئاوابێ ئەبێ زانینی بێ سنووری هەبێ، ئەبێ هەموو کار و کرداری رێك و راست و بەجێ بێ، کەواتە نە واز لە تۆ ئەهێنێ و نە بێ ئاگا ئەبێ لە تۆ. ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ﴾ کەواتە بەردەوام بە لەسەر پەرستنی ئەو پەروەردگارەت و بەردەوام بە لە خۆگرتن لەبەر زەحمەت و ئەرکی پەرستنی دا، ئەرکی بەرز بوونەوەو گەیشتن بەو رادە و پلەی بەرزی وەستان لە بەردەمی پەروەردگارت، خۆت کۆ بکەرەوە و هەموو هێز و وزەت ئامادە بکە بۆ پەیوەندی و گەیشتن بەخوای تاك و تەنیات، بۆ دەست کەوت و وەرگرتنی پیت و فەڕی بەندەیی و پەرستن لەو پلە بەرزەدا.. بەڕاستی ئەوەش ئەرکێکی قورس و گرانە: ئەرکی خۆ کۆکردنەوە و خۆ ئامادەو خۆ داڕنین و رووت کردن لە هەموو شتێ تر و لە هەموو خەریك کەرێ، هەموو ئەم لاو ئەولا کردنەوەیە بە هیچ لایەکی تردا، بێگومان ئەوە ئەرکێکی زۆر گەورە و گرنگی تێدایە، هەرکەس نەیچەشتبێ نایزانێ. بەڵام دەسیش ناکەوێ بەو زەحمەت و ئەرکە گرانە نەبێت، پەرستنی ئاوا چەند شتی تایبەتی و نهێنی و دەروونی تێدایە، بەڵام بە کەسێ ئەدرێن کە ئەو ئەرکە بخاتە سەر شان و ئەستۆی خۆی، چەند بۆن و هەناسەی خۆشی تێدایە، بەڵام بۆ کەسێ ئەبێ کە هەموو قاپی و کەلەبەری هەست و دڵ و دەروونی خۆی بۆ بکاتەوە، خوا بە بەزەیی خۆی بێبەشمان نەکات لەو تام و بۆنە خۆشانە – آمین –.**

**عیبادەت و پەرستنی خوا لە ئاینی ئیسلام دا تەنیا بریتی نی یە لە بەجێ هێنانی دروشمەکانی ئیسلام: نوێژ و رۆژوو و زەکات و... هتد. بەڵکو عیبادەت و پەرستنی راستەقینە لە ئاینی ئیسلام دا بریتی یە لە خستنە کارو بەکار هێنانی هێز و وزە و**

بزووتنەوە و جوڵانەوە و هەموو نیاز و خەتەرە بە تەنها لەبەر خوا و بۆلای خوا، بەڕاستی ئەوە هەروا شتێکی سووك و ئاسان نی یە دڵ وای لێ بێ هەموو کاروباری تەنها لەبەر خوا بێت و رووی تەنها بۆلای ئەو بێت، بەڕاستی بە ئەرك و زەحمەتێکی زۆر قورس دڵ وای لێ دێ کە هەموو مەبەست و نیاز و کردەوەی لەم زەوی یەدا روو بەرە و ئاسمان بێت و پاك و خاوێن بێت لە هەموو چڵك و چەپەڵی ئەم جیهان و زەوی یە و رووت بێ لە بەش و ئارەزووی ناڕەوای نەفس و ژیانی ئەم جیهانە... بێگومان لە ئایینی ئیسلام دا پەرستنی راستەقینەی خوا بەرنامەیەکی تێرو تەواوە ئەبێ مەردوم بە گوێرەی ئەوە رەفتار بکات و ژیان بەسەر ببات لە هەموو بارو روویەکی یەوە، چونکە تەنها خوا شایانە بۆ ئەمەی بپەرسترێ و گوێ رایەڵی بۆ بکرێ، هیچ شت و هیچ کەسی تر وێنەی ئەو نی یە وەکو ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا﴾ ئایا ئەزانی و ئاگاداری بە هیچ وێنەیەك بۆ خوا؟ واتە نەخێر ئەزانی کە خوا وێنەی نی یە، کەواتە تەنها ئەو بپەرستە و خۆت راگرە لەبەر ئەرکی پەرستنەکەی دا. لێرە بەدوای سورەتەکە لێکۆڵینەوەیە بۆ روون کردنەوەی پڕو پووچی بت پەرستی و بڕیاری رۆڵە و هاوبەش بۆ خوا لەگەڵ روون کردنەوەی ناڕەوایی و بێ جێی باوەڕ نەبوون بە زیندوو بوونەوە، کە ئەم باوەڕانە چ تاوانێکی گەورە و دژ و پێچەوانەی هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوان، بە تایبەتی ئەم باوەڕە بۆگەنانە جێگیر بوون لە مێشکی یەکەم چین کە ئەم قورئانەی چوو بە گوێ دا، بەم بۆنەیەوە هەڕەشەی سەخت و سامناك ئەکات لە تاوانباران و موژدەیش ئەدات بە لەخواترسان، لە یەکەم جارەوە ئەکۆڵێتەوە لە بێ باوەڕی بە زیندوو بوونەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا﴾ ئادەمی ئەڵێ ئایا کاتێ من مردم و بووم بە خۆڵ تازە لەوەو پاش زیندوو ئەکرێمەوە بە زیندوویی لە خاك دەرئەهێنرێم؟ واتەسەرسام ئەبێ لە شتی وا و زۆر بە دووری ئەزانێ، بێگومان ئەمە وتەو رەخنەیەکی زۆربێ جێیەلەبێ ئاگایی یەوەئەووتەبەدەمی دا دێت، هۆی سەرسوڕمانی بیر نەکردنەوەی ئەوئادەمی یەیەلەپەیدابوونی خۆی لەیەکەم جارەوە ئایالەکوێ بوو؟ چۆن پەیدا بوو؟

أَوَلَا يَذْكُرُ الْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَٰطِينَ ثُمَّ

لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾

وەکو ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَا يَذْكُرُ الْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا﴾ واتە ئایا ئادەمی بیر ناکاتەوە کە ئەومان لە پێشەوە دروست کردووە لە کاتێك دا ئەو هیچ نەبووە واتە با بیر بکاتەوە و پەیدا بوونی یەکەم جاری بکات بە نیشانە و بەڵگە لەسەر گونجاوی دوبارە کردنەوەی، بەڕاستی ئەو نیشانە و بەڵگەیەش ئێجگار بەمێزە هیچی تری ناوێ بۆ هەر کەسێ تێگەیشتنی هەبێ. لەپاش ڕێنموونی بۆ ئەو بەڵگە روونە، ئینجا خوای گەورە بەرامبەر ئەو بێ باوەڕیی و دەم درێژیی ئەوانە سوێند ئەخوات بە زاتی پاکی خۆی لەسەر چەند بەسەرهاتێ کە لەپاش زیندوو کردنەوەیان بەسەریان دێت، هەڕەشەیان لێ ئەکات بەو بەسەرهاتانە:

١- ئەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ﴾ ئەمجار سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر بەڕاستی ئەوانە لەپاش زیندوو کردنەوە کۆیان ئەکەینەوە ﴿وَالشَّيَٰطِينَ﴾ لەگەڵ ئەو شەیتانانەی کە لە دنیادا هاوسەریان بوون و گومڕایان کردن با لەگەڵیان بن بۆ زیادە سزای دەروونیان، با هەموو کات بیر بکەنەوە کە چۆن ئەوەندە نەفام بوون شوێنی ئەم شەیتانانە کەوتن، لەگەڵ ئەوەدا خوا لە دنیادا پێی ڕاگەیاند بوون کە شەیتان دوشمنتانە و شوێنی مەکەون، بە دوژمن سەیری بکەن، شەیتان بانگتان ئەکات بۆ ئەمەی پێکەوە لە دۆزەخ دا بن بێ بڕانەوە.

٢- ﴿ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا﴾ ئینجا لەپاش ئەوە بێگومان هەموویان حازر ئەکەین بە دەوری دا بە جۆرێ هەموو کەوتوون بەسەر ئەژنۆدا، لەبەر ئەوە کەس خۆی پێ ناگیرێ بوەستێ بە پێوە و بەسەر قاچی یەوە بێجگە لەوەش ئەوە شێوەی تاوانباری و زەلیلی و ریسوایی یە، بەڕاستی شێوەیەکی زۆر سامناکە، تا بیری لێ بکرێتەوە سامناکی روون تر ئەبێتەوە وەرە بیر بکەرەوە لەو هەمووە کە تەنها خوا ژمارەیان ئەزانێ: ئەوانە هەموو بەو ریسوایی یە بە دەوری دۆزەخ دا ڕاگیر بکرێن و هاڵاو و بڵێسەی بێت بە روویان دا و هەموو کاتێ چاوەڕوانی ئەوە بن کە بگیرێن و توڕ درێنە ناوی، بەڕاستی زمان توانای روون کردنەوەی ئەو بەسەرهاتەی نی یە، لەوانەیە دڵ بوەستێ لەکاتی بیر لێ کردنەوەی دا، خوا پەنامان بدات...

ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا

**٣- ﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا﴾ ئینجا بێگومان دائەڕنین و جوێ ئەکەینەوە لە هەموو دەستە و تاقمێ کامیان بەتین تر و سەرکێش تر بووە، بەرامبەر بە خوای خاوەن بەزەیی، واتە لە یەکەم جارەوە هەموو بە تێکڕایی بە دەوری دۆزەخ دا راگیر ئەکرێن، ئینجا جیاوازی ئەخەینە نێوانیان، هەرکەس تاوانبار تر و یاخی تر بووبێ لە خوا و زیاتر سنووری خوای شکاندبێ لە پێشەوە، ئەوانە توڕ ئەدەینە ناو دۆزەخ. بێگومان خوا راستە و ئەبێت هەموو کارو فرمانی راست بێت، دیارە ئەوە مافی خۆیەتی ئەوانە لەم جیهانە را پێشڕەو و پێشەوا بوون لە گوناهو تاوان دا، کەواتە ئەبێ پێشەوایش بن بۆ ئاگری دۆزەخ کە تۆڵەی تاوانبارانە. ﴿ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا﴾ ئینجا بێگومان ئێمە زاناتر و ئاگادارترین لە هەموو کەس بەوانەی کە شایاترن بە دۆزەخ کە بسوتێن پێی و تاو بدرێن و گەرمی ئاگرەکەی بچەژن، کەواتە ئەمانەن هەڵبـژێرراون بۆ پێشڕەوی و پێشەوایی، ئیماندارەکانیش ئەو بارە ناهەموارە و ئەو وەزعە سامناکە ئەبینن وەکو لەم فەرموودەیشەوە وەرئەگیرێ: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ [١] سوێند بەخوا هیچ کەس نی یە لە ئێوە کە نەچێتە دۆزەخ و حازری نەبێ و پێی نەگات! ﴿وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ ئەوە شتێکە خوای تۆ پێویستی کردووە لەسەر خۆی و بڕیار دراوە، بەڵام خوا لە ئاستی چاکان ئەیکوژێنێتەوە و سارد و سەلامەتی ئەکات، هەرچۆنێ لەم جیهانەدا ئاگرەکەی حەزرەتی ئیبراهیمی بەو جۆرە لێ کرد: کەواتە ئەمان هەرچەند نزیك ئەکەونەوە لە دۆزەخ، بەڵام خوا دووریان ئەخاتەوە لە سووتان و سزاکەیەوە، وەکو ئەوەش مەبەستە بە ئایەتی سورەتی – الأنبیاء – کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَىٰ أُولَٰئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾ ئەو لە خوا ترسانە خوا رزگاریان ئەکات و تێ یان ئەپەڕێنێ، بەڵام تاوانباران ئەمێڵێتەوە تیای دا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا﴾ پاش ئەوە کە هەمووتان چوونە دۆزەخ و حازر بوون،**

---

[١] هێندێ ئەفەرمون مەبەست نزیك کەوتنەوەیە لە دەورووبەری دۆزەخ، هێندێ تر ئەفەرمون: مەبەست گوزەر کردنە بەسەر پردی – صراط – دا کەوا بەسەری یەوە، بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە بەهێزە و حەدیس یارمەتی ئەدات.

وَنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ
ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾

ئینجا کەسانیٚ کە لە خوا ترساون و خۆپاریٚزەر بوون لە تاوان ئەوانە رزگار ئەکریٚن ﴿وَنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾ ستەمکاران و زاڵمەکان ئەمیٚڵینەوە تیای دا بە بەچۆکا هاتوویی و لەسەر ئەو شیٚوەی کە کۆ کرانەوە بە دەور و بەریا و لیٚ یان ئەگەڕیٚن لەناو دۆزەخ دا با بسوتیٚن. ئینجا لەم شیٚوە سامناکە دلٚ داچڵەکیٚنەرەی رۆژی دوایی یە – کە بەو جۆرە ستەمکارەکانی تیادا ئەچیٚ و چاکان و لەخوا ترسەکان رزگار ئەبن و ئەگەن بە ئامانجی گەورە – لەم شیٚوەوە دیٚتەوە بۆ شیٚوەی لوت بەرزی و گومڕایی کافرە ستەمکارەکانی قورەیش لە ئاستی ئیماندارە هەژارەکان، ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا﴾ کاتیٚ کە ئایەتەکانی ئیٚمە – کە روون و ئاشکران – ئەخویٚنریٚنەوە بەسەریان دا ئەوانەی کە کافرن ئەڵیٚن دەربارەی ئەوانەی ئیمانیان هیٚناوە: ئایا کام لەم دوو کۆمەڵە، واتە ئیمانداران و کافران جیٚ و شویٚنی چاکترە و کۆڕ و مەجلیسی شیرین ترە، واتە کاتیٚ ئەو کافرە نەفامانە کە ئایەتە روونەکانی خوایان ئەبیست و بەرگری یان پیٚ نەئەکرا و دەستە پاچە ئەبوون لە ئاستیان دا هیچیان بۆ نەئەمایەوە ئەمە نەبیٚ دەستیان ئەکرد بە کەشخە و شانازی بەسەر ئیماندارە هەژارەکان دا بەوەی کە ئەمان هەژار و بیٚ نەوان و خۆیان سامان و دارایی دارن و خاوەنی جیٚ و شویٚن و تاقم و کۆڕن.. ئەوا خوای گەورەش ئەدا لە دەماخ و کەللە بۆشەکەیان بەم فەرمودەیە: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا﴾ واتە زۆرمان بەرباد کرد لە میللەت و گەلە بیٚ باوەڕەکان لەپیٚش ئەمانەوە کە ئەوان چاکتر و جوانتر بوون لەمان لە بابەت دارایی و شت و مەکەوە، لەبابەت ئەو شتانەی کە سەرنج ئەدریٚن و چاویان بۆ هەڵئەخریٚ، واتە سامان و دارایی و جیٚ و شویٚن و دەسەڵاتی دنیایی بەڵگە نین لەسەر چاکی خاوەنەکانی، بەرگری سزای خوایان لیٚ ناکەن، ئەگەر نا ئەو هەموو تاقم و چینە لەپیٚش ئەمانەوە ئەوەیان بەسەر نەئەهات: کەواتە ئەوەی ئەمانە ئەیڵیٚن بیٚ جیٚ وناڕاستە، دەی باهەڵەی وانەکەن، بەڵکوتەمیٚ خوار بن لەویٚنەکانی خۆیانەوە ئینجا فەرمانیدابەپیٚغەمبەر(ﷺ) کەنزایان لیٚ بکات لەشیٚوەی(مباهلة)دا،واتەنەفرینی خواله درۆزن،

قُلْ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ
فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ هُدًى ۗ
وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا﴾ بڵێ بەوانە کە لایان وایە ئێوە لەسەر ناهەق و بەتاڵن، خۆیان لەسەر ڕێگای ڕاستن، پێ یان بڵێ: هەرکام لەم دوو کۆمەڵە جێگیر و دامەزراوە لە گومڕایی دا با خوای خاوەن بەزەیی بیهێڵێتەوە لەو گومڕایی یەدا و درێژەی پێ بدات ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ﴾ هەتا کاتێ بەچاو ئەبینن ئەوەی هەڕەشەیان لێ کراوە پێی و هەواڵیان پێدراوە بە بەدیهێنانی ﴿إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ﴾ کە ئەوەش یا سزایەکە لەم جیهانەدا دووچاریان ئەبێت، یان ڕۆژی دوایی یە کە لە ناکاودا دێت و داگیریان ئەکات ﴿فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا﴾ ئینجا ئەو کاتە ئەزانن کە کام لەم دوو کۆمەڵە خراپ و بەدە لەبابەت جێ و شوێنەوە و کام تاقمێ بێ هێز و لاوازە لەبارەی لەشکر و سەربازەوە؟!

لەم ئایەتەوە دەرکەوت کە مۆڵەت دانی تاوانباران و خۆشی و ڕابواردنێ کە خوا بۆیان فەراهەم ئەهێنێ نیشانەی فەزڵ و هونەر و تەواوی یان نی یە، بەڵکو مەبەستی شەڕی هەیە پێ یان، ئینجا لە بەرامبەر ئەوانەوە ڕوونی ئەکاتەوە کە هەر ناخۆشی و ناتەواوی و کەم و کوڕی یەك خوا بەسەر چاکانی بێنێ زیادە سوود و قازانجی ئەوانی ئەوێ لە بریتی ئەوەدا شتی چاکتریان بداتێ، ئەفەرموێ: ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ هُدًى﴾ ئەوانەی ڕێگای ڕاست ئەدەنە بەر و ڕێنموونی وەرئەگرن خوا ڕێنموونی یان زیاد ئەکات و لەو بارەیەوە پەرەیان پێ ئەدات و بەهێزتریان ئەکات ﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا﴾ ئەو تاعەت و گوێ ڕایەڵی کردنانە کە ئەو پیاو چاکانە لە دنیادا بەجێی ئەهێنن و بەرهەم و پاداشتەکانیان هەر ئەمێنێتەوە: ئەو تاعەت و گوێ ڕایەڵی کردنانە باشن بەلای پەروەردگارتەوە لە بابەت پاداشت و سوود و بەرهەمەوە، نەك ئەو نیعمەت و شتانەی کە داوێتی بە کافرەکان و کەشخەی پێوە ئەکەن لەم جیهانەدا و تێکەڵی داخ و مەراقن، وەکو ماوەکەیشیان کەم و کورتە بە تایبەتی کە سەریشیان لە سزا و عەزابی دۆزەخەوە دەرئەچێ وەکو بەم فەرمودەیەش ڕوونی ئەکاتەوە ﴿وَخَيْرٌ مَّرَدًّا﴾ پاشەڕۆژی ئەوانە چاکە کە سەریان لە ناز و ڕێزی بەهەشتەوە دەرئەچێ نەك ئەوەی کافرەکان کە سەری لە دۆزەخەوە دەرئەچێ.

أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ
عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا
فَرْدًا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ
وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ

---

ئینجا نموونه و شێوەیەکی تر لە وتەی ناڕەوا و شانازی بێ جێی کافرەکان پیشان ئەدات و بێزاری دەرئەبڕێ لێ ی و خەڵکی سەری سوڕ ئەمێنێ لە ئاستی، ئەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾، واتە لەپاش قسە و باسی ئەو کافرانە ئینجا هەواڵی بەسەرهات و دەنگ و باسی کەسێکم بدەرێ کە کافرە و باوەڕی نەهێناوە بە ئایەتەکانی ئێمە ﴿وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾ وتی و ئەڵێ: سوێند بەخوا ماڵ و دارایی و رۆڵەم پێ ئەدرێ لە رۆژی دواییش دا، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەمەیە کە لە(خوبابی کوڕی ئەرەت) ەوە ئەگێڕنەوە کە ئەڵێ: من پیاوێکی ئاسنگەر بووم قەرزم بەلای(عاسی کوڕی وائیل) ەوە بوو چووم بۆلای و داوای قەرزەکەم لێ کرد ئەویش وتی: سوێند بەخوا نایدەمەوە هەتا هەڵنەگەڕێتەوە لە باوەڕ بە محمد، ئەڵێ منیش وتم: من هەرگیز هەڵناگەڕێمەوە و بێ باوەڕ نابم بە محمد(ﷺ) هەتا تۆ ئەمریت و زیندوو ئەکرێیتەوە، ئەویش وتی: دەی کە من مردم و زیندوو کرامەوە لەوێ ماڵ و ئەولادم هەیە ئەو کاتە وەرە بۆلام قەرزەکەت ئەدەمەوە، ئینجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە... ئەو وتەی(عاس) ە نموونەیەکە لە لاقرتی و گاڵتە کردنی بێ باوەڕەکان بە زیندوو بوونەوە، ئەوا قورئان بە شێوەی سەرسام کردن بێزاری دەرئەبڕێ لەو وتە ناڕەوایە، ئەفەرموێ: ﴿أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ﴾ ئایا ئاگادار بوو بەسەر غەیب دا و غەیب ئەزانێ کە قسەی وا ئەکات؟ ﴿أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا﴾ یا ئایا پەیمان و بەڵێنێکی وەرگرتووە لای خوای خاوەن بەزەیی لەسەر ئەوەی کە ئەیڵێت؟ واتە ئەوەی عاس ئەیڵێت نازانرێ بە یەکێ لەو رێگایە نەبێت، دەی ئایا ئەو گەیشتووەتە ئەو رادە و پلە بەرزە کە غەیب بزانێ، یان خوا بەڵێن و پەیمانی بداتێ کە لە رۆژی دوایی دا ماڵ و سامان و ئەولادی پێ ئەدات؟ ﴿كَلَّا﴾ واتە بێگومان هیچ کام لەم دوو بارە نەبووە و نابێ، کەواتە با کۆتایی بێنێ لە وتەی ناڕاست و بێ جێ. بێگومان ئەو کافرە مەبەستی لاقرتی کردن بوو بە زیندوو بوونەوە و پرسیار و

حیساب، کەواتە ماڵ ئەوەیە ئەم هەڕەشە سامناکە بدرێ بە گوێیدا: ﴿سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ﴾ واتە لەمەو پاش لە رۆژی دوایی دا بۆی دەرئەخەین کە ئەوەی ئەیڵێ نووسیومانە لەسەری، یان لەمەوپاش تۆڵەی لێ ئەسێنین ﴿وَنَمُدُّ لَهُ مِنَ الْعَذَابِ مَدًّا﴾ درێژە ئەدەین بە سزادان بۆی تا ئەو رادە و ئەندازەی کە شایانە بۆی، یان سزای زیاد ئەکەین و دوو چەندانەی ئەکەینەوە لەبەر کوفر و درۆ هەڵبەستنی، لەبەر لاقرتی کردنی بە زیندوو بوونەوەو تۆڵە و پرسیار ﴿وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ﴾ ئەو ماڵ و ئەولادەی کە ئەو ئەیڵێ ئێمە لەوی دائەڕنین و وەری ئەگرین لێ ی وەکو کەلەپوور و میراتێ وەرئەگیرێ لە مردوو ﴿وَيَأْتِينَا فَرْدًا﴾ لە رۆژی دوایی دا دێتە لامان بە تەنها و رووت و قوت، بێ ماڵ و بێ ئەولاد، بێ یارمەتی دەر و بێ پشتیوان... ئینجا هەمیتر بیر و باوەڕی ناڕاست و ناڕێکی ئەوانە پیشان ئەدات کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوا نی یە و ئەو بێ باوەڕانە لەو کاتەدا چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان بڕیار دابوو بە نیاز و ئومێدی ئەوە یارمەتی یان بدەن و زۆردار و دەست داریان بکەن، هەندێ مەلائیکە و هەندێ جن و شەیتانیان ئەپەرست و هاواریان لێ ئەکردن، ئەوا خوایش بە درۆیان ئەخاتەوە و هەڕەشەیان لێ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا﴾ ئەوانە لەخوا بەدەر چەند پەرستراوێکی تریان بۆ خۆیان بڕیار داوە بۆ ئەمەی ئەو پەرستراوانە ببن بەهۆی هێزو زاڵ بوونیان، بەم رەنگە بیانگەیەنن بەخواو تکا و نزایان بۆ بکەن لای خوا ﴿كَلَّا﴾ با واز بێنن لەو کار و باوەڕە ناڕەوا، ئەوەی ئەوان نیازی ئەکەن و گومانی پێ ئەبەن وا نی یە، بەڵکو ﴿سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ﴾ پەرستراوەکان لە رۆژی دوایی دا ئینکاری پەرستنەکەی ئەوان ئەکەن و دانی پێدا نانێن ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ ئەو پەستراوانە ئەبن بەهۆی زەلیلی و سەرشۆڕی بەسەر ئەمانەوە کە لە دنیادا ئەیانپەرستن و ئەبن بە دوژمنیان، قسەیان لێ هەڵئەتەکێنن و نەفرینیان لێ ئەکەن و شایەتی یان لێ ئەدەن.

لەم ئایەتە پێشووانەوە روون بووەوە کە ئەو کۆمەڵە کافرە ئێجگار سەریان کردووەتە گومڕایی و رۆچوونە خوارەوە لە گومڕایی دا، جێگیر و دامەزراون لەسەر بێ باوەڕی و بەرگری راستی و ئایینی خوا، ئینجا لێرەدا سەرنجی پێغەمبەر(ﷺ) رائەکێشێ بەجۆرێ سەرسام بێت و سەری سوڕ بمێنێ لەو هەموو گوناهو تاوانی ئەوانە و ئاگاداریشی ئەکات بەهۆی گوناهو تاوانەکانیان، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ ئایا نەتزانیوە و سەرنجت نەداوە کە ئێمە شەیتانەکانمان ناردووەتە سەر کافرەکان،

تَؤُزُّهُمۡ أَزࣰّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعۡجَلۡ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمۡ عَدࣰّا ﴿٨٤﴾

زاڵمان کردوون بەسەریان دا ﴿تَؤُزُّهُمۡ أَزࣰّا﴾ بەجۆرێ پاڵیان پێوە ئەنێن و هانیان ئەدەن لەسەر کوفر و تاوان، بەمەی ئەو کارو کردەوانەیان لەپێش چاو جوان و شیرین ئەکەن، دەنووکیان وا بەسەریانەوە بۆ ئەمەی لا نەکەنەوە بۆلای رێگای راست و کۆتایی نەهێنن لەو بارو رێگا چەوتەی کە وان لەسەری و داویانەتە بەر.

خوای گەورە هەموو پەلپ و بەهانەیەکی بەندەکانی خۆی بڕیوە بەم رەنگە ژیریی و سەربەستی یەکی پێداون، ئەوەی پێویست بێت لە بەڵگە و نیشانەی روون پیشانی داون، لەخۆیان پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و ئاگاداری کردوون بە هۆکانی کامەرانی و بەختەوەری و هۆکانی بێبەشی و روو رەشی لە هەردوو جیهان دا، جا کاتێ بەندە بە ئارەزووی خۆی پشتی کردە فەرمانی خوا و لایدا لە رێگا راستەکەی خوا و شوێنی شەیتان کەوت، ئەو کاتە خوا شەیتانی بەسەردا زاڵ ئەکات، بە ئارەزووی خۆی شەو و رۆژ هانی ئەدات بۆ تاوان و خراپەکاری، ئەوەی هۆی هەڵخەڵەتاندن بێت بۆی فەراهەم ئەهێنێ، ئەوکاتە دووچاری دەردی چارە نەکراوی خۆی دێت هەتا زیاتر بمێنێتەوە و ماوەی ببێ باری خۆی گرانتر ئەکات، کەواتە هیچ پەلەی لێ نەکرێ چاکە، هەرچەند بژی ماوەکە کەمە و بە زوویی دووچاری سزای خۆی دێت وەکو خوایش ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو کۆمەڵە سیاچارە: ﴿فَلَا تَعۡجَلۡ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ ئینجا تۆیش پەلەیان لێ مەکە بە سزا و نەمانیان، بۆ ئەمەی تۆ و ئیمانداران سەرفراز بن لە دەستیان و وڵاتیش پاک ببێتەوە لە خراپە و ئاژاوەیان ﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمۡ عَدࣰّا﴾ چونکە مۆڵەتیان کەمە و چەند رۆژ و هەناسەیەکیان ماوە ئێمە بە ژماردن ئەیان ژمێرین بۆیان، هەروەها هەموو کردەوەیان ئەنووسرێ و ئەژمێررێ لەسەریان تا ئەگەنە تۆڵەکەی. ئای ئای بێبەشی و روو رەشی و بەد بەختی بۆ کەسێ کە خوا گوناهو کردەوە و هەناسەکانی بژمێررێ بۆ پرسیار و تۆڵە!! بەڕاستی زۆربەمان بێ شەرم و بێ ئاگاین ئەبینین یەکێ دنیای لێ دێتە یەک لەبەر ئەوە زۆر دارو کار بەدەستێ بەدوای دا ئەگەڕێ و گوناهو تاوانێکی لەسەر نوسیوە، کەچی بەرامبەر بەخوا بێ باک و بێ ترسە و ئەم هەموو تاوانەی هەیە و هەر بە دڵیشی دا نایەت بیرێکی لێ بکاتەوە! بەڕاستی هەر حیلم و سەبری بێ سنووری خوایە جێگای ئەم شتانەی تێدا ئەبێتەوە، پەنا ئەبەین بە رەحم و لێ بوردنی. ئینجا پاشە رۆژی ئەو ژمارەیە پیشان ئەدات لەشێوەی رووداوێ لە رووداوەکانی رۆژی دواییدا،

يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمۡلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا
مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴿٨٧﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ﴿٨٩﴾
تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا
﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ
عَبۡدٗا ﴿٩٣﴾ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴿٩٥﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا﴾ باسی ئەو رۆژە بکە کە لەخواترسەکان کۆ ئەکەینەوە بۆلای خوای خاوەن بەزەیی بە کۆمەڵێکی بەڕێز بچن بۆ بەهەشتەکەی بۆ وەرگرتنی ئەو ئەجرو پاداشتە بێ وێنەی کە لەم جیهانەدا بەڵێنی پێ داون. لە جێنشینی چوارەم علی – کرم الله وجهە – ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: سوێند بەخوا ئەو کۆمەڵە بەڕێزە بە پیادە ناڕۆن و نادرێنە بەر، بەڵکو ولاغی سواری یان بۆ ئەهێنن کە هیچ کەس وێنەی نەدیون بە زینی ئاڵتوون و جڵەوی زو بەرجەدەوە و بە سواری ئەوانەوە ئەچن تا قاپی بەهەشت، ﴿وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا﴾ تاوانبارەکان ئەدەینە بەر بۆلای دۆزەخ بە تینوێتی بە وێنەی گەلە ئاژەڵ ﴿لَّا يَمۡلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ﴾ ئەو تاوانبارانە خاوەنی تکاو لاڵە نین، واتە کەسێکیان دەست ناکەوێ تکایان بۆ بکات ﴿إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا﴾ جگە لەو تاوانبارەی کە بەڵێنێکی وەرگرتبێ لەخوای خاوەن بەزەیی، واتە ئەو تاوانبارەی کە لەسەر ئیمان و باوەڕێکی رێك و راست مردبێ، ئەوانە هەرچەند گوناهبار بن ماتوڵ بە ئیمانەوە مردبن شایانی ئەوەن تکایان بۆ بکرێ، تکاشیان بۆ ئەکرێ وەکو لە چەند حەدیسێکی سەحیح دا ئەفەرموێ. ئینجا باسی وتە و بڕیارێکی تری زۆر ناڕاست و ناڕەوا ئەکات کە کافران وتویانە دەربارەی خوا، ئەوەیش بریتی یە لە بڕیار دانی رۆڵە. ئەم بڕیارە ناڕاستە لەلایەن سێ تاقمەوە وتراوە: بت پەرستەکانی عەرەب کە لایان وابوو مەلائیکە کچی خوان، جوولەکە کە ئەیانوت: عوزەیر کوڕی خوایە. گاورەکان کە ئەڵێن عیسا کوڕی خوایە. ئینجا ئەوا قورئان ئەو قسە ناڕەوا ئەهێنێ و بەرپەرچی ئەداتەوەو هەڕەشەی لەسەر ئەکات و بێزاری دەرئەبڕێ لێ ی بە جۆرێ هەر لە دەست قورئان دێت و لە تواناداا نی یە لاسایی کردنەوەی، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا﴾ کافرەکان وتویانە خوا رۆڵەی بۆ خۆی داناوە و فەراهەم هێناوە!!

ئینجا رووی فەرمودەیان تێ ئەکات بۆ بەرپەرچ دانەوە و بێزاری دەربڕین بە جۆرێ ئەوپەڕی ناڕەزایی و خەشمی بەتین پیشان ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا﴾ سوێند بەخوا ئێوە شتێکی زۆر ناهەمواری بێزراوی گەورەتان کرد کە بڕیاری رۆڵە ئەدەن بۆ خوا. ئینجا روونی ئەکاتەوە کە بوونەوەر خەشم و قاری زۆر بەتینی هەیە ئاستی ئەو قسە ناڕەوای ئەوان دا، چونکە ئەو وشە بێ قەڕە کە بە دەمی ئەوان دا دێت دژ و پێچەوانەی سروشتی یەتی، ناکونجێ لەگەڵ ئەو باوەڕەی کە لە دەروونی دا جێگیر بووە، ئەو بنەڕەتەی کە لەسەری دارێژراوە تێکی ئەدات بە مل یەک دا و ئەیڕوخێنێ، ئەفەرموێ: ﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنْشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا﴾ نزیکە و لەوانەیە ئاسمانەکان لەت لەت و پارە پارە بن لەوەی ئەو کافرانە ئەیڵێن، زەوی کون ببێ و رۆ بچێتە خوارەوە، شاخ و چیاکان بە یەک جار بڕوخێن و هاڕەو شاخەیان لێوە بێت ﴿أَنْ دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا﴾ لەبەر ئەوە رۆڵەیان داناوە بۆ خوای میهرەبان، خەڵکیان ناو بردووە بە رۆڵە بۆی ﴿وَمَا يَنْبَغِي لِلرَّحْمَٰنِ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ لەکاتێک دا کە ناکونجێ و شایان نی یە بۆ خوای میهرەبان فەراهەم هێنانی هیچ رۆڵەیە بۆ خۆی، چونکە ئەگەر رۆڵەی ببێ ئەبێ وێنەو هاوتیرەیشی ببێ، رۆڵە بۆ کەسێ ئەبێ کە خۆی نەمێنێ و بەهۆی رۆڵەکان یەوە ژیان نەبڕێتەوە، بۆ کەسێ چاکە پێویستی بە کۆمەک و یارمەتی دەر بێ، ئەگەر رۆڵەی ببێ ئەبێ تاک و تەنیایی نەمێنێ ئەو کاتە بوونەوەر نامێنێ و ئەشێوێ بە مل یەک دا، بە کورتی بە هیچ رەنگ ناکونجێ لەگەڵ خوایەتی دا ﴿إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا﴾ هەموو ئەوانەی وان لە ئاسمانەکان و زەوی دا – ئیتر فریشتە، یان پەری، یان ئادەمی – هیچ کەسێ لەوانە نی یە کە موڵک و بەندەی خوا نەبێ، بەڵکو هەموو یەکێ دێت بۆلای خوای میهرەبان، پەنا ئەهێنێ بۆلای بە بەندەیی و مل کەچی ﴿لَقَدْ أَحْصَاهُمْ﴾ سوێند بەخوا دەوری ئەوانەی داوە بە زانین و توانین و هیچ کەسێکیان لەوە دەرناچن، ﴿وَعَدَّهُمْ عَدًّا﴾ بە ژماردن یەکە یەکە ژماردونی بە خۆیان و کرداروو گوفتار و هەناسەکانیشیانەوە ﴿وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا﴾ هەموو یەکێکیان بەتاک و تەنیا دێت بۆلای خوا لە رۆژی دوایی دا بە بێ کەس و یارمەتی دەر، کەواتە نە هیچ کەس رۆڵەیە و نەهیچ کەس هاوبەش، بەڵکو هەموو موڵکە و بەندەیە و دروست کراوە. بێگومان بەم چەند ئایەتی پێشووە ترس و سامێکی زۆر روو ئەکاتە ئەو دڵانەی کە زیندوو رووناکن، بە ئیمان و رووناکی ئیمان،

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ
بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا ﴿٩٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هَلۡ
تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا ﴿٩٨﴾

---

جا لەم کاتەدا دڵنەوایی چاکان ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا﴾ بەڕاستی کەسانێ کە ئیمانیان هێناوە و بە گوێرەی ئیمانەکەیان کردەوە چاکەکانیشیان بەجێ هێناوە ئەوانە خوای بەڕەحم خۆشەویستی یان بۆ فەراهەم ئەهێنێ و خۆشەویستی یان ئەکات لەدڵی خەڵك دا بێ هۆیەکی ئاشکرا. ئەو خۆشەویستی یە لە خواوە دێت بۆ ناو مەلائیکە و لەوانیشەوە دێت و بڵاو ئەبێتەوە لە زەوی دا وەکو لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە ئیمامی ئەحمەد و بوخاری و مسلم ئەیهێنن لە ئەبو هورەیرەوە: کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: کاتێ خوا بەندەیەکی خۆش ویست ئەفەرموێ بە جوبرەئیل: فلانم خۆش ئەوێ تۆیش خۆشت بوێ، ئەویش خۆشی ئەوێ، لە پاشان جوبرەئیل جاڕ ئەدات بە مەلائیکەکانی ئاسمان دا: کە خوا فلانی خۆش ئەوێ کەواتە ئێوەش هەموو خۆشتان بوێ. ئینجا بەجارێ مەلائیکەکانی ئاسمان ئەو کەسەیان خۆش ئەوێ، ئینجا ئەو کەسە لە زەوی دا خۆشەویست ئەبێت و لە دڵی خەڵك وەرئەگیرێ. ئەگەر مەبەست بۆ ڕۆژی دوایی بێت یان بۆ دوای چوونی بەهەشتە کە خوا کینە و نیگەرانی ناهێڵێ لە دڵ و دەروون دا، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾[1] یان پێش چوونی بەهەشت لە کاتی پیشاندان و خستنە پێش چاوی چاکەکانیان بۆ هەمووان لەو کاتەدا کە خراپان و تاوانباران ئەکەونە دوژمنایەتی و کینەبەری و شەڕە جوێن و نەفرین کردن لە یەکتر... لەو کاتەدا وا چاکان و پاکان خۆشەویستی و برایەتی یان بەهێزتر ئەبێت، بێگومان ئەم ئایەتە مەککەیی یە، لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا ئیمانداران بێزراو و دەرکراو بوون لە پاشان خوا ئەو بەڵێنەی لە دنیادا بەدی هێنا، ئیمانداری خۆشەویست و بەڕێز کرد لە دڵ و دەروون دا و بەڕاستی لەو کاتە تەنگەدا ئەو

---

[1] واتە هەر کینەیە بێ لە دڵەکانیان دا هەمووی دائەڕنین لێ یان بە جۆرێ هەموو برا ئەبن و لەسەر تەختی ڕازاوە ڕوو بە روو و بەرامبەری یەکتر دائەنیشن.

بەڵێنــە دڵنــەوایی و دڵخــۆش کردنێکــی زۆر گــرنگ بــوو، هەرچــۆنێ بــەدی هــاتنی بــە موعجیزەیەکی گەورە دەرچو و، لە دنیادا ئەو بەڵێنەی بەدی هێنا بۆیان، بێگومان لـە ڕۆژی دواییش دا بەدی ئـەهێنێ بە تێرو تەواوی، لـە لوتف و بەزەیی یەکەی بەزیاد بێت، خوای گـەورەی میهرەبـان هـەر پێغەمبـەرێکی ڕەوانـە کردبـێ بـۆ سـەر هـەر گـەل و کۆمـەڵێ و هـەر کتێبێکی ناردبێ بە زمانی ئەو گەل و کۆمەڵە بووە کە یەکەم جار بانگ کراون بۆ ئایینی خوا، چونکە ئەگەر بەو جۆرە نەبوایە خەڵکی تێی نەئەگەیشتن و حاڵی نەئەبوون ئەو کاتە هیچ سوودێ نەئەبوو لە ناردنی ئەو پێغەمبەرو ئایینەدا، ئەو خەڵکە بەهانەی بەهێزیان ئەبوو لە پەیڕەوی نەکردن دا، بەڵام کە بە زمانی خۆیان بوو بە باشی وەریان ئەگرت و حاڵی ئەبوون، بە ئاسـانی ئەچەسپا لـە دڵ و دەروونـی ئەوانـەی کە دڵ مـردوو نـەبوون، دڵ مردووەکانیش هیچ بەهانەیەکیان بە دەستەوە نامێنێ. ئینجا پاش ئەوە ئەو ئایینە جێگیر بوو، چەسپا ئیتر ئاسـانە گـۆڕین و ڕاڤـە و ڕوون کردنـەوەی ئـەو زمانـە و بـە هـەر زمـانێ تـر، جـا لەبـەر ئەمـە پێغەمبەرمان(ﷺ) لەگەڵی عەرەب بوو، ئەو گەلەی کە یەکەم جار ئەم ئایینەی پێ ڕاگەیاندن زمانیان عەرەبی بوو، لەبەر ئەو هۆیە ئـەم ئایینـە بە زمانی عـەرەبی هاتـە خـوارەوە، وەکو لـە چەند ئایەتێك دا ئەم مەبەستە ڕوون ئەکاتەوە یەکێ لـەو ئایەتانە ئەمەیە لـەم سورەتەدا کـە ئەفــەرموێ: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴾ ئــەم قورئانــەمان ئاسان کردووە بەم ڕەنگە بە زمانی خۆت کە عەرەبی یە ناردوومانەتە خوارەوە، ئەوەش هەر لەبەر ئەوەیە کە بەم قورئانە موژدە بدەیت بەو کەسانەی کە لە تۆڵە و عەزابی خوا ئەترسن و ئامادەن بچنە ڕیزی لەخوا ترسانەوە، هـەروەها بەم قورئانە بترسێنی گەل و کۆمـەڵێ کە لـە حـەق لایـان داوە و بـەتینن لـە دەمبـازی کـردن و دەم درێـژیی و ئـاژاوە کـردن لەسـەر شتی ناڕاست و ناڕەوا، ئەمجار کۆتایی ئەهێنێ بەم هەڕەشە سەختە: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا ﴾ گەل و کۆمـەڵی زۆرمان بەرباد کـردووە پـێش ئەمانە، ئایا هەست ئەکەیت بە هیچ کەس لەوانە، هیچ کامیان ئەبینی؟ یان ئایا ئەبیستی هیچ دەنگ و ورکە و سرکەیە لەوانە؟ واتە پێش ئەم گەلە سەرکەشەی تۆ گەل و میللەتی زۆر هەبوون وەکو ئەمان سەرپێچی یان کرد لە فەرمانی خوا و پێغەمبـەرەکانیان، ئەوانەمان هـەموو لەناوبردن، کەواتـە بـا ئـەمانیش بترسـن و تـەمێ خـوار بـن لـە هـاوڕێ و وێنـەکانی خۆیـان، تـۆیش ئـەی پێغەمبەر بەردەوام بە لەسەر فەرمانی خۆت، دڵنیا و دڵ ئارام بە کە سەرکەوتن بۆ تۆ و ئەو ئایینە ئەبێ کە تۆی پێ ڕەوانە کراوی...

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلٗا مِّمَّنۡ خَلَقَ
ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى ﴿٤﴾

## سورەتی(طه)
## مەککەیی یە و(١٣٥) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

خوا ئەم سورەتە دەست پێ ئەکات و دوایی دێنێ بە روو کردنی فەرمودەی بۆلای پێغەمبەر(ﷺ). فەرمان و ئەرکێ روون ئەکاتەوە کە خراوەتە سەر شانی کە بریتی یە لە بانگ کردنی خەڵکی بۆ سەر ڕێگای خوا و ئامۆژگاری کردنیان و موژدە دان بە چاکان و ترساندنی تاوانباران، ئیتر لە پاش بەجێ هێنانی خۆی کاروباری خەڵکی بەدەست خوایە و ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا، هەرکەس گوێ رایەڵی نەکات و مل پێچی بکات ئۆباڵی خۆی بە ئەستۆی خۆیەتی و هیچ لەکە و تانەیەك روو ناکاتە پێغەمبەر(ﷺ).

لەپاش سەرەتا سەر گوزەشتەی موسا پێغەمبەر ئەهێنێ(علیه السلام)، لەو سەرگوزەشتەیە زنجیرەیەك ئەهێنێ بە درێژیی لە کاتێکەوە کرا بە پێغەمبەر هەتا کاتێ کە تاقمێ لە بەنی ئیسرائیلی یەکان بوون بە گوێرەکە پەرست. لەو سەر گوزەشتەیەدا روون ئەبێتەوە چاودێریی و یارمەتی دانی خوا دەربارەی موسا(علیه السلام)، هەروەها سەرگوزەشتەی ئادەم ئەهێنێ بە شێوەیەکی پەلە و بە کورتی، لەو سەرگوزەشتەیەدا رەحم و بەزەیی خوا روون ئەبێتەوە دەربارەی ئادەم و رێنموونی کردنی لەپاش ئەو گوناهەی کە کردی، لەگەڵ پیشاندانی چەند شێوەیەك لە شێوەکانی رۆژی دوایی.. خوای گەورە سەرەتا ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ *طه﴾ لەبابەت ئەم دوو پیتە هەر ئەوە ئەڵێین کە لە

سەرەتای سورەتی(مریم) دا وتمان دەربارەی ئەو پێنج پیتەی ئەوێ کە وێنەی یەکن. لەو(١٤) پیتەن کە لە سەرەتای(٢٩) سورەتی قورئان دا هەن بە جیاوازی، لە یەکەوە تا پێنج، کەواتە پێویست نی یە لێرەدا هیچی تر بڵێین. ئینجا رووی فەرموده ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴾ قورئانمان نەناردووەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ بۆ ئەمەی ماندوو ببێ پێ یەوە و دووچاری زەحمەت و ئەرکی زۆر قورس ببیت بەهۆی خوێندن و خواپەرستی یەوە بە جۆرێ لە سنووری توانات تێپەڕێ، بەڵکو چونکە بە زمانی خۆتە رێك و رەوانە و خوێندنی سووك و ئاسانە و شتێکت لێ داوا ناکات کە لە توانات دا نەبێ، ئەوەی پێویستی ئەکات لەسەرت بە باشی بۆت بەجێ دێت، خواپەرستی لە سنووری تواناداا نیعمەت و خۆشی یە، نەك زەحمەت و ناخۆشی. قورئانمان نەناردووەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ بۆ ئەمەی ماندوو ببی و دووچاری زەحمەت و ئەرکی زۆر گران ببی لەگەڵ خەڵکی دا کاتێ کە ئیمانی پێ ناهێنن، چونکە پێویست نەکراوە لەسەر تۆ و داوات لێ نەکراوە ئیمان بە خەڵکی بێنی بە زۆر، یان بە داخ و خەفەت خۆت بکوژی لەسەر ئیمان نەهێنانیان، بەڵکو ئەوەی پێویستە لەسەر تۆ ئامۆژگاری و ترساندنی خەڵکە وەکو ئەفەرموێ: ﴿ إِلَّا تَذۡكِرَةً لِّمَن يَخۡشَىٰ ﴾ نەمان هێناوەتە خوارەوە بۆ ئەمەی دووچاری ئەرکی گران ببیت پێ ی، بەڵام لەبەر بیر خستنەوە و تەمێ دادان بۆ کەسێ کە لە خوا ئەترسێ و دڵ نەرمە، یان ئامادەیە بۆ ترساندن و تەمێ و ترساندن کاری لێ ئەکات. بێگومان تەمێ و ترساندنی قورئان پێغەمبەر(ﷺ) بە شێوەی گشتی یە و بۆ هەموو کەسە، چاك و خراپ، لە خوا ترس و لەخوا نەترس وەکو لە چەند ئایەتی تردا بەو شێوە گشتی یە وتراوە، بەڵام لێرەدا تایبەتی کراوە بە لەخواترسەکانەوە لەبەر ئەوە تەنها ئەم تاقمە سوود وەرئەگرن، کەواتە بێجگە لەمان وەکو هەر نەبن وایە، ئینجا رادە و بڵندی قورئان روون ئەکاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿ تَنزِيلًا مِّمَّنۡ خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى ﴾ ئەم قورئانە بە بەش بەش هێنراوەتەوە خوارەوە بۆ سەر تۆ لەلایەن کەسێکەوە کە زەوی و ئاسمانە بەرزەکانی دروست کردووە.

ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾

---

**ئەو کەسە ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ کەسێکە کە ڕەحم و بەزەیی بێ سنووری هەیە ﴿عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ بەرز و بڵندە بەسەر عەرش دا، واتە زاڵە و دەسەڵاتی بێ سنووری هەیە بەسەر هەموو کاروبار و هەموو شت دا، هەموو شت لە ژێر چاودێری ئەودایە. وشەی(عرش) لە زمانی عەرەب دا ناوە بۆ تەخت و کورسی یەکی ڕازاوە بە تایبەتی بۆ پادشایان، لە شەرع دا ناوە بۆ یەکێ لە دروست کراوەکانی خوا کە لەسەری هەموو ئاسمانەکانەوەیە، هەشت کەس یان هەشت تاقم لە مەلائیکە هەڵیان گرتووە و بە دەورو بەری دا مەلائیکەی زۆر هەن کراون بە کاربەدەست و ئیش و کاریان پێ سپێرراوە ڕا دەرئەکەوێ کە لە عەرشەوە هەموو بڕیارەکانی خوا دەرئەچێ دەربارەی هەموو ڕووداو و هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرە لەبەر ئەوە عەرش یەکێکە لە شتە نهێنی و غەیبی یەکان لە ئێمەوە چاک وایە زیاد لەم ئەندازەیە لێ ی نەدوێین. ئینجا دێینە سەر وشەی(استوی) ئەم وشەیە لە زمانی عەرەب دا ماناکەی: جێگیر و نیشتەجێ بوو، بەم جۆرە ناگونجێ بەکار هێنانی بۆ خوا، یەکێکە لەو وشانەی کە ناوبراون بە ﴿متشابهات﴾ واتە هەموو وشەیە کە بە دیمەن و گوێرەی مانا عەرەبی یەکەی بەکار نەهێنرێ بۆ خوا لە شەرع دا، وەکو(وجه، ید، قدم... هتد) دەربارەی ئەم جۆرە وشانە هەموو زانایانی ئیسلام سەرجەم باوەڕیان وایە کە بەکارهێنانیان بەو دیمەن و مانا عەرەبی یە قەدەغەن لە شەرع دا، بە گوێرەی دیمەنەکەیان ناگونجێن، کەواتە مەبەست پێ یان مانا عەرەبی یەکەیان نی یە، بەڵکو مەبەست مانایەکی تری گونجاوە کە شایانی خوا بێت، ئینجا پێشەوایان و زانایانی ئوممەت بوون بە دوو کۆمەڵ لەو بارەوە:**

**١- کۆمەڵێ کە ناو ئەبرێن بە(سلف) واتە زانایانی ئەم ئوممەتە لە چەرخی یەکەوە تا دوایی یان.**

**٢- کۆمەڵێ کە ناو ئەبرێن بە(خلف) واتە زانایانی ئوممەت لەدوای چەرخی(سلف). کۆمەڵی یەکەم هیچ مەبەست و مانایەك دیاریی ناکەن و حەواڵەی خوای ئەکەن و ئەڵێن: باوەڕمان هەیە بەمانە بەو جۆرەی خوا ویستویەتی و نیازی کردووە. بێگومان**

رای ئەم کۆمەڵە زۆر بەجێ یە و زیادە شەرم و ڕێزی تێدایە بۆ خوا، ئەگەر ناچاری نەبێ باوەڕمان ئەبێ هەر وابێ.

*کۆمەڵی دووەم مەبەست و مانای تایبەتی دیاریی ئەکەن. بۆ وێنە وشەی(ید) کە بۆ خوا بەکار هاتووە لە هەندێ جاردا ئەڵێن: مەبەست چاکە و نیعمەتی خوایە، لە هەندێ تردا ئەڵێن مەبەست هێزو توانینە، ئەوەیش بە پێی جێ و شوێنەکەیەتی. بێگومان ئەم رایە زۆر بەجێ یە بۆ بەرگری بەد گومانان و دەم کوت دانەوەی ئەوانەی بەد نیهادن و گومڕان و ئەیانەوێ خەڵکی گومڕا و سەر لێ شێواو بکەن. هەرچەند خۆم رای یەکەمم بەلاوە پەسەند ترە، بەڵام لەم ئایەتەدا بە گوێرەی رای تاقمی دووەم تەفسیرم کردووە، چونکە زۆر لە زانا باوەڕ پێکراوەکان بەو جۆرەیان فەرمووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، بەم کورتەیە کۆتاییمان هێناو ئەگەڕێینەوە بۆ لای ئایەتەکان.

خوا ئەفەرموێ: ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان دایە و هەرچی لە زەوی دایە و هەرچی لە نێوانی ئاسمانەکان و زەوی دایە و هەرچی لە ناو سکی زەویدایە و خۆڵ دایشاردووە. ئەمانە هەموو سەرجەم تەنها موڵکی خوایە و هەموو کاروباریان بەدەست خوایە و هەموو بەسەرهات و گۆڕانیان خوا ئەیکات. ئەم ئایەتە ئاگادار و بێداری کردینەوە کە دەسەڵات و توانینی خوا فراوانە و هەموو شتێ ئەگرێتەوە و چوار دەوری هەموو شتێکی داوە، ئینجا روونی ئەکاتەوە کە زانینیشی گشتی یە و هەموو شتێ ئەگرێتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى﴾ ئەی پێغەمبەر تۆ زیکر و وتراوت دەربڕی و بە ئاشکرا بیڵێیت بزانە هیچ پێویست بەوە ناکات، چونکە بێگومان خوا ئاگادارە بە هەموو نهێنی و شاراوەتر لە نهێنی، وەکو قسەی چپە و شاراوەتر وەکو ئەو نیاز و خەتەرەی دڵ، یان نهێنی وەکو نیاز و خەتەرەیەك کە بە دڵ دا بێت، شاراوەتر وەکو ئەو نیاز و خەتەرانەی کە ئێستا نەبن و لەمەوپاش گوزەر بکەن بەدڵ و دەروون دا، خوا بەمانە هەموو زانایە لەمەوپێش و ئێستا و لەمەوپاش، ئەم فەرمودەیە ئارامی دایە دڵی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە بێداری کردەوە کە پەروەردگاری وا لەگەڵی دا، هەموو شتێ ئەبیستێ و نایەڵێ بە تەنها بێت لە هەڵسانی بە ماف و ئەرکی ئەم قورئانە و لە بەرەنگاری و بەر بەرەکانێی کافرەکان دا، دڵ هەر کات هەستی کرد بە نزیکی لەخواوە بێگومان ئارام دار ئەبێ و هەست ناکات بە تەنیایی و غەریبی لەناو گەل و کۆمەڵێکی دوژمن و دژی بیر و باوەڕەکەی دا، ئینجا جاڕی تاك و تەنیایی خوا ئەدات بە بێ وێنە و هاوبەش،

ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ خوایەك كە ناوی(الله) یە هیچ پەرستراوێك نی یە بەڕاستی جگە لەو و هیچ كەس شایانی ئەو سیفەتانە نی یە كە باس كران جگە لەو، تەنها بۆ ئەوەو هەر شایانی ئەوە ئەو هەموو ناو و سیفەتانەی كە لە هەموو ناو و سیفەتێ تر بەرز و بڵند تر و پاك و خاوێن تر و شیرین ترن، ئەو ناوانە لە حەدیسێكی سەحیح دا(٩٩) ی باس فەرموە و بەناوبانگن و چەند كتێبێ دانراوە لە راڤە و تەفسیریان دا، لەپاش ئەم سەرەتا شیرینە ئینجا سەرگوزەشتە و دەنگ و باسی موسا پێغەمبەر(علیە السلام) ئەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا بەڵگە و نموونە بێت لەسەر یارمەتی و چاودێریی خوا بۆ ئەوانەی كە هەڵگری ئایینی خوان، سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی موسا پێغەمبەر لە هەموو سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەرەكانی تر زۆرتر و درێژ تر لە قورئان دا هاتووە، بە چەند زنجیرەیەك پیشان دراوە، هەر زنجیرەیەك بە پێی مەبەستی ئەو سورەتە چەند زنجیرەیەك هاتووە، لەم چەند سورەتانەدا: ﴿البقرة، المائدة، الأعراف، یونس، الإسراء، الكهف﴾ ئەوەی لە ﴿المائدة و الكهف﴾ دا هاتووە هەر یەكی زنجیرەیەكن تەنها لەو دوو سورەتەدا هەن و لە هیچ سورەتێكی تردا باس نەكراون. بەڵام ئەوەی لە ﴿البقرة و الأعراف و یونس و طه﴾ دا هاتوون هەر یەكە چەند زنجیرەیەكن، هەرچەند زۆر لەو زنجیرانە لە بنەڕەت دا یەكن بەڵام شێوەی وتنەكەیان جیاوازە، هەروەها هەر یەكە و بار و روویەكی جیاوازیان پیشان دراوە بە جۆرێ وەكو دووبارە كراو نین، بەڵكو هەموویان وەكو یەكەم جاری وتنیان بێت وان.

سەرەتای ئەم سورەتە بەزەیی و چاودێریی خوا پیشان ئەدات دەربارەی هەڵگری پەیامی خوا و راگەیەنەری ئایینی خوا، بەهۆی ئەوەوە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتەكەی موسا(علیە السلام) لێرەدا چەند بارو روویەكی پیشان دراوە هەمووی بەزەیی و چاودێریی خوا روون ئەكاتەوە دەربارەی موسا هەر لە منداڵی یەوە هەتا دوایی وەكو بۆمان ئاشكرا ئەبێ لە گوێ شل كردن لە بەسەرهاتەكە، لە یەكەم جارەوە سەرنج رائەكێشێ و سۆز و ئارەزوو ئەخاتە دڵ

و دەروون بۆ گوێ گرتن و وەرگرتنی دەنگ و باسەکە بە رستەیەك کە بەکار ئەهێنرێ بۆ ئەو مەبەستە لەم جۆرە شوێنانەدا کە گرنگن ئەفەرموێ: ﴿وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾[1] ئایا هەواڵ و دەنگ و باسی موسات بۆ هاتووە و پێت گەیشتووە؟ چۆن کرا بە پێغەمبەر و یەکەم جار سروشی بۆ کرا و خوا فەرمایشی لەگەڵ کرد؟ ئایا ئەو هەواڵەت پێ گەیشتووە کە چاودێریی و پەروەردە و پێگەیاندن و رێنموونی خوا روون ئەکاتەوە دەربارەی پێغەمبەرەکانی – درودی خوایان لەسەر بێت –؟ بێگومان لەم بەسەرهاتی موسادا چەند مەبەستێکی گرنگ هەیە:

أ- دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر هەموو سزا و ناخۆشی یەك کە دووچاری ئەبوو لە بەجێ هێنانی فەرمانەکەی دا.

ب- دڵخۆش کردنی بەمەی کە پاشەرۆژی سەرکەوتن بۆ ئەو و ئایینەکەیەتی.

ج- هاندان و رێنموونی لەسەر پەیڕەوی موسا(علیه السلام) لەئارام و خۆگری لە گەیاندنی فەرمان و پەیمانەکەی دا.

لە سورەتی(القصص) دا بە درێژیی بەسەرهاتی موسا ئەگێڕێتەوە لە پێش لەدایك بوونی یەوە تا پێگەیشتن و گەورە بوونی لەماڵی فیرعەون دا، ئینجا هەڵهاتن و دەرچوونی لە میسر لە ترسی کوشتنی لەلایەن فیرعەونەوە، ئینجا جێگیر بوونی لە مەدیەن ماوەی(٨) یان(١٠) ساڵ لەماڵی ئەو پیاوە ساڵحەی ئەوێ کە بەناوبانگە بە شوعەیب پێغەمبەر(ﷺ) و بوو بە خەزووری موسا، لەپاش ئەو ماوەیە کە رای بەهێز لەسەر ئەوەیە(١٠) ساڵ بووە، سۆزی دایك و کەس و کار و نیشتمان دای لە دەروونی و خوا نایە دڵی کە بگەڕێتەوە بۆ میسر، چونکە ئیشی پێ ی هەیە، ئەیەوێ لەم گەڕانەوەدا بیکات بە پێغەمبەر و بە پێغەمبەری بیگێڕێتەوە بۆ میسر بۆ سەر فیرعەون و گەلەکەی: جا لەم زنجیرەوە دەست ئەکات بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی موسا،

---

[1] مەبەست لەم شێوە پرسیارەدا دامەزراندنی هەواڵەکەیە لە دڵ و دەروونی قسە لەگەڵ کراودا، دان نانە بەو هەواڵەدا، واتە بەڵێ پێت گەیشتووە دەنگ و باس و بەسەرهاتی موسا، هەندێ ئەڵێن: وشەی(هل) واتە(قد) کەواتە ئەبێ بڵێین: بێگومان پێت گەیشتووە ئەو هەواڵە.

إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى
(١٠) فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ (١١) إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى (١٢)

---

**ئەفەرموێ: ﴿إِذۡ رَءَا نَارٗا﴾ ئایا هەواڵی موسات پێگەیشتووە لەو کاتەدا کە ئاگرێکی بینی، واتە لە دوورەوە ڕووناکی یەکی چاوکرد. لە کتێبەکانی تەفسیردا ئەگێڕنەوە کە ئیزنی خواست لە حەزرەتی شوعەیب و گەڕایەوە تا گەیشتە ئەو شیوەی کە ناوی(طوی) یە لەلای شاخی(طوی). لەو کاتەدا شەوێکی تاریک بوو لە زستان دا و بەفر ئەباری، لەو شەوەدا خوا کوڕێکی پێدان و ڕێگایان ون کردبوو، بزکەیە ئاژەڵ و ماڵاتی هەبوو پرژ و بڵاو بوونەوە لەو کاتەدا لە دوورەوە ئەو ئاگرەی بینی ﴿فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ﴾ بەهۆی ئەوەوە وتی بە خێزانەکەی بە شێوەی موژدە: لەم شوێنی خۆتانەدا بمێننەوەو مەیەن بە شوێنی من دا ﴿إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا﴾ چونکە من بەرێکی ئاگرێکم چاو کردووە ئەچم بۆلای ئەو ئاگرە ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ﴾ بەڵکو لەو ئاگرە گرێکتان بۆ بێنم کە خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە یان بۆ ئەمەی بە ڕووناکی یەکەی ڕێگا دەرکەن ﴿أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى﴾ یان ئەچم بۆ ئەمەی ڕێنموونی کەر و ڕێگا پیشان دەرێکم دەست کەوێ لەسەر ئەو ئاگرە. دانیشتوانی لادێ و کۆچەرەکان باویان وابوو لە شوێنی بەرزدا ئاگریان ئەکردەوە بۆ ئەمەی ڕێبواری دەشت و بیابانەکان ڕێگای پێ دەرکەن، یان بچن بۆلای بۆ میوانداری، یان بۆ ئەمەی کەسێکیان دەست کەوێ ڕێگایان پیشان بدات، جا بەو گومانەوە حەزرەتی موسا نیازی ئەو ئاگرەی کرد ﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ ئینجا لەکاتێك دا چووە لای ئەو ئاگرە بانگی لێ کرا: ئەی موسا: ﴿إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ﴾ بێگومان من پەروەردگاری تۆم ﴿فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ﴾ کەواتە پێڵاوەکانت داکەنە لەبەر ڕێزی شوێنەکە: ﴿إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ وایت لە شیوێك دا کە پاك و خاوێن کراوە و پیت و فەڕی تێ خراوە ﴿طوی﴾ لە شیوێکایت کە ناو براوە بە ﴿طُوٗى﴾ بەڵێ موسا(علیه السلام) گەیشتە لای ئەو ئاگرە، کە تەماشای ئەکات ئاگرێکی سپی یە و ئەگرێ لە درەختێکی تەڕ و سەوزدا، ئاگرێکی بینی کە تەنها لەش گەرم ناکاتەوە بەڵکو لەش و گیان پێکەوە گەرم ئەکاتەوە.**

ئاگرێك بوو كە تەنها لە شەودا ڕێگا پیشان نادات بەڵكو لەهەموو كات و سەرانسەر كۆچ و كاروان و گوزەر كردنی بە ژیانی ئەم جیهانەدا. بەڕاستی ڕووداوەكە ئێجگار گەورە و گرنگە، زمان و پێنوس توانایان نی یە ڕادەی گەورەیی و گرنگی یەكەی ڕوون بكەنەوە بە بیر لێ كردنەوەی ئەبێ دڵ و دەروون بكەوێتە لەرزە و تەپە تەپ و موچڕكە بە لەش دا بێت، ئادەمی یەكی بێ هێز و لاواز بەو جۆرە فەرمودەی لەگەڵ دا بكرێ، یەكسەر فەرمودە وەرگرێ لە كەسێكەوە كە هەموو ئاسمانەكان و زەوی لەوانەیە بتوێنەوە لە ئاستی جەلال و گەورەیی یەكەی، ئەگەر لوتف و یارمەتی خوا نەبێ ئادەمی بێ هێز و لاواز لەكوێ و ئەو ڕادە و پلە بەهێزە لە كوێ؟! بەڕاستی بەسە بۆ ئادەمی كە ڕێزی بگاتە ئەو ڕادەیە و ئامادەیی درابێ بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە گەورەیە. موسا(علیە السلام) لەو شوێنە بەفەڕەدا بانگی لێ كراو فەرمودەی خوای وەرگرت، بەڵام ئێمە نازانین چۆن بانگ كرا؟ چۆن موسا بیستی و وەری گرت؟ بەڵكو ئەم ڕووداوە لەو شتانەیە كە باوەڕمان پێ ی هەیە و پرسیار ناكەین لە چۆنی یەتی یەكەی، چونكە چۆنی یەتی یەكەی لە زانین و تێگەیشتنی ئێمە بەدەرە، باوەڕمان وایە كە موسا بە جۆرێكی تایبەتی و ڕێگایەكی تایبەتی یەوە بانگی لێ كراو فەرمودەی لەگەڵ دا كراو ئەویش بە جۆرێكی تایبەتی ئەو فەرمودەیەی وەرگرت، بە شێوەیەكی جیاواز لەوەی كە باو و ناسراوە لای ئێمە. بەڵێ زاناكانی ئیسلام بار و جۆریان باس فەرمووە لەو بارەیەوە:

١- موسا بە ڕۆح ئەو فەرمودەی وەگرت كە لە جۆری دەنگ و وشەی دەمی نی یە، پێ ی ئەوترێ(كلامی نفسی) وتراوی دەروونی.

٢- فەرمودەیەكی وەرگرت كە لە جۆری دەنگ و پیت و وشەی دەمی یە، بەڵام لە هەموو لایەكەوە ئەهات و بە هەموو لەش و ئەندامەكانی یەوە وەری ئەگرت نەك تەنها بە گوێچكە.

٣- هەردوو جۆرەكەی وەرگرت، بەم ڕەنگە لە یەكەم جارەوە بە ڕۆح جۆری یەكەمی وەرگرت و ئینجا لەوێوە هات بۆ هەموو لەش و ئەندامی و بەو جۆرە بیستی.

بەڵام ئەو جۆرانەش شتێكن لە تێگەیشتن و باو و زانینی ئێمە بەدەرن، كەواتە هەر ئەوە چاكە بڵێین: ئیمان و باوەڕی ڕێكمان هەیە پێ ی و چۆنی یەتی یەكەی نازانین.

وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ
﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا
يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ﴿١٦﴾

---

ئینجا پێی فەرمو: ﴿وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ﴾ من تۆم هەڵبژاردووە بۆ پێغەمبەرێتی ﴿فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ﴾ کەواتە گوێ بگرە بۆ ئەوەی سروش ئەکرێ: بەخ بەخ لەم رێز و نرخ پێدانە! خوای گەورە خۆی بەندەیە لە بەندەکانی هەڵبژێرێ، کە ئەو بەندەیە یەکێکە لەم هەموو کۆمەڵە، کە ژیان ئەبەنە سەر بەسەر ئەم زەوی یەوە، کە نوختە و خاڵێکی بچکۆلەیە لەناو ئەم هەموو کۆمەڵە خۆرەی کە پارچە و بەشێکی زۆر کەمن لە بوونەوەردا.. ئەو بوونەوەرە گەورەیە پەیدا بوو، ئەو خوایەی کە ئەو بوونەوەرە گرنگە بەرهەمێکی ئاوا بێ ئەرکە بۆ هێز و توانینی بێ سنووری... لوتف و بەزەیی وا بەکار بێنێ! بەڕاستی هەتا بیری لێ بکرێتەوە جێگای خۆیەتی!! ئەوەی کە سروشتی کردەلای بەکورتی سێ شتە کە هەموو ئایینی خوا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیانە، باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا، پەرستنی و گوێ رایەڵی بۆی، باوەڕ بە رۆژی دوایی.

فەرموی: ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي﴾ ئەوەی سروش ئەکرێ ئەمەیە: کە بەڕاستی من ناوم(الله) یە و هیچ پەرستراوێکی راست نی یە جگە لە من، کەواتە من بپەرستە و گوێ رایەڵی من بە.. ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ بەرێك و راستی نوێژ بەجێ بێنە لەبەر یادی من. بە تایبەتی نوێژی باس کرد و فەرمانی پێدا لەبەر زیادە گرنگی نوێژ. چونکە یادی خوا لە نوێژدا بەتین ترە، بە جاری دڵ و زمان خەریکن لەگەڵ خوادا کە ئەوەش مەبەست و ئامانجی راستەقینەیە، هۆی گەیشتنە بە ئارامی دڵ و بەختیاری لە هەردوو جیهان دا ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ﴾ بەڕاستی رۆژی دوایی دێت و بەدی دێت ﴿أَكَادُ أُخۡفِيهَا﴾ ئەمەوێ کاتی هاتنی بشارمەوە و کەسی پێ ئاشنا نەکەم، یان نزیکم لەوەی کە هاتنی رۆژی دوایی داشارم و هەر

نەڵێم: دێت! بێگومان هەواڵدان بە هاتنی ئەو ڕۆژە بەجێ یە لوتف و بەزەیی یەکەی گەورەیە، چونکە هەرکەسێ سروشتێکی ڕێك و راستی هەبێ و جڵەوی کاروباری لەدەستی ژیریی دا بێ بێگومان ئەو کەسە سام و ترسی ئەو ڕۆژە لە دەروونی دا جێگیر ئەبێ ئەو کاتە روو ئەکاتە چاکە و سەرناکاتە تاوان و خراپەکاری، بێگومان هەرکەسێ ئەو هەواڵەی پێگەیشتبێ هیچ بەهانەیەکی بەدەستەوە نابێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿وقد اعذر من انذر﴾[1] هەروەها دیاریی نەکردنی کاتی ئەو ڕۆژەیش زۆر زۆر راست و بەجێ یە، وەکو دیاریی نەکردنی کاتی مردن، تا بەندە هەمیشە ترس و بیمی هەبێ و وریا و پارێزەر بێ، بەڵام ئەگەر ئاگادار و زانا بێت بە کاتی مردن و ڕۆژی دوایی ئەو باك و سام و ترسەی نابێ پێش هاتنی یەکێ لەو دووانە، لەوانەیە لە ماوەی ژیانی دا سەر بکاتە تاوان و خراپەکاری بە ئومێدی گەڕانەوەو تۆبەکردن پێش مردن و دنیا لە دەست چوون، کەواتە زانینی کاتی مردن و دوایی هاتنی دنیا وەکو هاندان وایە لەسەر گوناهو تاوان بۆ ئەو جۆرە کەسانە، ئینجا هۆی هاتنی ڕۆژی دوایی روون ئەکاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ﴾ ڕۆژی دوایی دێت بۆ ئەمەی هەموو کەسێ لەو ڕۆژەدا پاداشت یان تۆڵە بدرێ بەهۆی چاکە و خراپەیە کە ئێستا ئەیکات. واتە هەموو کەس بە پێی کردەوەی خۆی رەفتاری لەگەڵ دا بکرێ، بەڵێ بێگومان پێویستە هاتنی ڕۆژێکی وا و نەهاتنی ئەو ڕۆژە پێچەوانەی بەزەیی و عەدالەتی خوایە، چونکە ئەگەر ئەو ڕۆژە نەبێ ئەبێ ئیمانداران و چاکان بە خۆیان و ئیمان و کردەوە چاکەکانیانەوە هەروا بڕۆن بە بێ سەر و شوێن رەنجەڕۆ و ستەم لێ کراویش بەداخەوە سەر بنێنەوە، لەم لایشەوە ئەبێ کافر و تاوان باران و دەست درێژیی کەرانیش وەکو بەرزی بانان بۆی دەرچن!! شتی وا بێگومان هیچ ژیری یەك رەوای نادات. ئینجا فەرموی بە موسا: ﴿فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾ کەواتە ئەی موسا ئەو کەسەی کە باوەڕی نی یە بە ڕۆژی دوایی و شوێنی هەواو ئارەزووی ناڕەوای خۆی کەوتووە، با ئەو کەسە تۆ بەرگری نەکات و لات نەدات لە

---

[1] ئەمە وەك پەندی پێشینان وایە، واتە هەرکەس ترسێنرا بێگومان بەهانەی بڕاوە.

باوەڕ بەو ڕۆژە و لەبیر کردنەوە و یادی ئەو ڕۆژە، واتە بە قسەی ئەو کەسە نەکەیت ﴿فَتَرْدَىٰ﴾[1] تا بەهۆی ئەوەوە بکەویتە حاڵی هیلاکی و گومڕایی و بەد بەختی. بێگومان لادان لە ڕێگای ژیریی و شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو بێ باوەڕی بە ڕۆژی دوایی فەراهەم ئەهێنێ، وەکو هەموو تاوانێ تر. ئەگەر تا هەر سروشتێ ساغ بێت هەر لە خۆیەوە باوەڕی هەیە کە لەم جیهانەدا ئادەمێتی ناگاتە پلە و رادەی هەرە بەرزی و عەدل و دادپەروەری لێرە تەواو نابێت، پێویستە هاتنی ژیان و جیهانێ تر کە ئادەمی تیای دا بگاتە دواترین پلە و رادەی خۆی. خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕەوانە نەکردووە بێ بەڵگە و نیشانەیەکی بەهێز لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەیان، بەڵکو هەموو بە بەڵگە و نیشانەیەکەوە ناردوونی کە پێی ئەوترێ موعجیزە، واتە خەڵکی پەك کەوتوو و دەستە پاچە کردووە لە بەرگری کردن و هێنانی وێنەی، ئەویش ئەوپەڕی لوتف و بەزەیی بەکار هێنانە لەگەڵ بەندەکانی دا وەکو نەهێشتن و بڕینی هەموو پەڵپ و بەهانەیەکی بێ جێ و ناڕەوای تێدایە، جا کەواتە پاش ئەوەی هەواڵی پێدا کە هەڵبژێرراوە بۆ پێغەمبەرێتی و بنەڕەت و پایەی ئاین و شەریعەتەکەی بۆ ڕوون کردەوە، پاش ئەوانە ئینجا کاتی ئەوەیە موعجیزەی بۆ دیاریی بکات، ئەوا ئەوەشمان بۆ باس ئەفەرموێ و لەو کاتەدا بوو ئەو دوو جۆرە موعجیزەی بۆ دیاریی کرد و نیشانی دا: گۆڕانی دار دەستەکەی بە مار و پەیدا بوونی ڕووناکی لە دەستی دا وەکو لەمەوپاش دێن. بێگومان حەزرەتی موسا(علیه السلام) لەو کاتەدا کە ئەو بانگەی لێ کراو ئەو هەواڵە زۆر گەورە و گرنگەی پێ درا وەزعێکی تایبەتی بەسەر هاتووە و لەوانە بووە بڵێین خۆیشی لەبیر نەمابێ، چ جای ماڵ و خێزان و ئەو مەبەستەی کە بۆی هات، بەڵکو گیان و دڵ و دەروون و ژیریی و هەموو هەست و فام و هۆشی داگیر کرابوو، هەموو شتێ خەریك بوو بەو بارو حاڵەی کە بەسەری هات و ڕووی تێکرد،

---

[1] بێگومان پێغەمبەران – درودی خوایان لێ بێت – دوورن لە گوناهو خراپەکاری چ جای کوفرو گومڕایی، کەواتە مەبەست بەم جۆرە شتانە بەردەوامی یە لەسەر چاکە و خۆپارێزیی لە خراپە، یان مەبەست تەمێ و ترساندنی خەڵکی ترە.

وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ
فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا
تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ

---

**كەواتە پێویستی هەیە بە بێدار کردنەوەو سەرنج راکێشان بۆ بیر کردنەوە و بینینی موعجیزەکەی لەبەر ئەوە بە شێوەی پرسیار پێی فەرمو: ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ ئەی موسا ئەوە چی یە کە بە دەستی راستتەوەیە؟ بێگومان خوا ئاگای لە هەموو شتە، کەواتە ئاشکرایە هەر پرسیارێ لەلایەن خواوە ئاراستە بکرێ مەبەست زانا کردنی خوا نی یە بەو شتەی پرسیاری لێ کردووە بەڵکو ئەبێ مەبەستێ تری بێت کە ئەزانرێ بە گوێرەی جێگا و شوێن، جا لێرەدا وەکو وتمان مەبەست وریا کردنەوەی موسایە و سەرنج راکێشانی لەبەر پچڕینی لەو حاڵ و بارەی کە داگیری کردبوو. هەروەها بەهۆی ئەم شێوە پرسیارەوە ئارام پەیدا بوو، سام و ترس لاچوو، ئینجا با باشتر گرنگی و گەورەیی موعجیزەکەی بۆ روون ببێتەوە بەم رەنگە بەدەمی خۆی ددان بنێ بەوەدا کە ئەوەی لە دەستی راستی دایە دار دەستە، ئینجا بەچاوی خۆی ئەیبینێ خوا ئەیکات بەو مارە زیندووە و ئینجا ئەبێتەوە بەدار دەستەکەی!! موسا(علیه السلام) وەڵامی دایەوە و چەند سوود و بەرهەمێکی باس کرد بۆ پرسیار لێ کراوەکە بەم جۆرە ﴿قَالَ﴾ فەرموی: ﴿هِىَ عَصَاىَ﴾ ئەوەی پرسیارت لێ کرد داردەستەکەمە. بەم رستەیە وەڵامەکە تەواوە بەڵام گفت و گۆ کردن لەگەڵ خوادا بەو شێوەی خوا بۆ موسای رێك خست چاکە و بەخششێکی کەس نەدیوە. رێز و نرخی هەرگیز دوایی نایەت، کەواتە هەتا ماوەکەی زۆر بێت خۆشترە لەبەر ئەوە موسا درێژەی دا بە وەڵامەکەی بەم چەند رستەی ترە:**

**١- ﴿أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا﴾ وتی: خۆمی ئەدەم بەسەردا و هێزی ئەخەمە سەر لە کاتی هەڵسان و رۆیشتن و مانوویی و وەستان بە دیاری مێگەل و ئاژەڵەکەمەوە.**

**٢- ﴿وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى﴾ بەو دار دەستە ئەدەم لە پەلی درەخت و پێی رائەوەشێنم، بۆ ئەوەی گەڵا بوەرێنم بەسەر ئاژەڵەکەم دا.**

**٣- ﴿وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ﴾ چەند پێویست و مەبەستی ترم هەیە تێیدا وەکو هەڵگرتنی توێشوو و دانی ئاو و نان، پاس کردنی خۆی لە درندە و مار و ئەو شتانەی سزا**

دەرن، هەروەها چەند پێویستی تر. ئەوەی کە موسا ئەیزانی لە دار دەستەکەیەوە ئەوانە بوون کە وەڵامی پێ دایەوە، بەڵام خوای توانا و دەسەڵات دار بەو دار دەستەی شتی وای فەراهەم هێنا کە بەدڵی موسادا گوزەری نەئەکرد، ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ خوا فەرموی بە موسا ﴿أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ﴾ ئەی موسا دار دەستەکەت فرێدە سەر زەوی، واتە تورِی دە با بیبینی ئەوەی کە ئەیبینی ﴿فَأَلْقَىٰهَا﴾ ئینجا ئەویش فرێیدا ﴿فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ﴾ لەگەڵ فرێیدا ئیتر دەست بەجێ و کتوپڕ ئەو دار دەستە مارێکە و بە چەسپانی ئەڕوات. بەڵێ ئەو موعجیزە گەورەیە بە پێش چاوی یەوە کتوپڕ رووی دا – موعجیزەی گیان بەبەردا کردنی شتی بێ گیان – وێنەی ئەوە لە هەموو کاتێك دا بە فەرمانی خوا روو ئەدات، لە هەموو کاتێك دا بە ملیۆن زەرە بێ گیانەکان ئەبن بە خەلیە و سێڵی گیاندار، زانایان ئەوە ئەزانن کەچی هیچ سەرسام نابن پێی، بەڵام باوەڕ ناکەن کە دار دەست ئەگونجێ ببێ بە مار، یان ئەگەر شتی وا ببینن بەچاوی خۆیان سەرسام ئەبن ئەوەش هۆکەی ئەوەیە کە خەڵکی بەستراوە بەوەی هەستی پێ ئەکات و بەراوردی ئەکات و دیلی ئەوەیە، کەواتە هەر شتێکی هەست کرد بە پێچەوانەی هەست و بەراوردی خۆی سەرسام ئەبێ لێ ی، کەواتە ئەبێ سەرسام ببێ لە بینینی موعجیزەی وا ئاشکرا، بەڵام ئەو موعجیزانەی کە بە پێش چاوەوە نین – هەرچەندە یەك شتە لەگەڵ ئاشکراکان دا– هیچ سەرسام نابێ لێ ی و هیچ سەری لێ ناکاتەوە. حەزرەتی موسا کە ئەوەی بینی سەرسام بوو، بە گوێرەی سروشتی ئادەمی ترسا لێ و خوایش دڵنیا و دڵ ئارامی کرد: ﴿قَالَ﴾ فەرموی پێی: ﴿خُذْهَا وَلَا تَخَفْ﴾ بەدەستت بیگرە و مەترسە لێ ی ﴿سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ﴾ چونکە دڵنیابە ئەیگێڕینەوە بۆ شێوەکەی یەکەم جاری خۆی و ئەیکەینەوە بە دار دەستەکە. موسا دڵنیا بوو و دەستی بۆ بردەوە و خوا کردی یەوە بە دار دەستە وشك و رەقە بێ گیانەکە، ئەمەیش موعجیزەیەکی تر بوو خوا پیشانی دا، ئینجا موعجیزەیە تری بۆ دیاریی کرد بەم رەنگە دەستی راستی ببا بۆ ژێر بن هەنگڵی چەپی و دەری بهێنێ سپی ئەبێ و روناکی لێ دەرئەچێ. وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ﴾ دەستی راستت ببە بۆلای تەنیشتی چەپت و بیلکێنە بە ژێر باڵتەوە و ئینجا دەری بێنە ﴿تَخْرُجْ بَيْضَآءَ﴾ دەریەت بە سپێتی،

مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخۡرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى ﴿٢٣﴾ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ
ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾

---

**﴿مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ﴾ بە بێ دەرد و بەڵەکی، ڕووناکی و شوعلە ئەداتەوە بە شەو و ڕۆژ وەکو مانگ و خۆر ﴿ءَايَةً أُخۡرَىٰ﴾ کە موعجیزەیەکی ترە جگە لە موعجیزەی دار دەستەکە. ئەوەشمان کرد ﴿لِنُرِيَكَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى﴾ بۆ ئەمەی پیشانت بدەین هەندێ لە موعجیزە و بەڵگە گەورەکانی خۆمان، خوای گەورە کە خۆی هەموو شت ئەزانێ، بە پێی چەرخ و دڵ و دەروونی خەڵکی موعجیزەی داوە بە پێغەمبەران - سەلامی خوایان لێ بێت - بۆ وێنە لە چەرخی موسادا جادووگەری باو بووە، خەڵکی لەو کاتەدا زۆر تر دڵیان بەسترا بوو بە نایابی جادووگەری یەوە، ئینجا خوای گەورە شتێکی دا بە موسا کە نرخ و ئابڕووی نەمێشت بۆ جادووگەری. لەپاش ئەمەی ئەو دوو موعجیزەیەی پیشان دا، ئینجا پێی فەرمو: ﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ﴾ بڕۆ بۆلای فیرعەون بەو دوو موعجیزەوە، بانگی بکە بۆ خواپەرستی ﴿إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ چونکە بەڕاستی فیرعەون لە کوفر و تاوان دا زیادە ڕەوی کردووە و لە سنوور دەرچووە، یاخی بووە. ئینجا بۆ موسا دەرکەوت کە کار و فرمانێکی زۆر گەورە و گرنگی پێ سپێرراوە بە تایبەتی فیرعەونی باش ئەناسی، ئاگادار بوو بەسەر زۆر و دەسەڵات و ستەمکاری فیرعەون دا، لەبەر ئەوە داوای کرد لە خوا کە کۆمەکی بکات لە بەجێ هێنانی ئەو فرمانە گەورەدا، نزای کردە لای بۆ ئەم مەبەستانەی کە بۆمان باس ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ موسا نزای کرد و وتی: ﴿رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي﴾ ئەی پەروەردگارم سنگم فراوان بکە بۆ وەرگرتن و هەڵگرتنی ئەو سروش و پەیامە و دڵتەنگیم لابە و دڵم بەهێز بکە تا بە دڵشادی هەڵسم بەم کارە گەورەیە. ﴿وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي﴾ کار و فرمانەکەم بۆ سووک و ئاسان بکە، بۆم ڕێک بخە هۆی هەڵسانم بەم کارە بە ئاسانی، هەرچەندە ئەم دوو داوایەی هەموو هۆیە ئەگرێتەوە بەڵام ئەم چەند مەبەستەی کە دێت زۆر لای گرنگ بوون لەبەر ئەوە بە تایبەتی وتی: ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةً مِّن لِّسَانِي﴾ گرێ و وەستانی زمانم بەرەڵا بکە بێ گیرو گرفت قسە بکەم ﴿يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي﴾ تا لە قسەم تێ بگەن و ئەوەی پێ یان ڕائەگەیەنم وەری گرن، چونکە ڕاگەیاندن لەلایەن قسە ڕەوانی ڕەوانبێژەوە شیرین و وەرگیراو ترە، ئەگێڕنەوە کە زمانی موسا(علیە السلام) وەستان و گیرو گرفتێکی تیا بووە وا دەرئەکەوێ مەبەستی نەمێشتنی ئەوە بووبێ.**

وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا
﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا
عَلَيۡكَ مَرَّةً أُخۡرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ فَلۡيُلۡقِهِ
ٱلۡيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأۡخُذۡهُ عَدُوّٞ لِّي وَعَدُوّٞ لَّهُۥۚ وَأَلۡقَيۡتُ عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴿٣٩﴾

---

**﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي * هَٰرُونَ أَخِي﴾ کۆمەك و پشتیوانێکم بۆ بڕیار بدە لە کەس و کاری خۆم کە هارونی برامە ﴿ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي﴾ بەهۆی ئەو کۆمەکەوە پشتم قایم بکە و هێزم بەتین بکە ﴿وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي﴾ بەشدراو و هاوبەشی بکە لە پێغەمبەرێتی یەکەم دا. هارون(علیه السلام) ڕەوان بێژ و قسە ڕەوان بوو، لەسەر خۆ و بە ئارام و نەرم و نیان بوو، موسا(علیه السلام) بەو جۆرە نەبوو لەبەر ئەوە داوای کرد لە خوا کۆمەکی بکا بەم برایە لەو کارە گەورەی کە پێی سپێررا بوو، لەو ئەرکە قورسەی خرا بووە سەر شانی، بێگومان هەڵسان بەو فرمانەیش پێویستی هەیە بە زیکر و یادی خوا بە زۆری، و ڕاگیر کردنی بە پاك و خاوێنی لەدڵ و دەروون و وتار و کرداردا، ئەمەیش بە کۆمەکی و یارمەتی باشتر پێك دێت. وەکو ئەفەرموێ: ﴿كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا * وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا﴾ هارونم بەو جۆرە بۆ لێ بکە بۆ ئەمەی بە زۆری تەسبیحی تۆ بکەین و بە زۆری زیکر و یادی تۆ بکەین ﴿إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا﴾ بەڕاستی تۆ بینای بە ئێمە و ئاگاداری بە هەموو بەسەرهاتمان و ئاگاداری بە لاوازی و کەم و کوڕیمان و ئەزانی پێویستین بە کۆمەکی و پەروەردە و چاودێریی، موسا(علیه السلام) بەو درێژیی یە پاڕە و لاڵەی خۆی کرد، خوای بەخشندە و میهرەبانیش بە سوك و ئاسان بە یەك جار هەموو داواکراوەکانی بۆ جێ بەجێ کرد و فەراهەمی هێنان، نەك بە شێوەی بەڵێن و دواخستنی، بەڵکو ﴿قَالَ﴾ فەرموی: ﴿قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ بەڕاستی داوا کراوەکەت پێ درا ئەی موسا، بێگومان موسا(علیه السلام) ڕەوانە ئەکرا بۆ سەر بەهێزترین پادشای ستەمکاری ئەو چەرخە لەسەر زەوی دا... ڕەوانە ئەکرا بۆ ئەمەی بچێتە ناو کوڕی جەنگ و ئاژاوە، بچێتە ناو گێژاوی بەربەرەکانێ، یەکەم لەگەڵ ئەو فیرعەونە ستەمکارە کە یەکەم کەس بوو لەو چەرخەدا لە زۆر و سوپا و سامان دا، ئینجا لەگەڵ گەلەکەی خۆی(بەنی ئیسرائیل) کە لە ژێر باری جەور و بەندەیی و ژێر دەستەیی دا سروشتیان بە تەواوی شێوا بوو، گۆڕا بوو، ڕام بوو بوون**

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ماوه‌یه‌كی زۆر دوور و درێژ مابوونه‌وه له‌سه‌ر شوێن كه‌وتن و سه‌ر شۆڕی و به‌ندایه‌تی و له‌سه‌ر ئه‌و باره لاره‌یه ده‌قیان پێوه گرتبوو زۆر به گران رزگار ئه‌كران و فێری ئازادی و سه‌ربه‌ستی و ئاده‌مێتی ئه‌كران، جا به‌هۆی ئه‌وه‌وه كه فه‌رمانه‌كه‌ی موسا ئه‌وه‌نده زه‌حمه‌ت بوو پێویست بوو به زیاده دڵنیا كردن و دڵنه‌وایی، له‌به‌ر ئه‌وه خوای خاوه‌ن به‌زه‌یی سه‌رنجی راكێشا بۆ ئه‌و هه‌موو چاكه‌ی كه رشتنی به‌سه‌ری دا هه‌ر له دایك بوون و شیر خواردنه‌وه هه‌تا گه‌وره بوو و پێگه‌یی و ئه‌و هه‌موو چاودێریی و ئاماده كردنه‌ی نیعمه‌ته پێش چاوی كه لێره‌دا ئه‌كرێ به حه‌وت به‌ش وه‌كو ژماره‌شی بۆ دائه‌نێین بۆ زیاده روون كردنه‌وه، ئه‌فه‌رموێ: ﴿وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَيۡكَ مَرَّةً أُخۡرَىٰٓ﴾ سوێند به‌خوا ئێمه منه‌ت و چاكه‌ی خۆمان رشت به‌سه‌رت دا له‌كاتی ترا:

١- ﴿إِذۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ﴾ له‌و كاته‌دا كه رامان گه‌یانده لای دایكت و تێمان گه‌یاند ئه‌وه‌ی كه شایانه و پێویسته راگه‌یاندن و تێگه‌یاندنی، ئه‌وه‌ی كه نازانرێ و رێی پێ نابرێ به راگه‌یاندنی ئێمه نه‌بێ، و له‌لایه‌ن ئێمه‌وه نه‌بێ. فیرعه‌ونی سته‌مكار بریاری ده‌ركردبوو به كوشتن و سه‌ر برینی رۆڵه نێرینه‌كانی به‌نی ئیسرائیلی یه‌كان، ئینجا كه خوا موسای دا غه‌میان لێ هات و نه‌یان ئه‌زانی چۆنی بشارنه‌وه، ئینجا خوایش ویستی كارێكی وا بكا موسا بپارێزێ له‌و كوشتنه و هه‌ر فیرعه‌ونی دوژمنیشی به‌خێوی بكات و پێی بگه‌یه‌نێ، له‌به‌ر ئه‌وه رایگه‌یانده لای دایكی ﴿أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ﴾ كه بیخه‌ره ناو سندوقێكه‌وه ﴿فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ﴾ ئینجا فڕێی بده ناو ده‌ریاكه‌وه – ده‌ریای نیل – ﴿فَلۡيُلۡقِهِ ٱلۡيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ﴾ ئینجا ده‌ریاكه‌ش با فڕێی بداته قه‌راخی ئاوه‌كه ﴿يَأۡخُذۡهُ عَدُوّٞ لِّي وَعَدُوّٞ لَّهُۥۚ﴾ با كه‌سێ كه دوژمنی من و دوژمنی ئه‌ویشه – واته فیرعه‌ون – وه‌ری گرێ و بیباته‌وه لای خۆی.

خوای گه‌وره به‌و جۆره رایگه‌یانده لای دایكی موسا – درودیان لێ بێ – ئیتر ئه‌و راگه‌یاندنه به خه‌و بووبێ، یان شتێك بووبێ خستبێتی یه دڵی یه‌وه كه پێی ئه‌وترێ:(إلهام و كشف) یان له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌رێ بووبێ له‌و كاته‌دا یاخود فریشته‌یه‌كی بۆ ناردبێ وه‌كو ناردی بۆلای دایكی حه‌زره‌تی عیسا – درودی خوایان له‌سه‌ر بێت – به‌هه‌ركام له‌م بارانه هه‌ڵئه‌گرێ و ئه‌گونجێ، دایكیشی ئه‌وه‌ی خوا ویستی به‌كاری هێنا و خوایش كوره‌كه‌ی به ساغ و سه‌لامه‌تی رزگار كرد و خستیه ده‌ستی فیرعه‌ونه‌وه. ئه‌گێڕنه‌وه كه رووباری گه‌وره هه‌ڵگیرا بوو له ده‌ریای نیله‌وه بۆ ناو باغه‌كانی فیرعه‌ون و ئاوی ده‌ریاكه

سندوقەکەی لادابوو بۆ ڕووبارەکە و لە ڕووبارەکەیشەوە ڕۆیشت تا گەیشتە بەردەم فیرعەون کاتێ کە دانیشتبوو لەگەڵ خێزانی دا بەسەر تەختەوە بە دەوری حەوزێکی گەورە کە لەو ڕووبارە ئاوی بۆ ئەهات، ئینجا فیرعەون فەرمانی دا سندوقەکەیان هێنا، کاتێ کە کردیانەوە تەماشای ئەکەن منداڵێکی زۆر جوان و شیرینی تێدایە، لە یەکەم جارەوە فیرعەون نیازی کرد بیکوژێ لەپاشان خێزانی پێی وت مەیکوژە ئومێدم وایە سوودمان پێ بگەیەنێ یان ئەیکەین بە ڕۆڵەی خۆمان و ئەیخەینە جێگای کوڕ، فیرعەونیش بەگوێی کرد، خوا خۆشەویستی خستە دڵی یەوە بەهۆی ئەوەوە هێشتی یەوە لای خۆی!

٢- ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي﴾ خۆشەویستی یەکی گرنگم ڕشت بەسەرت دا لە لایەن خۆمەوە، واتە خۆم خۆشم ویستی بەهۆی ئەوەوە خەڵکیش خۆشی ویستی، یان خۆشەویستم کردی لەدڵی خەڵك دا بەهۆی ئەوەوە فیرعەونیش خۆشی ویستی تا بەخێوی کردی و کردیتی بە کوڕی خۆی.

٣- ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي﴾ واتە خۆشەویستیم ڕشت بەسەرت دا بۆ ئەمەی خەڵکی سۆز و خۆشەویستی هەبێ بۆت، بۆ ئەمەی پەروەردە بکرێیت و پێ بگەیەنرێیت لەسەر چاودێریی و پارێزەری من، ئەوەی ئەم ڕستەیە ئەیگەیەنێ بە هیچ وشە و وتەیەکی تری لاسایی ناکرێتەوە، هەرچی وتراوە و بوترێ لە ڕاڤەی دا هەموو بۆ ئەمەیە مەبەستەکەی نزیك بخرێتەوە لە وەرگرتن و تێگەیشتنی ئێمەوە. ئەو کوڕە منداڵە هەرچەند خوا جێ و شوێنی چاکی بۆ سازاندبوو، بەڵام دایکی هەژاری بێ ئارامە بۆی و بە دڵە لەرزەوە ئەژی و بێگومان پەروەردە و شیر پێدانی دایکی گرنگ ترە بۆی، لەبەر ئەوە خوا کارێکی وای کرد کە بکەوێتەوە دەستی دایکی، بەم ڕەنگە وەکو لە سورەتی(القصص) دا ئەفەرموێ: خوا قەدەغەی کرد شیری کەس بخوات و مەمکی هیچ ئافرەتێکی تر وەرگرێ کە لە دەوروبەری ماڵی فیرعەون بوون، بەهۆی ئەوەوە ناچار بوون کە ئافرەتێکی بۆ بدۆزنەوە مەمکی وەرگرێ. لەوێدا خوشکی موسا هات و پێی وتن کە من ئافرەتێ شارەزام هەموو منداڵێ شیری وەرئەگرێ، ئەو ئافرەتە بۆتان بەخێو ئەکات، فیرعەون و کۆمەڵیش بێ ئاگان کە ئەو ئافرەتە دایکی یەتی، بەم ڕەنگە خوا گێڕایەوەبۆلای دایکی و بێگومان ئەودایکەوئەهلی ئەوماڵەبەدیمەن کوڕی پادشا بەخێو ئەکەن و دایەنی ئەون، کەواتە ئەبێ بین بەژێر لێشاوی ناز و نیعمەتەوە، لە ڕاستیش دا کوڕی خۆیان بەخێو ئەکەن!!! وەکو لەم فەرمودەیەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە:

إِذْ تَمْشِيٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ
وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ

---

٤- ﴿إِذْ تَمْشِيٓ أُخْتُكَ﴾ خۆشەویستیم رشت بەسەرت دا لەکاتێك دا کە خوشکەکەت هات و کەوتە شوێنت بۆ هەواڵ زانینت هەتا تۆی دەست کەوت لە ماڵی فیرعەون دا بە جۆرێ ئەگەڕان بۆ ئافرەتێ شیرت پێ بدات ﴿فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ﴾ ئەویش وتی ئایا ڕێنموونی و دەست نیشانتان بۆ بکەم بۆ سەر کەسێ کە بیگرێتە خۆی و بەخێوی بکات؟ ﴿فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾ ئینجا رۆیشت دایکتی هێنا و تۆیش شیرەکەت خوارد، بەهۆی ئەوەوە تۆمان گێڕایەوە بۆلای دایکت بۆ ئەمەی دڵخۆش ببێ و چاوی ئارام بێ و فرمێسك دانەڕێژێ و ئیتر دڵ غەمگین نەبێ.

٥- ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا﴾ پیاوێکت لە تاقمی فیرعەون کوشت بەهۆی ئەوەوە کەوتیتە غەم و مەراق لە ترسی تۆڵەی فیرعەون ﴿فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ﴾ ئینجا ئێمە رزگارمان کردی لەو غەمە کە داگیری کردبووی، بەم رەنگە گوناهەکەتمان سڕی یەوە و لێت بووردین بەهۆی تۆبە و گەڕانەوەت، لە دەست فیرعەونیش دەرمان کردی بە دەرچوون و کۆچ کردنت لە میسرەوە بۆ مەدیەن.

٦- ﴿وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا﴾ دووچاری چەند بەڵاو زەحمەتمان کردی لەو سەفەر و دەرچوونەت دا، یان بە تێکڕایی لە هەموو ژیانت دا، لە هەموویشی رزگارمان کردی. ئەو دووچار کردنە بەهرە و منەتێکە لەلایەن خواوە، چونکە بەوە ئیمانداران و خواناسان پاڵفتە ئەبن لە هەموو لەکە و کەم و کوڕی یەك کە لە ئادەمی دا هەیە، بەهۆی ئەو دووچار بوونەوە ئەجرو پاداشتیان زۆرتر ئەبێت و پایە و پلەیان لای خوا بەرز تر ئەبێتەوە، بێجگە لەوەش هەموو دووچار بوونەکانی حەزرەتی موسا رزگار کردنی بەوادا هاتووە کە نیشانەی لوتف و بەزەیی خوا بووە دەربارەی.

ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ﴿٤١﴾ اذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي ﴿٤٢﴾ اذْهَبَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾

---

٧- ﴿فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ﴾ ئینجا مایتەوە چەند ساڵێ لەناو دانیشتوانی(مەدیەن) دا. زۆربە لەسەر ئەوەن کە دە ساڵ لە ماڵی حەزرەتی شوعەیب دا خزمەتی کرد لەسەر ئەوەی کە کچێکی خۆی دایە، هەرچەند لە پێشەوە بڕیاری هەشت ساڵ بوو بە پیاوەتی خۆی کردی بە دە ساڵ ﴿ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ﴾ لەپاش ئەو دە ساڵە ئینجا هاتیت بۆ ئەم شوێنە لەسەر بڕیارێکی گرنگ، بە گوێرەی کاتێ کە دیاریم کردووە بۆ قسە لەگەڵ دا کردنت و گێڕانت بە پێغەمبەر. ئەم مانەوەی حەزرەتی موسایە لە مەدیەن دا لای حەزرەتی شوعەیب بەهرەیەك بوو لەلایەن خواوە بۆ موسا، چونکە لە هەموو بار و ڕوویەکەوە ئامادە کردن و پەروەردە کردنی تێدا بوو بۆی لەبەر ئەوە ژمارەم لەسەر دانا و کردم بە یەکێ لە بەهرەکانی خوا دەربارەی موسا(علیه السلام).

٨- ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ تۆم تایبەتی کرد و هەڵم بژاردی بۆ خۆم تاکو فروستادەیم بکەیت و پێغەمبەری لەلایەن منەوە و بانگی مەردوم بکەی بۆ ئایینی من ﴿اذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي﴾ بڕۆ خۆت و براکەت بۆ سەر خەڵکی بەو موعجیزانەی کە پێم داون ﴿وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي﴾ سستی و کەم و کوڕی بەکار نەهێنن لە زیکر و یادی من دا، دڵتان لە یادی من مەبڕن هیچ کاتێ، منتان لەبیر نەچێ لە هەر جێگا و شوێنێك دا بوون، چونکە چەکی بەکارتان ئەوەیە و پشتیوان و پاڵ پشتتان ئەوەیە کە پەنای پێ بەرن، ئاشکرایە بە تایبەتی فروستادەیی خواو پێغەمبەرێتی یەکەی بەجێ نایەت و نابرێ بەڕێوە بە بێ ئەو پەیوەندی یە بە خواوە. بێگومان یەکەم دەرکی ڕێگای حەزرەتی موسا و هارون بریتی بوو لە فیرعەون و ڕەق تر و بەتین ترین بەردێ کە پێ ی بانگەوازەکەیانی لێ هەڵکەوتبێ فیرعەون بوو لەبەر ئەوە بە تایبەتی فەرموی پێ یان: ﴿اذْهَبَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ﴾ بڕۆن بۆلای فیرعەون ﴿إِنَّهُ طَغَىٰ﴾ چونکە بەڕاستی لە سنوور دەرچووە و زیادە ڕەوی کردووە لە گوناهو تاوان دا و یاخی بووە. ئینجا ڕێنموونی یان ئەکات کە بەم شێوە بانگی بکەن بۆ ڕێگای خوا، ئەفەرموێ: ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا﴾ کەواتە قسەی لەگەڵ دا بکەن بە قسەیەکی نەرم، ڕەقی و توند و تیژی تێدا بەکار مەهێنن، چونکە ئەو جۆرە

سەرکێش و مل هوڕانە بە توند و تیژیی خراپتر ئەبن و سوورتر ئەبن لەسەر ئەو بارەی کە وان لەسەری، جەور و ستەمیان بڵێسە ئەسێنێ و ئەو کاتە ئەکەونە تۆڵە و سزادانی ئەو کەسەی ڕێنموونی یان ئەکات، کەواتە ئێوە نەرمی بەکار بێنن ﴿لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ﴾ دەست پێ بکەن بە وتو وێژ لەگەڵی دا بە ئومێد و چاوەڕوانی ئەوە، بەڵکو بیر بکاتەوە و ڕێنموونی وەرگرێ . بۆی دەرکەوێ کە ئێوە راست ئەکەن، یان هیچ نەبێ گومانی راستیتان پێ ببا و بەهۆی ئەوەوە بترسێ لە سزا و تۆڵەی خوا کە ئێوە ئەیترسێنن پێی، واتە بەو ئومێدەوە خەریك بین و هەوڵ بدەن بۆ ئەمەی بەتین و بەهێز بن، چونکە هەرکەس بە بێ ئومێدی ڕێنموونی و رابەری بکات گەم و گوڕ نابێ، خۆگر و بە ئارام نابێ لە بەجێ هێنانی فەرمانەکەی دا. بێگومان خوا زانیویەتی کە فیرعەون ئیمان ناهێنێ کەچی بەو گرنگی یەش فەرمانی دا بە بانگ کردنی بۆ ئیمان هێنان، بۆ ئەمەی بەهانەی ببڕێ و هیچ ڕێگای قسەی نەمێنێ، بۆ ئەمەی کە ئەو هەموو موعجیزە گرنگانە دەرکەون، بێجگە لەوەش بڕیاری خوا وایە کە تۆڵە و پاداشتی لەسەر کردەوەی بەندەکانی بێت، هەروەها پێویستە لەسەر رابەران هەوڵ و تێکۆشان و بەکار هێنانی ئەو شتانەی کە بە دیەمن هۆی چەسپاندنی بەرنامە و ئایینەکەی خوان، بۆ ئەمەی بە پێی توانا هەڵسن بە فرمانی خۆیان تا بگەن بە ئەجرو پاداشتی خۆیان، ئیتر بەرهەم ببێ بۆ هەوڵ و تێکۆشانەکەیان یان نەبێ، ئەوە بە دەست خوایە، تا ئێرە فەرمودەکانی خوا لەگەڵ موسادا بوو بە تەنیا و نزا و موناجاتی تەنیا موسا لەکارا بوو، ئینجا ئەوا کتوپڕ هارونیش ئەمێنێ لەگەڵ موسادا پێکەوە داوا و نزا ئەکەن و خوا فەرمودەیان لەگەڵ دا ئەکات، گومان وایە ئەمە جارێکی ترە بێجگە لە یەکەم جاری موسا بە تەنیا، چەند کات و ڕووداوی تر ئەبێ لە نێوان ئەم دوو جارەدا تێپەڕ بووبێ، بەم رەنگە پاش یەکەم جار خوا سروشی کردبێ بۆلای هارون بە هاوبەشی لەگەڵ موسادا، ئینجا لەگەڵ موسادا یەکیان گرتبێ و پێکەوە دەستیان کردبێ بە نزا و موناجات و فەرمودەیان لەگەڵ دا کرابێ، بەڵام لێرەدا قورئان ئەمانەی پێچایەوە و باسی نەکردن، چونکە باس کردنیان زیادە نرخێ نادات بە مەبەستی سەر گوزەشتەکە، جگە لەوەش ئەوەی کە نەوتراوە بە باشی وەرئەگیرێ لەوەی کە وتراوە، وێنەی ئەمە لە قورئان دا زۆرە، بە پێی ڕێزمانی زانیاری – بلاغة – پێی ئەوترێ: (ایجاز) و زۆر بەنرخە لەو زانیاری یەدا و لەلای زانایانی ئەو زانیاری یە،

قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾
فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ
وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ
فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾

---

لەبەر ئەوە ئەوانەی نەفەرمووە، لە ڕێوە فەرموی: ﴿قَالَا﴾ موسا و هارون وتیان: ﴿رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ﴾ ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە مەترسی ئەکەین کاتێ فیرعەون بانگ بکەین بۆ خوا پەرستی پەلە بکات بە سزا و تۆڵە لێمان و نەوەستێ تا بانگ کردن و ڕێنموونی یەکە دوایی پێ بێنین و موعجیزەی پیشان بدەین.. یان زۆرتر سەرکەشی بکات لە فەرمانی تۆ و زۆرتر لە سنوور دەرچێ، دەربارەی تۆ شتی خراپتر بڵێ. خوای گەورە لە وەڵامیان دا﴿قَالَ﴾ فەرموی: ﴿لَا تَخَافَآ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾ مەترسن لەوەی کە وتتان، چونکە دڵنیا بن من لەگەڵتانم بە پاراستن و یارمەتی دان، ئەوەی لە نێوانتان دا ڕوو ئەدا لە وتار و کردار ئەیبیستم و ئەیبینم. بێگومان بەم فەرمودەیە دڵ ئارام بوون و هیچ باکیان نەما، چونکە خوایان لەگەڵ بێت ئیتر ئەبێ فیرعەون چ نرخێکی هەبێ؟ لەگەڵ دڵ ئارام کردنیان ڕێنموونیشی کردن بۆ شێوەی بانگ کردنی فیرعەون و ڕێگای وت و وێژ و لێکۆڵینەوەی پیشاندان لەگەڵی: فەرموی: ﴿فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ﴾ ئینجا بچنە لای و پێی بڵێن: بێگومان ئێمە دوو نێرراو و فروستادەی خوای تۆین ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ کەواتە نەوە و بەرەی(بەنی ئیسرائیل) کە دیل و ژێر دەستەی تۆن بەرەڵایان بکە و لێ یان گەڕێ ﴿وَلَا تُعَذِّبْهُمْ﴾ سزایان مەدە بە ئەرك و بێگار و لێدان و کوشتن و بڕین، یان بەرەڵایان بکە و لێ یان گەڕێ و لەگەڵمان بیان نێرە بۆ وڵاتی شام با بگەڕێنەوە بۆ خواپەرستی خۆیان و بگەڕێنەوە بۆ خاکی پاکی خۆیان لە وڵاتی شام دا. لە یەکەم جارەوە پێ یان فەرمو: ئێمە نێرراوی خوای تۆین بۆ ئەمەی هەست بکات کە خوایەك هەیە تایبەتی نی یە بە موسا و هارونەوە، وەکو باو بوو لەو چەرخەدا باوەڕێکی پڕ و پووچ کە هەموو کەس و هەموو گەل و بەرەیەك خوایەك یان چەند خوایەکی تایبەتی هەیە، هەروەها لە هەندێ لەو چەرخانەدا باوەڕ

وابووە فیرعەونی میسر کە ئەپەرسترا لەبەر ئەوە بوو کە لە نەوەی خوا پەرستراوەکانە!!!
ئینجا لە رێوە داوای ئیمان هێنانی فیرعەونیان نەکرد، بەڵکو داوای بەرەڵا کردنی گەلە داماوەکەی خۆیانیان کرد بەرە بەرە و بە پلە سەرکەوتن لە مەبەستەکەیان دا، بێگومان داوای بەرەڵاکردنی ئەوانە سووك و ئاسانترە لە دەروونی فیرعەون دا لە داوا کردنی ئیمان هێنان و مل کەچ بوون و گۆڕینی بیر و باوەڕەکەی، بێجگە لەوەش لە دەروونەوە خواپەرست بوون و باوەڕیان بە خوا و ئایینی پێغەمبەران هەبوو، بەهۆی ئەوەوە رزگار کردنی ئەوان مەبەستێکی گرنگ تر بوو لە بانگ کردنی فیرعەون و کۆمەڵەکەی بۆ ئیمان هێنان. ئینجا فەرمویان بە فیرعەون: ﴿قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكَ﴾ ئێمە کە داوای پێغەمبەرێتی ئەکەین لە خۆمانەوە نەهاتووین و نالێین، بەڵکو لەلایەن خوای خۆتەوە بەڵگەیەکی روون و موعجیزەمان بۆ هێناوی ﴿وَالسَّلَامُ عَلَىٰ مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَىٰ﴾ سلاوی مەلائیکە لەسەر کەسێ بێ کە شوێنی رێنموونی و ئایینی خوا کەوتبێ، یان ئاسایش و رزگاری بۆ ئەو کەسەیە لە هەردوو جیهان دا. بەو رستەیە دڵنەوایی یان کرد و دڵیان راکێشا بۆ سەر رێگای خوا، وەکو بە شێوەیەکی نەرم و ناسکیش هەڕەشەیان کرد و مەترسی یان خستە بەری بەم فەرمودەیە: ﴿إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ بەڕاستی ئێمە سروشمان کراوەتە ؟ لەلایەن خواوە کە سزای هەردوو جیهان بۆ کەسێکە کە باوەڕ نەهێنێ بە ئێمە و ئەو ئایینە کە ئێمە هێناومانە، و پشتی تێ بکات و وەری نەگرێ، بەو جۆرە رێك و پێکە خوای گەورە نەخشەی بۆ کێشاون و رێبازی بۆ روون کردنەوە و ئەوانیش هاتنە لای فیرعەون و فەرمانی خوایان پێ راگەیاند ئەویش ﴿قَالَ﴾ وتی ﴿فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَىٰ﴾ دەی ئایا ئەو پەروەردگاری ئێوە کێ یە ئەی موسا؟ ئەو سەر لێ شێواوە نایەوێ دان بنێ بەوەدا کە خوای هارون و موسا خوای ئەویشە، وتی: خوای ئێوە کێ یە؟ تەنیا ناوی موسای برد، چونکە بۆی دەرکەوت کە موسا ئەسڵە و هارون شوێن کەوتووی ئەوە و وەزیری یەتی، لەبەر ئەوەیە کە وەڵامەکەشی تەنیا لەلایەن موساوە بوو وەکو ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ موسا لە وەڵام دا فەرموی: ﴿رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ پەروەردگاری ئێمە کەسێکە کە بەخشیویە بە هەموو جۆرە شتێ دروست کردنێکی تایبەتی لەسەر شێوە و باری تایبەتی خۆی کە شایانی یەتی و گونجاوە و هۆی فەراهەم هاتنی مەبەست لە دروست کردنەکەیەتی، بۆ وێنە چاوی دروست کردووە لەسەر شێوە و بارێکی تایبەتی جیاواز لە هەموو شتێ تر و رێك و گونجاوە لەگەڵ روانین و بینین دا کە فەرمانی

یەتی و بۆ ئەوە دروست کراوە و هەروەها هەموو شتێکی تر، ئینجا وەکو بەو جۆرە دروستی کردوون رێنموونیشی کردوون بۆ کارو فرمانی تایبەتی خۆیان. یان پەروەردگاری ئێمە کەسێکە کە بەخشیویەتی بە هەموو دروست کراوێکی هەر شتێ کە پێویستیان پێ ی هەیە و کار و فرمانی خۆیان پێ بەجێ ئەهێنن، بەهۆی ئەوەوە ئەژین و سوود و بەرژەوەندی خۆیانی پێ دەست ئەخەن، رێنموونیشی کردوون بۆ بەکار هێنانیان، ئەم وەڵامەی موسا(علیه السلام) بۆمان ئەگێرێتەوە زۆر زۆر رێك و راست و بەجێ یە، ئەو سیفەت و ناو نیشانەی خوا کە لێرەدا باسی کرد و پیشانی دا گەورەترین بەرهەمی خوایەتی یە، دروست کردنی هەموو دروست کراوێ لەسەر شێوە و باری تایبەتی و رێنموونی هەموو بۆ کار و فرمانی تایبەتی خۆیان، کاتێ چاوی سەر و دڵ بخرێتە کار بە پێ ی توانا بۆ سەرنج دان لەم بوونەوەرە گەورەیەدا ئەو بەرهەمە گرنگە ئەبینرێ لە هەموو دروست کراوەکانی خوادا گەورە و بچووك لە تاکە زەرەیەکەوە تا گەورەترین شت، لە تەنیا سێلێکەوە تا بەرزترین زیندوو کە ئادەمی یە، هەموو زەرەیەك لەم بوونەوەرەدا دەماری زیندوویی لێ ئەدات و هەموو سێلێکی گیانێکی تیادایە، هەموو زیندوویەکی جوڵان و بزووتنەوەی هەیە، هەموو شتێکی کارێ ئەکات و هاوکاری ئەکات لەگەڵ شتەکانی تردا... ئەمانە هەموو بە تەنیا و بە کۆیی کار و فرمان ئەکەن بە یاسایەکی تێرو تەواو کە دانراوە لە سروشتیان دا بێ وەستان و بێ بەرگری و دژێتی یەکتر لە هیچ کات دا... هەموو شتێ بە تەنیا بوونەوەرێکە و خۆی بۆخۆی عالەمێکە، زەرەکان و سێلەکان و پارچە و ئەندامەکانی و کۆئەندامەکانی ئیش و کار ئەکەن و هاوکاری یەکتر ئەکەن بە گوێرەی ئەو سروشتەی کە لەسەری دارێژراوە، لە سنووری رژێمە گشتی یەکەدا بە رێك و پێکی. هەموو شتێ بە تەنیا لەم بوونەوەرەدا چ جای هەموو بوونەوەر زانین و کۆششی ئادەمی دەستە پاچە و کول و کۆڵە لە ئاستی روون کردنەوەی هەموو سیفەت و نەخۆشی و چارەسەر و هەموو شتە تایبەتی یەکانی... پەك کەوتووە لە روون کردنەوەی رووت چ جای دروست کردنیان و رێنموونی یان بۆ کاروبارمان.. ئەوە شتێکە لە سنووری توانای ئادەمی بەدەرە. بەڕاستی وەڵامەکەی حەزرەتی موسا ئێجگار بەهێز بوو، وا دەرئەکەوێ بە تەواوی پەکی خستبێ و دەمی بەستبێ،

قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِى
جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ
شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْۗ لَا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا
وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟
أَنْعَٰمَكُمْ

---

لەبەر ئەمە لەسەری نەڕۆیشت و هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە قسەکەی گۆڕی و پرسیاری تری کرد ﴿قَالَ﴾ وتی ﴿فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ﴾ دەی کە تۆ ئەڵێیت من پێغەمبەرم هەواڵم بدەرێ ئایا حاڵ و باری گەل و تاقمە پێشووەکان چی یە لە پاش مردنیان؟ ئایا بۆ کوێ رۆیشتن؟ ئایا ئەوان کێ یان ئەپەرست؟ ئایا خۆش بەخت و کامەرانن، یان بەد بەخت و بێ بەشن؟ ﴿قَالَ﴾ موسا لە وەڵامیدا فەرمووی: ﴿عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍۖ﴾ زانینی ئەوە لای پەروەردگارمە نووسراوە لە کتێبێك دا کە ﴿لوح المحفوظ﴾ ە، واتە من بەندەیەکم وەك تۆ هەرچی خوا هەواڵم پێ نەدا و ئاگادارم نەکات پێی من نایزانم، ئەوەی تۆ پرسیاری لێ ئەکەیت نادیاریی یە و غەیبە جگە لەخوا هیچ کەس نایزانێ. ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى﴾ خوای من هیچ شتێ هەڵە ناکات و هیچی لێ ون نابێ و هیچی لەبیر ناچێ، ئینجا بە بۆنەی ئەم وەڵامەوە هەندێ لە بەرهەمی زانین و توانین بێ سنووری خوا ئەخاتە پێش چاوی فیرعەون و سەرنجی رائەکێشێ بۆ هەندێ لە بەهرە و نیعمەتە گرنگەکانی خوا بەسەر ئادەمی یەوە، بە تایبەتی باسی هەندێ لەو بەرهەم و بەهرانەی ئەکات کە لە پێش چاوی فیرعەونەوە بوو لە وڵاتی پڕ لە فەڕ و پیتی میسردا، فەرمووی: ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا﴾ پەروەردگاری ئێمە

کەسێکە کە زەوی گێڕاوە بۆ ئێوە بە جێگای ئارام و حەوانەوە بە وێنەی بێشکە بۆ منداڵ کە شوێنی ئارام و حەسانەوەیەتی، بەڵێ بەڕاستی زەوی بێشکەیە بۆ ئادەمی لە هەموو شوێن و چەرخێك دا، بێشکەیەکە وەکو بێشکەی منداڵ، هەموو ئادەمی لە راستی دا منداڵ و رۆڵەی ئەم زەوی یەیە، ئەیانگرێتە کۆشی خۆی و خۆراك و شیری خۆیان دەرخوارد ئەدات و ئەیانژیەنێ و پەروەردەیان ئەکات، ئامادە کراوە بۆیان هات و چۆ و کشتوکاڵ وهەموو هۆی ژیان، لەسەر بارو شێوەیەك دروستی کردوون شیاو و گونجاون لەگەڵ زەوی دا، شێوەی بێشکەیی و ئامادەکراوی زەوی بۆ بەرژەوەندی ئادەمی و ژیان بەسەر بردنی لە وڵاتی میسردا ئاشکرا ترە لە هەموو وڵاتێ تر، ئەو وڵاتە فەر و پیت دارە کە دەشت و سارایە و ئاو دارە و بەجۆرێکە دانیشتوانی بێ ئەرك و دامان هۆی ژیان و گوزەرانیان مسۆگەرە و بە لێشاو دەست کەوت ئەبێ، خوا بەو جۆرەی زەوی فەراهەم هێناوە بۆتان ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾ فەراهەمی هێناوە بۆتان لەو زەوی یەدا چەند رێگایەك لە نێوان چیاکان و شیو و دەشتەکان دا بۆ ئەمەی سوود و بەرهەم و پێویستی خۆتان دەست بخەن ﴿وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ هێناویەتە خوارەوە لای ئاسمانەوە ئاوێك واتە باران ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾ ئینجا بەهۆی ئەو بارانەوە رواندوومانە و دەرمان هێناوە لە زەوی چەند جۆرێ، یان چەند نێرو مێ یەك لەوەی ئەڕوێ کە جیاوازن لە تام و بۆن و رەنگ و شێوە و قەبارەدا، لەگەڵ ئەوەدا لە یەك زەوی دان، بە ئاوێ ئاو ئەدرێن! ﴿كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْ﴾ ئەو هەموو شتانەمان لە زەوی دەرهێنا لە کاتێك دا کە پێمان وتن بخۆن و ئاژەڵ و وڵاخەکانتان بلەوەڕێنن لەوەی رواندوومانە بۆتان، واتەهەندێکمان ئامادەکردووەبە خۆراك و خواردەمەنی خۆتان، هەندێکی بۆ ئاژەڵتان،

إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾
وَلَقَدۡ أَرَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئۡتَنَا لِتُخۡرِجَنَا مِنۡ أَرۡضِنَا بِسِحۡرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾

---

**ئیزنمان دان و بەرەلاّمان کردن کە بەلێشاو سەری تێکەن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ﴾ بەڕاستی لەو دروست کراوانی ئێمەدا چەند بەڵگە و نیشانەی روون هەن بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن ژیرین. بەڵێ بەڕاستی لەوانەدا نیشانەی روونی زۆر هەن لەسەر زانین و توانایی و دەسەلاّتی خوا، لەسەر رێك و پێكی و بەجێ یی هەموو کرداری. بەڕاستی هەموو ژیریی یەك ساغ و تەواو بێت و بیر بکاتەوە لەو رژێمە نایابە بێگومان ئەو بەڵگە و نیشانانە ئەبینێ، باوەڕی بەهێز ئەهێنێ بەو فەرمودەیە کە راڤەمان کرد ﴿رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ لەپاش پیشاندانی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانانە لەسەر خوایەتی خوا، ئینجا سەرنج رائەکێشێ بۆ باوەڕ بە هاتنی رۆژی دوایی و بە کورتی بەڵگەیەکی بەهێز ئەگەیەنێ کە ئەم هەموو خێرو بێری ئاسمان و زەوی یە کە باس کران مەبەستی راستەقینە نین و پشت بەمانە نابەستریَ، بەڵکو پێویستە بکریَ بە هۆی گەیشتن بە خۆشی و ناز و رێزی رۆژی دوایی، ئەفەرموێ: ﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ﴾ لە زەوی ئێوەمان دروست کردووە. بێگومان هەموو لەشی ئادەمی لەزەوی فەراهەم هاتووە، لەو خۆراکە ئەخوات کە لە زەوی دەرئەچێت، لە ئاوەکەی زەوی ئەخواتەوە و هەواکەی ئەو هەڵئەمژێ و زەوی بێشکەیەتی و تیای دا پەروەردە ئەبێت ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ﴾ دووبارەتان ئەکەینەوە بۆ ناو زەوی لەپاش مردنتان تا ئەبنەوە بە خاك وەکو لە یەکەم جار پێش دروست کردنتان. ﴿وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ﴾ پاش مردن و بوون بەخاك جارێکی تر لە زەوی دەرتان ئەهێنین، ئەوەش بە پێکەوە نانی هەموو پارچە و کەرەسەکانی لەشتان لەسەر شێوەی خۆتان، ئینجا گیانتان ئەکەینەوە بەبەردا وەکو پێش مردنتان، بەڕاستی تەنیا ئەم ئایەتە کورتە بەسە بۆ باوەڕهێنان بە راستی و گونجاوی هاتنی رۆژی دوایی، هەرکەسێ ژیریی ساغ و تەواو بێت هیچی تری ناویَ، چونکە ئەمە سێ رستەیە یەکەم و دووەمی بە پێش چاوەوە و هیچ کەس نی یە باوەڕی پێ ی نەبێ، کاتێ باوەڕی ببێ بەمەی خاك ئەبێ بە ئادەمی و ئادەمی دووبارە ئەبێتەوە بە خاك، کاتێ ئەم دوو باوەڕە هەبوو، ئایا چۆن سەر ئەکرێتەوە لە راستی و گونجاوی زیندوو بوونەوە و دووبارە بوونەوەی خاك بە ئادەمی؟!! ئاراستە کردنی ئەم فەرمودەیە بۆ فیرعەون و بیرخستنەوەی**

ئەوە کە لە زەوی دروست کراوە ئێجگار رێك و بەجێ یە بۆ سەر شۆڕ کردن و دانەواندنی ئەو لوتە بەرزەی کە بە نەفامی کردی بە کەڵە شاخ و داوای خوایەتی ئەکرد، هەروەها هەر کەسێکی تر کە خۆی بە زل و گەورە ئەزانێ و رێبازە نەفامی یەکەی فیرعەون ئەداتە بەر ئەم ئایەتە ئەدا بە تەوقی سەری دا و سەری شۆڕ ئەکات.

پاش باسی فیرعەون و وتو ویژ و لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ﴾ سوێند بەخوا هەموو جۆرە بەڵگە و نیشانە روونەکانی خۆمان پیشانی فیرعەون دا و ئاشنامان کرد پێ یان، بەڵگە و نیشانە لەسەر خوایەتیمان بە تاك و تەنیا، وەکو ئەو هەموو بەڵگە بوونەوەری یانەی کە باس کران لەو فەرمودانەی کە لە وەڵام دا ئاراستەی فیرعەون کران، هەروەها بەڵگە و نیشانە لەسەر پێغەمبەرێتی موسا کە بریتی بوو لە یەکەم جارەوە لە موعجیزەی دار دەستەکە و دەستە سپی یەکەی کە باس کران، ئەوانەمان هەموو پیشان داو پێمان ناسی کەچی پاش ئەوە فیرعەون هەر باوەڕی نەمێنا و بە توندی مل پێچی کرد. ئینجا بە درێژیی باسی باوەڕ نەمێنان و مل پێچی یەکەی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ فیرعەون وتی ئایا تۆ هاتی بۆلامان بۆ ئەمەی بە جادو بازی خۆت دەرمان بکەیت لە خاك و وڵاتەکەمان؟ بێگومان بەڵگەکانی موسا(علیه السلام) زۆر بەهێزبوون و موعجیزەکانی ئێجگار روون و ئاشکرا بوون لەبەر ئەوە فیرعەون بەر بەرەکانێ‌ی پێ نەکراو ویستی بەرگری بکات لە دووبارەوە:

١- بە پڕو پاگەندە خەشم و کینەی خەڵکی لێ هەڵسێنێ بەمەی کە نیازی خراپی هەیە، ئەیەوێ فیرعەون و گەلەکەی لە وڵاتی خۆیان دەرکات و وڵاتەکەیان داگیر بکات و ئەیەوێ خۆی ببێ بە پادشا، نیازی چاکەی نی یە، نیازی تەنها رزگار کردنی بەنی ئیسرائیلی یەکان نی یە، ئەوەش بە گوێرەی باوی ستەم کاران لە هەموو چەرخ و وڵاتێك دا کە بەو تەرزە پڕو پاگەندە ئەکەن لەو کەسانەی کە بەڕاستی بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ کۆبوونەوە لە ژێر ئاڵای خوادا، خەڵکی وا تێ ئەگەیەنن کە ئەوانە راست ناکەن و مەبەستی تایبەتی خۆیانیان هەیە!

٢- بە سیحر باز و جادوگەری پیشان بدات بۆ ئەمەی خەڵکی بە پێغەمبەری تەماشا نەکەن و با موعجیزەکانی بە سیحر و جادو دابنێن بەو بۆنەوە کە سیحر بازی و جادوگەری لەو چەرخەدا لە وڵاتی میسردا باو بووە، کەواتە ئاسانە بەرپەرچ دانەوەی موسا،

فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾
قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾
قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾
فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ
أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾

---

**وەکو وتی: ﴿فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ﴾ کەواتە سوێند بە گەورەیی خۆم ئێمەیش سیحر و جادویەکت بۆ بەکار ئەهێنین وێنەی جادووەکەی خۆت: ﴿فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ﴾ کەواتە کاتێ دیاریی بکە لە نێوان ئێمە و خۆت دا کۆ ببینەوە تیای دا، بۆ ئەو بەربەرەکانێیە و ملاملانێیە، کە نە ئێمە و نە تۆ لەو کاتە لا نەدەین، ﴿مَكَانًا سُوًى﴾ واتە بەڵێنی شوێنێکی سارایی و تەخت بدە بۆ ئەو کۆبوونەوە بۆ ئەمەی هەموو چاویان تێوە بێت، فیرعەون بە شێوەی هێز و دڵنیایی یەوە ئەو قسانەی ئەکرد، خۆی وا پیشان ئەدات کە پشت ئەستوورە لە سەرکەوتن و زاڵ بوون و بێ ئاگا بوو لەوە کە دووچاری شەرمەزاریی ئەبن لەو رۆژەدا، بەڵام حەزرەتی موسا(علیه السلام) بەڕاستی دڵنیا و پشت پڕ بوو بەخوای لەبەر ئەوە بێ باکانە بەر بەری دایەوە و ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ﴾ کاتی بەڵێن پێ دراوتان رۆژی ئارایشت کردن و خۆ رازاندنەوەتانە، واتە رۆژی جەژنێکی بەناوبانگیان کە لە هەموو لایەکەوە خەڵکی بۆ ئەهات و لە شوێنێکی دیاریی کراودا کۆ ئەبوونەوە ﴿وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى﴾ کاتی کۆکردنەوەی خەڵکی لە چێشتەنگاودا، دیارە دیاریی کردنی ئەو رۆژە و ئەو کاتە لە هەموو رۆژەکانی تر رێك ترە بۆ نەهێشتنی هیچ بڕ و بەهانەیەك. لە شوێنێ تر بە درێژیی ئەیگێڕێتەوە کە فیرعەون چی وت و چی بڕیاردا؟ چۆن سیحر بازەکانی کۆکردەوە؟ چی پێ گوتن؟ چۆن هانی دان؟ بەڵێنی چی پێدان؟ بەڵام بە گوێرەی مەبەستی شوێنەکە لێرەدا ئەوانەی نەفەرمو، بەڵکو بە کورتی فەرمووی: ﴿فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ﴾ ئینجا فیرعەون لە شوێنی خۆی هەڵسا و یان خۆی بە خودی خۆی هەڵسا بە فەراهەم هێنانی کارەکە، جادووگەرەکانی خۆی کۆکردەوە کە ئەیویست فرو فێڵێکیان پێ فەراهەم بێنێ بۆ**

بەرگری موسا و هاروون – درودی خوایان لەسەر بێت – ئینجا هات بەدەم وادەکەوە بۆ ئەو شوێنەی دیاریی کرابوو، هات بەخۆی و گەل و کۆمەڵ و سوپایەوە لەسەر تەختی پاشایی خۆی دانیشت و بە دەوری دا پیاو ماقوڵەکانی و خەڵکی تریش ریزیان بەست بەلای راست و بەلای چەپی دا، هەموو جادوگەرەکانیشی بەریز لەبەر دەستی دا وەستان، موسایش بە خۆی و دار دەستەکەی و هاروونی برایەوە هاتن – سەلامی خوایان لێ بێت – ئینجا بە گوێرەی رەوشتی پاکی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موسا ویستی لە پێشەوە ئامۆژگاری یەکی جادووگەرەکان بکات، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ﴾ موسا فەرمووی پێ یان: ﴿وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ خوا بتانگرێ و هاوار بۆتان هیچ شتێکی درۆ هەڵمەبەستن بۆ خوا و مەیسەپێنن بەسەر خوادا، بەم رەنگە ئەو موعجیزانەی کە داوێتی بە من، ئێوە بە سیحر و جادوی دابنێن ﴿فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە بە سزایەك بەربادتان بکات و لە ریشەتان بێنێ، ﴿وَقَدْ خَابَ مَنِ افْتَرَىٰ﴾ بەراستی هەرکەس درۆ هەڵبەستێ بۆ خوا زیان دار و رەجەڕۆ بووە، نەگەیشتووە بە ئامانج و مەبەستی خۆی، کەواتە لامەدەن لە رێگای راست، خۆتان دووروخەن لەو کردەوە خراپە، با وێنەی دەلەسە و پروپاگەندە چی یەکانی لەمە و پێشتان بەسەر نەیەت، بێگومان وشەی راست ئەچێتە دڵەوە، ئەدات لە هەندێ دڵ، وا دەرئەکەوێ فەرمودەکەی موسا کاری کردبێ لە دڵی هەندێ لە جادوگەرەکان، بەهۆی ئەوەوە دوو دڵ بووبن لەو بەر بەرەکانێ و ئەوانەی کە سوور بوون لەسەر کردەوەی خۆیان بە چپە لەگەڵ ئەوانی تر کۆڵیبنەوە و هانیان دابن بە نهێنی بۆ ئەمەی موسا قسە و باسەکەیان نەبینێ وەکو لەم فەرمودەیەوە دەرئەکەوێ: ﴿فَتَنَازَعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَىٰ﴾ بەهۆی ئامۆژگاری یەکەی موساوە جادوگەرەکان نیزاع و ئاژاوەیان کرد لە نێوان خۆیان دا لەبارەی کارەکەی خۆیانەوە ئەوەی بە چپە ئەیانوت زۆر نهێنی یان کرد تا موسا و هارون نەیبیستن ﴿قَالُوا﴾ ئەوانەیان کە سوور بوون لەسەر بەربەرەکانێ ئەیانوت بەوانەیان کە دوو دڵ بوون: ﴿إِنْ هَٰذَانِ لَسَاحِرَانِ﴾ بەراستی ئەم دووانە جادووگەرن، ﴿يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا﴾ ئەیانەوێ دەرتان پەرێنن لە خاك و وڵاتەکەتان و داگیری بکەن بۆ خۆیان بە جادووەکەیان ﴿وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ الْمُثْلَىٰ﴾ ئایین و مەزهەبەکەتان لابەرن کە چاکترینی هەموو ئایین و مەزهەبێکە، ئایین و مەزهەبی خۆیان بچەسپێنن لە جێگای دا یا حوکمرانی و کاربەدەستی و سەرۆکایەتی یەکەتان ناهێڵن و داگیری بکەن بۆ خۆیان،

فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ ﴿٦٤﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن
نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ ﴿٦٦﴾
فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا
صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا

---

**﴿فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ﴾ ماتوڵ ئەم دووانە ئاوا نیازیان خراپە دەی ئێوەیش هەمووتان پێکەوە بە یەك جار بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی لە دەستتان یەت بۆ بەرگری کردنی ئەم دووانە ﴿ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ﴾ ئینجا هەموو وەرنە پێشەوە ریز ببەستن ﴿وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ﴾ بێگومان ئەمڕۆ کەسێ رزگار و گەیشتووە بە مەبەست و ئامانج کە سەرکەوێ و زاڵ ببێ لەم بەر بەرەکانێدا.**

**جا وەرە تەماشا کە سام و هەیبەتی ئیمان و خواناسی و خواناسان لە چ رادەیەك دایە؟ فیرعەونی بەناوبانگ بە خۆی و گەل و سوپا و هەموو جادوگەرانی یەوە بەو بەگیر هاتبوون بە دەستی تەنها دوو کەسی هەژاری بێ دەسەڵات، کە لە تیرە و کۆمەڵێکیش بوون چەنای چەند ساڵ بوو بەندەیەکی سەرشۆڕی مل کەچ بوون بۆ فیرعەون و گەلەکەی بە جۆرێ خاوەنی ماڵ و سەر و گیان و رۆڵەیان نەبوون، کەواتە ئەوەی فامدار بێ ئەبێ تەنها لەگەڵ خوا بێت و پشت هەر بەو ببەستێ. جادوگەرەکان بەو زۆری یە هاتنە پێشەوە بۆ بەرگری ئەو دوو کەسە ئینجا ﴿قَالُواْ﴾ وتیان بە موسا(علیه السلام) ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ﴾ ئەی موسا یان تۆ لە پێشەوە دار دەستەکەت فڕێدە و کردەوەی خۆت پیشان بدە، یان ئێمە یەکەم کەس ئەبین کە شتی خۆی فڕێدا و کردەوەی خۆی لە پێشەوە ئەکات، واتە بە ئارەزووی خۆت یەکێ لەم دوو بارە هەڵبژێرە، ئەم شێوەی بەکاریان هێنا وا پیشان ئەدات کە دڵنیا و پشت پڕن بە کاری خۆیان، هەروەها ئەیانەوێ ئینساف بەکار بێنن و بەڕاستی**

بجولێنەوە، تەحەددا و بەر لێ برینەوەیشی تێدایە، ئەوان ئەوەیان وت و خوایش خستی یە دڵی موسا کە باری دووەم هەڵبژێری و بێگومان ئەم بارە چاك بوو، چونکە بێ باکی موسا پیشان ئەدات دەربارەی هەر کردەوەیەك ئەوان ئەیکەن، بۆ ئەمەی ئەوان چی لە دەستیان دێت بەکاری بێنن و بیخەنە پێش چاوی خەڵکی، ئینجا با موعجیزەی موسا بێت و کردەوەکەی ئەوان لە ریشە بێنێ و دروشم و شوێنەواریشی نەمێڵێ، چونکە بەم جۆرە روون و ئاشکرا تر ئەبێ سەرکەوتنی موسا، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ موسا فەرموی: ﴿بَلْ أَلْقُوا۟﴾ نەخێر ئێوە لە پێشەوە شتی خۆتان فڕێدەن، ئەوانیش فڕێ یان دا، ئەو فێڵ و جادووەی کە کردیان و بە دیمەن شتێکی زۆر گەورە بوو بریتی بوو لەوە گوریس و دار دەستێکی زۆریان ئامادە کردبوو و بە جیوە یان بە شتی تری وێنەی جیوە هەنی بوویان، کاتێ کە فڕێ یان داو گەرمی خۆریان لێ کەوت بەیەك جار لە پێش چاوی هەمووی کەوتە شڵەژان، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ﴾ لەگەڵ فڕێیاندان ئیتر دەست بەجێ بەهۆی جادووەکەیانەوە وا خرایە خەیاڵی موسا و وا کەوتە پێش چاوی کە ئەو گوریس و دار دەستانە ئەجوڵێن و ئەگەڕێن، ﴿فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ﴾ بەهۆی ئەوە موسا لە دەروونی خۆی دا هەستی کرد بە مەترسی یەك بەڵام دەری نەبڕی، ئەو مەترسی یەش شتێکە بەگوێرەی سروشتی ئادەمی لەکاتی روودان و بینینی شتی زۆر گەورە و گرنگ دا روو ئەدا و ئەو جۆرە خەتەرانە لەکاتی وادا هیچ جێگای سەرسوڕمان نی یە با لە کەسێکی وەك موسایشەوە بێت(علیه السلام) بێجگە لەوەش لە بێ باکی خوا ترساوە ئەگەر یارمەتی نەدایە چی ئەکرد؟ ئینجا خوا دڵی بەهێز کرد بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿قُلْنَا لَا تَخَفْ﴾ سروشمان کردە لای موسا و پێمان وت: مەترسی مەکە لەوەی خەتەرەت لێ کرد، دڵ ئارام و دڵنیا بە: ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ چونکە بەڕاستی تەنها تۆ بەرز و سەرکەوتوو و زاڵیت ﴿وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟﴾

با مەترسیت نەمێنێ و ئەوەی وا لە دەستی راستت دا فڕێیدە هەرچی ئەوان کردوویانە قووتی ئەدات و هەڵی ئەلوشێ ﴿إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ﴾ چونکە ئەوەی ئەوان کردوویانە هەر فڕو فێڵی جادوبازە، ﴿وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ﴾ جادو باز ناگات بە ئامانج لەهەر کوێ بووبێ و لە هەر جێگایەکەوە هاتبێ، چونکە شتی راستی پێ نی یە و بنەڕەتی لەسەر فڕو فێڵە، حەزرەتی موسا بە گوێرەی فەرمانی خوا دار دەستەکەی فڕێدا و بوو بە ئەژدیهایەکی ناهەموار و ئەو هەموو دار دەست و گوریس و فڕو فێڵەی ئەوانی خوارد و هەڵی لوشین بە پێش چاوی ئەو هەموو خەڵکەوە لەو رۆژە رووناکەدا، دەرکەوت کە ئەوەی موسا کردی جادو نەبوو، بەڵکو موعجیزەیە بوو لەلایەن خواوە دەرکەوت کە موسا پێغەمبەری خوایە ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّدًا﴾ بەهۆی ئەوەوە جادوگەرەکان خران بە روودا بە سوژدە بردنەوە بۆ خوا، واتە شتەکە ئەوەندە روون و گرنگ و گەورە بوو ناچاری کردن و خۆیان پێ نەگیرا کەوتن بە روودا لەبەر گەڕانەوە و تۆبە کردن بۆ لای خوا، لەسەر ئەو بەربەرەکانێ و کردەوەی خۆیانە، لەبەر گەورەیی ئەو موعجیزە کەس نەدیوە!! ئەگێڕنەوە کە سەرۆکەکەیان وتی: ئێمە لەمەوپێش جادوبازیمان ئەکرد و سەر ئەکەوتین بەسەر خەڵك دا بە جادو کردن، لەپاش لێ بوونەوە کەرەسە و شتەکانمان ئەمایەوە، دەی ئەگەر ئەوەی موسا کردی جادووە شتەکانی ئێمە چی بەسەرهات؟! پاك و بێگەردی بۆ خوا، ئەوانە گوریس و دار دەستیان فڕێدا و بەکارهێنا بۆ بەرگری موسا لەبەر ئەوەی کافر و بێ باوەڕ بوون کەچی ئەوەندەی پێ نەچوو، سەریان داخست بۆ سوژدە و سوپاس بۆ خوا. ئەوانە سەر لە بەیانی کافرو جادوباز بوون، کەچی بۆ ئێوار بوون بە شەهید لە رێگای خوادا، چونکە ئەڵێن فیرعەون کوشتنی! – خوا لێ یان رازی بێت –. ئەوخوابۆکردووانەسوژدەیان برد بۆ خوا و گەڕانەوە لە کوفر و بێ باوەڕی،

قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾

---

به بێ پێچ و پەنا باوەڕی خۆیان دەربڕی بەم ڕەنگە ﴿قَالُوٓاْ﴾ وتیان: ﴿ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ﴾ ئەوا باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری هارون و موسا، ئەوان ڕووناکی ئیمان دڵی پاك کردنەوە لە چڵك و چەپەڵی و تاریکی کوفر، بەڵام فیرعەونی ستەمکاری بەد بەخت لەباتی ئەوەی شەرم بیگرێ لەمەی خوا بێ ئابڕووی کرد لە پێش چاوی ئەو هەموو، کەواتە هیچ نەبێ بە بێ دەنگ بۆ خۆی دانیشێ، کەچی بێ شەرمی یەکەی بەتین تر بوو، کەوتە پڕو پاگەندە و هەڕەشە و تا پاڵ لەو ئیماندارانە و ﴿قَالَ﴾ وتی پێ یان: ﴿ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ ئایا ئێوە باوەڕتان هێناو مل کەچ بوون بۆ موسا پێش ئەوەی من رام لێ بێ و ئیزنتان بدەم؟ ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ﴾ بێگومان موسا مامۆستا و گەورەتانە لە جادوبازی دا و لێزانترینتانە، ئەو فێری جادوبازی کردوون و ئێوە قوتابی ئەون، واتە ئێوە دوو تاوانی گەورەتان کردووە:

١- بێ بیر کردنەوە و بێ سەر لێ کردنەوە و بە بێ ئەمەی من رام لێ بێ ئێوە باوەڕتان هێنا.

٢- ئێوە قوتابی موسان، ئەو مامۆستاتانە و لە نێوان خۆتان دا یەك کەوتوون لەسەر ئەوەی خۆتان پەك کەوتوو و دەستە پاچە بکەن بە فێڵ بۆ ئەمەی قسە و داوای موسا سەرکەوێ. ﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ﴾ ماتوڵ واتان کرد ئەوا ئەوە سوێندم بێت کە هەر یەکە دەست و قاچێکی ئەبڕم بە جیاوازی یەکتر، واتە هەر یەکە ڕاست و چەپێکتان ئەبڕم! دیارە ئەو شێوە پیس ترین شێوەیە، لەبەر ئەوە ئەو ستەمکارە هەڵیبژارد ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ﴾ هەڵتان ئەواسم بەسەر قەدی دار خورمادا، ئەوەش بۆ زیادە سزادانیان ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ﴾ بێگومان ئەبێ بزانن من و موسا

کاممان سزای بەتین تر و بەردەوام ترە، واتە کارێکی واتان بەسەر ئەهێنم تا تێ بگەن کە سزای من بەتین تر و نەبڕاوە ترە، بێگومان موسا(علیه السلام) بۆ سزادان نەهاتووە و سزای کەسی نەداوە، کەواتە یان مەبەستی لاقرتی کردن بووە بە موسا یان لای وا بووە باوەڕ هێنانیان لە ترسی دار دەستەکەی بووە کە بوو بەو ئەژدیها ناهەموارە، یان لای وابووە کە لە سزای خوای موسا ترساون، سزای خوایش نی یە بە پێش چاویانەوە و ئەم خۆی بە خاوەن سزا ئەزانێت، کەواتە با ئەو سزا بەتینەیان بدات تا تێ بگەن کە سزای ئەم بەتین ترە، ئەو هەڕەشەی کردی ئەگەر بەدی نەهێنابێ ئەوا هیچ قسە و پرسیارێك نی یە لێرەدا، ئەگەر بەدی هێنابێ وەکو هەندێ ئەڵێن: ئەو کاتە پرسیارێك ئەکرێ و پێویستە وەڵام دانەوەی، پرسیارەکە ئەمەیە: خوا بەڵێنی دا بە موسا(علیه السلام) کە خۆی و شوێن کەوتووەکانی زاڵ ئەبن، دەی ئەو بەڵێنە چۆن یەك ئەکەوێت لەگەڵ کوشتن و بڕینی ئەو کۆمەڵە ئیماندارەدا؟ وەڵامی ئەو پرسیارە ئەمەیە:

أ- مەبەست سەرکەوتن و زاڵ بوونیان لەبابەت بەڵگە و موعجیزەوە، خۆ ئاشکرایە لەم رووەوە سەرکەوتن و زاڵ بوون، ئەوەتا فیرعەون وەکو هەموو ستەمکارێك هیچی بۆ نەمایەوە جگە لە پڕو پاگەندە و چاو و راو لە خەڵکی و بەکار هێنانی سزا و چەکی ئاگرو ئاسن دەربارەی ئیماندار و خواناسان.

ب- مەبەست سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئایینەکەیانە، دەی خۆ دیارە ئایینەکەیان بە تەواوی سەرکەوت و ئایینی دوژمن لە ریشە هات.

ج- مەبەست زاڵ بوون و سەرکەوتنی کۆمەڵ و تیرەی شوێن کەوتووەکانە، نەك هەموو یەکە یەکەك، ئاشکرایە کە کۆمەڵی موسا سەرکەوت و کۆمەڵی فیرعەون بەرباد بوون، ئیتر با چەند کەسێ لە شوێن کەوتووی موسای تێدا چووبێت، وەکو لەناو هەموو ئوممەتەکان دا چەند کەسێ تیا چوون و پاشە رۆژی زاڵ بوون و سەرکەوتن بۆ گەلی موسڵمان بوو لەپاش دا.

قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾

---

د- **زاڵ بوونی راستەقینەی ئیمانداران ئەمەیە: کە ئەو ئیماندارانە لەسەر رێگای راستی خۆیان دامەزراو بن و هیچ هێزێك نەتوانێ ئیمانەکەیان لێ بستێنێ، بێگومان لەم بارەیشەوە سەرکەوتن و زاڵ بوون هەر بۆ موسا و کۆمەڵەکەی بوو، ئەو کۆمەڵە بەختیارە لە پێشەوە کە سەری بەندەیی یان بەستبوو بۆ فیرعەون و نزیك کەوتنەوە لە فیرعەون بە گەورەترین ئامانجیان دائەنا، کەچی ئیمانی راستەقینە وەری گێڕان لەو بارە بە جۆرێ هیچ نرخێکی بۆ فیرعەون نەمێشتەوە لەدڵ و دەروونیان دا، تەنانەت بەرامبەر بەو هەڕەشە سامناکەی فیرعەونەوە ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان: ﴿لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا﴾ هەرگیز ئێمە تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو موعجیزانەی کە هاتووە بۆمان لەلایەن خواوە لەسەر دەستی موسادا، تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو کەسەی کە ئێمەی لە نەبوون دروست کردووە، واتە ئەوەی بۆمان هاتووە بەڕێز و بە نرخە و خوا گەورەتر و بڵند ترە، کەواتە پەشیمان نابینەوە لە ئایین و باوەڕی خۆمان و گوێمان لە هەڕەشەکەت و بیممان لە ترساندنەکەت نی یە، ﴿فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ﴾ کەواتە چی ئەکەیت بیکە و ئەوەی ئەتەوێ بڕیاری بدەیت بڕیاری بدە و بەدی بێنە.**

**﴿إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ﴾ چونکە ئەوەی تۆ ئارەزووی ئەکەیت بیکەیت و ئەوەی ئەتەوێ بڕیاری بدەیت تەنها لەم ژیانی ئێستادایە، بەس و ئەم ژیانەش شتێکی کەمی بڕاوەیە، ﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا﴾ بەڕاستی ئێمە باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری خۆمان بۆ ئەمەی ببورێ و بسڕێتەوە لێمان هەموو کوفرو گوناهو تاوانمان ﴿وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ﴾ بە تایبەتی بسڕێتەوە لێمان گوناهو تاوانی ئەو سیحر و جادووەی کە زۆرت لێ کردین و بە زۆری تۆ بەکارمان هێنا دژی موسا و بۆ بەرگری موسا ﴿وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾ ئەجرو پاداشتی خوا باشترە بۆ ئێمە و بەردەوام ترە یان پاداشتی چاکترە و تۆڵەی هەمیشەیی و نەبڕاوە ترە، کەواتە گوێ رایەڵ و مل کەچین بۆ خوای خۆمان و باکمان نی یە لە هەڕەشەی تۆ، ئینجا خوا نایە دڵیان کە بە کورتی پاشەڕۆژی تاوانباران و چاکان روون بکەنەوە بە شێوەی ئامۆژگاری ئاراستەی فیرعەونی بکەن،**

إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ
﴿٧٦﴾ وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا

---

**وتیان:** ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا﴾ بەڕاستی کاروبار ئەمەیە: هەرکەس بە تاوانباری بڕواتە حوزووری پەروەردگاری خۆی، واتە بە کافری بمرێ، ﴿فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾ ئەوە بێگومان بۆ ئەو کەسە دۆزەخ هەیە و نیشتەجێ ئەبێت تیایدا بێ بڕانەوە ﴿لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾ لەو دۆزەخەدا نامرێ تا ڕزگاری ببێ لە سزا و سووتان و ناژی بە ژیانێک کە سوودێکی هەبێ، بەڵکو بەد بەختی هەر ئەمێنێ بەشی ئەوە هەر سزا بچەژێ. ﴿وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا﴾ هەرکەسێک بە باوەڕ و ئیمانداری بڕواتە حوزووری خوای خۆی ﴿قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ لەکاتێک دا کردەوە چاکەکانی کردبێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ﴾ ئەوە بۆ ئەو کەسانە هەیە ڕاوە و پلە و جێ و شوێنێک کە بەرز و بڵندن و ﴿جَنَّٰتُ عَدْنٍ﴾ ئەو جێ و شوێنە بەرزانەش بریتین لە بەهەشتانێ کە ئامادە کراون بۆ مانەوە و نیشتەجێی ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ئەو بەهەشتانە بە جۆرێکن کە ڕووبارەکان هاتوچۆ ئەکەن و دێن و ئەڕۆن لە ژێر کۆشکەکانیان دا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بەهەشتی یەکانیش نیشتەجێ ئەبن تیایان دا بێ بڕانەوە هەتا هەتایە ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ﴾[1] ئەوەیە پاداشتی کەسێک کە خۆی پاک و خاوێن بکات لە کوفرو گوناهو تاوان، لێرەدا کۆتایی هێنا بە زنجیرەیەک لە بەسەرهاتی موسا(علیه السلام) و لەم زنجیرەیەدا ڕوونی کردەوە سەرکەوتن و زاڵ بوونی ئایینی ڕاست و عەقیدەی پاک و خاوێن بەسەر ئایینی ناڕاست و باوەڕی پڕوپووچ دا بەڵام سەرکەوتنەکە تەنها لە دڵ و دەروون دا، ئینجا ئەوا دەست ئەکات بە زنجیرەیەکی تر کە سەرکەوتن پیشان ئەدات لە واقیع و ڕووداوی ژیان و جیهان دا و بێگومان سەرکەوتنی دووەم بەستراوە بە سەرکەوتنی یەکەمەوە تا یەکەم بە تێرو تەواوی بەدی نەیەت، دووەم بەدی نایەت، هەڵگرانی بیرو باوەڕی ڕاست و خاوەنی ئایینی ڕاست کاتێ سەرئەکەون بە ئاشکرا و بە دیمەنیش لە ژیان و جیهان دا کە لە پێشەوە لە دەروون دا

---

[1] ئەم وتارە لە پێشەوە وتمان هیتی ئیماندارەکان بووە، هەڵئەگرێ لە ڕێوە فەرمودەی خوا بێت بە تەعلیق لەسەر قسەکەی ئەوان.

سەرکەوتبن، بێگومان عەقیدە و باوەڕی راست هەر کاتێ لەسەر شێوە و بارە راستەقینەکەی دامەزراو جێگیر بوو لە هەست و دەروون دا خۆی پێ ناگیرێ و ئەکەوێتە کار و جوڵان، کارێکی وا ئەکات ئاشکرا ببێ و دەرکەوێ بۆ خەڵکی و خاوەن و هەڵگرەکانی جوێ ئەکاتەوە و ئەیانخاتە جەنگ و ئاژاوە و بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەوانەی دژ و دوژمنن، جا لەو کاتەدا خوا یارمەتی ئەدات دژ و دوژمنیان سەر شۆڕ و مل کەچ و ژێر دەست ئەکات هەرچەندە بە دیمەن هێزو چەکی گەورە بەدەستیانەوە بێت، خاوەن باوەڕو ئایینی راست بێ هێز و لاواز و بێ دەسەڵات بن، بەڵام ئەگەر عەقیدە و باوەڕی راست بەو جۆرە لە پێشەوە لە دەروون دا جێگیر و دامەزراو و سەرکەوتوو نەبێ، ئەو کاتە بێگومان دەرناکەوێ بۆ خەڵکی و شاراوە ئەبێ و جووڵانەوەی نابێ و خاوەنەکەی ناخاتە ئیش و کار و جوێی ناکاتەوە و نایخاتە جەنگ و ئاژاوە و بەربەرەکانێ و ئەگەر کەوتە جەنگ و ئاژاوەش زۆر تر دوژمن و دژیان زاڵ ئەبن و سەر ئەکەون، چونکە ئەو کاتە ئەمان شایانی یارمەتی خوا نین و زۆرتر هێز و چەکی گەورەش لای دوژمنە، پێویستە عەقیدە و باوەڕی راست لەبەر بار و شێوە راستەقینەکەی بەدی بێت لە دڵ و دەروون دا، هەموو کار و تێکۆشان و هەڵمەتێکی هەڵگرانی لەو عەقیدە و باوەڕەیەوە هەڵقوڵێ، ئەو کاتە هەڵگرانی ئەو عەقیدە و باوەڕە بیم و باکیان نابێ لە هێز و چەکی دوژمن هەرچەند بەتین و گەورە بن، حەزرەتی موسا و هارون - سەلامی خوایان لێ بێت - بەو چەکی چار نەکراوی عەقیدە و باوەڕەوە وەستان و بەرامبەر فیرعەون و کۆمەڵەکەی و ئەو هەموو جادوگەرانەوە و هەروەها جادوگەرەکان بەو چەکە گەورەیە وەستان بەرامبەر فیرعەون و هەڕەشە و تاپاڵی، بەهۆی ئەوەوە عەقیدە و باوەڕەکەیان بە تەواوی سەرکەوت بەسەر فیرعەون و شوێن کەوتووەکانی دا، ئەمان کە دژی ئەو عەقیدە و ئایینە راستە بوون خوا بەربادی کردن و لە ریشەی هێنان وەکو بۆمان باس ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي﴾ واتە سوێند بەخوا سروشمان کردە لای موسا کە شەو رەوی بکە بە بەندەکانم و بە شەو لە میسر دەرچن بۆ ئەمەی فیرعەون بەرگری نەکات، ﴿فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا﴾ ئینجا کە گەیشتنە ئەو دەریایەی کە لە رێگاتان دایە رێگای وشکیان بۆ فەراهەم بێنە لە دەریاکەدا، بەم رەنگە بە دار دەستەکەت بدە لە دەریاکە ئەو کاتە دوازدە رێگای وشکی لێ پەیدا ئەبێت و هەر تاقمێ لە دوازدە تاقمەکەی بەنی ئیسرائیلی رێگایەک بداتە بەر ﴿لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا﴾ ئەوە بکە لە کاتێك دا مەترسی ناکەیت لەوەی کە فیرعەون پێتان بگات.

وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا
هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ

---

﴿وَلَا تَخْشَىٰ﴾ ناترسی كه دەریاكه بتانخنكێنێ.. موسا پێغەمبەر(علیه السلام) به پێی فەرمانی خوا جوڵایەوە ئەوەی پێی سپێررا بوو بەجێی هێنان، گوزەریان كرد به دەریاكەدا به ئاسانی، بەڵام خوا ئەو دەریایەی كرد بە(تەپكە) بۆ فیرعەون و لەشكرەكەی ئەوە بوو رێگاكەی ئەوانیان دایه بەر تا هەموو چونە ناویەوە، ئینجا خوا دەریاكەی دایەوە بەسەریان دا و هەمووی خنكاندن وەكو ئەفەرموێ: ﴿فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ﴾ ئینجا فیرعەون به لەشكر و سەربازەكانی یەوە شوێنی موسا و گەلەكەی كەوتن تا چوونە ناو دەریاكە ﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە دای بەسەریان دا و دایپۆشین ئەوەی كه دایپۆشین لەو دەریایه، واته ئەوەندە گرنگ و ناهەموارە باس ناكرێ و مەگەر تەنها خوا بزانێ چۆنه، بێگومان هیچ ئیماندارێكی راستەقینە سەر ناكاتەوە لەوەی كه چۆن ئەو دەریایه له ئاستی موسا و گەلەكەی بەو جۆرەی لێ هات و لایدا له رەوشت و سروشتی خۆی تا ئەوان گوزەریان كرد پیای دا، ئینجا له ئاستی فیرعەون و كۆمەڵەكەی وەكو خۆی لێ هاتەوەو گەرایەوە بۆ سەر رەوشت و سروشتی خۆی هەروەها هەموو موعجیزەكانی تر. بێگومان ئیمانداری راستەقینە ئەزانێ كه توانین و دەسەڵاتی خوا بێ سنوورە، ئەو خوایه كه ئەم بوونەوەرەی دروست كردووە له نەبوون ئەو خوایه ئەتوانێ هەر شتێ لەمانه بگۆرێ بەهەر بارێك دا خۆی بیەوێ، ئەوەی كه دڵی نەخۆشه و فام و ژیریی بێ هێز و لاوازە چی ئەڵێ با بیڵێ؟ هەتا بڵێ و دەمبازی بكات نەفامی خۆی روون تر ئەكاتەوە. خوای گەورە لێرەدا به كورتی باسەكەی بری یەوە و هیچ باسی ئەوەی نەفەرمو كه جادوگەرەكان پاش ئیمان هێنانیان چی یان بەسەرهات؟ هەروەها لێرەدا باسی ئەو بەسەرهاتە گرنگانەی كه له ماوەی چەند ساڵێك دا روویدا له نێوان موسا و فیرعەون دا پێش دەرچوونی موسا و گەلەكەی له میسر و خنكانی فیرعەون و شوێن كەوتووەكانی، چونكه گێرانەوەی ئەم سەر گوزەشتانه به پێی پێویستی یه بۆ ئەو مەبەستەی كه سەرگوزەشتەكەی بۆ هاتووە، به گوێرەی پەیوەندی یەتی به مەبەستی ئەو سورەتانەوە كه سەر گوزەشتەكەی بۆ هاتووە، به گوێرەی پەیوەندی یەتی به

مەبەستی ئەو سورەتانەوە کە سەرگوزەشتەکانی تێدایە، لە سەرەتای ئەم سورەتەوە باسمان کرد بە روونی کەمەبەست لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی موسا لێرەدا روون کردنەوەی بەزەیی و چاودێریی خوایە دەربارەی هەڵگرانی پەیامەکەی، ئەوەی نەوتراوە لێرەدا پەیوەندی بە مەبەستەکەوە نی یە، کەواتە پێویست نی یە ئێمەیش درێژە بدەین و باسی شتێ بکەین کە قورئان درێژەی پێ نەداوە و باسی نەکردووە، فیرعەونی ستەمکار تەنها زیانی هەر بۆ خۆی نەبوو، بەڵکو بوو بەهۆی گومرایی ئەو هەموو خەڵکەی کە شوێنی کەوتن، دووچاری بەدبەختی هەردووجیهانی کردن، لای خۆی لە پێشەوە لاف لێدا و وتی پێ یان: ﴿وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾. وەکو لێرەش دا بە توانجەوە دەربارەی ئەفەرموێ: ﴿وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ﴾ فیرعەون گەلەکەی خۆی گومرا کرد و بە رێگایەك دا بردنی کە دووچاری زیانی هەردوو جیهانی کردن ﴿وَمَا هَدَىٰ﴾ رێنموونی نەکردن و رابەریی نەکردن بۆ رێگایەك کە بیانگەیەنێ بە مەبەست و ئامانج لەم جیهان و نە لەو جیهان. ئەوەی کە لێرەدا شایانی باس و بیر لێ کردنەوەیە ئەمەیە کاتێ کە فیرعەون بە هێزو سوپاکەیەوە پەلاماری داو کەوتە سەر موسا و کۆمەڵە بێ دەسەڵاتەکەی کە جگە لە خوا هیچ شتێکی تریان نەبوو پشتی پێ ببەستن، کاتێ کار گەیشتە ئەوە دەستی قودرەتی خوا هاتە پێشەوە بەو جۆرە کەس نەدیوە بەرگری کرد لەو کۆمەڵە ئیماندارە بێ هێز و بێ دەستە و ئەو دوژمنە بەهێزەی بۆ بەرباد کردن، بێ ئەمەی هیچ ئەرکێ بخاتە سەر شانی ئەو ئیماندارانە. بەڵام ئەو یارمەتی و بەرگری یە لە پاش ئەوە بوو کە ئیمان و باوەڕی راستەقینە بە تێرو تەواوی جێگیر بوو لە دەروونی ئیماندارەکان دا، بەجۆرێ ئەو ئیمان و باوەڕە خۆی دەرخست و روو بەڕووی جەور و ستەم وەستا و نەترسا لە هەڕەشە و تاپاڵی، و نەخەڵەتا بەو هەموو دەسەڵات و دارایی و سامان و جیفەی دنیایە کە بەلێشاو کۆبووەوە لە دەوری، ئەوەبوو فیرعەون ئەیوت پێ یان: راست و چەپتان ئەبڕم و هەڵتان ئەواسم بەسەر پەلی داردا، ئەوانیش پێ یان وت: چی ئەکەیت بیکە، بڕیارو حوکمڕانی تۆ تەنها لەم ژیانی ئەم جیهانەدایە، لەم کاتەدا خوا لەسەریان هاتە جواب و ئەوەی کە کردی، کەواتە ئیمانداران تا نەگەنە ئەو رادە و پلە بەرزە شایانی ئەوە نابن خوا بەو جۆرە لەسەریان بکاتەوە بەدەست و زۆری خۆی و لەم بارەیشەوە هەرکات گەیشتنە ئەو رادەیە بێگومان خوا یارمەتی یان ئەدات و دەستی قودرەتیان بۆ ئەخاتە کار بۆ وێنە: ئەو گەلە هەر ئەو گەلە بوون کە چەند ساڵ لەوەو پێش بەسەر شۆڕی سزا ئەدران و کوڕەکانیان سەر ئەبڕین و ئافرەتانیان ئەهێشتنەوە بۆ ریسوایی و کارەکەری، چەندەها ساڵ بەو جۆرە

جەور و ستەمیان لەگەڵ ئەکراو خوایش یارمەتی نەئەدان و مۆڵەتی ستەمکاری ئەدا بەسەریانەوە، چونکە ستەم لێ کراوەکان دڵ و دەروونیان پڕ بوو لە سام و ترس لە زاڵم و ستەمکار و مل کەچ و سەر شۆڕ بوون بۆیان و ئەو ئیمان و باوەڕەیان نەبوو کە باس کرا و لەمەوپاش بۆیان پەیدا بوو، بەڵام ئەوەبوو کە لەپاش دا ئەو ئیمان و باوەڕەیان بۆ فەراهەم هات و ئەو بیم و ترسەیان نەما و گۆڕا بە بیم و ترس لە خوا، لەو کاتەدا ئەوەی بۆ کردن کە کردی، کەواتە با ئیمانداران بە تایبەتی ئەوانەی کە رابەرن و رێنموونی ئەکەن بۆ رێگای خوا با هەموو بزانن چ کاتێ کاتی چاوەڕوانی یارمەتی دانی خوایە بۆیان؟ با هەموو بزانین کە هەر گەل و کۆمەڵێکمان بینی بەژێر باری سزا و جەور و ستەمەوە ماوەیەکی دوور و درێژ بێ ئەمەی خوا دەروویان لێ بکاتەوە با هەموو بزانین کە سووچی خۆیانە و هۆی دەردی خۆیان لای خۆیانە، دەرمان و چارەسەری خۆیان بە خۆیان ئەکرێ وەکو باس کرا... ئینجا لەناو سێبەرو سەهەندی خۆشی و یارمەتی دانی خوا و رزگار کردنی(بەنی ئیسرائیل) لە فیرعەون و بەرباد کردنی خۆی و گەلەکەی، لەم کاتە خۆشەدا رووی فەرموە ئەکاتە رزگار کراوەکان بە تەمێ و ئامۆژگاری یان و بیر خستنەوەی ئەو بەهرە و چاکەی کە خوا لەگەڵی کردن، ئەیانترسێنێ لەوەی خۆیان لەبیر بچێتەوە و سەرکەشی بکەن و یاخی بن لە خوا و ئەو چەکەی کە پێ ی سەرکەوتن لە خۆیانی بکەنەوە: چاکەی گرنگیان بیر ئەخاتەوە:

١- ئەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ﴾ ئەی نەوەکانی ئیسرائیل بەڕاستی رزگارمان کردن لە دوژمنەکەتان، ئەو دوژمنەی کە بە چەند جۆر و شێوە سزای ئەدان، بە پێش چاوی خۆیانەوە خنکاندنی لە دەریادا.

٢- ﴿وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ﴾ لەپاش خنکاندنی فیرعەون و کۆمەڵەکەی، وادە و بەڵێنمان دا پێتان بە هاتنی موسا بۆلای راستی شاخی(طور) بۆ ناردنە خوارەوەی تەورات بۆ سەری، بۆ موناجات و بیستن و گوێ گرتنی لە فەرمودەی خوا، لەبارەی ئەو عەقیدە و شەریعەتەی کە ناردی بۆی، بۆ ئەمەی ئەو گەلە رەفتاری پێ بکەن و نۆبە و دەوری خۆیانی پێ ببینن لە وڵاتی بە فەڕی پاك و خاوێنی شام دا لەپاش دەرچوونیان لەمیسر، یان بەڵێن و وادەمان پێدان بەهۆی موساوە بە هاتنتان لەگەڵ موسادا بۆ ئەو شوێنە بۆ ئەمەی بە دیارەوە بن کاتێ خوا قسە لەگەڵ موسادا ئەکات و ئێوەیش بیبیستن.

وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ
وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴿٨٢﴾
۞ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾

---

**٣- ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ﴾ باراندمان بەسەرتان دا گەزۆ و پەلەوەری شەلاقە کاتێ کە ئەسوڕانەوە لەو دەشت و بیابانەدا کە پێ‌ی ئەوترێ خاك و زەوی ﴿تیە﴾، ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾، واتە پێمان وتن: بخۆن ئەو رۆزی یە پاك و حەڵاڵانەی کە پێمان داون ﴿وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ﴾ لە سنوور دەرمەچن و زیادە رەوی مەکەن لەو رزق و رۆزی یە پاك و حەڵاڵی منەدا، بەم رەنگە هەڵنەسن بە سوپاس و بەفیڕۆ و بێ جێ ئیسراف تێدا بکەن و کەشخە بکەن و خۆتان لێ بگۆڕێ یان بەکاری بێنن لە گوناهو تاوان دا، یان بەرگری ئەو مافانە بکەن کە ئەکەوێتە سەر شانتان بەهۆی ئەو رزق و رۆزی یەوە، ﴿فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە قارو خەشمی من بێتە سەرتان و پێویست ببێ و بنوسێ پێتانەوە ﴿وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ﴾ هەرکەسێ قار و خەشمی من بێتە سەری و بکەوێ بەسەری دا بێگومان ئەو کەسە ئەکەوێتە ناو ئاگرو چاڵی بە هیلاك دا چوون، ئینجا لەگەڵ ئەو ترساندن و هەڕەشەدا قاپی تۆبە و گەڕانەوەی واز کردووە و کردوویەتی یەوە لە تاوانباران، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ﴾ بەڕاستی من زۆر لێ بووردوم لەهەر کەسێ کە لەم جیهانەدا گەڕابێتەوە و تۆبەی کردبێ**

لە کوفرو بت پەرستی و باوەڕی هێنابێ بەو شتانەی پێویستە باوەڕ پێ یان و کردەوەی چاکی بەجێ هێنابێ، ئینجا پاش ئەوە دامەزراو و بەردەوام بووبێ لەسەر ئەوەی باس کرا، خوای گەورە بەڵێنی دابوو بە حەزرەتی موسا کە پاش چل رۆژ برواتەوە بۆ شاخی(طور) بۆ وەرگرتنی تەورات و فەرمانی خوا ئەویش هات و سەرکەوت بۆ سەر شاخەکە بۆ شوێنی تایبەتی دیاریی کراو و هاروونی برای دانا بەسەر خەڵکەوە لەباتی خۆی و بەجێی هێشتن. موسا(علیه السلام) سۆزی موناجاتی خوا لێ یدا و بە پەلە رۆیی، لەپاش ئەو یەکێ لە گەلەکەی کە ناوی(سامیری) بوو خەڵکەکەی گومرا کرد و کردنی بە گوێرەکە پەرست، ژمارەیەکی زۆر کەمیان نەبێ و موسا بێ ئاگایە لەو بەسەرهاتە ناڕەوا، کاتێ گەیشتە شوێنی خۆی لەسەر شاخەکە خوا ئاگاداری کرد بەسەری دا بەم جۆرە بۆمان باس ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ خوا پێی فەرمو: ئەی موسا ئایا چی یە پەلەی پێ کردی لەگەلەکەت و چی پاڵی پێوەنایت لەوەی پێش کەوتی لێ یان؟ ئەمە پرسیارە لەهۆی پەلە کردن و بێزاری و ناڕەزایی پیشان ئەدات دەربارەی ئەو پەلە کردنە، چونکە پەلە کردن لەخۆی دا شتێکی بێزراوە، بە تایبەتی لێرەدا پیشانی ئەدا کە موسا دەربەستی گەلەکەی نی یە و گوێی نی یە لێ یان و خۆی بەزل و گەورە سەیر ئەکات، جا لەبەر ئەوە موسا وەڵامی هەردوو شتەکەی دایەوە، وەڵامی بێزاری یەکەی پێش خست، چونکە ئەوە گرنگ ترە

قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ

**﴿قَالَ﴾ موسا فەرمووی: ﴿هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي﴾ گەلەکەم ئەوانەن وان بەدوامەوە و نزیکن لێمەوە، من کەمێ لێ یان پێش کەوتووم ﴿وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ﴾ من پەلەم کرد بۆلای تۆ ئەی پەروەردگارم بۆ ئەمەی لێم رازی بیت، چونکە پەلە کردن لە گوێ رایەڵی و فەرمان بەریدا هۆی رەزامەندی یە. ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ﴾ دەسا بەڕاستی لەپاش تۆ ئێمە گەلەکەتمان تاقی کردەوە، یان دووچاری گومڕایی مان کردن بە گوێرەکە پەرستی ﴿وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ﴾[1] سامیری گومڕای کردن و بانگی کردن بۆ گوێرەکە پەرستی و هانی دان لەسەری. ئەوانە ئەو کۆمەڵە بوون کە هارونی بەسەرەوە دانان و خۆی بەجێی هێشتن، ئەڵێن: شەش سەد هەزار کەس بوون جگە لە دوازدە هەزاریان ئیتر هەمووی کەوتە شوێنی ئەو سامیری یە، بەڵێ موسا(علیه السلام) پەلەی کردو ویستی کە تەمێ و بەرنامە وەرگرێ لەخوا کە ژیانی تازەی گەلەکەی لەسەر دارێژێ لەپاش ئەوەی رزگاری کردن لە بەندەیی و سەرشۆڕی... ویستی سەر لە نوێ ئادەمێتیان بروێنێتەوە لەپاش وشك بوون و فەوتانی لەژێر سایەی دووکەڵی رەشی بت پەرستی فیرعەونێتی دا، بەڵام بەندەیی و ژێر دەستەیی کاری لێ کردبوون میزاج و سروشتی شێواندبوون، بت پەرستی فام و هۆش و ژیریی بێ هێز و لاواز کردبوون بەهۆی ئەوەوە کە چاویان لە موسا بڕا فریوویان خوارد بە قسەی سامیری و موسا بێ ئاگا بوو لەو بەسەرهاتە ناڕەوا تا خوا هەواڵی پێدا ﴿فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ﴾ ئینجا پاش دواهاتنی ماوەی دیاریی کراو و وەرگرتنی تەورات موسا گەڕایەوە بۆلای گەلەکەی بە قارو خەشمەوە لەگەڵەکەی و بەداخ و دڵ غەمگینی یەوە بەهۆی ئەو کردەوە ناڕەوا و ئەو تاوانە گەورەیەی کردبوویان،**

---

[1] لە ئیبن و عەباسەوە ئەگێڕنەوە کە سامیری پیاوێك بووە لە گەلێکی گا پەرست لەپاش دا چوو بۆ میسر و بە دیمەن ئایینی بەنی ئیسرائیلی وەرگرت، بەڵام لە دڵەوە گا پەرستی هەر مابوو، هەندێ ئەڵێن لە تاقمی فیرعەون بووە، هەندێ تر ئەڵێن هەر لە گەلی بەنی ئیسرائیل و لە تیرەی سامیرەیە.

قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ
غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ﴿٨٦﴾ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن
زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ

---

**گەڕایەوە بۆ لایان بەو رق و داخەوە پرسیاری لێ کردن ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًا﴾ ئەی گەلەکەم ئایا پەروەردگارتان بەڵێنی پێ نەدان بە بەڵێنێکی راست و شیرین؟ واتە بەڵێنی پێدان بە ناردنی کتێبی تەورات کە رێنموونی و رابەری ئەکات بۆ شەریعەتی راستی خوا، بەڵێنی پێدان بە لێ بوردن و پاداشتی گەورە لە رۆژی دوایی دا و بەڵێنی پێدان کە ئەبن بەخاوەنی وڵاتی ستەمکارەکان و شاد ئەبن بە جێگا و شوێنی ئەوان، بەو جۆرە بەڵێنی پێدان، هیچ رێگاتان نی یە ددانی پێدا نەنێن، کەواتە چۆن لاتان دا لەخوا پەرستی؟ ﴿أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ﴾ ئایا خوا بەڵێنی پێدان و ئینجا ماوەو کاتی درێژ بەسەرتان دا تێپەڕی تا بەهۆی ئەوەوە بەڵێنەکەتان لەبیر چووبێ؟ ﴿أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ یان ویستتان کە قارو خەشمێکی بەتین بێتە سەرتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە؟ واتە یان لەبیرتان بوو، بەڵام ویستتان بەدەستی ئەنقەست کارێ بکەن کە هۆی اقرو خەشمی خوا بێت لێتان؟ ﴿فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەو بەڵێنەی داتان بە من نەتانبردە سەر و پێچەوانەی جوڵانەوە و ئێوە بەڵێن و پەیمانتان دا بە من کە دامەزراو بن لەسەر خواپەرستی و بەردەوام بن لەسەر ئیمان و باوەڕی خۆتان و نەگۆڕێن لەم ماوەدا کە من بەجێتان ئەهێڵم؟ ئینجا ئەوانیش دەستیان کرد بە عوزر هێنانەوە، بەڵام عوزرەکەیان تاوانەکەی پێنە پەڕۆ نەکردن. بەڵکو روونی ئەکردەوە کە ئەو کۆمەڵە بەهۆی بەندەیی و ژێر دەستەیی یەوە سروشتی ئادەمێتی یان تێك چوو بوو، هۆش و ژیریی یان لەڕ و لاواز بوو ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا﴾ ئێمە بەڵێن و پەیمانەکەی تۆمان نەشکاند بە ئارەزوو و دەسەڵاتی خۆمان، بەڵکو سامیری زۆری پێ هێناین و راو ژیریی لەدەست سەندین و ئەو سەری لێ تێك داین و خەڵەتاندینی. مەبەستیان لە شێوەی خەڵەتاندنەکە ئەمەیە: ئەم کۆمەڵە خشڵ و زێوەرێکی زۆر و فراوانیان دەست کەوتبوو لەلایەن گەلەکەی فیرعەونەوە ئیتر لێ یان**

خواستبوون له پێش خنکانیان دا بەناوی جەژن و شادی یەوە و ئینجا ئەوان هاتن بەدوایان دا و خنکان لەناو دەریاکەدا و ئەمانیش لە پێشەوە بە خشڵەکانەوە پەڕینەوە، یان لەپاش خنکانیان ئاوی دەریاکە خشڵی خنکاوەکانی دایە لاو ئەمانیش هەڵیان گرت، بەهەر جۆر بێ ئەو هەموو خشڵ و زێوەرەیان درابوو بەسەردا هەڵی گرن تا دوایی، ئینجا کە حەزرەتی موسا رۆیشت بۆ شاخی(طور) و زۆری پێچوو ئەو سامیری یە پێی وتن: ئەمەی وا بە ئێوە حەرامە بەهۆی ئەوەوە موسا دواکەوت و نەهاتەوە، کەواتە توڕی دەن، ئەوانیش بە گوێ یان کرد، ئینجا ئەو سامیری یە زەڕەنگەر بوو لەو خشڵانە شێوەی گوێرەکەیەکی بۆ داڕێژان رێك وەکو گوێرەکە ئیتر ئەیقۆڕان و دەنگی لێوە ئەهات، وەکو دەنگی گوێرەکە کە ئیتر ئایا گیانیشی تێ کەوتبێ بە فەرمانی خوا بەهۆی ئەو خۆڵەی کە کاتی خۆی سامیری هەڵی گرتبوو لە جێگا پێی جوبرەئیل، یان لە جێ پێی وڵاغەکەی، وەکو هەندێ لەسەر ئەوەن، یان هەر لەشێکی بێ گیان بووبێ و بەڵام سامیری فێڵێکی فەراهەم هێنابێ لەو شتەدا، کون و کەلەبەرێکی تێ کردبێ کە با بچێ بەناوی دا و ئەو دەنگەی لێ پەیدا بووبێ وەکو هەندێ تر ئەڵێن؟ بەهەر جۆر بووبێ ئەوشتەی بۆ داڕشتن ئینجا خەڵەتاندنی بەمە کە ئەو شتە خوایە و بیپەرستن!!! پەنا بەخوا ئەو نەفامانەش چونکە بەندەیی ناڕەوا و دەق گرتن بە بت پەرستی یەوە مێشکی تێك دابوون، هەڵخەڵەتان بەو شتە پڕو پووچە، ئینجا با لەسەر رووناکی ئەم باسە کە کرا بگەڕێینەوە بۆ تەفسیر و راڤەی قورئان کە بە کورتی ئەو مەبەستە پیشان ئەدات: ئەوانە وتیان: ئێمە بە ئارەزوو و دەسەڵاتی خۆمان بەڵێن و پەیمانەکەمان نەشکاند و پێچەوانەی نەجوڵاینەوە ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا﴾ بەڵکو ئێمە چەند کۆڵ و بارێ لە خشڵ و زێوەری(قیبتی یەکان) درابوو بەسەرمان دا، ئینجا فڕێمان دا، چونکە حەرام بوو و سامیری وەری گرتنە لای خۆی، ﴿فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ﴾ بەو جۆرە سامیریش ئەوەی پێی بوو توڕی دا ﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ﴾ ئینجا سامیری لەو خشڵە تواوانە شێوە گوێرەکەیەکی بۆ داڕێژان لە قاڵب دا، بۆی دەرهێنان کە لەشێکی بێ گیان دوو دەنگ و هۆرەیەکی هەبوو وەکو هینی گوێرەکە، بەهۆی ئەوەوە بە فەنێکی سەیر دروستی کردبوو و چەند کون و بۆری یەکی لێ هەڵخست، ئینجا کاتێ با لێ ی ئەدا و ئەڕۆیی بەو کون و بۆری یانەدا، ئەو دەنگەی لێ پەیدا ئەبوو، یان بە فەرمان و خواهیشی خوا بوو بە لەشێکی گۆشت و خوێن: بەهۆی ئەو مشتە خۆڵەی کردی بەسەری دا وەکو لەپاش دا باسی ئەکەین.

فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ
ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي
وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي ﴿٩٠﴾

سامیری ئەو شتەی بۆ دروست کردن و ﴿فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ﴾ ئینجا شوێن کەوتووەکانی لەگەڵ بینی یان لەناو خۆیان دا وتیان: ئەمەیە خوای ئێوەو خوای موسا، کەواتە موسا لەبیری چووە و بێ ئاگایە کە چووە بۆ شاخی(طور) بەدوای دا ئەگەڕێ. بەڕاستی ئەوە ئەوپەڕی کەودەنی و نەفامی و نەزانی یە، لەپاش ئەو هەموو بەڵگە و موعجیزە گەورانە موسا نیشانی دان، بەو جۆرە کەس نەدیوە رزگاری کردن لەو دوژمنە بێ بەزەیی یە، لەپاش بینینی ئەو هەموو بەهرە و بەرهەمە نایابەی بەزەیی و دەسەڵاتی خوا، پاش ئەوانە هەموو ئەو نەفامانە دەربارەی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ئەوەندە شەرم و بەد گومان بوون و بەو شتە پڕوپووچە هەڵخەڵەتان تا رادەیەك بڕیاریان دا بەخوای خۆیان!! ﴿أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا﴾ ئایا ئەوانە نەیانزانی کە ئەوشتەی سامیری هیچ وتە و وتارێکیان ئاراستە ناکات و وەڵامیان ناداتەوە و خاوەنی هیچ زیان و سوودێ نی یە بۆ ئەوان؟ ئەوەیان ئەزانی، بەچاوی خۆیان ئەیانبینی کە ئەو شتە بەو جۆرەیە، کەواتە چۆن ئەوەندە نەفام و نەزان بوون ئەیانکرد بە خوای خۆیان؟!! بێجگە لەوەش کە شتەکە ئەوەندە روون و ئاشکرا بوو ﴿وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ﴾ سوێند بەخوا لەپێش گەڕانەوەی موسا بۆلایان هارون ئامۆژگاری کردن و پێی وتن ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی گەل و کۆمەڵەکەم ﴿إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ﴾ ئەم بەسەرهاتی ئێوە هیچ شتێ تر نی یە بێجگە لەوەی کە ئێوە گومڕا کراون بەهۆی ئەو گوێرەکەوە، یان هیچ شتێ تر نی یە جگە لەوەی تاقی کراونەتەوە بەو شتە تا دەرکەوێ ئایا کێ دامەزراوە لەسەر رێگای راستی خوا و کێ لائەدات؟ کەواتە وریای خۆتان بن و گومڕا مەبن. ﴿وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ بەڕاستی خوای پەروەردگاری ئێوە تەنیا کەسێکە کەخاوەنی بەزەیی فراوانە ﴿فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي﴾ کەواتە شوێنی من بکەون و گوێ رایەڵی فەرمانی من بن لە دامەزراوی دا لەسەر ئایینی راستی خۆتان و پەرستنی خوا بە تاك و تەنیایی. هارون پێغەمبەر(علیه السلام) کە بە تایبەتی جێگرو جێنشینی موسا بووە، پەیمانیان دابوو کە فەرمان بەر و گوێ رایەڵی بن، بەو شێوە شیرینانە ئامۆژگاری کردن،

قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي ﴿٩٤﴾

---

**بەڵام ئەوانە سروشتی ئادەمێتی یان تێك چوو بوو لەباتی گوێ رایەڵی و گەڕانەوە هیچ گوێ یان بۆ نەگرت و ﴿قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ﴾ وتیان: هەرگیز لا نادەین ئەمێنینەوە لەسەر ئەوەی ئەیپەرستین هەتا موسا ئەگەڕێتەوە بۆلامان، مەبەستیان بیانووی بێ جێ و لاری بوو، ئەگەر نا شتەکە ئاشکرا بوو و هاتنەوەی موسای بۆچی بوو؟ موسا(علیه السلام) بە خەشم و داخەوە گەڕایەوە و کە چاوی کەوت بەو کۆمەڵە بەو جۆرەیان بەسەر هاتبوو لە داخ دا خۆی بۆ نەگیرا و ئەوەی لەسەر و ریشی هارون و رایکێشا بۆلای خۆی ﴿قَالَ﴾ پـێی وت: ﴿يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ * أَلَّا تَتَّبِعَنِ﴾ ئەی هارون کاتێ دیت ئەمانە گومڕا بوون ئایا چی بەرگری کردی لەمەی پەیڕەوی من بکەیت لە خەشم و قار گرتن لەبەر خوا و بەرگری و جەنگاندن لەگەڵ ئەوانەی لایاندا لە پەرستنی خوا؟ واتە نەئەبوو هەروا بێ دەنگ بیت لێ یان و وازیان لێ بێنی، یان چی بەرگری کردی لەوەی شوێنی من بکەوتیتایە و بهاتیتایە بۆلای من لەگەڵ ئەوانەی لایان نەدابوو لە رێگای خوا، ئەوانەت بەجێ بهێشتایە کە کەوتنە شوێنی سامیری؟ واتە ئەو بەجێ هێشتنەت چاك بوو، چونکە نیشانە ئەبوو لەسەر زیادە بێزاری و قار و خەشمی زۆر بەتینت، لەوانە بوو ببوایە بەهۆی کۆتایی هێنانیان و گەڕانەوەیان بۆلای خوا، ئەوە باشتر کاری لێ ئەکردن، ﴿أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي﴾ ئایا سەرپێچیت کرد لە فەرمانی من؟ واتە من کە رۆیشتم فەرمانم دا کە هیچ شتێ نەقەومێ، ماوە نەدەیت هیچ کەس هیچ شتێ بقەومێنێ، من ویستم کە بەتین و رەق بیت لەکاروباری ئایین دا**

و پارێزەر بیت لەسەر ئایین و من وتم جێگری من بکە لەناو ئەم گەلەدا و وەکو من رامیاری بکە، کەواتە نەئەبوو سەرپێچیت بکردایە و پێچەوانە رەفتارت بکردایە. ئینجا هارون کە لەسەر خۆ و بە ئارام تر بوو، بە نەرمی وەڵامی دایەوە و ویستی لە رێوە ئەهوەنی بکاتەوە، ئینجا وەڵامی گلەیی یەکەی بداتەوە، لەبەر ئەوە بانگی لیَ کرد بە سۆز و بەزەیی برایەتی بە تایبەتی برایەتی لەلایەن دایکەوە کە کانی سۆز و بەزەیی یەوە ﴿قَالَ﴾ فەرموی ﴿يَبْنَؤُمَّ﴾ ئەی کوری دایکم ﴿لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓ﴾ مەنەوە لە ریشم و لەمووی سەرم، واتە چونکە من سەرپێچیم نەکردووە و سووچێکم نەبووە و لام وابوو گویَ رایەڵی تۆ لەوەدا بوو کە من کردوومە ﴿إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾ چونکە ئەگەر من جەنگم بکردایە بە ئیماندارەکان لەگەڵ گومڕاکان دا یان خۆمان جویَ بکردایەتەوە و بهاتینایە بۆلات ئەو کاتە بنی ئیسرائیلی یەکان ئەبوون بە دوو تاقم و منیش بەڕاستی مەترسیم کرد کە تۆ هاتیتەوە پێم بڵێیت: تۆ بەنی ئیسرائیلی یەکانت بەش بەش کرد و پچڕیتن لە یەك و پارێزەری قسە و فەرمانی منت نەکرد کە پێم وتی جێنشینی من بە لەناو گەلەکەم دا و یەکیان بخە و ئیسلاحیان بکە و ماوە مەدە هیچ شتێك روو بدات لەناویان دا، کەواتە گویَ رایەڵی لەمەدا بوو کە من کردوومە، ئینجا موسا رق و خەشمەکەی ئاراستەی سامیری کرد کە کان و هۆی تاوانەکە بوو، لە یەکەم جارەوە رووی نەکردە ئەم، چونکە لێپرسراوی گەلەکە بریتی بوو لە هارون، شوانەکەیان ئەم بوو، ئەبوایە ماوەی نەدایە گورگ و دڕندە زیانیان پیَ یان بگەیاندایە، کەواتە ئەبیَ پرسیار لە شوانەکەیان بکات ئینجا کە دەرکەوت سووچی نەبووە ئەوا کۆتایی لەو هێنا و رووی کردە سامیری تاوانبار،

قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ
ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾

---

﴿قَالَ﴾ پێی فەرمو: ﴿فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ﴾ ئینجا ئەی تۆ ئەم کارە ناهەموارە چی بوو کردت؟ دەنگ و باسی تۆ چی بوو لەم کارەدا؟ ﴿قَالَ﴾ سامیری وتی: ﴿بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ﴾ شتێکم زانی کە خەڵکەکە نەیانزانی، شتێکم بینی ئەوان نەیانبینی، ئەویش ئەمە بوو کاتێ جوبرەئیل هات بەدوای تۆدا کە بچی بۆ شاخی(طور) من بینیم لەسەر ئەوە شێوەی کە هاتە خوارەوە، جێگا پێی خۆی یان وڵاغەکەی دەست بەجێ گیای لێ ئەڕوا و سەوز ئەبوو، منیش زانیم ئەوە شتێکی زۆر گرنگە، ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ﴾ ئینجا منیش پڕی مشتێکم هەڵگرت لە جێ پێی ئەو فریشتە نێرراوە، یان جێ پێی وڵاخەکەی ﴿فَنَبَذْتُهَا﴾ ئینجا فڕێم دایە ناو ئەو خشڵە تواوە بەهۆی ئەوەوە ئەو شێوەیە پەیدا بوو، یان پاش ئەوە خشڵە تواوەکانم کرد بەناو سکی دا بەهۆی ئەوەوە گیانی تێ هات و ئەو دەنگەی لێوە هات!
﴿وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى﴾ بەو جۆرە نەفسم شتەکەی بۆ رازاندبوومەوە و شیرینی کرد لە دڵم دا... بە کورتی: بە ئارەزوو و هەوای نەفسی خۆم ئەوەم کرد و هیچ بەڵگە و نیشانەیەکم بە دەستەوە نەبوو لەسەر راستی ئەوەی بەسەر ئەو خەڵکەم هێنا. ئینجا تۆڵە و هەڵوێستی موسا(علیه السلام) بەرامبەر خۆی و بتەکەی ئەوەبوو:

أ- دەرکردنی سامیری و هەتا ماوە لەناو گەل و کۆمەڵ دا نە کەس نزیکی بکەوێتەوە و نە نزیکی کەس بکەوێتەوە و جاڕی گوناهو پیسی بۆ بدرێ کە ئەوەش یەکێ بوو لە تۆڵەی تاوان لە شەریعەتی موسادا، ئەگێڕنەوە کە خوا کارێکی وای کرد هەرکەس لێ ی بکەوتایە یان بکەوتایە لەهەرکەس هەردوولا دووچاری(تاوتێ) ئەبوون لەبەر ئەوە داوای ئەکرد کە کەس لێ ی نەکەوێ و نزیکی کەس نەبێتەوە.

ب- لەپاش ئەوە کاروباری حەواڵەی خوا کرد بۆ رۆژی چی لێ ئەکات خۆی ئەزانێ.

ج- سوتاندنی بتەکەی و کردنی بە تۆز و رشتن و کردنی بەناو دەریادا وەکو تۆمێ بچێنرێ.

قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ
إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ
ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾ كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ مَا قَدۡ سَبَقَۚ وَقَدۡ
ءَاتَيۡنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكۡرٗا ﴿٩٩﴾

---

**ئەوەبوو موسا(عليه السلام) وەکو قورئان ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ موسا وتی بە سامیری: ﴿فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ﴾ ماتووڵێ ئەو تاوانەت کردووە بڕۆ و دەرچۆ لەناومان بە دەرکراوی نە تێکەڵی کەس بکەیت و نە کەس تێکەڵیت بکات، چونکە تۆ تا ماوی لەم ژیانەدا هەر کەست بینی بۆ تۆ هەر ئەمە هەیە بڵێیت: نە کەسم لێ کەوێ و نە لەکەس ئەکەوم، لەم جیهانەدا ئەوە تۆڵەتە، ﴿وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ﴾ بێگومان سوێند و کاتێکت هەیە بەڵێنت پێ دراوە لە ڕۆژی دوایی دا هەرگیز لێ ی دواناخرێت و خوا بەدی ئەهێنێ لەپاش تۆڵەی ئەم جیهانەت ﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ﴾ بڕوانە بۆ بتە پەرستراوەکەت کە دامەزراو و بەردەوام بوویت لەسەر پەرستنی، تەماشای بکە بزانە چی لێ ئەکەین؟! ﴿لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا﴾ سوێند بەخوا بە ئاگر چاك ئەیسوتێنین تا ئەبێ بە خۆڵەمێش، ئینجا خۆڵەمێشەکەی ئەوەشێنین بەناو دەریادا بە جۆرێ هیچ دروشمیشی نەمێنێ و هیچی دەستی کەس نەکەوێتەوە. پاش ئەوە بەو جۆرە دای لە باوەڕی ناڕاستی پڕو پووچ ئینجا جاڕی دا و باوەڕی ڕێك و ڕاستی ڕوون کردەوە، فەرموی: ﴿إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ﴾ پەرستراوی ڕاستەقینەی ئێوە هیچ کەس نی یە جگە لە کەسێ کە ناوی ﴿الله﴾ یە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لەو.**

**﴿وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا﴾ پەرستراوی ڕاستی ئێوە کەسێکە کە زانین و ئاگاداری ئەو فراوانە بۆ هەموو شتێ و دەوری هەموو شتی داوە و هیچ شتێك لە سنووری زانیاری دەرناچێ.**

ئا بەمە دوایی هات ئەم ئەندازەیە لە سەرگوزەشتە و دەنگ و باسی موسا کە بەزەیی و چاودێریی خوای تێدا روون بووەوە دەربارەی هەڵگرانی ئاڵای ئایین و بانگەوازەکەی. لە سەرەتای سورەتەکەوە باسی قورئانی فەرمو کە بۆچی هاتووە، ئینجا بەو بۆنەیەوە ئەو ئەندازەیە لە بەسەرهاتی موسای باس کرد کە بەزەیی و چاودێریی خوای روون کردەوە دەربارەی موسا و هاروون و گەلەکەیان، ئینجا لێرەدا ئەگەڕێتەوە بۆلای قورئان و ئیش و فرمانی قورئان و پاشەڕۆژی بەدی ئەو کەسە روون ئەکاتەوە کە رووی لێ وەرئەگێڕێ و پشتی تێ ئەکات، ئەو پاشە ڕۆژە بەدەیش روون ئەکاتەوە لە پیشاندانی شێوەیەك لە شێوە سامناکەکانی رۆژی دوایی، ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ مَا قَدْ سَبَقَ﴾ ئا بەو جۆرە گێڕامانەوە کە رابوردوو ئەیگێڕینەوە بۆت و ئەخوێنینەوە بەسەرت دا هەندێ لە هەواڵەکانی ئەوانەی پێش کەوتن و رابوردن لە ئوممەت و گەلەکانی لەمەوپێش، بێگومان گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانە چەند سوود و بەرژەوەندی گرنگی تێدایە، چاو و دڵی پێ روون ئەبێتەوە، زانین و ئاگاداری پێ زۆر و فراوان ئەبێ، هەموو دەنگ و باسێ لەوانە ئەبێ بە موعجیزەیەکی تایبەتی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تەمێ و ئامۆژگاری یان تێدایە بۆ میللەت و پەندیان لێ وەرئەگرن هەتا دنیا دنیایە، دڵخۆش کردن و دڵنەوایی بۆ ئەوانەی کە ویستوویانە و ئەیانەوێ ئاڵای ئایینی خوا بەرز کەنەوە، ﴿وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾ بێگومان ئێمە داومانە پێت لەلایەن خۆمانەوە کتێبێکی گەورە و گرنگ کە یاد و زیکری خوایە و بیر خەرەوەی بەڵگە و نیشانەکانی خوا لە گەل و چەرخە پێشووەکان دا، شایانە بە بیر لێ کردنەوە و پەند و تەمێ وەرگرتن لێ یەوە. بێگومان ئەم کتێبەی کە دراوە بەم پێغەمبەرە(ﷺ) بە هیچ پێغەمبەرێکی تر نەدراوە – درودی خوایان لەسەر بێت – چونکە ئەو هەواڵە نهێنی یە گرنگانەی تێدایە و ئەو هەموو یاسا و بڕیارانەی تێدایە کە ژیانی کامەرانی هەردوو جیهان بەستراوە پێ یانەوە و بەبێ ئەوانە دەست کەوت نابێ، دەست نیشانی کردووە بۆ هەموو خو و رەوشت و ئادابێ کە بەرزی هەموو گەل و ئەندامەکانی تەنها بەوانە دەست کەوت ئەبێ و گەیشتن بە پۆپەی ئادەمێتی بەوانە نەبێ ناگونجێ.

مَنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى
ٱلصُّورِ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا
يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾
فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ

---

**﴿مَنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا﴾ هەركەس رووی لێ وەرگێڕێ و پشتی تێ بکات، بێگومان ئەو کەسە بارێکی گران هەڵئەگرێ لە ڕۆژی دوایی دا: باری تۆڵەی سەخت و سزای چار نەکراوی ﴿خَٰلِدِينَ فِيهِ﴾ ئەو بارە گرانە هەڵئەگرێ لە کاتێك دا کە ئەو کەسانە ئەمێننەوە لە هەڵگرتنی دا بێ بڕانەوە ﴿وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا﴾ ئای چەندە خراپە ئەو بارە گرانە بۆ ئەوان لە ڕۆژی دوایی دا!!! ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ﴾ باسی ئەو ڕۆژە بکە کە فو ئەکرێ بە سووردا بۆ جاری دووەم بۆ زیندوو کردنەوەی خەڵکی ﴿وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا﴾ ئێمە تاوانبارەکان لەو ڕۆژەدا زیندوو ئەکەینەوە و کۆیان ئەکەینەوە کە لەشیان و روو و دەم و چاویان شینە، کە ئەوە ناشیرین ترین شێوەیە بۆ ئادەمی، نیشانەی سزا و ئازار و داخ و دووی فراوانە، ئەو تاوانبارانە بەهۆی خراپی و سامناکی ڕۆژەکەوە زاتیان نی یە دەنگ بەرزکەنەوە، بەڵکو ﴿يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ﴾ بە دەنگی نزم ئەڵێن و چپە ئەکەن لە نێوان خۆیان دا و هەندێکیان ئەڵێن بەهەندێکی تریان ﴿إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا﴾ ئێوە نەماونەتەوە لە دنیادا جگە لە دە شەو، یان دە ڕۆژ، واتە ژیانی ئەم جیهانە زۆر بە کەم و کورت دێتە پێش چاو، لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆیی و بەسەرچوو و ماوەی ڕۆژی دواییش شتێکی نەبڕاوەیە، بێجگە لەوەش کاتێ ئەو هەموو بەسەرهات و ڕووداوە سامناکە ئەبینن بێ هۆش و بێ ئاگا ئەبن لە ژیانی دنیایان و شتێکی کەمی نەبێ بیریان ناکەوێتەوە، خوا پەنامان بدات لە سزای ئەو ڕۆژە. ئەو تاقمە کە ژیانی دنیا بەوجۆرە سەیر ئەکەن، هەرچەندە قسەکەیان بەجێ یە لەم بارەوە کە ژیانی ئەم جیهانەیان بە کەم و کورت سەیر ئەکەن و پەشیمانی دەرئەبڕن لەسەر ئەوەی تەمەن و ژیانی خۆیانیان بەکار نەمێنا لە هۆی ڕزگاری یان لە سزای ڕۆژی دوایی، هەرچەند لەو ڕووەوە ئەندازەیە قسەکەیان ڕاست و بەجێ یە، بەڵام هێشتا دوورن لە ڕاستی یەوە و هەرکەمیان وتووە، ژیر تریان و نزیك تریان لە ڕاستی یەوە ئەوانەیە کە بە کەم و کورت سەیری ئەکات،**

وەکو خوا ئەفەرموێ: ﴿ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذۡ يَقُولُ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً ﴾ ئێمە زاناتر و ئاگادار ترین بەوەی کەئەوانەلەنێوان خۆیاندا ئەیلێن لەکاتێك دا کەژیرتریان و نزیك تریان لەراستی یەوە، ئەلێت: ﴿ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمًا ﴾ ئێوە نەماونەتەوە جگە لە تەنها رۆژێ، بەڕاستی حەق وایە تەنها ئایەتێکی وەکو ئەم ئایەتە بەس بێت بۆ هەموو ئیمانداری، کە هەڵنەخەڵەتێ بە ژیانی ئەم جیهانە، ئاگای لە خۆی بێ پێش ئەمەی هەلی ئەم ژیانەی لەدەست خۆی دەرکات، ئینجا بە بۆنەی باسی بەسەرهاتی رۆژی دوایی یەوە پرسیارێك لە پرسیارەکانی بێ باوەڕەکان ئەهێنێ و وەڵامی ئەداتەوە و ئینجا چەند بەسەرهات و رووداوێکی گرنگ و سامناکی تری ئەو رۆژە ئەهێنێ... قورەیشی یەکان بە شێوەی گاڵتە و لاقرتی و تەشەردان لە زیندوو بوونەوە و هاتنی رۆژی دوایی پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: ئەی محمد خوای تۆ چی ئەکات بەم شاخانە لە رۆژی دوایی دا؟ بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ﴾ ئەی پێغەمبەر پرسیارت لێ ئەکەن لە شاخەکان کە چی یان بەسەر دێت لە رۆژی دوایی دا؟ ﴿فَقُلۡ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسۡفًا ﴾ تۆیش لە وەڵامیان دا بڵێ: خوای من هەموویان پارە پارە ئەکات و ئەیانکات بە تۆزو ئینجا با پرژ و بڵاویان ئەکاتەوە ﴿ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفۡصَفًا ﴾ کەواتە شوێنەکانیان یان هەموو زەوی ئەکات بە دەشتێکی خاڵی تەختی ساف ﴿لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمۡتًا ﴾ کە نابینی تیای دا هیچ جۆرە لاری و نزمی و بەرزی یەك ﴿ يَوۡمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِيَ ﴾ لەو رۆژەدا کە شاخەکان ئەوەیان بەسەر دێت خەڵکی هەموو ئەکەونە شوێن جارچی خوا و ئەچن بەدەم بانگ و بانگەوازەکەیەوە، بۆ مەیدانی حەشرو کۆکردنەوە بە جۆرێ ﴿لَا عِوَجَ لَهُۥ﴾ ئەو جارچی یە هیچ بانگ کراوێ نی یە لاری و لارە جڵەوی بکات لێ ی و لێ ی لابدات، بەڕاستی شێوەیەکی ئێجگار سامناکە، با بیری لێ بکرێتەوە ئەم هەموو شاخە گەورە گەورە دامەزراوانە هیچ نیشانە و دروشمیشیان نەمێنێ، ئینجا ئەو هەموو خەڵکە – کە خوا نەبێ کەس ژمارەیان نازانێ – هەموو کۆ بکرێتەوە و بدرێتە بەر، بێ ئەمەی هیچ کەس بتوانێ سەرپێچی و لادانێکی ببێ، بەڵکو وێنەی گەلە و ئاژەڵ بێ دەنگ و بێ سرکە مل کەچ و سەر شۆڕ، بێ لاکردنەوە و دواو بەر، بە پێچەوانەی ئەم جیهانەوە کە مل پێچی و سەرکێشی ئەکەن لە جارچی خوا کاتێ بانگیان ئەکات بۆ رێگا راستەکەی خوا. لێرە ئەو دەمبازی و چەنە بازی یە ئەکرێ، بەڵام لەوێ ئەم بێ شەرمی و نالەباری ئێستا نامێنێ،

وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ
وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ
لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا
وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا

---

**بەڵكو هەموو بەم جۆرەن کە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ﴾ هەموو دەنگەکان بەئارام و لەسەر خۆ ئەبن لەبەر سام و ترسی خوای خاوەن بەزەیی، ﴿فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا﴾ بەجۆرێ نابیستی جگە لەدەنگ و چپەیەکی وەك لێو جووڵاندنەوە ﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ لەو رۆژەدا تکا کردن سوود ناگەیەنێت بە هیچ کەس جگە لە کەسێك کە خوای خاوەن بەزەیی لە پێشەوە ئیزنی دابێ بە تکا کردن بۆی ﴿وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا﴾ رازی بووبێ لە وتە و وتارێ کە بوویەتی، واتە وشەی شایەتومانی بووبێ و لەسەر ئەوە مردبێ ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ خوا ئەزانێ و ئاگادارە بە هەموو شتێ لەمەو پێشی بەندەکانی و بە هەموو شتێ لەمەو پاشیان، یان ئاگای هەیە بەهەموو کاروبار و بەسەرهاتی رۆژی دوایی و لەمەوپاشیان و بە هەموو شتێ لەمەو پێش و ئەم جیهانەیان ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾ بەندەکانی بە باشی زانا نین بەخوا، یان بە زانراوەکانی خوا، ﴿وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ﴾ هەموو کەس مل کەچ و سەر شۆڕ و سەر داخراوە بە وێنەی دیل بۆ خوایەك کە زیندووە و خۆی بەخۆی هەیە و راگیرە و هەموو شتێ تر بەو هەیە و وەستاوە و راگیرە، ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾ بێگومان بەش براو و بێ بەشە هەر کەسێ باری کوفری هەڵگرتبێ بۆ رۆژی دوایی، ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ هەرکەس هەندێ لە کردەوە چاکەکانی بەجێ هێنابێ ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ لەکاتێك دا ئەو کەسە ئیمان و باوەڕدار بێت، چونکە بە بێ ئیمان و باوەڕ هیچ چاکەیەك وەرناگیرێ ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا﴾ ئەو کەسە مەترسی ناکات لە هیچ جەور و ستەمێ لێ ی بکرێ، بەم رەنگە بەرگری پاداشتێکی لێ بکرێ کە شایانە بۆی بە پێ ی بەڵێنی خوا، یان زیادە تۆڵە و سزایەك بدرێ ﴿وَلَا هَضْمًا﴾ مەترسی ناکات لە کەم کردنەوەی ئەجرو پاداشتی ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا﴾ ئا بەوجۆرە و لەسەر ئەم بارە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە،**

وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ
بِالْقُرْآنِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰ إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَىٰ آدَمَ مِن قَبْلُ

---

که خوێنراوەیەکە بە زمانی عەرەبی ﴿وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ﴾ خەڵکیمان ترساندووە و بە چەند جۆر و شێوەیەك هەڕەشەمان لێ کردووە و چەند بارەمان کردووەتەوە لەم قورئانەدا ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکو بترسن و خۆیان بپارێزن لە گوناهو تاوان ﴿أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا﴾ یان قورئان فەراهەم بێنێ لە دەروونیان دا پەند و ئامۆژگاری و بیر کردنەوەیەك لەوەی دووچاری ئەبن لە ڕۆژی دوایی دا ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾ ئینجا ئەو خوایەی کە ئەم قورئانەی بەو جۆرە ناردووەتە خوارەوە، ئەو خوایە بەرز و بڵندە و پاکە لە هەموو لەکە و کەم و کوڕی یەك، ئەو خوایەی کە فەرمان و بڕیاری ئەو کار ئەکات لە هەموو شتێك دا، هەموو شت بەدەست ئەوە و شایانی ئەوەیە کە چاوەڕوانی بەڵێنی بکرێ و مەترسی بکرێ لە هەڕەشە و ترساندنی و تەنها ئەو دامەزراو و لانەچوو و نەگۆڕاوە، کەواتە وەکو قورئانەکەی ناردووەتە خوارەوە پارێزگاریشی ئەکات با پێغەمبەر دڵنیا بێت لەوە، بێگومان ئەم فەرمودەیە پاڵ پێوەنەر و هاندەرێکی بەتینە لەسەر ڕووکردنە قورئان و چوونە ژێر سایەی و خۆ ڕازاندنەوە بە خو و ڕەوشتە شیرینەکانی و خۆ خاوێن کردن لەهەموو بەد خویی و بەد کرداری یەك. ئینجا پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فێر ئەکات کە بە چ شێوەیەك ئەم قورئانە گەورە و گرنگە وەرگرێ لە جوبرەئیل(علیه السلام) و بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) لەهەموو کەس سوورتر بوو لەسەر ئەم قورئانە و بە گرنگتر ئەیگرت، جا لەبەر ئەوە کاتێ کە جوبرەئیل بەسەری دا ئەیخوێندەوە بە پەلە شوێنی ئەکەوت لە هەموو وشەیەك دا، نەئەوەستا تا ئەو لێ بێتەوە، لە ترسی ئەوە نەوەك پیای دا نەکات و لە بیری بچێتەوە، خوای گەورەش دڵنیا و دڵ ئارامی کرد لەوە و شێوەی وەرگرتنی پیشان دا فەرموی: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰ إِلَيْكَ وَحْيُهُ﴾ پەلە مەکە بە خوێندنی قورئانەکە لەگەڵ جوبرەئیل دا لەپێش ئەوە سروش کردنی بۆلای تۆ و گەیاندنی بە تۆ دوایی پێ بهێنرێ، واتە پەلە مەکە و بوەستە تا ئەو لێ ئەبێتەوە ئینجا تۆ بیخوێنەوە و مەترسی مەکە لە لەبیرچوونەوە، چونکە ئەو کەسەی کە ئەو قورئانەی ناردووە بۆ تۆ نایەڵێ لەبیرت بچێتەوە، کەواتە پەلە مەکە و لەباتی پەلە کردن دا داوا لە خوا بکە ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ بڵێ ئەی پەروەردگارم عیلم و زانینم زیاد بکە بەهۆی قورئانەوە... ئەم

سورەتە بەزەیی خوا و سەرپەرشتی و چاودێریی خوای دەرخست دەربارەی بەندە هەڵبژێراوەکانی، ئینجا لەپاش ئەوە فەرموی: کە بە چەند جۆرێ هەڕەشە و ترساندن چەند جار ئاراستە بکات بۆ ئەمەی بەندەکانی بترسن و خۆیان بپارێزن لە گوناهو تاوان، لەگەڵ ئەوەدا ئاشکرایە زۆربەی خەڵکی گوێ رایەڵ نابن و شتەکەیان لەبیر ئەچێتەوە، جا بەبۆنەی ئەوەوە ئەوا بەشێ لە سەرگوزەشتەی ئادەم و شەیتان ئەهێنێ کە ئەو بەزەیی و چاودێریی یەی خوا پیشان ئەدات دەربارەی ئادەم لەگەڵ گوێ رایەڵی نەکردن و لەبیر چوونی فەرمانی خوادا، بێجگە لەوە بێگومان هێنانی ئەم سەرگوزەشتەیە پێغەمبەر(ﷺ) بەتین تر و بەهێز تر ئەکات لەسەر پارێزگاری فەرمانی خوا و ئەوەی رایگەیاندووەتە لای... ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ﴾ سوێند بەخوا وەسیەتمان کردە لای ئادەم و فەرمانمان پێدا لەمەوپێش، پێش ئەم چەرخ و کاتە، ئەو وەسیەت و فەرمانە بریتی بوو لەوە کە لە میوە و بەرو بوومی هەموو درەختێ بخوا جگە لە تەنها درەختێ کە ئەوەش نموونەی قەدەغەکردن بوو، ئەو قەدەغەیش شتێکی زۆر پێویستە بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی ئیرادە و خواهیش و بۆ بەتین کردن و بەهێزکردنی سەربەستی و بۆ ئازادی لە بەندەیی ئارەزوو و مەبەستەکانی نەفس، بە جۆرێ ئادەمی هەرکاتێ ویستی بتوانێ خۆی رزگار بکات، و نەبێ بە بەندەی ئەڵقە لە گوێ بۆ ئارەزووەکانی و بێگومان بەم ترازووە بەراورد ئەکرێ رادەی بەرزی ئادەمێتی، کەواتە مەردوم هەتا زاڵ تر بێت بەسەر نەفسی خۆی دا و دەسەڵاتی زۆر تر بێت بەسەر گرتنەوەی جڵەوی خۆی دا، ئەو کەسە پلەی ئادەمێتی بەرزترە. هەتا لاواز و پەك کەوتوو تر بێت بەرامبەر ئارەزووی نەفسی ئەو کەسە پلەی ئادەمێتی پەست ترە و رادەی ئاژەڵێتی تێرو تەواو ترە. جا لەبەر ئەوە خوایە کە تیرەی ئادەمی دروست کرد بۆ ئەمەی بیکات بە جێنشین لە زەوی دا هەر لە یەکەم جارەوە ئامادەی کرد بۆ ئەو کارە گرنگە بە تاقی کردنەوەی ویست و سەربەستی یە کە هەیەتی و بە بێدار کردنەوەی هێزی بەرگری یەك کە دروستی کردووە تیای دا، چاوی کردەوە لە ئاستی ئەو بەر بەرەکانێ‌ی کە چاوەڕوانی روودانی ئەکرا لە نێوان ئارەزوو و مەبەستەکانی نەفس کە شەیتان شیرینیان ئەکات و ئەیانڕازێنێتەوە لەپێش چاو و لەنێوان خواهیش و خود سەری و پەیمانێ کە ئادەمی داوێتی بەخوای خۆی، ئیتر پەیمانی سروشتی یان لەگەڵ پەیمانی تریش، خوای گەورە ئەو وەسیەتەی راگەیاند بە ئادەم و بەو جۆرە تاقی کردەوە بەڵام لەو بەراورد و تاقی کردنەوەدا بەرێکی دەرنەچوو،

فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ
أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا
تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ
قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا
سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾

---

وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَنَسِيَ﴾ ئینجا ئادەم ئەو وەسیەت و فەرمانەی بە گرنگ نەگرت و خەریک نەبوو پێیەوە هەتا بێ ئاگا بوو لێ ی و لەبیری چوو، یان بەدەستی ئەنقەست وازی لێ هێنا و بەجێی نەهێنا، بەڵام بە فێڵ و تەڵەکە و سوێندی شەیتان هەڵخەڵەتا، بەهەر جۆر بێ ئەفەرموێ: ﴿وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾ دەستمان نەکەوت بۆ ئادەم خۆگری و دامەزراوی لە راو بریاری دا، واتە لە بەری درەختە قەدەغە کراوەکەی خوارد وەکو بۆمان باس ئەفەرموێ لەم ئایەتانەدا کە دێن: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە فەرمانمان دا و وتمان بە فریشتەکان سوژدە بەرن بۆ ئادەم ﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ﴾ ئینجا ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد جگە لە شەیتان کە ناوی ئیبلیسە، ئەو سەرپێچی کرد و سوژدەی نەبرد. لە شوێنی تردا ئەم بەسەرهات و رووداوەی بە درێژیی باس فەرمووە، بەڵام لێرەدا ئاوەها بە کورتی بەسەری دا ئەڕوا، چونکە شوێنەکە شوێنی باس کردنی چاکە و چاودێریی خوایە بۆ ئادەم، کەواتە تەنها باسی ئەوە شایانە، ﴿فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا﴾ ئێمەیش وتمان ئەی ئادەم بەڕاستی ئەم ئیبلیسە ﴿عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ﴾ دوژمنە بۆ تۆ و بۆ هاوسەرەکەت، ﴿فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ﴾ کەواتە با شەیتان دەرتان نەکات لە بەهەشت، واتە کارێکی وا مەکەن کە شەیتان بکەن بەهۆی دەرکردنتان لێ ی ﴿فَتَشْقَىٰٓ﴾ تا بەهۆی دەرکردنەوە دووچاری زەحمەت و ئەرک و ماندویی ببیت، بەڕاستی ئەمە بەزەیی و سەرپەرشتی و چاودێریی یەکی زۆر گرنگ بوو، کە ئادەمی ئاگادار کرد بەو دوژمنایەتی یە، ترساندی لە غەدر و تاوانی، بێداری کردەوە بە دووچار بوونی پاشە رۆژێکی بەدی خراپ، ئەگەر بەگوێی ئەو دوژمنە بکات، بەڵام ئەگەر بە قسەی نەکات لە بەهەشت دا ئەمێننەوە، ئەو کاتە دوور ئەبێت لە هەر شتێك کە هۆی زەحمەت و ئەرك و ماندوویی یە، پێ ی فەرمو: ﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ﴾ لە بەهەشت دا بە راستی بۆ تۆ ئەمە هەیە کە برسی نابی تیای دا

و رووت نابی ﴿وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ﴾ تینوو نابی تیای دا و خۆر لێت نادات، واته گەرمی سزای نە دەروونت ئەدا و نە لەشت.

بەڕاستی ئاشکرایە کە ئەم چوار شتە بنەڕەتی هەموو خۆشی یەکن و لەم جیهانەدا هەموو هەوڵ و تەقەلایە ئەگەڕێتەوە بۆ فەراهەم هێنان و دەست کەوتنی ئەم چوارە، خوای گەورە ئەم هەموو شتەی خستە پێش چاوی ئادەم(علیه السلام)، بەڵام ئادەم بێ ئاگا بوو لە فرو فێڵ و دەلەسە و تێ نەکەوتبوو و شەیتانیش بە شەیتانی و فرەزانی خۆی لە بارێکەوە بۆی ڕۆیشت کە فریو دەر و خەڵەتێنەرە وەکو بۆمان روون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ ئینجا شەیتان رایگەیاندە لای ئادەم و نیازی خراپی خستە دڵی یەوە، بەم رەنگە ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ﴾ وتی ئەی ئادەم ﴿هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ﴾ ئایا رێنموونیت بکەم بۆ سەر درەختێ ئەگەر هەر کەس لێ ی بخوات ئیتر هەرگیز نامرێ و هەر ئەمێنێ بێ برانەوە؟ ﴿وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ﴾ رێنموونیت بکەم بۆ موڵك و دەسەڵاتێك کە ناڕوا و کەم و لاواز نابێ؟ واتە ئەگەر لەو درەختە بخۆن ئیتر هەرگیز نامرن و لەسەر ئەم بارە ناگۆڕێن و هەر ئەمێننەوە و سوێندی بۆ خواردن کە راستە لەگەڵیان و بەدڵێکی پاك و خاوێنەوە ئەو رێنموونی یە ئەکات. بێگومان تەمەنی درێژ و دەسەڵاتی نەبڕاوە نەفس – بە سروشت – ئارەزووی ئەکات و ئاواتە خوازە بۆی لەبەر ئەوە ئەو وەسیەت و فرمانەی بەجێ نەهێنا، دیارە کە ئەو بەو جۆرە بوو هاوسەرەکەیشی شوێنی ئەکەوێ ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا﴾ ئینجا ئادەم و هاوسەرەکەی ئەو درەختەیان خوارد کە قەدەغە کرابوو لێ یان ﴿فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا﴾ بەهۆی ئەوەوە عەیب و عەورەتیان دەرکەوت بۆیان، کە لەوەو پێش شاراوە بوو لێ یان و نەیانئەبینی ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ﴾ دەستیان کرد بە لکاندنی گەڵای بەهەشت بە خۆیانەوە و لەو گەڵایان ئەدا بەسەر خۆیان دا، بۆ شاردنەوەی عەیب و عەورەتیان ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ﴾ بەو خواردنە ئادەم پێچەوانەی فەرمانی خوا جوڵایەوە و ﴿فَغَوَىٰ﴾ بەو هۆیەوە ون بوو لە رێگای راست و لێ ی لادا. ئەم گوناهە هەرچەند بچووك بوو بەڵام خوا بە گەورە پیشانی دا ئەوەتا جاری یاخی بوون و سەرپێچی و رێگا ون کردنی دا لە ئادەم و ئەوەیش لەبەر ئەوەیە کە ئادەم بەڕێز و پایە بەرز بوو لای خوا، با لەو کاتەدا پێغەمبەریش نەبووبێ، بێگومان ئەبێ ئەو جۆرە بەندەیانە ئێجگار دوور بن لەهەموو جۆرە کردەوەیەکی ناڕەوا و هەر شتێکی ناڕەوا کە بۆ خەڵکی تر گوناه نەبێ بۆ ئەوان بە گوناه دائەنرێ، بێجگە لەمانەش بە گەورە گرتنی ئەم کردەوە بچووکەی ئادەم ئەبێتە تەمێ و ترساندن و بەرگری یەکی بەهێز بۆ رۆڵە و نەوەکانی.

ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا

---

﴿ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ﴾ ئینجا خوا ئادەمی هەڵبژارد بۆ پێغەمبەرێتی و نزیکی خستەوە بەمەی خستیە دڵی یەوە، گەڕانەوەی بۆلای خوا و داوای لێ بوردن لێ ی ﴿فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ﴾ بەهۆی ئەوەوە تۆبە و گەڕانەوەکەی وەرگرت و ڕێنموونی کرد بۆ دامەزراندن لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی خۆی. ئینجا فەرمان درا بە دەرچوونی ئەم دوو کەسە کە ئاژاوە و بەربەرەکانێ هەیە لە نێوانیان دا، فەرمان درا بە دەرچوونی ئادەم و شەیتان، وەکو ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ﴾ خوا فەرمووی دەرچن لە بەهەشت و بچنە خوارەوە هەمووتان بە کۆمەڵ ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ﴾ کە دوژمنی یەکترن و هەندێکتان دوژمنن بۆ هەندێکی ترتان بە خۆتان و رۆڵە و نەوەتانەوە، کەواتە هەر لەو کاتەوە جاڕی ئاژاوە و دوژمنایەتی درا لە نێوان ئەم دوو تیرەدا، هیچ کەس لە نەوەکانی ئادەم هیچ بەهانەیەکیان نی یە و نابێ بڵێن نەمانزانی و بێ ئاگا بووین، چونکە ئەوا زانی یان و هەواڵیان پێ درا و لە یەکەم جارەوە باوکە گەورەیان هەڵەخەڵەتا بە درۆ و سوێندی شەیتان، تا لە ئەنجام دا هەمووی دووچاری زەحمەت و ناڕەحەتی کردن لەگەڵ ئەم جاڕی دوژمنایەتی یەدا کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی و مەلائیکە بیستیان و شایەت بوون لەسەری... لەگەڵ ئەوەدا خوای خاوەن بەزەیی هەر بەوە وازی نەهێنا، بەڵکو هەر لە ئادەمی ی پێغەمبەرانیشی بۆ ناردن بۆ ڕێنموونی و پیشاندانی ڕێگای ڕاست و روون کردنەوە و جیا کردنەوەی هەموو هەق و ناهەقێک، وەکو بەم فەرمودەیەش تێمان ئەگەیەنێ: ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾ ئینجا ئەگەر لەلایەن منەوە ڕێنموونیتان بۆ هات بەم ڕەنگە ئایین و کتێبی خۆمم بۆ ناردن بە پێغەمبەران دا، ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ﴾ ئەوە هەرکەس شوێنی ڕێنموونی من بکەوێ ئەوکەسە لە دنیادا ون نابێ و گومڕا نابێ و لە ڕۆژی دوایش دا دووچاری سزا و زەحمەت نابێ، ﴿وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا﴾ هەرکەس ڕوو وەرگێڕێ لە ڕێنموونی من و پشتی تێ بکات بە

راستی ئەو کەسە گوزەرانێکی زۆر تەنگی ئەبێ و ژیانێکی ناخۆش بەسەر ئەبات، گوزەرانێکی تەنگ و ژیانی ناخۆش بریتی نی یە لە نەبوونی و کەم و کوڕی سامان و دارایی و هەروەها لەو بارەکەی تریشەوە ژیان و گوزەرانی خۆش بریتی نی یە لە سامان و دارایی زۆر و خۆراك و پۆشاکی بە نرخ و فراوان، بەڵکو ژیان و گوزەرانی تەنگ و تاڵ بریتی یە لە بێ ئارامی دڵ و چاوبرسێتی و تێر نەخواردن، ژیان و گوزەرانی کامەرانی و خۆشیش بریتی یە لە ئارام و ڕەزامەندی دڵ و دەروون، ئەی ئاشکرایە بۆ هەموو خاوەن ژیریی یەك هەرکەس بە تەواوی ڕوو وەرئەگێڕێ لە خوا و پشت بکاتە ئایین و بەرنامەی خوا، ئەو کەسە هەموو مەبەست و ئامانجی ڕوو ئەکاتە ڕابواردن و کۆ کردنەوەی دارایی و سامان و هەموو کات چاو ئەبڕێتە شت و مەکی ئەم جیهانە و هەموو توانای خۆی بەکار ئەهێنێ و بەختی ئەکات بۆ ئەو مەبەستە، ئەوکاتە تەنگی و تاریکی ڕوو ئەکاتە دڵی لە هەموو لایەکەوە و ئارامی لێ ئەبڕێ، تەنگ و تاریکی بڕانی لە خوا و لە یادی بەزەیی یە فراوانەکەی خوا و لە ئارام گرتن لە سایە و پەنای دا، کە ئەو یاد و ئارامە خۆشترین شتە بۆ دڵ و دەروون، تەنها ئیمانداری ڕاستەقینە نرخیان ئەزانێ... تەنگ و تاریکی سەرگەردانی و بەد گومانی و دانەمەزراوی.. تەنگ و تاریکی چرووکی و چاوبرسێتی و چاو تێ بڕینی ئەوەی هەیەتی و مەترسی نەمان و کەم و کوڕی.. تەنگ و تاریکی هەڵپە و پەلاماردان و بەدەمەوە چوون و گەڕان بەدوای هەموو تەماع و سوود و قازانجێك دا.. بەڵام بە پێچەوانەی ئەم کەسەیە کەسێ کە دڵی دامەزراوە بە یادی خوا و ئیمانی ڕاستەقینە بەخوا و شوێنی ڕێنموونی خوا و ئایینی خوا کەوتن، ئەم ئیماندارە ئارامی ئیمانەکەی ژیانەکەی کامەران و پاك و خاوێن و بەرەکەت دار ئەکات، بێجگە لەمانەش شوێن کەوتنی ڕێنموونی و بەرنامەی خوا بە ڕێك و ڕاستی هۆی زۆری و فراوانی سامان و دارایی و ناز و نیعمەتە، هۆی بەردەوامی و دووری یە لە بەلا و بەسەرهاتی خراپ کە ژیان تاڵ ئەکەن، بەڵام پشت کردنە خواو بەرنامەی خوا هۆی بێ فەڕی و خێر لێ نەبینین و داباریني بەلاو بەسەرهاتی خراپە.. ئەو کەسەی کە ڕوو وەرگێڕێ لە ئایین و بەرنامەی خوا لەم جیهانەدا بەو جۆرە تەنگ گوزەرانە و ژیانێکی ڕاستەقینەی خۆشی نی یە، ئیتر با بوەستێ ژیانی سەختی سامناکی ئەو کەسە مەگەر تەنها خوا بزانێ چۆنە؟

وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ
أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ وَلَعَذَابُ
ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ أَفَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامٗا وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ﴿١٢٩﴾

---

لێرەدا نموونەیەك لەو ژیانە خراپە باس ئەكات كە ئەفەرموێ: ﴿وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ﴾ ئەو كەسەی كە روو وەرئەگێڕێ ئێمە بە كوێری حەشری ئەكەین لە رۆژی دوایی دا، ئەوەش لە تۆڵەی ئەوەی كە لەم جیهانەدا خۆی كوێر كرد لە ئاستی ئایەتەكانی خوا و سەرنجی نەدان. وەكو روون ئەبێتەوە لەم پرسیار و وەڵامەدا: ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا﴾ كابرا كە بە كوێری حەشر ئەكرێ، پرسیار ئەكات و ئەڵێ: ئەی خوای پەروەردگارم ئایا لەبەرچی بە كوێری حەشرت كردم لەكاتێك دا كە من لەدنیادا چاوساغ و بینا بووم؟ لە وەڵامی دا ﴿قَالَ﴾ خوا ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ﴾ تۆ لە دنیادا وێنەی ئەوەت كرد و بەو جۆرە بوویت ئەوەش ئەمەبوو: ﴿أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا﴾ ئایەتەكانی ئێمەت بۆ هات كە روون و رووناك بوون ئینجا تۆیش كوێر بوویت لە ئاستیان و لێ یان گەڕایت و تەماشات نەكردن. ﴿وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ﴾ هەروەها تۆیش ئەمڕۆ گوێت پێ نادرێ و ئەمێڵرێیتەوە لە كوێری و سزادا ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ﴾ بەو جۆرە ئێمە تۆڵە ئەسێنین لە كەسێ كە لە دنیادا زیادە رەوی كردبێ لە توانین دا و سەری كردبێتە پێك هێنانی ئارەزووە ناڕەواكانی و باوەڕی نەهێنابێ بە ئایەتەكانی پەروەردگاری خۆی ﴿وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ﴾ سوێند بەخوا سزای رۆژی دوایی بەتین ترە لەسزای دنیا و بەردەوام ترە، چونكە نەبڕاوەیە، خوا پەنامان بدات لێ ی. ئینجا سەرنجێكی بێ باوەڕەكان رائەكێشێ و چاوێكیان پێ ئەخشێنێ بۆ دواوە و بۆ ناو ئەو هەموو گەل و میللەتە یاخی و مل هوڕانە كە بەهۆی باوەڕ نەهێنان و تاوانیانەوە خوا

لە ریشەی هێنان، کەواتە با بێ باوەڕەکانی ئەم میللەتە بترسن و تەمێ خوار بێن لەوانەوە، بیرێ بکەنەوە و فریای خۆی کەون پێش ئەوەی شتەکە لەدەست دەرچێ، ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ﴾ ئایا خوا ڕێنموونی ئەم بێ باوەڕانەی نەکردووە و بۆی روون نەکردوونەتەوە بەم رەنگە کە ئەفەرموێ: ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ﴾ زۆرمان بەرباد کردووە لە چین و گەلی چەرخەکانی رابوردووی پێش ئەمان ﴿يَمْشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمْ﴾ لەکاتێك دا کە ئەم بێ باوەڕانە هاتوچۆ ئەکەن و ئەگەڕێن بە جێ و شوێنەکانیان دا، بە چاوی خۆیان دروشم و نیشانەکانی بەرباد بوونیان ئەبینن کاتێ ئەڕۆن بۆ ئیش و کار و بازرگانی بەرەو شام و بەرەو یەمەن، واتە بەڵێ خوا ئەوانەی بۆ باس کردوون و خۆیشیان نیشانە و دروشمی وێران بوونی وڵاتەکان و بەرباد بوونی دانیشتوەکانی بەچاو ئەبینن، کەواتە زۆر نەفامی یە تەمێ وەرنەگرن با وەکو ئەوانیان بەسەر نەیەت، بێگومان بیر کردنەوە لە بەرباد بوونی گەلانی رابوردوو بە تایبەتی سەرنج دانی جێگا و شوێنی وێران بوویان زۆر گرنگ و بەکارە بۆ تەمێ دادان جڵەو گرتنەوە لە مل هوڕی و تاوان و خراپەکاری، بەڵام زۆربەی ئەم بێ باوەڕانە تەمێ وەرناگرن، چونکە کەسێ تەمێ خوار ئەبێ کە ژیر و خاوەن فام بێ، ئەمانە نەفام و نەزانن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ﴾ بەڕاستی لە بەسەرهاتی ئەو گەلە پێشووانە و بینینی شوێنەواریان چەند بەڵگە و نیشانەی روون هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن ژیری یەکن کە بەرگری خاوەنەکانیان ئەکەن لە شتی ناشیرین و خراپ. ئەم ئایەتە پێشووە هەڕەشەیەکی سامناکی لێ وەرئەگیرێ دەربارەی بێ باوەڕەکانی ئەم میللەتە، ئەو تاقمەی کە خۆیان بە مل هوڕ دائەنا و بەر بەرەکانێ یان ئەکرد لەگەڵ ئایەتەکانی خوا و لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)، ئینجا هۆی بەدی نەهێنانی ئەو هەڕەشەیە روون ئەکاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى﴾ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە لەلایەن خوای تۆوە بەڵێن و بڕیارێ پێش کەوتووە و رابوردووە بە مۆڵەت دان و هێشتنەوەی ئەمانە و بەرباد

نەکردنیان، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ماوەیەکی ناوبراو و دیاریی کراو دانراوە بۆ ژیانی ئەمانە لەم جیهانەدا، یان بۆ هاتنی سزایان... ئەگەر لەبەر ئەوانە نەبوایە، بێگومان سزا و تۆڵەیان ئەنووسا پێ یانەوە، ئەمانیش بە وێنەی گەلە پێشووەکانیان بەسەر ئەهات، بەڵام خوا ئەوەی بەسەر ئەم ئوممەتە نەهێنا، لەبەر چەند حیکمەت و بەرژەوەندی یەکی گەورە، کە خۆی بە تەواوی ئەیانزانێ و زانایان چەند بەشێکیان لێ باس کردووە:

١- گەڕانەوەو تۆبە کردنی زۆر لەو یاخی یانە کە ئەوەش شتێك بوو بەچاو ببینرا، بۆ وێنە(خالیدی کوڕی وەلید و عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل) و ئەوانی تر کە پێویست نی یە بە باس کردنیان، هەروەها موسڵمان بوونی ئەو هەموو رۆڵە و نەوە و وەچەی کە لە پاشان پەیدا بوون.

٢- زیادە رێز گرتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نەهێشتنی ئەو جۆرە سزایانە کە لەوەو پێش هەبوون تا ئەو ماوەو لەناو ئەو گەلەدا بێت وەکو ئەفەرموێ: ﴿وما کان الله لیعذبهم و انت فیهم﴾ خوا سزای بەرباد کردنی ئەوانە نادات تا تۆ لەناویان دا بیت. کەواتە مۆڵەت دانەکە رەحم و بەزەیی بوو دەربارەی خەڵکی و هۆی زۆر بوونی ئوممەت و شوێن کەوتووەکانی پێغەمبەر بوو(ﷺ) کە ئەوەش ئومێد و ئامانجێکی گرنگ بوو، سەرانسەر بەخێرو چاکەی ئەو تەواو ئەبێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەشدارە لە هەموو چاکەی ئوممەت دا بە چەندانە تا رۆژی دوایی بێ ئەمەی پاداشت و ئەجری ئەمان کەم بێتەوە.

ئینجا ماتوڵ مۆڵەتی ئەو یاخی یانە ئەدا و سزایان دوا ئەخات، ئیتر چارە و رێگای پێغەمبەر(ﷺ) ئەبێ هەر خۆ گرتن بێت و توێشووی ئەو رێگایەیش پەرستنی خوایە و یاد و پەیوەندی یە لەگەڵ خوادا و گوێ پێ نەدانە بەو یاخی یانە و هەر باش و بۆشی یەکی ئەم جیهانە کە پێ یان دراوە بۆ تاقی کردنەوەیان،

﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ ﴿١٣٠﴾﴾

لەبەر ئەوە فەرمووی پێی: ﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ کەواتە ئەی پێغەمبەر خۆت بگرە و سەیر بکە لەسەر ئەوەی ئەوانە ئەیڵێن دەربارەی خۆت و ئایینەکەت ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ﴾ نوێژ بکە بە جۆرێ سوپاسی پەروەردگاری خۆت بکە لەسەر ڕێنموونی و گەیاندنت بە ڕێگای ڕاستی خوا، یان پەروەردگاری خۆت بە پاکی ڕاگرە لە هاوبەش و هەموو شتێکی تر کە شایان ئەو نی یە، سوپاس بکە لەسەر ئەوەی تۆی جوێ کردووتەوە بەم ئایین و شەریعەتەی پێی داوی، دان بنێ بەوەدا کە خوا خاوەن و بەخشندەی هەموو بەهرە و چاکەیەکە... خوای خۆت بەو جۆرە بپەرستە ﴿قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ﴾ لەپێش هەڵاتنی خۆر و ﴿وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ﴾ لەپێش ئاوا بوونی دا ﴿وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ﴾ لەهەندێ کات و ساتەکانی شەودا خوا بپەرستە نوێژ بکە ﴿وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ﴾ هەروەها لەم سەر و ئەو سەرەکانی ڕۆژدا، واتە بەیانیان و ئێواران، خوای خۆت لەو کاتانەدا بپەرستە ﴿لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ﴾ بە ئومێد و چاوەڕوانی ئەوە ئەجرو پاداشتێکت لای خوا دەست کەوێ کە ڕازی بیت پێی. بێگومان پەرستنی ڕاستەقینەی خوا یاد و پەیوەندی یە بە خواوە بە یاد و پەیوەندی بە خواوە ئارام و ڕەزامەندی لە دڵ و دەروون دا جێگیر ئەبێت و ئارام و ڕەزامەندی و دڵنیایی خۆشتر و بە نرخ ترین بەهرە و دەست کەوتێکە کە چارەسەری هەموو ناخۆشی و بەسەرهاتی خراپ و داخ و دووی ئەم جیهانەی پێ ئەکرێ. مەبەست لەم کاتانەدا کاتەکانی ئەم پێنج فەرزەیە لەگەڵ کاتی شەو نوێژدا، یان مەبەست هەمیشەیی پەرستن و یاد و پەیوەندی یە، بە هەرکام مەبەست بێت خوا ئەو فەرمانەی دا بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ)،

وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ

وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴿١٣١﴾ (١٣٢)

**ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ بە شێوەی خۆشەویستی و ئاواتە خوازی درێژە مەدە بە سەرنجی چاوەکانت بۆلای ئەو دەسەڵات و دارایی و شت و مەکەی کە داومانە بە چەند تاقمێ لە بێ باوەڕەکان و سوودمان پێ گەیاندوون بەهۆی ئەو شتانەوە کە ئەوەش پێمان داون ﴿زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ زینەت و جوانی ژیانی ئەم جیهانەیە کە بە زوویی تێپەڕ ئەکات بە وێنەی گوڵ کە چەندە جوان و شیرینە، کەچی ئەوەندەی پێ ناچێ سیس و وشک ئەبێ و ئەوەش کە پێمان داون ﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ بۆ ئەمەیە تاقییان بکەینەوە تیای دا دەربارەی تا دەرکەوێ بۆ خەڵکی ئایا ئەوانە سوپاسی خوای خۆیان ئەکەن و هەڵئەسن بە مافی ئەو بەهرە و چاکەیانە؟ یان پێمان داون بۆ ئەمەی لە رۆژی دوایی دا سزایان بدەین لەسەریان. ﴿وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ ئەو رۆزی یە پەروەردگارت بۆی ئامادە کردووی لە رۆژی دوایی دا یان ئەو پێغەمبەرێتی و پایە بەرزی یەی کە کردوویەتی بە بەش و رۆزی تۆ ئەوە چاکترین و بەردەوام و نەبڕاوەیە. واتە چاوت نەڕوانێ بۆ ئەو شت و مەکەی کە لەم جیهانەدا داومانە بەوانە کە گڕ و فڕێکە و بە نیازی خێرو چاکەیش پێمان نەداون، بەڵکو چاوت هەر بۆ ئەوە بڕوانێ کە بە تۆ دراوە و ئەدرێ. وێنەی ئەم ئایەتە لە چەند سورەت و جێگایەکی تردا هەیە و مەبەست بەهەموویان دڵنەوایی پێغەمبەرە(ﷺ) و رێنموونی یەتی بۆ ئەوەی هەمیشە دامەزراو بێت لەسەر ئەو بارە راستەی کە لەسەریەتی و رێنموونی ئوممەتەکەی بۆ پەیڕەوی کردن و لانەدان لە رێگا راستەکەی ئەو، پێویستە بزانرێ کە مەبەست بەم جۆرە ئایەتانە رێنموونی و بانگ کردن نی یە بۆ خۆ گرتنەوە و قەدەغە کردنی هەموو خۆشی و ژیانی پاک و خاوێن و رابواردنی راست و رەوای ئەم جیهانە، چونکە شتی وا دوورە لەم ئایینی پاکی ئیسلامەوە بە پێی فەرمودەی خوا و فەرمودە و کردەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵکو مەبەست بانگ کردنە بۆ شانازی کردن و دڵ بەستن تەنها بە رەزامەندی خوا و پەیوەندی و ئەو شتانەی کە نەمان و فەوتان روویان تێ ناکات ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ ئەی پێغەمبەر فەرمان بدە بە ئال و بەیتەکەت، یان بە هەموو شوێن کەوتووەکانت لە ئوممەتەکەت، فەرمانیان پێ بدە بە نوێژ کردن و خۆیشت بەردەوام بە لەسەری،**

لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقًاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴿١٣٢﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَا يَأۡتِينَا بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّهِۦٓۚ أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ فَتَرَبَّصُواْۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾

---

بە رێکی بەجۆی بێنە و دانی بەسەردا بگرە ﴿لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقًاۖ﴾ ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین نە بۆ خۆت و نە بۆ ئەوان ﴿نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ﴾ ئێمە ڕۆزی تۆ ئەدەین، هەروەها ڕۆزی ئەوانیش، کەواتە خۆت یەك تەن و یەك دڵ بکە بۆ کاروباری ڕۆژی دوایيت. ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ پاشە ڕۆژی چاك بۆ لەخواترسی یە، کەواتە بۆ ئەو کەسانەیە کە لە خوا ئەترسن و بەهۆی ئەوەوە خۆیان ئەگرنە لە تاوان و خراپەکاری، بێگومان نوێژی ڕاستەقینەش ئەو سیفەتە پەیدا ئەکات، ئەو قەڵغانە بەتینە فەراهەم ئەهێنێ بۆ مەردوم. لە پێشەوە فەرمانی دا کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆگر بێت لەسەر ئەوەی ئەو یاخی یانە ئەیڵێن دەربارەی خۆی و ئایینەکەی، ئینجا ئەوا ئەگەڕێتەوە سەریان و داوایەکی زۆر بێ جێ و قسەیەك لە قسە ناڕەواکانیان ئەهێنێ، بۆ ئەمەی بیانباتەوە بە خۆیان دا و بەرپەرچی وتە ناڕەواکانیان بداتەوە. کورتەی داوا و وتە ناڕاستەکەشیان ئەمەیە: قورئانیان بە موعجیزە دانەنا و داوای موعجیزە و نیشانەی پێغەمبەرێتی یان ئەکرد، بێگومان مەبەستیان بڕ و بیانوو بوو ئەگەر نا ئەیانزانی کە قورئان موعجیزە و نیشانەیەکی تێرو تەواوە و هەموو لە ئاستی سەرگەردان و داما و دەستە پاچەبوون، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَوۡلَا يَأۡتِينَا بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّهِۦٓۚ﴾ ئەوانە وتیان: ئەگەر ڕاستە محمد پێغەمبەرە دەی با نیشانە، بەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ بێنێ لەلایەن خواکەیەوە تا ڕاستی و پێغەمبەرێتی یەکەی دەرکەوێ و ئاشکرا بێ لێمانەوە. ئینجا خوایش ئەیانباتەوە بە خۆیان دا و بەرپەرچی داواکەیان ئەداتەوە بەوە کە قورئانیان بۆ هاتووە و ئەو قورئانەش گەورەترینی هەموو موعجیزەو نیشانەیەکە و شتێکی هەمیشەیی و هەموو کاتی یە، وێنەی ئەو موعجیزانە نی یە کە ئەمانە داوای ئەکەن، وێنەی ئەو موعجیزانە نی یە کە پێغەمبەرە پێشووەکان پێی هاتوون، بۆ وێنە: وەکو ئەو دوو موعجیزەی موسا(علیە السلام) کە لەم سورەتەدا باسی فەرمون، کە ئەو جۆرە موعجیزانە شتێکی هەمیشەیی نین، بەڵکو هەر بۆ ئەو

کاتە بەکار هێنراون و روویان داوە تیای دا و زۆر تر بۆ ئەو تاقم و چینە بەکار هاتوون کە بەچاو شتەکەیان بینیوە، ئیتر بۆ تاقم و چینێ تر ئەو هێزەیان نەماوە، بەڵکو هەر کار ناکات لە بێ باوەڕان بە تایبەتی لەپاش نەمانی پێغەمبەرەکە و تێپەڕ کردنی چەند کات و چەرخێ بەسەری دا.. بۆ وێنە ئەو هەموو موعجیزە گەورە گەورانەی کە لەسەر دەستی موسا و عیسادا روویان داوە – درودی خوایان لەسەر بێت – ئەو هەموو موعجیزانە بە ئێستای جوولەکە و گاورەکان چی؟ ئەتوانن بە کێی بسەلمێنن کە ئەو موعجیزانە روویان داوە؟ بەلام قورئانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی هەمیشەیی و هەموو کاتی یە، لە هەموو چەرخێك دا تەڕ و تازەیە، بەڵکو لەپاش پێغەمبەرو ئێستا و لەمەوپاش هێزو دەسەڵاتی ئاشکرا ترە لە خەڵکی، چونکە زۆر شتی نهێنی قورئان هەیە لەکاتی هاتنە خوارەوەی و لە چەرخی پێغەمبەرو چەند چەرخێ تر پاش خۆی ئەو شتە نهێنی یانە دەرنەکەوتوون بۆ خەڵکی، تا دنیا دنیایە ئەو شتە نهێنی یە نایابانە دوایی نایەن و بەرە بەرە خوا دەریان ئەخات و تا بێت قورئان بەهێز تر ئەبێ لە پێش چاوی مەردوم و جوولەکە و گاورەکان ئەگەر بیانەوێ موعجیزەکانی موسا و عیسا روون بکەنەوە و بیسەلمێنن بە خەڵکی بە هیچ کلۆج ناتوانن لەم بارەوە نەبێ پەنا بێنن بە قورئان بۆ ئەو مەبەستە.. قورئان لە چەند بارو روویەکەوە موعجیزە و نیشانەیەکی روون و رەوانە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمان(ﷺ) یەکێ لەو بارو روانە ئەمەیە: کە ئەم قورئانە کورتە و خولاسەی کتێب و پەڕاوە پێشووەکانی ئوممەت و میللەتە رابوردووەکانی تێدایە، کە ئەوەش شتێکی نهێنی و غەیبی بووە بە هیچ کلۆج لەلایەن خواوە نەبێ ئاگاداری بەسەر ئەوەدا نابێ و ناگونجێ، بە تایبەتی ئەو پێغەمبەرە کە ئەم قورئانەی راگەیاند کەسێکی نەخوێندەوارە و لەناو گەلێکی نەزانی بێ ئاگای نەخوێندەواردا پێگەیووە و تێکەڵی خوێندەواریشی نەکردووە، کەواتە قورئان هەرچۆنێ موعجیزە و نیشانەیەکی روونە لەسەر پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ) هەروەها نیشانە و بەڵگەیشە لەسەر راستی پێغەمبەرە پێشووەکان و ئەو کتێب و پەڕاو و ئایینەی کە ئەوان هێنایان، جا لێرەدا لەم بارەوە بەرپەرچی داوای بێ باوەڕەکان ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ ئایا ئەوانە قورئانیان بۆ نەهاتووە کە بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکرایە لەسەر راستی ئەوەی کە لە کتێب و پەڕاوە پێشووەکان دا بوو؟ واتە بەڵێ قورئانێکی ئاوا و موعجیزەیەکی وا بەهێزیان بۆ هاتووە، کەواتە چۆن بیر ناکەنەوە لەم موعجیزە گەورەیە و داوای بەڵگە و نیشانەی تر ئەکەن؟ بەڕاستی زۆر جێگای سەر سوڕمانە ئەو داوایە، بەلام وەکو لە پێشەوە

وتمان ئەوانە هەر مەبەستیان لاری و بڕ و بەهانە بوو، خوایش بڕو بەهانەی بڕبون ئەگەر چی دانیان پێدا نەئەنا وەکو لەم فەرمودەیشەوە روون ئەبێتەوە ﴿وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ﴾ ئەگەر لە مەرجێك دا ئێمە بێ باوەڕەکانمان بەرباد بکردایە بە سزایەك پێش ڕەوانە کردنی محمد بۆ سەریان ﴿لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ﴾ بێگومان لە ڕۆژی دوایی دا ئەیان وت: خوایە کاشکێ پێغەمبەرێکت ڕەوانە بکردایە بۆلامان، ئینجا ئێمەیش شوێنی ئایەتەکانی تۆ ئەکەوتین کە ئەو پێغەمبەرە ئەی هێنان پێش ئەمەی زەلیل و سەر شۆڕ بووینایە بە سزای دنیا و بێ ئابڕوو ببین بە سوتان و کەوتنە ناو ئاگری دۆزەخ، بە کورتی ئەگەر پێغەمبەرمان ڕەوانە نەکردایە بۆ سەریان لە ڕۆژی دوایی دا بیانوویان ئەهێنایەوە بۆ کوفر و بێ باوەڕی یەکەیان، بەڵام لەپاش ناردنی پێغەمبەر ئیتر بیانوویان بڕا و ڕێگای قسەیان نەما و دووچاری پاشەڕۆژی سەخت و سزای بەتینی خۆیان دێن و ماتوڵ پاشەڕۆژی ئەمانە ئەوەیە، کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) گوێی نەبێ لێ یان و دڵتەنگ و ناڕەحەت نەبێ بەو باوەڕ نەهێنانەیان، چونکە خۆیان تاوانبارن و سوچ لە خۆیانەوەیە.. پێ یان ڕاگەیەنێ کە ئەم چاوەڕوانی هاتنی ئەو پاشە ڕۆژە سامناکەیە بۆیان، ئیتر ئەوان چاوەڕوانی چی ئەکەن با بیکەن، لە دوایی دا تێ ئەگەن و ئەزانن کێ لەسەر ڕێگای ڕاست بووە؟ وەکو ئەفەرموێ: ﴿قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا۟﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ هەموو یەکێ لە ئێمە و ئێوە چاوەڕوانی پاشە ڕۆژین بۆ خۆمان و بۆ یەکتر، کەواتە چاوەڕوانی بکەن چۆن ئارەزووی ئەکەن! ﴿فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ﴾ لەمەوپاش بەم نزیکانە ئەزانن کە کێن خاوەنەکانی ڕێگای ڕاست و ئایینی ڕاست، کێ لە گومڕایی دەرچووە و کەوتووەتە سەر ڕێگای ڕاست و ڕێنموونی وەرگرتووە؟ واتە بێگومان بۆتان روون ئەبێتەوە بە باشی لەمەوپاش ئەزانن، کە ئێمە لەسەر ئایینی ڕاست بووین و ئێوە گومڕا و سەر لێ تێك چوو بوون.

**دوایی هات سورەتی(طه ) لە بەیانی ڕۆژی جومعە ١٤٠٠/٥/٥ خوا یارمەتی بدات بۆ لەمەو پاش و بە بەزەیی خۆی وەری گرێ – آمین –.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم
مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ

## سورەتی(الأنبياء)
## مەككەیی یەو(١١٢) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە سورەتێكی زۆر گەورەیە، ئامۆژگاری گەورەو گرنگی تێدایە بە وێنەی زۆربەی سورەتە مەككەیی یەكانی تر هەموو باس و مەبەستەكانی ئەگەڕێتەوە بۆ چاندن و دامەزراندنی عەقیدەو باوەڕ بە تاك و تەنیایی خواو پێغەمبەرێتی پێغەمبەرو راستی قورئان و هاتنی رۆژی دوایی، لە یەكەم جارەوە چەند رستەیەك ئەمێنێ كە زۆر بەمێزن و دڵ و دەروون ئەهێنێتە لەرزەو داینەچڵەكێنن، بەڵام دڵ و دەروونێ كە زیندوو بێ و ئامادەیی تێدا بێ بۆ بێداربوونەوە و بیر كردنەوە. ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ﴾ نزیك كەوتووەتەوە لە خەڵكی یەوە حیساب و لێ پرسینەوەیان لەو كردەوانەی لەم جیهانەدا كردوویانە، واتە كاتی هاتی رۆژی دوایی نزیكە كە لەو رۆژەدا پرسیار ئەكرێ لە خەڵكی، بە گوێرەی كردەوەیان پاداشت و تۆڵەیان ئەبێت. بەڵێ بەڕاستی ئەو رۆژە نزیكە، ئیتر هەرچەندە كات و چەرخی ترمی مابێ، چونكە بەلای خواوە نزیكە با خەڵكی بە دووری دابنێن، نزیكە كاتێ كە ئەوەی ماوە لە تەمەنی ئەم جیهانە بەراورد بكرێ لەگەڵ ئەوەی تێپەڕی كردووە، نزیكە چونكە بێگومان ئەو رۆژە بەدی دێت، هەرچی بەدی بێت نزیكە، دوور ئەو شتەیە كە رۆیشت و تێپەڕی و دوایی هات و ئیتر نابێ، بێجگە لەمانەش: بێگومان مردن نزیكە و هەركەس بمرێ پێ یەك ئەنێتە ئەو رۆژەو دەست ئەكرێ بە جۆرێ لە حیساب

و پرسیاری. كەواتە زۆر راستە نزیك كەوتنەوەی ئەو رۆژە لە خەڵكی یەوە، ﴿وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ﴾ لەكاتێك دا خەڵكی لە بێ ئاگایی دایەو هۆشی بەلای ئەو حیساب و پرسیارەوە نی یە كە یەخەی ئەگرێ ﴿مُّعْرِضُونَ﴾ روو وەرگێڕاوە و پشت تێكەرن لە بیر كردنەوەو خۆ ئامادە كردن بۆ ئەو رۆژە ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾ لە لایەن پەروەردگاریانەوە ئامۆژگاری یان بۆ دێت كە بێداریان بكاتەوە لە خەوی بێ ئاگایی و نەزانی، كات لە دوای كات ئەوەشیان بۆ تازە ئەكرێتەوە و ئەدرێتەوە بە گوێچكەیان دا، هیچ لەو ئامۆژگاری یانەش نی یە كە بە باشی نەبیستن، لە كاتێك دا هیچ گوێ یان نی یە لێ یان و گاڵتە ئەكەن و لاقرتی یان پێ یان دێت. ئەو ئامۆژگاری یانە بە باشی ئەچێ بە گوێچكەیان دا، بەلاَم لە كاتێك دا ﴿لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾ دڵەكانیان بێ ئاگایە لە بیر كردنەوە لێ یان.

سەرەتای ئەم سورەتە هەرچەند لە یەكەم جارەوە هاتە خوارەوە دەربارەی كۆمەڵێكی تایبەتی لە دڵ مردووەكانی یەكەم چین كە ئەم قورئانەی چوو بە گوێچكەدا، بەلاَم ئەم نیشانەو شێوەی كە باسی فەرمووە بۆ هەموو كەسێكی كە لە بۆشی دڵ خاڵی یە، لە هەموو چەرخ و كاتێك دا، لە هەموو تاقم و گەلێك، بەم سیفەت و نیشانانە دڵە مردووەكان – كە قوفڵ دراون و هەرگیز تەمێ وەرناگرن – جوێ ئەبنەوە لە دڵە زیندووەكان كە كراوە و ئامادەن بۆ گوێ رایەڵی و وەرگرتنی هەموو ئامۆژگاری و تەمێ یەك. ئەو كۆمەڵە سەرەڕای ئەوە كەللە بۆش و دڵ مردوو بوون و بە دیمەن لاقرتی یان ئەكرد و نرخێكی ئەوتۆیان بۆ قورئان دانەئەنا، بەلاَم لە دەروون دا سام و ترسی ئەم قورئانە هێنا بوونیە دڵە لەرزەوە و كەوتبوونە چم و چار بۆ بەرگری كردنی بە پڕو پاگەندە بە چەند جۆرو شێوەیەك كە لەوەو پاش باس ئەكرێن زۆر بە نهێنی خەریك ئەبوون بۆ دیاریی كردنی جۆرو شێوەی پیلان و پڕو پاگەندەكەیان بۆ ئەمەی كۆمەڵی ژێر دەستەو گشتی خەڵك نەزانن بەو گرنگی و سام و ترسی قورئانە كە دەروونی سەرۆكە پیلان گێڕەكانی داگیر كردبوو،

وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ۖ أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّى يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۖ

ئەفەرموێ: ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئەو تاقمە کە ستەمکار بوون و بت پەرست بوون ئەیان ویست کە خەڵکی گومڕا بکەن، ئەو تاقمە زاڵە قسەو باس و راوێژیان لەبارەی پێغەمبەرەوە زۆر بە نهێنی کرد، لە نێوان خۆیان دا بە چپەو نهێنی ئەمەیان ئەوت: ﴿هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ ئایا ئەمە – واتە محمد – هیچ شتێکی ترە جگە لە ئادەمی یەك بە وێنەی خۆتان؟ واتە نەخێر فریشتە نی یە و هەر ئادەمی یەکە وێنەی خۆتان، کەواتە پێغەمبەر نی یە و ئەوەش بە گوێرەی تێگەیشتنی ئەوان کە پێغەمبەر ئەبێ فریشتە بێت و نابێ ئادەمی بێت، ماتوڵ پێغەمبەر نی یەو ئادەمی یە، کەواتە ئەوەی رایئەگەیەنێ و ئەیڵێ و خەڵکی سەرسامە لێ ی و لەچاردا نی یە، ئەوە لە لایەن خواوە نی یە، بەڵکو سیحر و جادووە ﴿أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ﴾ دەی ئایا ئێوە ئەچن بۆلای جادو سیحرو باوەڕی پێ ئەهێنن و شوێنی ئەکەون ﴿ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ لە کاتێك دا کە خۆتان شتەکە ئەبینن، واتە بە چاوی خۆتان ئەبینن کە محمد پیاوێکە وەکو خۆتان، کەواتە ئەزانن ئەوەی ئەیڵێ جادووە دەی ئیتر چۆن باوەڕی پێ ئەهێنن و شوێنی ئەکەون؟ خوای گەورە هەواڵی ئەو کۆبوونەوە و راوێژە ناڕەوای دا بە پێغەمبەر(ﷺ) و ئاگاداری کرد بەسەر پیلانەکەیان دا، فەرمانی دا کە کاروباری خۆی و ئەو بێ باوەڕانە هەواڵەی خوا بکات و بیداتە دەست خوا، پێغەمبەریش وای کرد و هەموو شتەکەی هەواڵەی خوا کرد، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّى يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾[1] بەرامبەر بەو قسەو کردەوە ناڕەوای ئەوانە پێغەمبەر(ﷺ) وتی: پەروەردگاری من زانایە و ئاگادارە بە هەموو وتەو وتارێك لە ئاسمان و زەوی دا، ئیتر پەنهان و نهێنی بن، یان ئاشکرا، ئاگادارە بەوانە هەموو و جای ئەوەی ئەو بێ باوەڕانە بە نهێنی وتویانە،

---

[1] تەفسیرەکە بە پێی خوێندنەوەیە بە وشەی:(قال) کە ئێستا بەو جۆرە باوە. ئەم وشەیە ئەخوێنرێتەوە بە(قل) ئەوەش هەر رێك و راستەو مەبەستە هەریەکەو ناگۆڕێ.

وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلۡ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمِۭ بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ بَلۡ هُوَ شَاعِرٞ فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ
كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآۖ أَفَهُمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا
قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٧﴾

---

﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ تەنیا خوا بیسندەی راستەقینەیە و هەموو شت ئەبیستێ، زانای راستەقینەو هەموو شت ئەزانێ و ئاگادارە پێی، کەواتە هەر پیلانێ بگێڕن خوا ئەزانێ و پێغەمبەریش ئاگادار ئەکات بەسەری دا، ئەو بێ باوەڕانە سەرسام و سەرگەردان بوون، نەیان ئەزانی دەربارەی ئەم قورئانە چی بڵێن؟ لەسەر بارو رایەك رانەئەوەستان هەر دەمە شتێکیان ئەوت، وەکو روونیش ئەبێتەوە لەم فەرمودەیەوە ﴿بَلۡ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمِۭ﴾ [1] وازبێنە لەوە کە ئەیان وت جادووە، ئەوانە وتیان: ئەم قورئانە شتی پڕو پووچ و تێکەڵ و پێکەڵە، محمد لە خەودا دیوێتی!! ئینجا لەوەش گواستیانەوە وتیان ﴿بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾ محمد خۆی بە دەست قست هەڵی بەستووە بەدەم خواوە و دەست هەڵبەستی خۆیەتی، ئینجا لەوەش گواستیانەوە و وتیان: ﴿بَلۡ هُوَ شَاعِرٞ﴾ محمد شیعر بێژەو ئەمەی کە ئەیڵێ شیعرە واتە ئەوانە سەرسام بوون لەبارەی قورئانەوە، لەسەر بارێ دامەزراو نەبوون، ئیتر ئایا ئەو وشە ناڕاستانە لەلایەن هەموویانەوە بووبێت، یان هەر تاقمێك یەکێك لەو وشە ناڕەوایانەی ئەوت، بەهەر جۆرێ بووبێ ئەو وتە جیاوازانە بەڵگەیەکی روونن لەسەر ئەوە کە داماو و دەستە پاچە بوون بەرامبەر قورئان و نەیان ئەزانی چی بکەن و بە چ جۆرێ بەرگری بکەن؟ ئینجا ویستیان خۆیان رزگار بکەن لە دەست قورئان بە داوا کردنی موعجیزەیە، بە وێنەی موعجیزەی پێغەمبەرە پێشووەکان، وتیان: ﴿فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾ ئەگەر ئەوەی ئێمە ئەیڵێین راست نی یە و بەڵکو ئەوە راستە کە محمد پێغەمبەرە پێشووەکانی پێ رەوانە کراوە، وەکو دەست و دار دەستەکەی موسا و کەڕ و کوێر چاك کردنەوەکەی عیسا، واتە

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە وشەی(بل) هەرسێکیان بۆ گواستنەوەیە، یەکەمیان لەلایەن خواوەیە و ئەوانی تریان هینی کافرەکانە و خوا ئەیگێڕێتەوە، بۆ بەتاڵ کردنەوەی پێشی خۆیانن، ئەم سێ وشە ناڕاستەش وەکو ئەوانە پێشووەکە لەو وتە ناڕەوایانەیە کە زۆر بە نهێنی ئەیان وت، ئینجا با بزانرێ کەسێ باری تر ئەگونجێ لە وشەی(بل) ەکان دا و بەو هەموو بارە تەفسیر کراونەتەوە.

ئەگەر موعجیزەیەکی وامان بۆ بێنیٚ ئێمە باوەڕی پیٚ ئەهێنین، ئینجا خوا ئەیانخاتەوە بە درۆوە کە ئەو کاتەش باوەڕ ناهێنن، چونکە وێنەی ئەمان لە گەل و ئوممەتە پێشووەکان پەڵپ و بەهانەی وایان گرت و بۆیان جیٚ بەجیٚ کراو کەچی لەپاشان باوەڕیان نەهێناو ئینجا خوایش بەربادی کردن و لە ریشەی هێنان، ئەوەش بە گوێرەی باوی خوا دەربارەی ئەوانەی ئەوەندە یاخی و سەرکێش بن و بگەنە ئەو رادەیە، ئەفەرمویٚ: ﴿ مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآۖ ﴾ لە پێش ئەوان دا هیچ خەڵکی وڵات و شاری تر باوەڕی نەهێنا کە ئێمەیش لەریشەمان هێنا و بەربادمان کردن بەهۆی باوەڕ نەهێنان و پەیمان شکاندنەکەیانەوە، ﴿أَفَهُمۡ يُؤۡمِنُونَ﴾ دەی ئایا ئەمان باوەڕ ئەهێنن؟ واتە نەخێر باوەڕ ناهێنن، چونکە سروشتی یاخی و مل هوڕەکان یەك جۆرە، کەواتە ئەمانیش پاش بەجیٚ هێنانی پەڵپەکەیان هەر باوەڕ ناهێنن وەکو ئەوانەی گەلە پێشووەکان، بەڵکو ئەمان یاخی و مول هوڕ ترن، دیارە بە گوێرەی باوی خوا ئەو کاتە ئەمانیش بەرباد ئەکران، کەواتە بەدی نەهێنانی پەڵپەکەیان چاکە و بەهرەیەك بوو لەلایەن خواوە دەربارەی ئەم ئوممەتە، لە لوتف و بەزەیی خوا بەزیاد بێت، یەکێك لە رەخنەی بت پەرستەکان دەربارەی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ)ئەوەبوو کە ئادەمی یە و پێغەمبەریش نابیٚ ئادەمی بێت، ئەوا خوای گەورەش بەرپەرچی قسەکەیان ئەداتەوەو ئەیانخاتەوە بە درۆوە، ئەفەرمویٚ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ ﴾ ئەی محمد لە پێش تۆ رەوانەمان نەرکردووە بۆ سەر گەل و ئوممەتەکانی رابوردوو جگە لە پیاوانیٚ کە سروشمان کردە لایان ئەوەی ویستبێتمان، پیاوانێکمان رەوانە کردووە لە تیرەی ئادەمی و وێنەی رەوانە ئەلا کراوەکان، بۆ سەر هیچ گەلیٚ مەلائیکەمان نەناردووە ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئینجا بیٚ باوەڕەکان ئەگەر خۆتان زانا نین و ئەوە نازانن پرسیار بکەن لە زاناکان و ئەهلی تەورات و ئینجیل تا ئەوەتان بۆ روون بکەنەوە. ئەو بت پەرستانە پرس و رایان ئەکرد بەو ئەهلی کیتابانە لەبارەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) و باوەڕیان هەبوو بە قسەیان، بێجگە لەوەش ئەوانە دوو تاقم و کۆمەڵی گەورە بوون و بێگومان هەموو باوەڕیان بووە و هەموو یەك قسە بوون کە پێغەمبەران لە تیرەی هەموو ئادەمی بوون – سەلامی خوایان لیٚ بێت –، کەواتە بەم فەرمودەیە دەمی بت پەرستەکان بەستراو هیچ قسەیان بۆ نەمایەوە. بێگومان ماتولیٚ پێغەمبەران لە تیرەی ئادەمی بوون ئەبیٚ یاسای گوزەران و ژیان و مردنیشیان لەسەر باو و رەوشتی ئادەمی بێت،

وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾

---

**وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ﴾ ئەو پێغەمبەرانەمان نەكردووە بە لەش و قەبارەیەك كە خۆراك و خواردەمەنی نەخۆن وێنەی فریشتە، بەڵكو هەرچۆنێ لە تیرەی ئادەمی بوون، هەروەها لەسەر سروشتی ئادەمیشن لە ژیان دا و پێویستی یان هەبوو بە خەو و خواردن، ئەو پێغەمبەرانە هەمیشەیی و نەمر نەبوون، بەڵكو وەكو خەڵكی تر ماوەیەك لەم جیهانەدا ژیاون و ئینجا مردوون، ئەم رەخنەی كە بت پەرستەكان ئەیانگرت لە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی ئادەمێتی و خەو و خواردن و هەڵسان و گەڕان بە دەشت و دەرو بازاڕدا، ئەم رەخنە بێ جێ یە هەر لە كۆنەوە گیراوە لە پێغەمبەرەكانی تریش – سەلامی خوایان لێ بێت – و هۆكەشی نەفامی و نەزانی یە، ئەوانە تێ نەگەیشتوون لە مەبەست لە پێغەمبەرو پێغەمبەرێتی بەهۆی ئەوەوە ئەو قسانەیان بەدەم دا ئەهات. بێگومان پێغەمبەر كەسێكە فروستادەو رەوانە كراوی خوایە بۆ راگەیاندنی ئاینێ و بەرنامەیەك كە خوا ناردوویەتی بۆ سەر بەندەیانی، ئەو پێغەمبەرە ئەبێ لە هەموو بەندەكانی تر گوێ رایەڵ تر و مل كەچ تر بووبێت، لە بەدی هێنان و پێك هێنانی ئەو ئاینێ و بەرنامەی كە خوا ناردوویەتی، ئینجا مامۆستایی ئەو خەڵكەی كردبێ و فێری كردبن. كەواتە ئەبێ كەسێ بووبێ كە پەیوەندی تەواوی بووبێ لەگەڵ ئەوانەی كە رابەریی و مامۆستایی كردوون، توانیبێتی بژی لە ناویان دا بێ سڵەمینەوە لە یەكتر، ئەبێ هەستی كردبێ بەهەر شتێك ئەوان هەستی پێ بكەن لە ژیانی ئەم جیهانەدا، ئەگینا ئەو مامۆستایی یە ناكونجێ و ئەو رابەری یە بە رێكی ناڕوا، كەواتە ئەبێ كەسێك بووبێ لە تیرەی خەڵكەكە و لەسەر سروشتی ئەوان بووبێت، بێجگە لەوەش ئەگەر لە تیرەی ئەو خەڵكە نەبوایەو لەسەر**

سروشتی ئەوان نەبوایە، ئەو خەڵکە نەیان ئەتوانی پەیڕەوی یان بکەن و لاسایی یان بکەنەوە لە کردارو رەفتاریان دا، پێغەمبەرانیش ئەبێ پەیڕەوی کراو بووبن، ژیانیان ئەبێ نموونەیەکی پاك و خاوێن بووبێ بۆ چاو لێ کردن. لە پاش ئەوانە هەموو، خوای گەورە رێزی داوە بە ئادەمی و رادەو پلەی بەرز کردوونەتەوە، بەهرەو چاکەی تایبەتی رشتووە بەسەر ئەو تیرەدا بەمەی هێندێکی لێ کردوون بە جێنشین و رابەری خۆی کەچی ئەو نەزان و نەفامانە شانیان ئەو رێزو بەهرەی هەڵ نەئەگرت، بەهۆی ئەوەوە دژی وەستان و دەمبازی یان ئەکرد کە نابێ پێغەمبەر لە تیرەی ئادەمی بێت!! بەڵام خوای گەورە – کە هەموو بڕیار و کرداری بە جێ یە و راستە – بە قسەی نەفام و نەزان ناکات، بە گوێرەی نیازو ئارەزووی نارەوای ئەوان بڕیار نادات، بەڵکو بە گوێرەی زانین و حیکمەتی خۆی کرد و پێغەمبەرانی لە تیرەی ئادەمی هەڵبژارد، لەسەر سروشتی ئادەمی رەوانەی کردن و ژیاندنی، هەر بە پێی ئەو زانین و حیکمەتی خۆیە سەری خستن و زاڵی کردن و دوژمنەکانی بەرباد کردن وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ ئینجا ئێمە لە تیرەی ئادەمی پێغەمبەرانمان رەوانە کردو بەڵێنمان پێدان، راستمان لەگەڵ کردن لە بەڵێنەکەمان دا، بەم رەنگە ئەوان و هەرکەسی تریش ویستبێتمان رزگارمان کردن و ئەوانەی زیادە رەوی یان کرد لە کوفرو گوناهو تاوان دا بەربادمان کردن، لە پێشەوە هەڕەشەی کرد لە بت پەرستەکان و تانەو تەشەری لێ دان و لەکەداری کردن بەمەی بێ ئاگا و بێ هۆشن و لاقرتی یان لێ دێت بە ئایەتەکانی خوا، ئینجا راستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمانی روون کردەوە(ﷺ) و بەرپەرچی دانەوە و هەڕەشەی لێ کردن لەبارەی چەند رەخنەیەکی نەفامانە کە بەدەمیان دا ئەهات دەربارەی پێغەمبەرو قورئانەکەی، لە پاش ئەوە ئەوا هەندێ گەورەیی و سوودی قورئان روون ئەکاتەوە و هانیان ئەدات لەسەر بیرکردنەوەو گوێ رایەڵی،

لَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ كِتَٰبٗا فِيهِ ذِكۡرُكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٠﴾

ئەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ كِتَٰبٗا فِيهِ ذِكۡرُكُمۡ﴾ [1] سوێند بەخوا ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە بۆلای ئێوە کتێبێکی گەورەو گرنگ کە شەرەف و ناوبانگی ئێوەی تێدایە، ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ ئەی ئایا ئێوە ژیر نین و بیر ناکەنەوە؟ واتە ژیر بن و بفامن و بیر بکەنەوە لەو کتێبە گەورەیە و بترسن و خۆتان بپارێزن لە پشت تێ کردن و رەفتار بە پێچەوانەی فەرمانەکانی. بێگومان ئەم قورئانە موعجیزەیەکی روون و رەوان و کراوەیە بۆ هەموو چین و تاقمێك تا دنیا دنیایە، هەمیشەیی یە، نەك بە وێنەی موعجیزەکانی پێغەمبەرانی رابوردوو کە هەرچەند شتێکی گەورەو گرنگ بوون و خەڵکی هەموو دەستە پاچە و پەك کەوتوو بوون لە ئاستیان، بەڵام شتێکی کاتی بوون و کاریان تەنها لەو تاقمە ئەکرد کە بە چاو ئەیان بینین، ئیتر پاش ئەوان هیچ دوژمن و بێ باوەڕێکیان پێ پەك نەئەخراو دەم کوت نەئەکرا. بەڵێ بە راستی ئەم قورئانە هۆی شەرەف و بەرزی وناوبانگی گەورە بوو بۆ گەلی عەرەب، چونکە بە زمانی ئەوان هاتە خوارەوە، زمانەکەیانی پاراست و هێشتی یەوەو کردی بە زمانێکی جیهانی، گەلی عەرەب پێش ئەم قورئانە هیچ باس و ناوبانگێکی نەبوو، بەڵکو گەلێکی بەش خوراوی چەوساوە بوو لەژێر دەستی فارس و رۆم دا و تا ئەم قورئانە هات و ئەوانیش بە رێکی پەیامەکەیان هەڵگرت و تەنها ئاڵاکەی ئەویان بەرز کردەوە ئەو کاتە بەهۆی ئەم قورئانەوە ناوبانگیان بەرزبووەوە، رۆژئاواو رۆژهەڵات و خوارو ژووری زەوی یان کەوتە ژێر دەست، جڵەوی ژیان و جیهانیان گرتە دەست، رووناکی داد و ژیانی بەختەوەری و کامەرانی یان بڵاو کردەوە بە وڵاتان دا، بەهۆی ئەوەوە خۆیشیان خۆش بەخت بوون و خەڵکیشیان خۆش بەخت کرد، ئەو مێژووە بەرزەیان بۆ فەراهەم هات کە رووی ئادەمیێتی پێ سوور و سەربەرز بوو، تا دنیا دنیایە کردەوەی شیرینی پیاوە هەڵکەوتووەکانیان سەرمەشقە و رابەرە بۆ

---

[1] وشەی(ذکر) بە سێ جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەوەی تەفسیرەکە بەهێز ترە، چونکە رای – ابن عباس – و ئێرەی لەسەر، جۆرەکانی تریش ئەگەڕێنەوە بۆی.

هەموو وێڵێ، روون کەرەوەی هەموو تاریکی یەکە بۆ هەموو داماو سەر لێ شێواوێ. بەڵام ئەوانەیان کە بۆ فەراهەم هات بەهۆی ئەوەوەبوو کە تەنها ئاڵای ئیسلامیان هەڵگرتبوو بەس، تەنها بەناوی ئیسلامەوە قسەیان ئەکرد و بەس، عەرەبایەتی و رەگەزایەتی بە هیچ جۆر دروشمیشی ئەما بوو لە دەروون و مێشك و هەستیان دا. تا ئەوان لەسەر ئەو بارە راستەبوون هەموو کاروباریان لەسەر راستی بوو، بەراستی ئەڕۆیشت، بەڵام کە دەستیان کرد بە لادان لە رێگا راستەکەیان ئەو کاتە کەوتنە سەر رەورەوەی پەستی و کزی و داماوی تا وایان لێ هات ئاڵای ئیسلامیان فڕێ داو چەند ئاڵایەکی تریان خستە جێگاکەی، دەستیان بەردا لە قورئان و رەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) دەستیان گرت بە جاهیلی یەتی کۆن و تازەوە، ئەو کاتە بوون بە ژێر پێوە و پێشێل کران و ماف و بەشیان داگیر کرا بەجۆرێ جوولەکە کە بێ نرخ و ریسوا و ژێر دەستەی هەموو جیهان بوو لێ یان راست بوونەوەو لە جەرگەی خاك و وڵاتیان دا میریی یەکیان پێك هێنا کە گاڵتە و لاقرتی ئەکات بەو هەموو میری یە عەرەبانە کە ژمارەیان بەناو ئەگاتە(٢٢) میریی، نفوسیان ئەگاتە زیاد لە(٢٥٠) ملیۆن!! بەراستی پێویستە عەرەب بیرێ بکەنەوەو ئاوڕێ بدەنەوە بەلای خۆیان دا تا بزانن کە بە بێ ئەم قورئانە هیچ بیر و باوەڕێکیان نەبووە و نیانە، ناریشیان بێ کە کەڵکی پێوە بێت بۆ خۆشیان، چ جای بۆ خەڵکی تر، جگە لەم قورئانە هیچ توێشوویەکیان پێ نی یە کە خۆیانی پێ بژیەنن چ جای خەڵکی تریش لە بڕینی ژیانی ئەم جیهانەدا، هیچ خزمەتێکیان لەدەست نایەت بەرامبەر ئادەمێتی بێ رابەریی ئەم قورئانە و لە ژێر سایەی ئەم قورئانەدا نەبێ، کەواتە ئەگەر بە تەواوی چوونە ژێر سایەی ئەم قورئانە و لەژێر سایەی ئەم قورئانە و بیرو باوەڕی ئەم قورئانەیان راگەیاند ئەو کاتە جیهان و ئادەمێتی ئەیانناسن و رێزیان لێ ئەگرن و بە پایە بەرز سەیریان ئەکەن و هەموو تیرە و گەلە موسڵمانەکان لە جیهان دا بە برا گەورەیان دائەنێن، بەڵام ئەگەر بیرو باوەڕی قورئانیان لەخۆیان داڕنی، بەناوی گەلی عەرەبەوە ویستیان عەرەبایەتی راگەیەنن و بڵاوی بکەنەوە، بێگومان بن ئەو کاتە خەڵکی لاقرتی یان پێ ئەکات و قین و خەشمیان لێ هەڵئەگرن، چونکە خەڵکی ئەزانن مێژوو شایەتە کە عەرەب لە پێش قورئان دا هیچ باس و ناوبانگ و ناونیشانێکیان نەبووە کە شانازی پێوە

بکەن، هەر شتێکیان بووبێ کە جێگای کەشخەو شانازی بێت بەهۆی قورئان و لەژێر سایەی قورئان دا دەستیان کەوتووە، بەهۆی قورئانەوە ناویان کەوتە مێژوو، کەواتە عەرەبایەتی بە تەنها هیچ رێزو نرخێکی نی یە لە دەروونی هیچ گەلێکی تردا، بەڕاستی ئەگەر بیرێ بکەنەوە و بە ترازووی ژیریی بەراوردێکی بەسەرهاتی خۆیان بکەن لە پێش ئیسلام و لەپاش ئیسلام دا تێ ئەگەن کە ئاراستە کردنی رستەی ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ بۆ ئێستای گەلی عەرەب زۆر راست ترو بەجێ ترە لە یەکەم تاقم کە ئەم قورئانەیان بیست و هاتە سەریان، چونکە ئەو تاقمە ئاشنا نەبوون و ئاگادار نەبوون بە پیت و فەڕو بەرهەمی بێ وێنەی قورئان، تاقمێکی نەخوێندەواری بێ ئاگا بوون، بەڵام ئەم چین و تاقمی ئێستا خوێندەوار و زاناو ئاگادارن لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەموو میریی و کار بەدەستانە سڵ ئەکەن و ئەتارین لەناو بردنی قورئان لەبابەت یاسا و رامیاری و رژێمەوە، مەگەر بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی، بە هەموو هێز بەرگری و دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ هەرکەسێك یان هەر کۆمەڵێك کە بانگی ئەکەن بۆ گەڕانەوە بۆلای قورئان و حوکمی ئیسلام، هیچ شەرم ناکات ئەو کەسانە لەکەدار ئەکەن و پێیان ئەڵێن:(کۆنە پەرستەکان!!) هەر هەلێکیان بۆ هەڵکەوێ بەسەریان دا ئاژەن بۆ بەند و کۆت و زنجیری ئەوانە کە ئەیانەوێ بانگەوازەکەی پێغەمبەرو یارەکانی تازە بکەنەوە، هیچ دەست ناگێڕنەوە لە سزا دانیان بە کوشتن و ئاگر و ئاسن، بێگومان پرسیارو محاسبەی ئەو ستەمکارانە ئێجگار سەخت و بەتینە، سزایان زۆر بە سۆیە لای خوا ئەگەر نەگەڕێنەوە بۆلای خوا، خوا پەنامان بدات و رووی کاربەدەستەکانمان و خۆمان وەرگێڕێتەوە بۆلای خۆی. آمین. بێگومان خوای گەورە رەحم و بەزەیی بەکار هێنا بە تایبەتی لەگەڵ ئەو یەکەم تاقمەدا کە ئەم قورئانەی هاتە سەر ئەوەتا مۆڵەتی دان، بە گوێرەی پەڵپ و بەهانەی خۆیان موعجیزەی بۆ نەهێنان، چونکە بێگومان باوەڕیان نەئەهێنا ئەو کاتە خوای بەپێی باوی خۆی هیچ مۆڵەتی نەئەدان و بەربادی ئەکردن بە وێنەی ئەو هەموو گەلە بێ باوەڕانەی کە پێش ئەمان لە ریشەی هێنان، وەکو بە شێوەی خەشم و غەزەبی بەتین هەواڵی سامناکی ئەوانەمان بۆ باس ئەکات،

وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ
إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾

---

**كە ئەفەرموێ: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً﴾ شارو وڵاتی زۆرمان وێران کرد و دانیشتوانیمان لە ریشە هێنا کە ئەو دانیشتوانە ستەمکار بوون و باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان ﴿وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾[1] لەپاش وێران کردنی ئەو شارو وڵاتانە و بەرپاد کردنی دانیشتوانی گەل و تاقمێکی تری جیاواز لەوانمان داهێنا و دروستمان کردن لەجێگای ئەوان، ئینجا شێوەی ئەو غەزەب لێ گیراوانەمان پیشان ئەدات لەکاتی هاتنی سزاکەیان دا شێوەی داچڵەکان و شڵەژانیان و سەر لێ شێواندیان وەکو مشکی مەرگەموش خۆر، راکردنیان هەر دەمە بە لایەك دا ئەفەرموێ ﴿فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ﴾ ئینجا کاتێك هەستیان کرد بەو سزای کە ئێمە ناردمانە سەریان ﴿إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ﴾ دەست بەجێ بە چەسپانی رایان کرد لەو شارانە، واتە کەوتنە هەوڵدان بۆ دەرچوون بە راکردن یان بە غاردانی وڵاخ، ئینجا لەوکاتە سەخت و سامناکەدا لەلایەن مەلائیکە، یان ئیمان دارانەوە لاقرتی یان پێ کرا و پێیان وترا: ﴿لَا تَرْكُضُواْ﴾ رامەکەن و دەرمەچن ﴿وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ﴾ بگەڕێنەوە بۆ ئەو نازو نیعمەت و گوزەرانە خۆشەی کە بە لێشاو پێتان درا بوو، بگەڕێنەوە بۆ شوێن و جێگای خۆتان: ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ﴾ بگەڕێنەوە بەڵکو پرس و راتان لێ بکرێ و راوێژتان لێ داوا بکرێت، یان داوای یارمەتی و بەخششتان لێ بکرێ و سواڵتان لێ بکرێ وەکو لەوەو پێش باوتان بووە یان با پرسیارتان لێ بکرێ لە هەموو ئەو شت و مەکەی پێتان درابوو با بزانرێ لە چی دا بەکارتان هێنان؟ بە هەرکام مەبەست بێت گاڵتەو لاقرتی بووە پێیان بۆ سزادانێکی تریان، ئینجا لەو کاتەدا هۆشێکیان کردەوەو تێگەیشتن کە راکردن رزگاریان ناکات و هیچ پەنا دەرێك نی یە لە سزای خوا،**

---

[1] بەڕاستی هەر بە قورئان ئەکەوێ وتن و گەیاندنی مەبەست، بۆ وێنە لێرەدا وشەی(قصمنا) بۆ شارەکان بەکار ئەهێنێ، چونکە شکاندن و پارە پارە کردن هەرچڵۆنێ بۆ دانیشتوان ئەبێ بۆ وڵات و جێگا و شوێنەکەش ئەبێ و راستە، بەڵام بەکار هێنانی بۆ شارەکان شێوەی سزاکە گرنگ و سامناك تر ئەکات، بۆ ئەو بارەکەی تر داهێنان و ئاوەدان کردنەوە لە پێشەوە بۆ ئادەمی یەکان ئەبێ، چونکە ئەبێ خەڵکی بێ ئینجا ئەوان شوێن و وڵات ئاوەدان بکەنەوە.

قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾
وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوۡ أَرَدۡنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهۡوٗا لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن
كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾

لەو کاتەدا دانیان نا بە تاوان و خراپی خۆیان دا و ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ ئای مەرگ بێ بۆمان! بەڕاستی ئێمە ستەمکارو تاوانبار بووین، بێ باوەڕ بووین بە ئایینی خوا، واتە ئەم سزایە ماڵی خۆمانە و سووچی خۆمانە بەو جۆرە دانیان نا بە خراپی خۆیان دا و پەشیمان بوون لە کردەوەی خۆیان، بەڵام تازە تۆبە و گەڕانەوە نەما، چونکە لەو کاتی نائومێدی یەدا، گەڕانەوەکە لە راستی یەوە نایەت، بەڵکو لە ترسایە و کە لە راستیشەوە نەبێ خوا نایەوێ، لەبەر ئەوە کۆتایی پێنەمێنان هەتا هەناسەی لێ بڕین هەرچەندە ئەوانیش کۆتایی یان نەمێنا لەو دەم تۆبەیە وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَمَا زَالَت تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ﴾ ئەوانە لە کاتی هاتنی سزاکەیان دا دانیان نا بە تاوان و خراپی خۆیان ئەوەبوو داوای مەرگیان ئەکرد بۆ خۆیان، ئینجا هەر ئەوە بوو داوای ئەوان و هەر ئەوەیان ئەوتەوە ﴿حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ﴾ هەتا جوڵەمان لێ بڕین وەکو گیا و شینایی یەکی دروێنە کراو و ساردمان کردنەوە وەکو ئاگرێکی کوژاوە. ئینجا پەیوەندی ئەخاتە نێوان عەقیدەو باوەڕو ئایینی راست و تۆڵە سەندن لە بێ باوەڕان وەکو باس کرا، نێوان راست و بەجێ ی یەك کە ئەم بوونەوەرە گەورەیەی لەسەر داڕێژراوە بە شێوەی گشتی و ئەو هەموو بەرژەوەندی و مەبەستی راست و رەوایە کە نیاز کراوە لەدروست کردنی ئەم ئاسمان و زەوی یەدا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ﴾ ئاسمان و زەوی و ئەوەی وا لە نێوانیان دا ئێمە دروستمان نەکردووە، بەجۆرێ گاڵتەمان کردبێ و مەبەستێکی رێك و راستمان نەبووبێ. بەڵێ راستە و ئەبێ هەموو خاوەن ژیریی یە باوەڕی هەبێ کە ئەم بوونەوەرە لە خۆڕایی دروست نەکراوە، چونکە کردەوەی بێ سوود و بێ هوودە بۆ بەندەش عەیب و لەکەیە چ جای بۆ خوای پاك و بێ وێنە. بەڵێ بێگومان ئەم بوونەوەرە کە پڕە لە چەند جۆر شتی نایابی سەرسوڕهێنەر و خوا دروستی کردووە بۆ چاو روون کردنەوەی تەماشاکەران، بۆ تەمێ و ئامۆژگاری ژیران تا بە هۆی ئەوەوە پەروەردگاری خۆیان بناسن و بیپەرستن و گوێ رایەڵی بن. بەڵێ خوا ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە بە لێزانی تەواو و بۆ

مەبەستێکی ڕێك و ڕاست، بەو جۆرە هەموو کاروباری ئەبا بەڕێوە، گرنگ ترو گەورەتر مەبەست ناردنی ئایین و بەرنامەی خوایە بۆ سەر بەندەکانی بەهۆی پێغەمبەرانەوە – درودی خوایان لێ بێت – تا چاك و خراپ دەرکەوێ، هەرکەس بەرهەمی کردەوەی خۆی دەست کەوێ، ئەو کاتە عەدالەت و داد و ڕاستی بەدی دێت، کەواتە بەبێ ناردنی ئایین و ڕەوانە کردنی پێغەمبەران و دروست کردنی ئاسمان و زەوی بێ سوود و بێ هوودە و بەگاڵتە دەرئەچوو، ئەم ئایەتە بەڵگە و نیشانەیە لەسەر ڕاستی ئایین و پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەربێت –، ئینجا دڵنیایی ئەکات لەسەر نەشیاوی و نەگونجاوی و گاڵتەو شتی بێ سوود و بێ هوودە بۆ خوا بەم فەرمودەیە: ﴿لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ﴾[1] واتە بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ بۆ ئێمە گاڵتە و هیچ شتێك کە بێ هودەو بێ مەبەستی ڕاستەقینە بێت و ئەگەر ئێمە بمانویستایە فەراهەم هێنانی شتی گاڵتەو ڕابواردنی پێ بکەین ئەو شتەمان فەراهەم ئەهێنا لەلایەن خۆمانەوە کە پەیوەندی بە ئێمەوە ببوایەو شایانی ئێمە بوایە، نەك پەیوەندی بە ئاسمان و زەوی لە جۆری دروست کراوەکان بێت، چونکە ئەمانە هەموو تازە پەیدا بوون و نەبوون بەسەریان دا هاتووە، هەرشتێ بۆ زاتی خوا بێ ئەبێ وەکو خۆی نەبوونی ڕووی تێ نەکردبێت و ڕوویشی تێ نەکات، نە سەرەتا ببێ بۆ بوونی و نە دوا هاتن. وەکو لە پێشەوە وترا شتی بێ سوود و بێ مەبەستی ڕاست بە هیچ کلۆج بۆ خوا ناگونجێ، بەڵام لەکاتی لێکۆڵینەوەدا شتی نەگونجاو فەرز ئەکرێ و بڕیار ئەدرێ بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستەی کە لێکۆڵینەوەی تێدا ئەکرێ. کەواتە هەر شتێك لەهەر جۆر و هەر بابەتێك بێت ماتوڵ بۆ گاڵتەو ڕابواردن بێت بە بێ سوود و مەبەستێکی ڕاست ئەو شتە بە هیچ ڕەنگ بۆ خوا ناگونجێ و ڕەوا نادرێ، وەکو ڕوونیش ئەبێتەوە لەم فەرمودەیەوە ﴿إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ ئێمە شتی وامان نەکردووە، لەلایەن خۆمانەوە شتێکمان فەراهەم نەهێناوە کە گاڵتە و ڕابواردنی پێ بکەین، کەواتە هەرگیز شتی وامان نەویستووە، ئینجا کۆتایی ئەهێنێ لەم باسەو ئەگوێزێتەوە بۆ باسی شتێك کە ڕەوشت و باوی خوای لەسەرە، ئەویش بریتی یە لەسەر خستن و زاڵ کردنی شتی حەق و ڕاست بەسەر ناحەق و بەتاڵ دا،

---

[1] بە پێی تەفسیرەکە مەبەست بە وشەی(لهو) هەموو شتێکی بێ هودەیە کە مەبەستی ڕێك و ڕاست نەبێ لەوەدا، بەڵام هەندێ تایبەتی ئەکەن بە کوڕ و ڕۆڵەوە، هەندێ تر ئەیبڕن بەسەر ژن و هاوسەردا. بە گوێرەی ئەم دوو ڕایە ئەم ئایەتە بۆ بە درۆ خستنەوەی ئەو کەسانەیە کە هەرکام لەو دوو شتە ناڕەوا بۆ خوا ڕەوا ئەدەن، بەم دوو جۆرەش نەگونجێ، بەڵام شێوە گشتی یەکە چاکترە.

بَلۡ نَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَى ٱلۡبَٰطِلِ فَيَدۡمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٞۚ وَلَكُمُ ٱلۡوَيۡلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَنۡ عِندَهُۥ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ
وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ ﴿٢٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ نَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَى ٱلۡبَٰطِلِ﴾ ئەو شتە نارەوا و ناڕاستە هەرگیز ئێمە نەمان کردووەو نایکەین، بەڵکو کارو بڕیاری ئێمە ئەوەیە کە حەق و ڕاست بەشێوەی گشتی زاڵ ئەکەین و سەری ئەخەین بەسەر ناحەق و بەتاڵ دا، حەق ئەهێڵینەوەو بەتاڵ ناهێڵین و لەناوی ئەبەین، بەم ڕەنگە حەق و ڕاست وەکو شتێکی ڕەق و قورس ئەدەین بەسەر تەوقی سەری بەتاڵ دا ﴿فَيَدۡمَغُهُۥ﴾ بەهۆی ئەوەوە زامداری ئەکات تا ڕادەیەك پەردەی سەرمێشکی ئەپژێنێ ﴿فَإِذَا هُوَ زَاهِقٞۚ﴾ ئینجا دەست بەجێ بەتاڵ ئەمرێ و گیانی دەرئەچێ.

بەڕاستی هەر بە قورئان ئەکەوێ ڕوون کردنەوەی مەبەست و پیشاندانی شێوەی شت بەجۆرێ کار بکات لەدەروون و هەست و ژیریی داگیر بکات. با بیرێ بکەینەوە کە ئەم مەبەستی زاڵ کردنی حەقە بە چ جۆر و شێوەیەکی هەست پێکراوی نایاب پیشان ئەدا، بەڕاستی زۆر سەیرە وا ئەخاتە پێش چاو کە حەق وەکو شتێکی قورس یان قونبولەیەك وایە بە دەستی قودرەتی خواوە لە دوورەوە ئەیماڵێ بەسەر سەری بەتاڵ دا و مێشکی ئەپژێنێ و ئەیکوژێ!! بەڵێ باوی نەگۆڕاوی خوا هەر وا بووە و هەر وایش ئەبێ کە هەق و ڕاستی زاڵ کردووە، چونکە حەق شتێکی بنەڕەتە و ئەسڵەو دامەزراوە لە سروشتی ئەم بوونەوەرەدا، بەتاڵ شتێکی بێگانەیە و هیچ پەیوەندی نی یە بە دروست کردن و داڕشتنی ئەم بوون و بوونەوەرەوە، شتێکی تازە پەیدا بووەو دەرکراو و تارێنراوە لە لایەن خواوە، کەواتە ئەبێ هەر بڕوا و نەمێنێ، چونکە دەستی قودرەت لێ ی ئەدات و قەزڵ ئەکات. بێگومان زۆر جار پێچەوانەی ئەو باو و بڕیارە گوزەر ئەکات و دێت بە خەیاڵی خەڵك دا، تەنانەت زۆر لە ئیمان دارانیش ئەو خەتەرەیە لە دەروونیان دا هەیە، چونکە لە ڕووداوی ژیان دا پێچەوانەی ئەو باو و بڕیارە ئەبینن، ئەوەتا ئەبینرێ ناحەق و بەتاڵ لە هەموو لایەکەوە بافیشی کردووەتە

خۆی و به دیمەن ئەو زاڵە و حەق و راست بە هیچ رەنگ نابینریٚ و بەڵکو هەر ناو و باسیشی نی یەو بەو جۆرە ماوەی دوور و درێژ بەسەر ئەوبارەدا تێپەڕ ئەکات، بەڵام با بزانریٚ ئەوەی کە بینراوە و ئەبینریٚ بە پێچەوانە، هەموو شتێکی کاتی یە و تێپەڕ ئەکات و ئەوەی باوی خوایە هەر ئەوە لە پاش دا هاتووەو هەر ئەوەش ئەبێت ئیتر هەرچەندی پیٚ چووبێت یان پیٚی بچێت، زۆری کات و چەرخ بۆ ئێمەیە و لە پێش چاوی ئێمەدا هەیە و لای خوا لە حیسابی خوادا کەمە و هیچ چاونادات، بۆ روون کردنەوە و دڵنیا بوون لەسەر ئەو مەبەستە پێویستە بیر بکەینەوە لەم دوو خاڵە کە دێت:

١- بێگومان حەق و راست تەنها یەك شتە و ناگونجیٚ بە هیچ کلۆج پتر بێت لە یەك شت، ناحەق و بەتاڵ جۆر و باری هەیە لە رادەیەك دا نایەتە ژمارە بە ئاسانی، بۆ وێنە ئاینی خوا کە حەق و راستە لە یەکەم پێغەمبەرەوە تا دواترینی هەمووان – درودی خوایان لەسەر بێت – تەنها یەك شتە و یەك سەرچاوەی هەیە و بۆ یەك مەبەست، بێجگە لە ئاینی خوا ناحەق و بەتاڵە کە بریتی یە لەو هەموو ئاین و بیر و باوەڕ و فەلسەفانەی کە لە جیهان دا بوون و هەن لە کۆن و تازەوە، دەی بە درێژایی تەمەنی ئادەمی ئاینی خوا کە تەنها شتێکە بە رێك و پێکی هەر مایەوە و لەناو نەچوو، لە هەموو کات و چەرخێك دا کزیی و ناتەواوی رووی تیٚ کردبیٚ و لەوانە بووبیٚ لەبیر بچێتەوە خوا تازەی کردووەتەوە بە ناردنی پێغەمبەرێکی تر یەك لە دوای یەك تا گەیشتە دواترینی هەمووان پێغەمبەری ئازیزمان محمد(ﷺ) ئینجا تاکە ئاینەکەی خوا تازە کرایەوە لە جوانترین و تێر و تەواو ترین شێوەی دا، بە ناردنە خوارەوەی ئەم قورئانە کە هەموو شێوەکانی تری تاکە ئاینەکەی خوا پیشان ئەدات، بێگومان تازە کردنەوەی ئەم جارە کە دواترین جارە بە جۆرێکە کە پارێزراوە و دەست نادات بۆ گۆڕان و دەست تیٚ خستن هەتا هەتایە، هەرچۆنیٚ ئاشکرایە کە ئەم جارە لە هەموو بار و روویەکەوە زاڵ بوو بەسەر هەموو شتێك دا و جڵەوی ژیان و جیهانی گرتە دەست ماوەیەکی دوور و درێژ هەتا کاتیٚ کە ئیمانداران و موسڵمانان سست و لاواز بوون لە پەیڕەوی کردنی ئەو کاتە بەهۆی دوژمنی دەر و ناوخۆوە کارێکی وا کرا جڵەوی

رامیاری لە دەست سەنرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا هەر زاڵە و زۆر و دەسەڵاتی هەر هەیە بەسەر هەموو ئایین و بیرو باوەڕ و فەلسەفەیە ترا بەم رەنگە هیچکام لەوانە ناتوانن روو بە رووی بوەستن و لە رووی ژیریی و زانینەوە لەکەیەکی تێدا بدۆزنەوە، بەڵکو هەتا ژیریی پێش بکەوێ و زانین و زانیاریی پەرە بسێنێ راستی ئەم روون ئەبێتەوە، بەڵام ئەم ئەتوانێ هەموو لەکەیەکی ئەوان روون بکاتەوە، زۆریەی بەند و بڕیارەکانیان بە درۆ بخاتەوە و ناڕاستی یان ئاشکرا بکات، تاکە ئایینەکەی خوا لە یەکەم جارەوە تا ئێستا بە رێك و پێکی مایەوە، بەڵام ئەو هەموو بیرو باوەڕ و ئایینانی ترە لە کۆن و تازەوە تاك و تەرایەك نەبێ هیچ کام سروشمیشی نەماوەتەوە، ئەو تاك و تەراش هیچ کام لەسەر باری یەکەم جاری نی یە و گۆڕاوە بە جۆرێك هەروەکو ئەوەی یەکەم جار نەبێ وایە، کەواتە روون و ئاشکرا بوو کە حەق و راست زاڵ و زیندووە، ناحەق سەر شۆڕ و مردووە.

٢- باوی خوا لەسەر ئەوە نی یە کە تەنها بە زۆرو دەسەڵاتی خۆی حەق و راست زاڵ بکات و ناحەق بمرێنێ، بەڵکو هەوڵ و تێکۆشانی ئیمان دارانی کردووە بە هۆی ئەو مەبەستە، کەواتە لەهەر کات و چەرخێك دا بەتاڵ و ناحەق بە دیمەن سەرکەوتبێ و و حەق و راست کەناری گرتبێ و بە کز و کەنەفت تەماشا کرابێت، ئەوە بە هۆی ئەوە بووە تێکۆشان لە پێناوی حەق و راستی دا نەکراوە، یان کەم و کوڕی و سستی تێدا کراوە، یان ئەگەر هەوڵ و تێکۆشان تێر و تەواو بووبێ ئەوە ئیمان دارەکان هێشتا پێ نەگەیشتوون و پێویستی یان ماوە بە تاقی کردنەوەو پاڵفتە کردن.

کەواتە ئیمانداری راستەقینەی تێگەیشتوو هەرگیز دوو دڵی و گومان رووی تێ ناکات و ئەزانێ ئەو بەڵێنی خوا راستە و ئەبێ هەر ئەوە بەدی بێت، هەر دوا کەوتنێ هەبووە ئەوە هۆی تایبەتی خۆی هەیە، پاش راگەیاندنی ئەو بەڵێنە گرنگە ئینجا ئەم هەڕەشە و ترساندنە سامناکە ئاراستەی ئەوانە ئەکات کە دەمبازی و چەنەبازی ئەکەن دەربارەی، شتێکی بۆ رەوا ئەدەن کە شایانی ئەو نی یە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَكُمُ ٱلۡوَيۡلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾ سزای بەتین هەیە بۆ ئێوە لەبەر سیفەت و نیشانێ کە ئەیکەن دەربارەی خوا، شتێکی بۆ بڕیار ئەدەن کە شایانی ئەو

نی یە، ئینجا بەرامبەر بەسەر کێشی و یاخی بوونی بێ باوەڕەکان نموونەیە لە گوێ ڕایەڵی و خواپەرستن پیشان ئەدات لەلایەن ئەوانەی نزیکن لە خواوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَنۡ عِندَهُۥ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ * يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ﴾ هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەوی دایە هەمووی هینی خوایە و موڵك و دروست کراو و بەندەی خوایە، ئەو مەلائیکەتانەی کە رادەو پلەیان بەرزە لای خوا خۆیان بەزل سەیر ناکەن و سەرپێچی ناکەن لە پەرستنی خوا و کول و پەك کەوتوو و ماندوو نابن لە پەرستنی، بەم رەنگە شەو و رۆژ – واتە هەمیشە – خوا بە گەورە رائەگرن و باسی پاك و بێگەردی ئەکەن، بێگومان ئەوانەی کە هەن لە ئاسمانەکان و زەوی دا جگە لە خوا کەس ژمارەیان نازانێ و ئێمەی ئیماندار باوەڕمان هەیە بە بوونی مەلائیکە و جن، چونکە لە قورئان دا هەن، بەڵام ئێمە لە بابەتیانەوە هیچ نازانین جگە لەوەی خوا هەواڵی پێداوین، هەڵئەگرێ بێجگە لەوان چەند گیانلەبەرانی تر ببن کە خاوەنی فام و ژیریی بن لە زەوی دا یان لە ئەستێرەکانی تردا، بە شێوەو سروشتێ دروست کرابن رێك و شایانی ئەو ئەستێرانە بن. کەواتە ئەوانەی هەواڵمان پێ دراوە ئەزانین و باوەڕمان هەیە بە بوونیان و بێجگە لەوانە لەخۆمانەوە دەم ناکوتین و زانینی حەواڵەی خوا ئەکەین. خوای خاوەن بەزەیی بەهرەیەکی تایبەتی داوە بە ئادەمی کە ئەتوانن هەموو ژیانی خۆیان بکەن بە عیبادەت و پەرستنی خوا، تەنانەت خەو و خواردن و هەموو خۆشی و رابواردنێکیان. چونکە لە ئایینی پاکی ئیسلام دا هەموو کردەوە و بزووتنەوە و هەناسەیەك بە خواپەرستی دائەنرێ ئەگەر بەندەی ئیماندار بە نیازی خوا و بە پێی بەرنامە و رژێمی خوا بجوڵێتەوە و پەیرەوی پێغەمبەر(ﷺ) بکات لە هەموو کارو باری ژیانیدا. جا ئیتر بەندە چی ئەوێ لە خوا؟ چی ماوەتەوە خوا بۆی بکات؟ لە لوتف و بەزەیی بە زیاد بێت.. لەم کاتەدا باسی خواپەرستی مەلائیکە ئەکات کە بە بێ وچان بە هەمیشەیی خوای تاك و تەنیای خۆیان ئەپەرستن. لەم کاتەدا کاتی ئەوەیە بێزاری دەربڕێ دەربارەی ئەو کەسانەی کە خوا ناپەرستن و هاوبەشی بۆ رەوا ئەدەن،

جا لەو بارەیەوە ئەفەرموێ: ﴿أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً﴾ ئایا ئەوانە بڕیاری چەند خواو پەرستراوێکیان داوە و باوەڕیان بەوە هەیە؟ واتە بڕیارەکەیان ناڕاست و ناڕەوایە و بێزاری هەیە دەربارەی، ئینجا بۆ روون کردنەوەی بێ نرخی پەرستراوەکان و نەزانی و نەفامی بڕیار دەرەکانی، ئەفەرموێ: ﴿مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ کە ئەو پەرستراوانە لە خاکن و لە کەرەسە و مادەی زەوییں، ئەوەش کە ئەو دارو بەرد و شتانە بوون کە لەم زەوی یەدان، ئینجا لاقرتی یان پێ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿هُمۡ يُنشِرُونَ﴾ ئایا بڕیاری چەند پەرستراوێکیان داوە کە مردوو زیندوو ئەکەنەوە و بە زیندوویی راستیان ئەکەنەوە لە گۆڕەکانیان!! بێگومان ئەو بت پەرستانە لایان وا نەبوو کە ئەو بتانە مردوو زیندوو ئەکەنەوە و شتی وایان نە ئەوت، بەڵام باوەڕ و بڕیاردانەکەیان ئەوە ئەگەیەنێ، چونکە کەسێ خوایە و ئەپەرسترێ کە توانا بێت بەسەر هەموو شتێك دا و بتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوە، بۆ ئەمەی ئەجرو پاداشتی بەندە گوێ رایەڵەکانی بداتەوە لە رۆژی دوایی دا. لە پاش بێزاری دەربڕین و روون کردنەوەی بێ نرخی بتەکان و نەزانی بت پەرستەکان و لاقرتی کردن پێ یان، ئینجا بەڵگەو نیشانەی رێك و راستی ژیریی ئەهێنێتەوە لەسەر تاك و تەنیایی خوا و ناڕاستی هیچ پەرستراوێکی تر جگە لە خوا، ئەفەرموێ: ﴿لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ﴾ ئەگەر لە ئاسمانەکان و زەوی دا خوایە تر ببوایە بێجگە لە ئەو خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە بە بێ گومان ئەم ئاسمان و زەوی یە وێران ئەبوون و ئەم رژێمەیان نەئەما، بەخۆیان و هەرچی وا لە نێوانیان دا بەرباد ئەبوون و کەڵکیان نەئەما[1]. بەڕاستی بەڵگەیەکی راست و روون و رەوانە هەموو ژیری یەکی ساغ وەری ئەگرێ و دڵ و دەروون وەری ئەگرێ و دڵ و دەروون زۆر پێ ی ئارامە، چونکە نموونەی ئەوە وا بینراوە، ئەوەتا هەر وڵاتێ لەژێر دەستی دوو حاکم و کار بەدەستی سەربەخۆدا بووبێ هەمیشە وێران و سەر لێ شێواو بووە، بەڵکو هەر شتێ چەند وەستایەکی هەبێ ئەو شتە

[1] مەبەست لەم ئایەتە روون کردنەوەی تاك و تەنیایی خوایە و نەگونجاوی پتر لە یەك خوا، هەرچۆنێ کۆمەڵێ نابێ و نەگونجاوە دوانیش هەر وایە نابێ و نەگونجاوە، هێنانی وشەی(الهە) بە کۆ نەك بە تاك بە گوێرەی باوی بت پەرستەکانە کە پەرستراوی زۆریان هەبوو، هەروەها وشەی(فیهما) چونکە پەرستراوەکانیان هەندێ لە ئاسمان بوون و هەندێ لە زەوی.

کاروباری بەرێکی ناڕوا. ئەم ئایەتە بەفەڕە - وەکو هەموو ئایەتە بوونەوەری یەکانی تری قورئان - رێك و گونجاوە لەگەڵ رادەی هەموو جۆرە کەسێك دا، زانا و نەزان، خوێندەوارو نەخوێندەوار، سادە و بێ ئاگا، زیرەك و ورد و وریا..

دیمەن و شێوە ئاشکراکەی بێگەردو لەکەیە و واقیع و رووداوی ژیان شایەتە لەسەر راستی و بەجێ یی وەکو باس کرا، زۆربەی خەڵکی دڵنیان پێ ی و هیچ پێویستی یان بەشی کردنەوەو لێکۆڵینەوە نی یە، دیوی ناو و ناوەرۆکەکەشی بەسە بۆ ئەو کەسانەی کە بیر تیژ و زیرەکن و بە وردی ئەکۆڵنەوە لە شت، بە هیچ رەنگێ هۆی ملە جەڕێ ناهێڵنەوە بۆ هیچ کەس مەگەر کەسێ کە ئارەزووی دەمبازی هەبێ، هەرکەسیش وابێ شایانی ئەوە نی یە گوێچکەی بۆ شل بکرێ و سەر بنرێتە سەری، بێگومان ئەگەر ئەم بوونەوەرە چەند خوایەکی ببێ، ئەبێ سەر بەخۆ و جیاواز بن لە یەکتر لە زات و سیفەتەکانیان دا، واتە ئەبێ هەرکام لەوانە بوونێکی جیاواز و زانین و توانا و خواهیشێکی جیاوازی تایبەتی یان ببێ ئەگەر نا تەنها یەکێکن و پتر نین لە یەك خوا، هەرکات بەو جۆرە جیاواز بوون ئەبێ کردەوەو بەرهەمیشیان جیاواز بێت و بە هیچ رەنگ ناگونجێ یەکێتی و یەك گرتنیان لە هەموو شتێك دا بێ جیاوازی، کەواتە ئەبێ هەر بدەن لە یەك و دژی یەك هەڵسن و بەرگری یەکتر بکەن، ئەی کە ئەوەش رووی دا ئەبێ رژێمی ئەم ئاسمان و زەوی یە بشێوێ و بەرباد ببێ. ئەم بوونەوەرە گەورە و فراوانە بە هەموو پارچە و بەشەکانی یەوە دامەزراو و دارێژراو و راگیرە لەسەر تەنیا رژێم و یاسایەکی تێرو تەواوی نەگۆڕاو، لەسەر پەیوەندی و یارمەتی و کۆمەکی لە نێوان هەموو پارچە و بەشەکانی دا، کەواتە ئەبێ تەنیا خوایەکی هەبێ و تەنیا خواهیش و توانایەك کاروباری ببا بەڕێوە ئەگینا ئەو یەك رژێمی یە نامێنێ، پەیوەندی و یارمەتی یەکە ئەپچڕێ. ئەم ئایەتە بەفەڕە رێنموونی ئەکات بۆ دەلیل و رابەرێکی زۆر بەهێز لەسەر تاك و تەنیایی خوا کە بەناوبانگە لای زاناکانی ئیسلام بە(برهان التمانع) و(برهان التوارد) بە هیچ رەنگ هۆی گومان و دوو دڵی نامێنێ بۆ هیچ خاوەن ژیریی یەك، رێگا ئەبڕێتەوە لەهەرکەسێ دەمبازی بکات، ئێرە جێگای درێژە دان نی یە، پێویستیش ناکات بە هێنان و شی کردنەوەی ئەو دەلیل و رابەرە، چونکە دیمەن و زاهیری ئایەتەکە بەسە و هەر دڵێك نەخۆش نەبێ بە ئارام و پڕ باوەڕە پێ ی، هەموو سروشتێکی رێك و راست شایانی ئەدات لەسەر تاك و تەنیایی خوای ئەم بوونەوەرە کە یەك رژێم و یەك یاسایە، هیچ کەم و کوڕی و ناتەواوی و ناڕێکی یەك نی یە لە پێك هێنان و لە بەڕێوەبردنی کاروباری دا،

فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن
دُونِهِۦٓ ءَالِهَةًۖ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡۖ هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِيۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ
ٱلۡحَقَّۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٢٤﴾

---

﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ کەواتە خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە پەروەردگاری عەرشە، واتە موڵك و سەڵتەنەتی تێرو تەواوە و بەرز و بڵند و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا ئەو خوایە پاکە و بە پاك و بێگەرد رای گرن لە هەموو هاوبەش و رۆڵە و هاوسەرو لەکەو رەخنەیە کە کافرەکان بۆی باس ئەکەن و رەوای ئەدەن بۆی، ئەو خوایە گەورەیی و بەرز و بڵندیی و پاکی لە رادەیەك دایە: ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ﴾ پرسیاری لێ ناکرێ لە هەر شتێك کە ئەیکات، چونکە خوایەکی تاك و تەنیایە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك دا هەیە و ئاگای لە هەموو شتە و هەموو کاروکرداری بەجێ یە، واتە شایانی کەس نی یە پرسیار بکات لە کارو فرمانی و رەخنە بگرێ لێ ی ﴿وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ﴾ پەرستراوەکانی تر و هەموو بەندەکان پرسیاریان لێ ئەکرێ، چونکە بەندەو ژێر دەست و ناتەواون، بێگومان زۆر کەس هەن هەڵەن و زۆر کات ئەخەڵەتێن پرسیار ئەکەن لە کارو فرمانی خوا، تەنانەت هی وا هەیە نەفامی ئەگاتە رادەیەك بە بێزاری و سەرسامی یەوە پرسیارەکەش ئەکات: ئەڵێ ئەوە خوا بۆ وای کرد؟ ئایا لەبەرچی فلأنەشتی کرد، چ سوود و حیکمەتێکی تێدایە؟ وەکو بیەوێ بڵێ: کردەوەی بێ سوود و بێ هوودە و لە خۆڕایی بوو! خوا پەنامان بدات ئەو جۆرە پرسیارانە هەندێکیان کوفری رووتە، هەندێکی تریان بەرە و رێبازی کوفر ئەڕۆن! بێجگە لەوە بە تێکڕایی پرسیار لە کارو فرمانی خوا زۆر بێ شەرمی یە و دەرچوونە لە سنووری بەندەیی و دەرچوونە لە سنووری ژێریی، هەرکەس ژێر بێ ئەبێ خۆی بناسێ و دەم نەکوتێ لە شتێ کە لە سنووری تێگەیشتن و زانینی بەدەرە، دوو تاقم پرسیار لە کارو فرمانی خوا ناکەن:

١- ئیمانداری راستەقینە، چونکە خۆی ئەناسێ و شەرم ئەکات لە پرسیار کردن.

٢- کافری بێ باوەڕی تەواو، چونکە باوەڕی نی یە، خوا پەنامان بدات و سەرمان لێ نەشێوێ.

ئەوەی کە ئەو پرسیارە نەفامانە ئەکات تاقمێ ترن کە نە موسڵمانی تەواون و نە کافری تەواون، کەواتە پێویستە هەرکەسێ خۆی بە ئیماندار دائەنێ دەمی خۆی بگرێتەوە لە بێ

شەرمی لە ئاستی خوا خۆی، خوا یارمەتیمان بدات بە بەزەیی خۆی. ئینجا دووبارە بە شێوەی بێزاری و سەرسام کردن پرسیار ئەکاتەوە لە بڕیاردانی هاوبەش بۆ خوا و داوای رابەرو دەلیلیان لێ ئەکات کە بیسترابێت لە لایەن ئایینەکانی خواوە تا بیکەن بە پاڵپشت بۆ ئەو بڕیارە ناڕەوای خۆیانە لە پاش ئەوە بە رابەرو دەلیلی ژیریی روون بووەوە کە بڕیارەکان ناڕاست و ناڕەوایە، ئەفەرموێ: ﴿أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً﴾ ئایا ئەوانە بڕیاری چەند خوا و پەرستراوێکی تریان داوە جگە لەخوا و جیاواز لە خوا و باوەڕیان بە شتی وا هەیە؟ واتە باوەڕ و بڕیارەکەیان زۆر ناڕەوا و ناڕاستە و بێزاری هەیە دەربارەی، بێگومان هەر داوا و بڕیارێ روون و ئاشکرا نەبێ وەرناگیرێ و نرخی نی یە تا دەرنەخرێ و روون نەکرێتەوە بە نیشانە و رابەرێکی رێك و راست لەبەر ئەوە فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەر بیڕێتەوە لە کافرەکان بە داوا کردنی نیشانە و رابەر لەسەر داوا و بڕیارەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: بەڵگە و رابەرەکەتان بێنن. ئاشکرایە ئەو نەفامە سەر لێ تێك چووانە بێبەش و داماون و هیچیان بە دەستەوە نی یە، رابەرو نیشانەی ژیریی وەکو باس کرا نەبوو، چونکە هیچ نیشانە و دروشمی خوایەتی نی یە لە پەرستراوە ناڕەواکانیان دا، بەڵکو نیشانەی روون و بەڵگەی بەهێز هەبوو لەسەر تاك و تەنیایی خوا و نەگونجاوی هیچ هاوبەش و شەریکێ بۆی، وەکو روون کرایەوە ئینجا لەبارەی رابەری ئایینیشەوە ئەوا بەریان لێ ئەبڕێتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِي﴾ [1] ئەمە قورئانەکەی من کە پەند و ئامۆژگاری کەسانێکی تێدایە کە لەگەڵ من دایە، ئەمە کتێبەکانی تری خوا کە پەند و ئامۆژگاری پێشی منی تێدایە، وەرن تەماشایان بکەن ئایا لە هیچ کامیان دا شەریك و هاوبەش رەوا دراوە؟ بێگومان لە هەموو کتێب و ئایینەکانی خوا لەسەر بنەڕەتی تاك و تەنیایی خوا داڕێژراوە و لەسەر ئەوە راگیرە، کەواتە هۆی ئەو بڕیارە ناڕاستە یچ نی یە جگە لە نەزانی و نەفامی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ﴾ واز بێنە لە بەڵگە و رابەر هێنانەوە باسی ئەوە بکە کە زۆربەی ئەو کافرانە نەزان و حەق ناناسن و جیای ناکەنەوە لە ناهەق و بەتاڵ ﴿فَهُم مُّعْرِضُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە روو وەرئەگێڕن لە حەق و تاك و تەنیایی خوا و پشتی تێ ئەکەن،

---

[1] وا دەرئەکەوێ مەبەست بە(ذكر من قبلي) تەورات و ئینجیل بێت، چونکە لەو کاتەدا لە کتێبە پێشووەکان ئەو دووانە مابوونەوە لەناو خەڵك دا.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾
وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم
بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم
مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ
كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾

---

ئینجا باوەڕ بە تاك و تەنیایی خوا بەهێزو جێگیر ئەكات بەم فەرمودەیە ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾ ئەی پێغەمبەر لە پێش تۆوە هیچ پێغەمبەرێكمان ڕەوانە نەكردووە مەگەر سروشمان كردووەتە لای كە هیچ خوایەك نی یە جگە لە من كەواتە من بپەرستن بە تاك و تەنیا. خوزاعە كە تیرەیەك بوون لە بت پەرستەكان باوەڕیان وابوو كە مەلائیكە كچی خوان!! جا لەپاش باسی پاكی خوا لە هاوبەش، ئینجا باسی پاكی ئەكات لەوەی ئەو نەفامانە بۆیان بڕیار ئەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا﴾ ئەوانە وتویانە و ئەڵێن: خوای خاوەن بەزەیی ڕۆڵەی بۆ خۆی ڕەوا داوە و ڕۆڵەی هەیە. ئینجا بەدرۆیان ئەخاتەوە و بەرپەرچیان ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ﴾ پاكی بۆ خوا لەوەی ڕۆڵەی ببێ، خوا پاكە لەوە، بە پاكی یەكی خۆی ڕایگرن، پاكی یەك كە شایانی ئەوە، ﴿بَلۡ عِبَادٞ﴾ مەلائیكە بەو جۆرە نین كە ئەوانە ئەڵێن بەڵكو مەلائیكە بەندەیانی خوان، كەواتە موڵك و دروست كراوی خوان، بەڵام وەكو هەموو بەندەكانی تر نین، بەڵكو ئەمان هەموو ﴿مُّكۡرَمُونَ﴾ نزیك خراوە و ڕێز گیراون لای خوا، بەندەیەكن مل كەچ و گوێ ڕایەڵن بە جۆرێ ﴿لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ﴾ بە هیچ وتەو گفت و گۆیە پێش ناكەون لە خوا، هیچ شتێ ناڵێن تا ئەو نەفەرموێ: ﴿وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ﴾ بە فەرمانی ئەو ئیش و كار ئەكەن و هەرچی ئەو نەفەرموێ ئەمان نایكەن و لە خۆیانەوە هیچ شتێك ناكەن، بە كورتی لە هەموو وتارو كرداریان دا شوێنی فەرمانی ئەو ئەكەون. هۆی گوێ ڕایەڵی و مل كەچی یەكەیان ئەمەیە باوەڕی بەهێزیان هەیە كە خوا ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾ ئاگادارەو زانایە بە هەموو

کاروباریٚ لەمەو پێش و لەمە وپاشیان، کەواتە هەمیشە ئاگایان لە خۆیانە و چاودێریی خۆیان ئەکەن لەمەی پێچەوانەی راو فەرمانی خوا بجولێنەوە ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ﴾ تکا ناکەن بۆ هیچ کەسێك جگە لەوەی کە خوا رای ببیٚ لە تکا کردن بۆی، ئەوانەش کەسانێکن کە لەم جیهانەدا باوەڕیان بە تاك و تەنیایی خوا بووە و هیچ شتێکیان نەکردووە بە هاوبەشی، کەواتە ئەوانەی مەلائیکەیان ئەپەرست بە ئومێدی ئەوە تکایان بۆ بکەن لای خوا ئەوانە با نائومێد بن و هیچ چاوەڕوانی نەکەن، چونکە مەلائیکە تکایان بۆ ناکەن ﴿وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ﴾ ئەمان لە ترسی گەورەیی و سامناکی خوا دڵە لەرزەیانە و مەترسی ئەکەن لە تۆڵەی، خۆیان ئەپارێزن لە قەدەغە و سنوور شکاندنی خوا. ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ﴾ هەرکەس لەوان بڵیٚ من خوایەکی ترم، شایانی پەرستنم لەگەڵ خوادا ئەو کەسە ئێمە بە دۆزەخ تۆڵەی لیٚ ئەسێنین و سزای ئەدەین ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئا بەو جۆرە ئێمە تۆڵە ئەسێنین لە هەموو ئەوانەی ستەمکاران بە داوا کردنی خوایەتی و هاوبەش بۆ خوا و پەرستنی جگە لە خوا. بە کورتی پێنج سیفەتی باس کرد بۆ مەلائیکە کە نیشانەن لەسەر بەندەیی یان نەك رۆڵەیی یان بۆ خوا:

١- بەندەو موڵك و دروست کراوی خوان.

٢- بیٚ ئاگایی یان لە نهێنی یەکانی خوا.

٣- تکا نەکردنیان بۆ هیچ کەس بەبیٚ رای خوا، دەی ئەگەر خوا بوونایە، یان رۆڵەی بەو جۆرە نەئەبوون.

٤- ئەوپەڕی سام و ترس و دڵە لەرزەیان لەخوا.

٥- هەڕەشە و ترساندنیان بە سزاو تۆڵەی سەخت ئەگەر لە رێگای خوا لابدەن بە وێنەی بەندەکانی تر، لە ئادەمی و جن.

لەپاش پیشاندانی چەند بەڵگە و رابەری ژیریی و ئایینی و دەروونی لەسەر تەنیایی خوا بیٚ هاوبەش و بیٚ رۆڵە، ئینجا تەشەریان لیٚ ئەدات لەسەر بیر نەکردنەوە و سەرنج نەدانیان لەم هەموو بەڵگە و نیشانە و رابەرە روونانە کە خوا لەم بوونەوەرەدا فەراهەمی هێناون، هەموویشی شایەتن لەسەر تاك و تەنیایی و زانین و دەسەڵاتی بیٚ سنووری خوا و بەجیٚی هەموو کرداری، جا لێرەدا سەرنج رائەکێشیٚ بۆ بیر کردنەوە لە شەش شت، سیانیان ▫ قورئان نەیفەرمون بە دڵی هیچ کەسێك دا نەهاتوون.

أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾

---

١- ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا﴾ ئایا ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە نەیانزانیوە کە ئاسمانەکان و زەوی لە پێشەوە نووسابوون پێکەوە و یەك شت بوون ﴿فَفَتَقْنَٰهُمَا﴾ ئینجا ئێمەش لە یەکمان کردنەوەو جیامان کردنەوە لە یەك؟ ئیتر ئایا مەبەست ئەوە بێت کە لە پێشەوە هەموو یەك بوون و وەکو یەك وابوون لەمەدا کە هەردوو نەبوون ئینجا خوا لە نەبوون فەراهەمی هێنان و کردنی بەمەی کە ئێستا هەن؟ یان مەبەست ئەوە بێت لە بنەڕەت دا یەك ماددەو کەرەسەیان هەبووە و ئینجا خوا بەم جۆرو شێوەی ئێستا دروستی کردون لەو مادەو کەرەسە و جوێی کردنەوە لەیەك؟ یان مەبەست باریێ تریێت جگە لەم دووبارە کە وترا؟ بێگومان بێ بڕواکان زانا نەبوون بە هیچ کام لەم بار و مەبەستانە، بەڵام زانا بوونیان بەوە شتێکی گونجاوە و توانان بەهۆی بیر کردنەوە ئەو زانینە بۆ خۆیان فەراهەم بێنن، کەواتە با زانایش نەبن هەر بە وێنەی زانا سەیر ئەکرێن و شایانی تەشەر لێ دانن لەسەر باوەڕ نەهێنان بەهۆی ئەم بەڵگەوە گونجاویی زانا بوونیان بە بارو مەبەستی یەکەم شتێکی ئاشکرایە، چونکە هەرکەسێ بە تەواوی چاوی دڵی کوێر نەبێ، بێبەش نەبێ لە فام و ژیریی و تێگەیشتن، ئەبێ پاش هەندێ بیر کردنەوە بزانێ کە ئەم ئاسمان و زەویی یە بەم هەموو یاسا و ڕژێمە تێرو تەواو و نەگۆڕاوە بە هیچ ڕەنگ ناگونجێ لەخۆوە بەڕێکەوت پەیدا بووبێ و فەراهەم هاتبێ، چونکە ئاشکرایە شتی ڕێکەوت یاسا و ڕژێمی نی یەو هەرگیز کاروباری بەڕێکی ناڕوا، کەواتە ئەبێ سنعەت و کردار و فەراهەم هێنراوی خوا بێت، کەواتە ئەمانە ئەبێ نەبووبن و لە نەبوونەوە هێنانی و کردنی بەم ئاسمان و زەوی یە، کەوا بە پێش چاومانەوەن، زانا بوونیان بە مەبەستی یەکەم بەو جۆرە گونجاو و ئاسان بوو، بە مەبەستی دووەم یان هەر مەبەستێکی تر ئەوەیش هەر گونجاوە، چونکە ئەوا قورئان هەواڵی پێ ئەدا، قورئانیش

ئەو رابەرو موعجیزە بەهێزەیە کە هەموو کەس لە ئاستی دەستە پاچەو داماوە، کەواتە هەواڵەکانی ئەبێ بە زانراو سەیر بکرێن و بە زانراو دابنرێن. بێجگە لەوەش ئەگونجێ خوای گەورە چەند دروشم و نیشانەیەك پیشان بدات، ئەو مەبەستەی پێ روون بێتەوە، بۆ وێنە ئەگونجێ بەهۆی ئەم گەشتە ئاسمانی یانەوە پارچەیەك لە مانگ یان لە ئەستێرەکانی تریش ببینن و بەراوردی بکەن لەگەڵ زەوی دا لە بەرەنجام دا دەرئەکەوێ کە لە بنەڕەت دا یەك شتن، بەڵێ بەڕاستی هیچ جێگای سەر سوڕمان نی یە کە بەهۆی ئەوەوە، یان بە هەر هۆیەکی تر خوا زانایان بکات بەو یەکێتی یە کە هەبێ لەنێوان ئاسمان و زەوی دا، چونکە ئەوەتا ئەبینین بەرە بەرە خوا ئەم هەموو شتە نهێنی یە سەر سوڕهێنەرانە کە شاراوە بوون لەم بوونەوەرەدا، لەمەوپێش نەزانراو بوون و بە دڵی هیچ کەس دا گوزەریان نەئەکرد، خوا ئەو هەموو شتە نایابانەی دەرخست لەسەر دەستی بەندەکانی دا دەی با هۆی زانینی ئەو یەکێتی یەش دەربخات لەسەر دەستی بێ بڕواکان دا، کە ئەم زانیاری و زانینی تازەیە کەوتە لای ئەوان. ئەم مەسەلەی یەکێتی یە زاناکانی زاناکانی ئاسمان شناسی تازە ئەیڵێن و بە درێژیی لێ ی دواون وەکو لە پەڕاوەکان دا باس کراوە، بەڵام ئەوە شتێکە گۆترەکاری یە و بەدەم بڕ وتراوە، بەبێ ئەمە بەڵگەو نیشانەیەکی روونی لەسەر بێت، ئەو جۆرە شتانە بەناوبانگن بە ﴿النظريات العلمية﴾ دەست ئەدەن بۆ گۆڕان و هەڵوەشانەوە و جیاوازن لەو شتانەی کە بە تاقی کردنەوە و بەراورد کردنی راستی یان روون و بەناو بانگن بە ﴿الحقائق العلمية﴾ هەرگیز دەست نادەن بۆ گۆڕان و هەڵوەشانەوە بۆ وێنە وەکو گۆڕانی ئاو بە هەڵم و تەم بەهۆی گەرمی یەوە، بەستنی بەهۆی سەرماوە و پێك هاتنی هەور و باران و بەفر و تەرزە. جا ئێمەی موسڵمان کە خاوەنی ئەم ئایین و شەریعەتە راستە نەگۆڕاوەین هەرگیز نابێ هیچ ئایەتێکی قورئان ببەستین بەو نەزەریاتانەوە و بیانکەین بە تەفسیر بۆ قورئانەکەمان، هەرگیز نابێ هەوڵ بدەین بۆ یەك خستنی قورئان لەگەڵ ئەو نەزەریاتانەدا. بێگومان قورئان کتێبی نەزەریات نی یە، بۆ ئەمە نەهاتووە ببێتە کتێبی زانین و زانیاری و تاقی کردنەوە و بەراورد کردن، بەڵکو قورئان کتێبی بەرنامەی هەموو ژیانە، بەرنامەیە بۆ نرخ و رێزی ژیریی و راست کردنەوەی، تا ئیش

بکات لە سنووری توانای خۆی دا، بۆ نرخ و رێزی گەل و راست کردنەوەی گەل، تا رێگای ژیریی بداتە بەر و بەرەلاّ بێت و ئیش بکات لە سنووری خۆی دا، ئیتر ناکۆڵێتەوە و ناچێتە ناو شتی تایبەتی و درێژە پێدان بەو شتانەی کە کارگەی زانین و زانیاریی رووتن، ئەو جۆرە شتانەی واز لیّ هێناوە بۆ ژیریی کاری تێدا بکات. بەلیّ قورئان جار بەجاریّ رێنموونی ئەکات و دەست نیشان ئەکات بۆ هەندیّ شت کە راستن لەم بوونەوەرەدا، بۆ وێنە وەکو ئەم یەکێتی و جیا کردنەوە کە ئەم ئایەتە ئەگەیەنیّ، ئێمەی موسڵمان بە رێکی و هەموو ئارام و دڵنیایی یەوە باوەڕمان هەیە پیّ ی، لەبەر ئەوە لە قورئانەوە وەرئەگیریّ، ئەگەر چی نازانین و ئاشنا نین بە چۆنێتی ئەو یەکێتی و جویّ بوونەوە، هەرە ئەزەریاتێکی زاناکانی ئاسمانی هەیە لەم بارەیەوە هیچ دژیان نین ماتولّ پێچەوانە و دژی ئەوە نەبن کە قورئان ئەیگەیەنیّ، بەلاّم قورئان نابەین بیگێڕین بە دوای ئەو ئەزەریاتانەدا و رێکی بخەین لەگەڵیان دا، ناما نەویّ راستی قورئان روون بکەینەوە بەو ئەزەریاتانە کە پشتیان پیّ نابەستریّ، چونکە دامەزراو و نەگۆڕاو نین، بە کورتی ئەسڵیّ ئەم ئەزەری یە یەکێتی و جویّ بوونەوەی ئاسمان و زەوی یە، کە زانا تازەکانی ئاسمانی ئەیڵێن ئێمە وەری ئەگرین، چونکە ئەگونجیّ و رێکە لەگەڵ ئەوەی کە وەرئەگیریّ لەم ئایەتەی ئێرە کە بە چەند چەرخ پێش ئەم زانایانە رایگەیاندووە، بەڵکو باوەڕ وایە ئەمە و زۆربەی ئەزەری یاتەکانی تریش هەر لە قورئانەوە وەرگیراون و سەرچاوەکەیان قورئانە.

ب- ئەمەیە کە ئاو یەکەم هۆ و بنەڕەتێکی سەرەکی یە بۆ گیان و ژیان کە دۆزینەوە و دەرخستنی ئەمە ئێجگار گرنگ بوو لای زانایان، بوو بە هۆی ئەوپەڕی دۆزی یەوە و دەری خست، کەچی ئەوەتا بە روونی لەبەشی دووەمی ئەم ئایەتەدا هەیە کە دووەم شتە لەو شەش بەڵگە و رابەرە کە لێرە سەرنجیان بۆ رائەکێشیّ،ئەمیش وەکو یەکەم تا قورئان نەیهێنا و دەری نەخست هیچ کەس نەیئەزانی و بەدڵی هیچ کەس دا نەئەهات: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو دروست کردووە، ئیتر مەبەست لە زیندوو گیانلەبەر بێت، یان هەموو شتێك کە پەرە ئەسێنیّ و زیاد ئەکات و گەورە ئەبیّ وەکو قتادة ئەفەرمویّ، بە پیّ ی ئەم رایە مەبەست بە هەموو شتێکی

زیندوو گیانلەبەرانەو هەموو شتێ کە بڕوێ لە زەوی دا. واتە ئەوەیش کە بڕوێ لە زەوی دا بنەڕەت و هۆی یەکەمی ئاوە وەکو گیان لەبەران. ئینجا ئایا مەلائیکە و جنۆکەش وێنەی گیانلەبەرانی ترن، یان ئەوان جیاوازن؟ هەندێ لە زانایان لەسەر رای یەکەمن بەهۆی ئەوەوە دیمەنی ئایەتەکە گشتی یە و بێ بەڵگە لانادرێ لە دیمەنی قورئان و حەدیس و هیچ بەڵگەیەکی بەهێزیش نی یە لەسەر ئەوە کە شێوە گشتی یەکە مەبەست نی یە و تایبەتی یە و مەلائیکە و جنۆکە مەبەست نین، بەڵکو بەڵگە لەسەر گشتی یەتی هەیە: ئەبو حاتەمی بەستی لە موسنەدی سەحیحا حەدیس ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵم بدەرێ لە هەموو شتێك کە لە ئاو دروست کرابێ، لە وەڵام دا فەرمووی: ﴿کل شیء خلق من الماء﴾ [1] هەموو شتێك لە ئاو دروست کراوە. کۆمەڵێکی تر لە زانایان لەسەر رای دووەمن و ئەڵێن: مەلائیکە و جنۆکە مەبەست نین لەم ئایەتەدا. بۆ ئەم رایە هیچ بەڵگەیەك نی یە بەدەستەوە جگە لەوە کە لە قورئانەوە وەرئەگیرێ کە جنۆکە لەئاگر دروست کراون، لە حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە مەلائیکە لە رووناکی دروست کراون، بەڵام بەڵگەیەکی بەهێز نین، چونکە مەبەست ئەوە نی یە کە تەنیا لە ئاگرو رووناکی دروست کراون، بەڵکو مەبەست ئەوەیە وەکو زانایان ئەفەرمون: باری ئاگرو رووناکی یان زاڵ ترە ئیتر با بنەڕەت و هۆی یەکەمیان ئاو بێت بە وێنەی ئەوە ئەفەرموێ: ئادەم لە خاك دروست کراوە و خۆ بێگومان ئاویش بنەڕەت و هۆی یەکەمی یەتی بەلای هەمووانەوە پتر لە چواردە چەرخ لەمەو پێش قورئانی پیرۆز سەرنجی بێ بڕواکان رائەکێشێ بۆلای نایابی کرداری خوا لەم بوونەوەرەدا و بێزاری ﴿أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ دەی ئایا ئەو بێ بڕوایانە باوەڕ ناهێنن بە تاك و تەنیایی من لەگەڵ ئەم هەموو نیشانە و بەڵگە روونانە؟

[1] بێگومان ئەم فەرمودەیە هەموو بونەوەر ئەگرێتەوە و هیچ دوور نی یە ئەم فەرمودەیە بەلگەی ئەوانە بێت کە ئەڵێن: ئاو بنەڕەتە بۆ هەموو بونەوەر، بەڵام مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) هەموو شتی زیندووە بە نیشانەی پرسیارەکە کە لەو کراوە وەکو باس کراوە، زانین لای خوایە.

ج- ئەمەیە کە ئەفەرمویّ: ﴿وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ﴾ چەند چیاو شاخی گەورە و دامەزراومان لە زەوی دا دروست کردووە بۆ ئەمەی زەوی تاسە و لەنگەرە نەکات و جووڵە جولْ نەکات بەو خەڵکەی وا بەسەر پشتی یەوە. ئەم فەرمودەیە روونی ئەکاتەوە کە ئەم شاخانە هۆی هاوتایی و بیّ هاوکێشی لە نێوان زەختی ناو سکی زەوی لەگەڵ پاڵەپەستۆی دەرەوەدا یان بەوە بێت کە بەرزیی ئەمان لە لایەوە هاوتایی نزمی و قوڵایی لایەکی تر بکات، بەهەر جۆر بیّ قورئان روونی کردەوە کە ئەم شاخانە پەیوەندی یان هەیە بەو مەبەستەوە ئەم شتە گرنگەی دەرخست کە کەس ئاگادار نەبوو پیّ ی، زانیاری تازەش باوەڕی بەم شتە گرنگە هێناوە بە لایەوە شتێکی رێك و راستە و بەرە بەرە و تا بێت هۆی راستی یەکەی دەرئەکەویّ بۆ زاناکانی تازە، کەواتە با ئەو بارە لیّ گەڕێێن بۆ ئەوان.

د- ئەمەیە کە ئەفەرمویّ: ﴿وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ﴾ لە زەوی دا یا لەو شاخە دامەزراوانەدا چەند رێگای پانی فراوانمان فەراهەم هێناوە کە شوێنی هاتوچۆ و گوزەر کردنن، بەڵکو بەهۆی ئەو رێگا و بانە خەڵکی رێگا دەرکەن بۆ هەر شوێن و وڵاتیّ کە مەبەست و پێویستی یان پیّ ی هەیە، بەڕاستی هەتا بە چاوی ژیریی سەر نەدریّ و بیر نەکرێتەوە نرخ و رێزی ئەم هەموو چاکە و بەهرەی خوا روون نابێتەوە، مەسەلەی رێگا و بان ئەگەر ئاوا قورئان نەیخاتە پێش چاو کەم کەس هەیە شتی وای هەر بە خەیاڵیش دا بێت لەگەڵ ئەوەدا خەڵکی ناچارە بۆی و بیّ ئەوە گوزەران ناکریّ ئەگەر خوا ئەم زەوی یەی بە جۆریّ دروست بکردایە بە تایبەتی شاخەکان کە دەستی نەدایە بۆ رێگاوبان، ئایا خەڵکی چی بکردایە؟ چۆن بگەڕایە بە ناوچەو وڵاتەکان دا بۆ بەجیّ هێنانی مەبەست و پێویستی خۆیان؟ لە بەزەیی و لوتفی بە زیاد بێت.

وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًاۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾

---

هـ- ﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًاۖ﴾ ئاسمانمان دروست کردووه به لای سەرەوه و گێڕاومانه به سەربانێکی پارێزراو له رووخان و کەوتن و له بێ یاسایی تاکاتی دیاریی کراوی خۆی بەلای خواوه، پارێزراوه له کون بوون و گۆڕان و پەك کەوتن ئەوەتا رێك و پێکی یەکەی به چاو دەرئەکەوێ، ئاسمان بریتی یه لەوەی وا به لای سەرەوه تەنانەت سەربانی خانوو ناو ئەبرێ به ئاسمانی خانووەکه، ئینجا ئاشکرایه که شێوەی ئاسمان بۆ ئەم زەوی ئێمه وەکو سەربان وایه بۆ خانوو. ئەم ئاسمانه بەلای سەرمانەوه بەم هەموو جوانی و شیرینی و رێك و پێکی یه هەیه و به چاو تەماشا ئەکرێ. ﴿وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ لەکاتێك دا که بێ بڕواکان بێ ئاگا و بێ هۆشن و بیر ناکەنەوه له بەڵگه و نیشانه روونەکانی که رێنموونی ئەکەن و رابەرێکی بەهێزن لەسەر تاك و تەنیایی خوا و زانین و دەسەڵاتی فراوانی و بەجێ ی هەموو کارو فرمانی.

و- ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ خوا کەسێکه که شەو و رۆژی دروست کردووه، خۆرو مانگی دروست کردووه به جۆرێ هەموو یەکێکیان به چەسپانی ئەگەڕێن و گەردش ئەکەن له خرۆکه و خولگەی خۆیان به بێ لەخشه وەکو مەلەوان بەسەر ئاودا. شەوو رۆژ دوو شتی ئاشکران دێن بەدوای یەك دا به یاسایەکی تێرو تەواوی نەگۆڕاو بۆ بەرژەوەندی ژیانی ئێمه، خۆرو مانگ دوو قەوارەی گرنگن ژیانی ئادەمی لەم جیهانی ئێمەدا بەڵکو ژیان هەموو پەیوەندی یەکی زۆر بەتینی هەیه پێ یانەوه، بێگومان بیر کردنەوه له شەو و رۆژ، گەڕانی خۆر و مانگ بەم هەموو وردی و نەگۆڕانەوه زۆر شایانه که رێنموونی دڵ و دەروون بکات بۆ تاك و تەنیایی خوایه که ئەم کارو باره ئەبات بەڕێوه.

وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾

**لەم چەند ئایەتی رابوردووەدا هەندێ لە یاساو رژێمی بوونەوەری باس کرد لە بابەت دروست کردن و پێك هێنان و بەڕێوە بردنی کاروباری. ئینجا لەم چەند ئایەتی ترەدا یاساو رژێمی ئادەمی باس ئەفەرموێ لەبارەی سروشت و دوایی نەهاتن و پاشە رۆژی یەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ﴾ بڕیارمان نەداوە بۆ هیچ ئادەمی یەك لە پێش تۆوە نەمردن و مانەوەی هەمیشەیی لەم جیهانەدا، بەڵكو هەموو مردوون و ئەبێ بمرن، چونكە هەر شتێ لەپاش نەبوون پەیدا بووبێ ئەبێ نەبوونی بەسەردا بێت و هەر شتێك سەرەتا بێ بۆ بوونی ئەبێ دوایی هاتنیشی ببێ ﴿أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴾ كەواتە ئەی پێغەمبەر ئەگەر تۆ بمری ئایا ئەوان نامرن و هەمیشەیی ئەبن؟ واتە نەخێر ئەوانیش هەموو ئەمرن ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ چونكە هەموو گیانلەبەرێك تامی مردن ئەچەژێ و ئەبێ گیانی لە لەشەكەی جوێ ببێتەوە، ئەمە یاسایەكە و هیچ كەسێ لێ ی دەرناچێ كەواتە زیندووەكان ئەبێ غەمێكی خۆیان بخۆن و بیرێكی مردن و پاش مردنیان پێوە بێت ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ لەماوەی ژیانی ئەم جیهانەدا ئێمە تاقیتان ئەكەینەوە بە زیان و نەبوونی و نەخۆشی و هەموو جۆرە ناخۆشی یەكی تر، بە سامان و دارایی و تەندروستی و دەست خستنی ئەوەی ئارەزووی ئەكەن، تاقیتان ئەكەینەوە بە تاقی كردنەوەیەك كە پاڵفتە كردنە تا دەردەكەوێ كێ خۆگرە و سنووری خوا ناشكێنێ و كێ چاری خۆی پێ ناكرێ و خۆگر نی یە لەسەر هیچ بارێك و بەرگەی سەرما و گەرما ناگرێ و بە هەموو جۆر لە سنوور دەرئەچێ؟ ﴿وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ بۆلای ئێمە ئێوە ئەگێڕێنرێنەوە، واتە لە پاش مردنتان زیندوو ئەكرێنەوە و ئینجا بە پێ ی كردەوەتان رەفتارتان لەگەڵ ئەكرێ، كەواتە ئەوەی خۆگرە و سنوور ناشكێنێ با دڵخۆش بێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت لەو رۆژە سەختەدا و ئەوەی بەرەڵا و تاوان كارە با بترسێ لە تۆڵەی سەخت و سامناكی خوا، خوا بە بەزەیی خۆی پەنامان بدات لە سزاو روو رەشی ئەو رۆژە سەختە، تاقی كردنەوە بە زیان و دەرد و ناخۆشی شتێكی ئاشكرایە و خەڵكی تێ ئەگات كە بۆ ئەمەیە دەركەوێ رادەی خۆگری لە ژێر باری گرانی ناخۆشی و زیان دا، رادەی ئومێد و باوەڕ بەخوا و چاوەڕوانی بەزەیی خوا، بەڵام تاقی كردنەوە بەخۆشی و ناز و رێز پێویستە روون كردنەوەی، بێگومان ئەم تاقی كردنەوەیان زۆر گرانتر و بە ئەرك ترە لە پێشووەكە، ئەگەرچی زۆربەی خەڵكی وا نازانێ، پیاوی ئەوێ لێ ی دەرچێ، زۆر كەس**

هەیە بەرگەی نەخۆشی و دەرد و لاوازی ئەگریَ، بەلاّم کەم کەس هەیە جڵەوی نەفسی سەرکێشی خۆی پیَ ئەگیریَ لەکاتی ساغی و تەندروستی و هێز و توانای دا، بەم رەنگە بەرگری بکات لە تاوان و خراپە و نەیەڵیَ یاخی بێ لە خوای خۆی. زۆرکەس هەیە خۆگرە لە ژێر باری گرانی نەبوونی و بیَ بەشی دا، بەجۆریَ دەروونیان ناڕوخیَ و ریسوا و سەرشۆڕ نابن، لەبەر نەبوونی و کەم دەستی سەر داناخەن بۆ کردەوەی ناڕەوا و شتی بیَ نامووسی، بەلاّم کەم کەس هەیە خۆگر و دامەزراو بێت لەکاتی بوون و دەسەلاّت و سامانی زۆردا. بەم رەنگە یاخی نەبیَ لە خوا و کەشخە نەکات بەسەر بەندەکانی خوادا و سەرنەکاتە رابواردنی ناڕەوا. زۆرکەس هەن خۆگرن لە ژێر سزاو ئازاردا، باکیان نی یە لە ترساندن و هەڕەشە بە جۆریَ ناترازیَ لە رێگای راستی خۆی، بەلاّم کەم کەس هەیە خۆگر بێت و هەڵنەخەڵەتیَ بەو شتانەی نەفس ئارەزووی ئەکات. زۆرکەس هەن خۆگرن لە تێکۆشان و بەر بەرەکانیَ دا، بەم رەنگە [illegible] بێت چالاکتر و دەمار گرژ تر ئەبن، بەلاّم کەم کەس هەیە خۆگر بێت لەسەر ئارام و رەحمەتی بەم رەنگە سەر نەکاتە لەوەڕ و رابواردنی خۆی و کەڵك و دەماری پیاوەتی تێدا بمێنیَ. بە کورتی تەنگی و ناڕەحەتی زۆر جار دەماری پیاوەتی راستی ئەکاتەوە و هێزی بەرگری ئەخاتە ئیش و بەهۆی ئەوەوە مەردوم ئامادە ئەکات بۆ خۆگری و دامەزراوی، بەلاّم خۆشی و رەحەتی دەماری پیاوەتی سست و بیَ هێز ئەکات و هێز بەرگری ئەخەوێنیَ و پەکی ئەخات! جا لەبەر ئەوە زۆر کەس هەن قۆناغی تەنگی و ناڕەحەتی ئەبڕن و لەتاقی کردنەوەکەدا دەرئەچن سەد لە سەد، بەلاّم هەر ئەوانە ئەبینریَن لە تاقی کردنەوەی قۆناغی خۆشی و کامەرانی دا ئەکەون و دەرناچن! ئادەمی بەو جۆرەن، مەگەر کەسانیَ کە خوا پارێزگاری یان بکات و بەهۆی ئەوەوە لە هەردوو قۆناغەکەدا دەرئەچن، سەرئەکەون و ئەوانە ئەو ئیماندارانەن کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەربارەیان ئەفەرمویَ: ﴿عجبا لأمر المؤمن، إن أمره كل خير و ليس ذلك لأحد إلا للمؤمن، إن أصابته سراء شكر فكان خيرا له، و إن أصابته ضراء صبر فكان خيرا له﴾ [1] ئەوانەش بێگومان کەمن. کەواتە وریایی و ئاگاداری لەکاتی خۆشی دا پێویست ترە تا کاتی ناخۆشی، بێگومان پەیوەندی دڵ بە خواوە چارەسەرە لە هەموو کاروبارێك دا و دەرمانی هەموو دەردێکە.

---

[1] واتە کاری ئیماندار زۆر سەیرەو جێگای سەر سوڕمانە، چونکە هەموو کاروبارێکی چاکە و ئەوەش تەنها بۆ ئیماندار هەیە و بەس ئیمانداری راستەقینە ئەگەر لە خۆشی و کامەرانیدا بێت سوپاسی خوا ئەکات، کەواتە شتێکی چاك بوو بۆی و ئەگەر ناخۆشی و سزا بوو ئەو کاتە ئارامی ئەبیَ، کەواتە ئەمیش چاك بوو بۆی، چونکە پاداشتی بەهەشتە.

وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَـٰنِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ مِنْ عَجَلٍ

ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ وێنەی ئەوەی کە لە سەرەتای ئەم سورەتەوە باسی کرد لە بارەی هەڵوێستی ناڕەوای بێ باوەڕەکان بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾ ئەی پێغەمبەر کاتێ کافرەکان تۆ ئەبینن هیچ شتێك ناکەن جگە لەوەی تۆ ئەکەن بە جێگای گاڵتەو لاقرتێ و بەشێوەی بێزاری و سەر سوڕمانەوە لەناو خۆیان دا ئەڵێن: ﴿أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ﴾ ئایا ئا ئەمەیە ناوی پەرستراوەکانتان ئەبات و بە خراپە باسیان ئەکات؟ ئەو سەر لێ تێك چووانە بێزاری یان دەرئەبڕی دەربارەی ئەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی بتە بێ نرخەکانی ئەوانی ئەکرد و بێ نرخی یەکەیانی روون ئەکردەوە بۆیان بۆ ئەمەی کۆتایی بێنن لە پەرستنیان و رێگای راست بدەنە بەر کە تەنیا پەرستنی خوای خاوەن بەزەیی یە، بێزاری یان دەرئەبڕی لەو شتە راست و رەوایە، ﴿وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَـٰنِ هُمْ كَـٰفِرُونَ﴾ لەکاتێك دا خۆیان بێ بڕوان و باوەڕیان نەبوو بە باس کردنی خوا بە تاك و تەنیایی و بەو سیفەت و ناو و نیشانەی کە شایانی ئەوە، باوەڕیان نەبوو بە رەوانە کردنی پێغەمبەر و ئەو قورئانەی کە خوا بە بەزەیی خۆی ناردبووی بۆیان بۆ تەمێ و ئامۆژگاری یان، سەر لێ شێواوی یان لەو رادەیەدا بوو. بەڕاستی هەڵوێست و کردەوە و وتەی ئەوان جێگای سەر سوڕمانە و بەڵگە و نیشانەیەکی روونن لەسەر تێك چوونی سروشت و نەفامی و نەزانی یان. ئەو بێ براوایانە ئەوەندە نەفام و سەر لێ شێواو بوون پەلە پەلیان ئەنایەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) لاقرتی یەوە بە هاتنی سزای خوا، جا بەو بۆنەیەوە ئەوا ئەفەرموێ: ﴿خُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ مِنْ عَجَلٍ﴾ بە سروشت ئادەمی پەلە پەل کەرە تا رادەیەك وەکو لە پەلە دروست کرابێت وایە. کەواتە پەلە کردنی ئەو بێ باوەڕانە جێگای سەر سوڕمان نی یە،

سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِي فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾
لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ
يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً فَتَبْهَتُهُمْ

---

**ئینجا ئەفەرمویٚ: ﴿سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِي فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ﴾ بێگومان لەمە و پاش سزا و تۆڵە سەختەکانی خۆمتان پیشان ئەدەم، کەواتە پەلەم لیٚ مەکەن، واتە بوەستن تا کاتی تایبەتی دیاریی کراوی خۆی دێت، چونکە هەموو شتیٚ کاتی تایبەتی خۆی هەیە بەلای خواوە نە پێش کەوتنی هەیە لەو کاتە و نە دوا کەوتن، ئەو بیٚ باوەڕانە پەلە پەلیان ئەنایەوە ﴿وَيَقُولُونَ﴾ ئەڵێن بە پێغەمبەرو ئیمانداران: ﴿مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ﴾ ئایا کەی ئەبیٚ ئەو سزایە کە ئێوە بەڵێنی پیٚ ئەدەن و هەڕەشەی پیٚ ئەکەن لە ئێمە ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن، دەی بە زوویی بیهێنن، لە باتی وەڵامدانەوەیان، جاڕی نەفامی و نەزانی یان لیٚ ئەدات و شێوەیەك لە شێوە سامناکەکانی ڕۆژی دوایی یان ئەخاتە پێش چاو، ئەفەرمویٚ: ﴿لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەوانەی کە کافرن بەهۆی نەفامی و نەزانی یەوە پەلە ئەنێنەوە لە هاتنی ئەو سزایەی کە هەڕەشەیان لیٚ کراوە پیٚی، ئەگەر ئەوانە ئەزانن ﴿حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ﴾ بەکاتی هاتنی ئەو سزا کە کاتێکە ئاگری دۆزەخ دەوریان ئەدات لە هەموو لایەکەوە، بە جۆرێك نە خۆیان بەرگری ئەو ئاگرەیان پیٚ ئەکریٚ نە لە ڕوو و دەم و چاویان و نە لە پشتیان ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ نە یارمەتیش ئەدرێن لە لایەن هیچ کەسێکەوە بەرگری یان لیٚ بکات، ئەگەر ئەوانە زانا ئەبوون بەو کاتە سامناکە پەلەیان نەئەنایەوە بۆ هاتنی ئەو سزایە، بە تایبەتی باسی دەم و چاو و پشتی کردن چونکە سزای ئەو دووانە بەتین تر و سەخت ترە، ئەوانە زانا نین بە کاتی هاتنی ئەم سزا کە بەڵێن دراوە بە هاتنی و هەڕەشەیان لیٚ کراوە و ترسێنراون پیٚی ﴿بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً﴾ بەڵکو لەناکاودا بە کوت و پڕی ئەو ئاگرەیان بۆ دێت و داگیریان ئەکات ﴿فَتَبْهَتُهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە سەرسام و سەرگەردانیان ئەکات،**

فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ
سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ۗ بَلْ هُمْ
عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا ۚ لَا يَسْتَطِيعُونَ
نَصْرَ أَنفُسِهِمْ وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ ﴿٤٣﴾

---

**﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا﴾ ئینجا نه خۆیان ئەتوانن بەرگری بکەن و بیگێڕنەوە ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ نە مۆڵەتیش ئەدرێن و دوا ئەخرێن بە هیچ جۆر. ئەوانە پەلەیان ئەنایەوە بۆ ئەو سزایە لە تۆڵەی ئەوەدا ئەوا لەناکاودا دێت بێ هۆش و سەر لێ شێواو و دەستە پاچەیان ئەکات، بەش براو لە هەموو خێرو خۆشی و بەزەیی پیا هاتنەوەیەك، خوا پەنامان بدات. ئینجا دڵخۆشی پێغەمبەر(ﷺ) ئەداتەوە و ئەوانیش ئەترسێنێ بە سزای ئەم جیهانەش بە وێنەی هاوبیر و باوەڕەکانیان لەگەل و ئوممەتە پێشووەکان کە ئەوانیش بە لاقرتی یەوە پەلەیان ئەنایەوە لە پێغەمبەرەکانیان درودی خوایان لەسەر بێت، ئینجا خوایش پێشەکی لەم جیهانەدا هەر گەل و تاقمێکی بە جۆرە سزایەك لە ریشە هێنان و بەربادی کردن، ئەو جۆرە سزایە هەرچەندە خوا لەم ئوممەتەدا نەیهێشت و قەدەغەی کرد، بەڵام جۆرێ تری سزای زۆر، کوشتن و برین و بەدیل گرتن و ژێر دەست کردنی کرد بە سزای پێشەکی بێ باوەڕ و لاقرتی کەرانی ئەم ئوممەتە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ واتە سوێند بەخوا گاڵتە و لاقرتی کرا بە پێغەمبەرانی زۆر لە پێش تۆدا، ﴿فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ ئینجا ئەو سزای کە لاقرتی یان پێ ئەکرد هاتە سەر گاڵتە کەرەکانی گەلانی رابوردوو و دەوری دان، واتە ئەمانیش سزای خۆیان ئەبینن، کەواتە دڵ غەمگین و تەنگاو مەبە بە لاقرتی کردنەکەیان. ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە پرسیارێکیان ئاراستە بکات بە شێوەی بێزاری و تەشەر لێ دانیان بۆ ترساندن و بێدار کردنەوەیان لەو بێ ئاگایی ی وان تێیدا. ئەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بێ**

باوەڕە لاقرتی کەرانە: ئایا کێ بە شەو و بەرۆژ ئێوە پاس ئەکات و ئەتانپارێزێ لەخوای خاوەن بەزەیی فراوان ئەگەر بیەوێ دووچاری سزایەکتان بکات کە شایانن بۆی؟! واتە هیچ کەس نی یە بتوانێ بەرگری هیچ سزایەکی خوا بکات و تەنها خوا پارێزەری هەموو پارێزراوێکتانە، سیفەتی رەحم و بەزەیی یەکەی هۆی ئەو پاراستنەیە ئەگەر نا سزادانتان زۆر شایان و بەجێ یە، هەروەها نابێ هیچ کەس هەڵخەڵەتێ بە سیفەتی بەزەیی خوا، چونکە لەگەڵ بەزەییدا سزا و تۆڵەی بەتینە دەربارەی هەر کەسێك کە داد و عەداڵەت لە سزادانی دا بەدی بێت. بەڵێ بێگومان هیچ کەس نی یە پارێزەر بێت و بتوانێ بەرگری بکات لە سزای خوا بەڵام ئەو بێ باوەڕانە ناترسن و باکیان نی یە لە سزای خوا ﴿بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ﴾ بەڵکو ئەوانە هەمیشە بێ ئاگان لە باس و یادی پەروەردگاری خۆیان و [illegible] وەرگێڕن لێ ی و جای ئەوە بترسن لە سزای، کەواتە ئەوانە پارێزەری خۆیان ناناسن تا پرسیاریان لێ بکرێ لەو بارەیەوە، ئینجا پرسیار دووبارە ئەکاتەوە لە شێوەیەکی تردا، ئەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا﴾ ئایا بۆ ئەوانە چەند پەرستراوێك هەیە کە بەرگری یان بکات بێجگە لە بەرگری ئێمە یان بەرگرییمان بکات لە سزایەك کە بێت لە لایەن ئێمەوە؟! واتە نەخێر شتی وا نی یە، چونکە ئەو پەرستراوانەی ئەوان ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ﴾ ناتوانن یارمەتی خۆیان بدەن و بەرگری هیچ شتێ لەخۆیان بکەن، کەواتە باشتر ناتوانن یارمەتی خەڵکی تر بدەن، ئەو پەرستراوانە خۆیان بەخۆیان بەو جۆرە بێ دەسەڵات و بێ توانان ﴿وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ﴾ لەلایەن ئێمەشەوە هاوڕێیی ناکرێن بە یارمەتی دان، یان بە کەسێ کە یارمەتی دەر بێت، واتە هەروەکو خۆیان بێ دەسەڵات و بێ هێزن هەروەها یارمەتیش نادرێن بە هێزو دەسەڵات لەلایەن خواوە کە خاوەنی هەموو هێز و دەسەڵاتێکە، کەواتە پەك کەوتوو و دەستە پاچەی تەواون. لەپاش ئەم هەموو لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو بت پەرستانە کە پرووپووچی بیر و باوەڕەکەیانی پێ روون بووەوە، دەرکەوت کە هیچ شتێکیان بە دەستەوە نی یە کە رابەرێکی لەسەر بێت یان ژیریی وەری گرێ، لە پاش، ئەوە ئینجا واز ئەهێنێ لە لێکۆڵینەوە و هۆی عیناد و سەرکێشی یەکەیان روون ئەکاتەوە.

بَلْ مَتَّعْنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۗ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ ۚ أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾

**ئەفەرموێ:** ﴿بَلْ مَتَّعْنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۗ﴾ **هۆی عیناد و سەرپێچی یان لە ئایینی راست و لانەدانیان لەو بارە لارەی کەوان لەسەری ئەمەیە کە ئێمە ئەوانە و باو و باپیریانمان ژیاندووە بەخۆشی و تێر و تەسەلی و فراوانی نازو نیعمەت و مۆڵەتمان دان هەتا تەمەنیان درێژ بوو ماوەی درێژ بەسەریان دا تێپەڕی کرد بەخۆشی، بەهۆی ئەوەوە گومانیان برد کە هەر لەسەر ئەو بارە خۆشە ئەمێننەوە، ئەو هەموو خۆشی و کامەرانی یەش بەهۆی ئەو بیر و باوەڕەیە کە هەیانە، کەواتە ئەبێ وازی لێ نەهێنن. بێگومان خۆی و رابواردنی دوور و درێژ بە تایبەتی کە بە کەلەپوور لەباوك و باپیرەوە هاتبێ سروشت تێك ئەدات و دڵ و دەروون بێ ئاگا ئەکات لەیادی خوا و چاو کوێر ئەکات لە سەرنج دانی بەڵگە و نیشانەیەك کە هۆی تەمێ خواری یە، جا ئەوا بێداریان ئەکاتەوە لە خەوی بێ ئاگایی، ئەفەرموێ:** ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ﴾ **دەی ئایا ئەوانە سەرنجی بەرهەمی زۆر و دەسەڵاتی ئێمە نادەن و نابینن کە ئێمە بەرە بەرە دێینە خاك و وڵاتی ئەوان و داگیری ئەکەین و خاکەکەی ئەوان کەم ئەکەینەوە لە هەموو لایەکی یەوە؟ واتە بەرە بەرە موسڵمانەکان زاڵ ئەکەین و وڵاتەکەی ئەوان ئەخەینە ژێر دەستیان، ئەوەبوو لەپاش کۆچ کردن بۆ مەدینە و دامەزراندنی حکومەتی ئیسلام خاك و وڵاتی موسڵمانەکان زۆر ئەبوو بە داگیر کردنی خاکی کافرەکان.** ﴿أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ **دەی ئایا بت پەرستەکانی مەککە زاڵ ئەبن و ئەوەی بەسەر کافرەکانی دەوروبەریان هات بەسەر ئەوانیش دا نایە؟ واتە نەخێر زاڵ نابن بەڵکو ئەوانیش وەکو هاوسەرانیان ژێر ئەکەون و وڵاتیان ئەکەوێتە ژێر دەستی موسڵمانان وەکو بەچاو بینرا، ئەوەبوو هەر لە چەرخی پێغەمبەردا مەککە گیرا و ئەو کۆسپە گەورە نەما لەبەر پێی موسڵمانان بەهۆی ئەوە نیوە دوورگەیش کەوتە ژێر دەستی ئیسلام، ئینجا لە پاشان لە دوورگە تێپەڕی هەتا ئیمپراتۆریەتی رۆم و فارسیش کە زۆربەی ئاوەدانی رووی زەوی بریتی بوو لەو دووانە ژێر دەست کران، بەرە بەرە خاکی ئیسلام پەرەی ئەسەند و فراوانتر ئەبوو، خاکی کوفر بەرە و کزی و کەم و کوڕی ئەچوو هەتا موسڵمانەکان کشانەوە لە ئیسلام کە هۆی سەرکەوتن و زاڵ بوونیان بوو ئینجا کارەکە پێچەوانە بووەوە، بەڵام بە یارمەتی خوا ئینجا هەمیتر نۆبەی ئیسلام و موسڵمانانە[1].**

[1] هەرچەند ئەم سورەتە مەککەیی یە، بەڵام ئەم ئایەتە مەدینەیی یە بە لای کۆڕی زانایان لەبەر ئەوە تەفسیرەکەی بەوڕێ یە کرا. رایەکی تر لەسەر ئەوەیە کە ئەم ئایەتەش هەر مەککەیی یە بە گوێرەی ئەو رایە ئەبێ زاڵ کردنی موسڵمانان و کەم

قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْيِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ
نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ
ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا
حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾

**ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم فەرمودەیان پێ ڕاگەیەنێت ﴿قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْيِ ۚ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەو بێ باوەڕانە کە پەلە ئەنێنەوە بە هاتنی سزای خوا کە هەڕەشەیان لێ ئەکەیت پێ یان بڵێ: من ناتانترسێنم بەوە نەبێ کە سروشم بۆ کراوە لە لایەن خواوە، واتە خوا فەرمانی پێیا داوم کە بتانترسێنم، من لەلایەن خواوە ئەتانترسێنم نەك لە لایەن خۆمەوە، من ترسێنەری ڕوونم. ئیتر هیچی ترم بە دەست نی یە، لە دەسەلآتی من دا نی یە هێنانی سزاو ئەو شتەی کە هەڕەشەتان لێ ئەکەم پێی، ئینجا من ئەوا بانگتان ئەکەم و ئەتانترسێنم، ئەگەر گوێ ڕایەڵ نەبوون ئەوە خۆتان خراپن ﴿وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ﴾ کەسانێك کە کەڕن و بانگ لێ کردن نابیستن، کاتێ ئەترسێنرێن و بانگ ئەکرێن بۆ ڕێگای ڕاست، واتە ترساندنی ئەوانە سوودیان پێ ناگەیەنی، چونکە وێنەی کەسانێکن کە کەڕن و هیچ شتێك نابیستن، ئەو بێ باوەڕانە کە لە پێشەوە باکیان نییە لە سزای خوا هەرکات دووچار بوون بەرگەی هەڵمێ ناگرن و دان ئەنێن بە تاوان و خراپی خۆیان دا وەکو ڕوون ئەبێتەوە لەم فەرمودەیەوە ﴿وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ﴾ سوێند بەخوا ئەگەریەك جار سووکترین بەش لە سزای خوای تۆ لێ یان کەوێ ﴿لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ بێگومان هاواریان لێ هەڵ ئەستێ و ئەڵێن: ئای مەرگ بێت بۆمان، بە هیلاك دا بچین، بەڕاستی ئێمە تاوان بار و ستەمکار بووین لە دنیادا! بەڵام تازە هیچ سوودی نی یە نە هاوار و نزای شەڕ نە پەشیمانی و نە دان ئان بە خراپە و تاوان دا، چونکە کاتیان لە دەست خۆیان**

کردنەوەی خاك و وڵآتی کافرەکان بکەین بە بەڵێن لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەدا، وشەی(أفلا یرون) تەفسیر بکەین بە: ئایا نازانن؟ نەك بە ئایا نابینن؟

دەرکرد، لە پاش ترساندن بەهاتنی رۆژی دوایی و سزا بەتینەکەی، ئینجا روونی ئەکاتەوە کە هیچ کردەوەیەك گەورەو بچووك، چاك و خراپ هیچی ون نابێ و حیساب و پرسیار و کێشانەی هەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ ترازووی گرنگی داد دائەنێین لە رۆژی دوایی دا ﴿فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ﴾ کەواتە هیچ کەس زوڵم و ستەمی هیچ شتێکی لێ ناکرێ. ﴿وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ﴾ ئەگەر کردەوە بە ئەندازەی قورسایی تەنیا دانەوێڵە و ناوکەی خەرتەلە بێت ﴿أَتَيۡنَا بِهَاۗ﴾ ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەکەین، ناوکە دانەوێڵەی خەرتەلە وێنە و نموونەی بچوکترین شتە کە بە چاو ببینرێ و سووك ترین شتە کە لە ترازوودا دیاریی بدات. مەبەست ئەوەیە هیچ شتێ و هیچ کردەوەیەك ون نابێ و بە خۆڕایی ناڕوا، چونکە کارو بارەکە لە ژێر زانین و دەسەڵاتی بێ سنووری خوادایە، ئیتر ئەوە ئەوپەڕە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ بەسە بۆ خەڵکی لەو رۆژەدا کە ئێمە ئاگادار و زاناین بە هەموو شتێك و هەڵژمێرەری هەموو کردەوەیەکین، کەواتە با هەموو کەسێ تێبینی بکات و بیرێ بکاتەوە لەو کردەوەی کە ئێستا ئەیکات پێشی هاتنی ئەو رۆژە، با بەدڵ گوێ بگرێ لە ترسێنەری خوا، با بێ ئاگا و لاقرتی کەرەکان پەلە بکەن پێش ئەمەی کار لەکار بترازێ. ئینجا تا نزیکی دوا دوایی سورەتەکە گەل و ئوممەتی پێغەمبەران پیشان ئەدات، هەندێکیان بە هێمان دەست نیشان ئەکات و هەندێ تریان دیاریی ئەکات و بە درێژیی یان بە کورتی باسیان ئەکات، لەم باسانەدا بەزەیی و چاودێریی خوا دەربارەی پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان روون ئەبێتەوە، هەروەکو تۆڵەی سەختی خوا دەربارەی بێ باوەڕەکان ئاشکرا ئەبێت. هەروەها دڵ ئاگادارو بێدار ئەبێتەوە بە باو و رەوشتی خوا لە ناردنی پێغەمبەران دا، لە رەسەنی ئادەمیزاد، هەرچۆنێ ئاگادار ئەبێتەوە بە یەکێتی بیر و باوەڕ و رێگای هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – بە جۆرێك وەکو هەموو یەك گەل و یەك ئوممەت بن هەرچەند چەرخ و جێگا و شوێنیان لە یەکترەوە دوور بێت. لەمە و پێش زۆرجار قورئان باسی موسا و تەورات ئەکات بەجوت لەگەڵ باسی پێغەمبەرمان و قورئان دا،

جا بە گوێرەی ئەوە ئەوا لێرەدا بەو جۆرە دەست پێ ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ﴾ سوێند بەخوا بەخشیمان بە موسا و هارون کتێبێ -کە تەوراتە - کە جیا کەرەوەی شتی راست و رەوایە لە چەوت و ناڕەوا، رووناکی یەکە لە تاریکی و نەزانی و سەرگەردانی دا رێگای پێ دەرئەکرێ، ئامۆژگاری یەکە بۆ خۆپارێزەکان. لەمەوپێش لەم سورەتەدا باسمان کرد کە بت پەرستەکان لاقرتی یان ئەکرد بە پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ئەمەی ئادەمی یە، باوەڕیان نەبوو بە قورئان ئەیانوت جادووە، یان شیعرە، یان دەست هەڵبەستە، وا لێرەدا روونی ئەکاتەوە کە باوی خوا هەروا بووە پێغەمبەری تەنها لە تیرەی ئادەمی ناردووە، ئەمانەی کە لەم سورەتەدا باس ئەکرێن نموونەیەکن لەوانەی رابوردوو، هەروەها روونی ئەکاتەوە کە ناردنەخوارەوەی قورئان جێگای سەر لێ کردنەوەو سەر سوڕمان نی یە، چونکە لەمەوپێش خوا کتێبی تری ناردووە بۆسەر پێغەمبەران بۆ نموونە تەوراتی موسا(علیه السلام) کە لێرەدا بە ﴿الفرقان﴾ ناوی بردووە کە ئەم وشەیە ناوێکە لەناوەکانی و سیفەتێکە لە سیفەتەکانی واتە ئەم دوو کتێبە یەکن تەنانەت لەناو و سیفەتیش دا. بێگومان هەموو کتێبەکانی خوا ئەم سیفەتەیان هەیە، هەموو جیاکەرەوەی حەقن لە ناحەق، جیا کەرەوەی رێگای راست و رێنموونن لەرێگای لارو چەوت و گومڕایی و سەر لێ شێوان، هەروەها هەموو رووناکین بۆ ژیریی و دەروون و هەست، تاریکی و تەم و تەپ و تۆزیان بەسەرەوە ناهێڵن، هەروەها ئامۆژگارین، بەڵام سوودی ئەم سیفەتانە بۆ کەسانێ نی یە کە چاوی دڵیان کوێرە، بەهۆی ئەوەوە هێزی ژیریی یان پەکی کەوتووە و ئیش ناکات، بەڵکو سوود و بەرهەمیان تەنها بۆ ئەوانەیە کە چاوساغن و ئامادەن بۆ باوەڕهێنان و یان باوەڕیان هێناوە، بەهۆی ئەوەوە خۆپارێزەرن، یان ئامادەن بۆ خۆپارێزی لەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردوون. ئینجا دوو سیفەتی گرنگی ئەو خۆپارێزەرانە باس ئەفەرموێ: کە بنەڕەتی هەموو پیت و فەڕ و چاکەیەکن.

ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشۡفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكۡرٞ مُّبَارَكٌ أَنزَلۡنَٰهُۚ أَفَأَنتُمۡ
لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ
وَقَوۡمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾

---

﴿ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ﴾ ئەو خۆپارێزەرانە کەسانێکن کە سام ئەکەن و ئەترسن لە پەروەردگاریان ﴿وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشۡفِقُونَ﴾ کەسانێکن کە ئەترسن لەرۆژی دوایی، ئەترسن و دڵە لەرزەیانە لە سزای ئەو رۆژە و بەسەرهاتە ناهەموارەکانی، کەواتە لە ئێستاوە خۆیانی بۆ ئامادە ئەکەن و توێشووی بۆ هەڵئەگرن، ئا ئەوانەن سوود وەرئەگرن لە کتێبەکانی خوا، بە پێی رێنموونی کتێبی خوا ئەجولێنەوە، کەواتە کتێبی خوا بۆ ئەوانە ئەبێتە پەند و ئامۆژگاریی، خوای خۆیانیان بیر ئەخاتەوە و ناوبانگیان بەرز ئەکاتەوە لەناو خەڵك دا. ئەوە بوو بە کورتی باسی موسا و هارون و کتێبەکەیان، ﴿وَهَٰذَا ذِكۡرٞ مُّبَارَكٌ أَنزَلۡنَٰهُ﴾ ئەم قورئانەیش پەند و ئامۆژگاریی یەکی بە پیت و فەرە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بۆتان ﴿أَفَأَنتُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە بێ باوەڕن پێی و دانی پێدا نانێن؟ واتە چ هەڵوێستێکی ناڕەواتان هەیە؟ پێچەوانەی ژیریی یە. لە پاش تێپەڕین بەسەر باسی موسا و هارون و کتێبەکەیان دا بە کورتی و بە پەلە ئەگەڕێتەوە بۆ سەر باسی ئیبراهیم کە باوکە گەورەی قورەیشە و دروست کەری خانوی کەعبەیە بۆ ئەمەی نەوەکانی بیر بکەنەوە و ئاوڕێك بەلای باوکە گەورەیانەوە بدەنەوە و پەیڕەوی بکەن لە پەرستنی خوا و رێزگرتنی کەعبەدا و زنجیرەیەك لەسەرگوزەشتەکەی باس ئەکات:

ئەم زنجیرەیە لێرەدا لە بابەت پێغەمبەرێتی ئیبراهیمەوەیە، لە یەکەم جارەوە دەست پێ ئەکات بەمەی کە ئیبراهیم هەرلەمنداڵی یەوە خوا رێنموونی کردووە بۆ خواپەرستی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ﴾[1] بێگومان ئێمە بەخشیمان بە ئیبراهیم هۆی کاردروستی خۆی لەپێش ئەمەی بیکەین بە پێغەمبەر، واتە هەر لە منداڵی یەوە باوەڕ بە تاك

---

[1] هەندێ ئەفەرمون مەبەست بە(من قبل) پێش موساو هارونە، یان پێش پێغەمبەرمانە، بەپێی ئەمە مەبەست لە وشەی(رشد) پێغەمبەرێتی یە، بەلاَم رای تەفسیرەکە بەهێز ترە.

ڕ تەنیایی خوامان لەدڵی دا جێگیر کرد، کە ئەو باوەڕە بنەڕەت ڕ یەکەم هۆی دروستی ڕ ڕاستی هەموو کاروبارێکە لە هەردوو جیهان دا، ﴿وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ﴾ ئێمە ئاگادارو زانا بووین پێ ی، واتە ئیبراهیممان ناسیوە ڕ زانیومانە کە شایانی ئەو بەخششەیە ڕ ئامادەیە بۆ هەڵگرتنی سپاردەی گەورەی پێغەمبەرێتی، شتێکی بەناو بانگە کە باوك و کەس ڕ کار ڕ گەلەکەی ئیبراهیم بت پەرست بوون بە تایبەتی باوکی کە وەکو ئەڵێن بت تاش بووە، جا لێرەدا بەسەرهات و هەڵوێستێکی ئەخاتە پێش چاو کە بەڵگەو نیشانەیەکی بەهێزە لەسەر ڕێگەی ڕاستی و کار دروستی ئیبراهیم، لەسەر ئەوەی کە شایانی ئەو بەخششە بووە کە خوا پێ ی داوە، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم بە باوکی و گەلەکەی وت: ئایا چین ئەم وێنە و هەیکەلە دەست کردانەی کە ئێوە ماونەتەوە بەلایانەوە و هەمیشە دڵتان پێوە بەستوون؟ واتە ئەم بتانەی کە ئێوە ئەیانپەرستن شتێکی بێ نرخن، من بێزاری دەرئەبڕم لێتان کە ئێوە شتی ئاوا بێ نرخ ئەپەرستن! مەبەستی لەم شێوە پرسیارەدا بێدار کردنەوەیانە تا بیر بکەنەوە و لە بێ نرخی ڕ بێ سوودی ئەو دارو بەردە پەرستراوەیان بگەن، بەڵام ئەوان ژیریی یان لە ئیش کردن وەستا بوو بیریان لەوە نەئەکردەوە، هەروەها ئەم پرسیارە وا نیشان ئەدات کە هیچ هۆو پاڵ پێوە نەرێك نی یە بۆ ئەو کردەوە ناڕەوایەیان، لەبەرئەوە لە وەڵام دا هۆ ڕ پاڵ پێوەنەریان باس کرد و ﴿قَالُوا۟﴾ وتیان: ﴿وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ﴾ ئێمە ئەمانە ئەپەرستین، چونکە زانیومانە کە باوك و باپیرمان پەرستویانن و عیبادەتیان بۆ کردوون و ئێمەیش شوێن ئەوان کەوتووین، ئەم وەڵامە وا پیشان ئەدات کە هیچ هۆیەکیان بەدەستەوە نی یە جگە لە لاسایی کردنەوەو شوێن کەوتنی کوێرانەی باوك و باپیریان، ئەمەیش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر وەستان و لەکار کەوتنی هێزی ژیریی یان، شێواندنی دڵ و دەروون و سروشتیان، چونکە ئادەمی وا دروست کراوە کە ئازادو سەربەست بێت و کوێرانە شوێن کەوتوو نەبێت، بە تایبەتی ئەبێ عەقیدەو باوەڕی لەسەر ژیریی و ڕابەری بەهێز داڕێژێ، نابێ بنەڕەتی لەسەر لاسایی و شوێن کەوتن بێت، هەروەکو نابێت لەسەر بۆش و گومان ڕ دوو دڵی بە بێ بەڵگەو ڕابەرێکی بەهێزی ژیریی،

قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ
﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾
وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ

---

لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێ یان: ﴿لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ سوێند بەخوا ئێوە و باوك و باپیرتان لە گومڕایی یەكی روون و ئاشكرادا بوون. بێگومان پەرستنی باوك و باپیر هیچ نرخێ نادات بەو بتانە، چونكە پەرستنەكەیان لەرووی ژیریی یەوە نەبووە، لەسەر بۆش بووە و بە بێ بەڵگەو رابەرێ. ئینجا بەو جۆرە بێ پێچ و پەنا روو بە روویان وەستا و بڕیاری گومڕایی خۆیان و باوك و باپیریانی دا ئەوانیش وەكو بڵێیت كەوتنە گومان و دوو دڵی لە عەقیدەو ئایینەكەی خۆیان بە هۆی ئەوەوە ئەم پرسیارەیان لێ كرد: ﴿قَالُوٓا۟﴾ وتیان: ﴿أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ﴾ ئایا تۆ كە ئەوە قسەو بڕیارتە، شتی حەق و راستیت بۆ هێناوین و بەدڵ ئەو قسە و بڕیارە ئەدەیت؟ یان بەڕاستت نی یە و یەكێكی لە گاڵتە كەران و بەگاڵتەوە ئەیڵێیت؟ بێگومان ئیبراهیم لەهێزی دڵ و باوەڕی دامەزراوەوە ئەو بڕیارەی ئەدا، عەقیدەو باوەڕی حەق و راستی بۆ هێنابوون بە بەڵگەو رابەری روون و ئاشكراوە، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ وتی پێ یان: ﴿بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ نەخێر من گاڵتە كەر نیم، بەڵكو عەقیدەو باوەڕی راستم بۆ هێناون، كە ئەمەیە: خوای پەروەردگاری ئێوە كەسێكە كە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی یە، ﴿ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ﴾ كە ئەو ئاسمانان و زەوی دروست كردووە لە نەبوونەوە دای هێناون. ئەمەیە عەقیدەو باوەڕی رێك و راست و پاك و خاوێن، تەنها كەسێ پەروەردگاری هەموو دروست كەرو داهێنەری هەمووە كەواتە تەنیا ئەو كەسە شایانی پەرستنەو بەس، نەك وەك ئەو بت پەرستانە كە ئەیان وت: خوا داهێنەرو دروستكەری هەموانە و لەگەڵ ئەوەیش دا سوژدەیان ئەبرد بۆ ئەو دارو بەردەی كە بەدەستی خۆیان رێك و پێكیان ئەكردن و لایشیان وا بوو دروست كراوی خوای گەورەن!!

باوەڕی بەهێزی ئیبراهیم بە دروستکەرو داهێنەریی خوا لەرادەیەك دا بووە وەکو بەچاو دیبێتی وا بوو، لەبەر ئەوە فەرموی: ﴿وَأَنَا عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ الشَّٰهِدِينَ﴾ من لەو کەسانەم کە شایەتن لەسەر ئەوەی کە باسم کرد بۆتان. ئاشکرایە کە ئیبراهیم دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و خۆی و گەلەکەی بەچاو نەدیبوو، بەڵام شتەکە ئەوەندە راست و روونە، ئەوەندە بەڵگەی ئاشکرا و دیاریی لەسەرە، گەیشتووەتە رادەیەك کە ئیمانداران بە هەموو دڵنیایی و هێزی دەروونەوە ئەتوانن شایەتی لەسەر بدەن. ئەو هەموو وت و وێژو لێکۆڵینەوە دەمی یە هیچ سوودی نەبوو بۆ بەرگری ئەو گەلە لە بت پەرستی و روون کردنەوەی بێ نرخی بتەکانیان، ئینجا ویستی بەکردەوە بێ نرخی یان روون بکاتەوە، لەبەر ئەوە نیازی کرد کە هەتکی بتەکانیان بکات و پەن و خراپەیەکیان بەسەر بێنێ، دیارە ئەوەیش بەپێش چاوی بت پەرستەکانەوە ناکرێت، کەواتە ئەبێ بوەستێ تا هەلێکی بۆ هەڵ ئەکەوێت هەلی دۆزی یەوە بۆ پێك هێنانی ئەو مەبەستە، کە بریتی بوو لە کاتی جەژنی نەورۆزیان کە باویان وابوو لەو جەژنەدا ساڵانە بە کۆمەڵ و تێکڕایی دەرئەچوون بۆ شوێنی تایبەتی و دوور لە بتەکانیان، جا لەبەر ئەوە ئیبراهیم پێی فەرموون: ﴿وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ﴾ سوێند بەخوای گەورە شتی خراپ بەسەر بتەکانتان ئەهێنم و کۆشش ئەکەم لە زیان پێ گەیاندنیان دا لەپاش ئەوەی ئێوە رۆیشتن لایان و پشتتان تێ کردن، ئیتر ئایا ئەم هەڕەشەی لەبەرخۆیەوە کردبێ بە نهێنی لەوان؟ یان بە ئاشکرا و روو بەرووی ئەوان بەڵام ئەگەر روو بەرووی ئەوان بوو بێت گوێ یان لەم هەڕەشەیە نەبووە، چونکە باوەڕیان وابووە هەرگیز ئیبراهیم ناتوانێ شتی وا بکات و هەر لەگەڵ نیازی خراپەی بەدڵ دا بێت بتەکان قاری لێ ئەگرن و بەربادی ئەکەن، بە هەردوویار ئەگونجێ و بە هەر جۆر بووبێت ئەو هەڕەشەی کردی بەدی هێنا وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا﴾ ئینجا ئیبراهیم هەموو بتەکانی پارە پارە کرد ﴿إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ﴾ جگە لە بتە گەورەکەیان، گەورە لە قەبارەدا، یان گەورە لە رێزو گرنگی دا لەدڵی بت پەرستەکان دا، بەهەرحاڵ ئەوەیانی هێشتەوەو ئەڵێن ئەو تەورەی کە بتەکانی پێ شکاند نای بەسەر شانی ئەو بتە گەورەیەوە.

لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ سَمِعْنَا
فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ فَأْتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓاْ
ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾

﴿لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾ بەڵکو کە هاتنەوە بگەڕێنەوە بۆلای ئیبراهیم و ئەو پەنەی پێیان دراوە بیبڕن بەسەر ئەودا و ئەویش بە لاقرتی یەوە بیبڕێ بەسەر بتە گەورەکەدا بەڵکو بێدار ببنەوە کە ئەو بتانە شتێکی بێ نرخ و بێ کەڵکن، ئەوەتا بەکاری خۆیشیان نەهاتن، یان بەڵکو کە هاتنەوە بگەڕێنەوە بۆلای ئەو بتە گەورەیە و پرسیاری لێ بکەن کە چۆن ئەو بە دیارەوە بوو بە پێش چاوی ئەوەوە ئەو پەنە دراوە، ئەمەیش کە گەورەیانە هیچ بەرگری لێ نەکردوون؟!! ئینجا لەوەوە بیر بکەنەوە کە بت پەرستی شتێکی پڕو پووچەو نەفامی یە، گەلەکەی هاتنەوەو بتەکانی خۆیانیان بەو جۆرە بینی، بەڵام ئەوەندە تێگەیشتوو نەبوون بیرێ بکەنەوە لەمەی کە ئەم بتانە ئەگەر شت بوونایە ئەوەیان بەسەر نەئەهات، بیریان لەو شتە ئاشکرایە نەکردەوە، چونکە پەردەی ئەستووری پڕو پووچی درابوو بەسەر چاوی ژیریی یان دا و پەکی خستبوون لە بینین و لاسایی، شوێن کەوتنی کوێرانەی باوك و باپیریان سروشتی گۆڕی بوون، بەهۆی ئەوەوە بە شوێنی ئەو کەسەدا ئەگەڕان کە ئەو کارەی کردووە تاکو تۆڵەی لێ بسێنن، لەبەر ئەوە کاتێ گەڕانەوە ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ﴾ [1] ئایا کێ ئەمەی کردبێ بە پەرستراوەکانمان؟ ﴿إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڕاستی ئەو

[1] تەفسیر لەسەر ئەوە کراوە کە وشەی(من) بۆ پرسیار بێت و پرسیارەکەش بۆ بێزاری دەربڕینە، باری تریش هەیە کە وشەی(من) موصولە بێت و(مبتدأ) و(خبر) ەکەی رستەی(إنه لمن الظالمين) ە، هەردو هەر ئەگونجێ.

کەسە لە ستەمکارانە. بێگومان لەوەو پێش بیسترا بوو کە ئیبراهیم رەخنە لە بتەکان ئەگرێ و بێزارە لە بت پەرستی، ئەوە بوو لەگەڵ باوکی لەو بارەیەوە چەند وت و وێژی کرد، جا لێرەدا ئەوەیان بیر کەوتەوەو تاقمێ ﴿قَالُوا﴾ وتیان: ﴿سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ﴾ بیستوومانە لاوێك بە خراپە ناویان ئەبات و رەخنە و لەکەیان لێ ئەگرێت، ئەو کورە ﴿يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ﴾ پێی ئەوترێ ئیبراهیم، واتە ناوی ئیبراهیمە. لەم فەرمودەوە دەرئەکەوێت کە ئیبراهیم(علیه السلام) گەنج و منداڵ کار بووە، هەر لەو منداڵی یەدا خوا خستی یە دڵی یەوە کە بێزار بێت لە بت پەرستی بەڕادەیەك ئەو پەنە گەورەی هێنا بەسەر ئەو بت و بت پەرستانەدا، بەڵام ئایا لەوکاتەدا سروشتی بۆ هاتبێ و کرابێ بە پێغەمبەر، یان خێر پێش پێغەمبەرێتی بووەو بەڵام خوای ئەوەی نایە دڵی و هەر بە پاکی هێناوێتی؟ بەهەرکام بێ هەر ئەگونجێ، بەڵام دڵ بە باری دووەم بەهێز و بە ئارام ترە. ئینجا ئەوانەی کە ئەم هەواڵی ئیبراهیمەیان پێ دراوە ﴿قَالُوا﴾ وتیان: ﴿فَأْتُوا بِهِ عَلَىٰ أَعْيُنِ النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ﴾ کەواتە برۆن بیهێنن لەپێش چاوی خەڵکی راگیری کەن بەڵکو شایەتی لێ بدەن یان با خەڵکی ببینن و بزانن کە ئەو ئەم کارەی کردووە، واتە جاڕی لێ بدەن و بێ ئابڕووی بکەن. هێنایان، ئینجا ﴿قَالُوا﴾ پێیان وت: ﴿أَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ﴾ [1] ئایا تۆ ئەمەت کرد بە پەرستراوەکانی ئێمە ئەی ئیبراهیم؟ ئەو سەر لێ تێك چووانە هێشتا هەر بە پەرستراوی خۆیانیان دائەنان پاش ئەمەی پارە پارەیش کرا بوون!! جا بەهۆی ئەوەوە ئەوەندە پەست و نەفام بوون ئیبراهیم هیچ خۆی پێ نەگیرا،

---

[1] ئەم جۆرە پرسیارە بۆ تەقریرە، واتە هاندانی لەسەر دان نان بەو کردەوەیەدا، ئەو کۆمەڵە لایان روون بوو کە ئیبراهیم ئەو کردەوەیەی کردووە، کەواتە پرسیارەکەیان لەسەر مانای راستەقینە نی یە.

قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ
فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ
﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ
وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ

---

لاقرتي پێ كردن و وەلامێكی دانەوە رێك بێت لەگەڵ رادەی نەزانی و نەفامی یان دا بەم شێوەیە: ﴿قَالَ﴾ فەرمووی پێ یان: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ﴾ نەخێر ئەم بتە گەورەیان ئەوەی كردووە، دەی پرسیاریان لێ بكەن ئەگەر گفتوگۆ ئەكەن تا بۆتان روون بكەنەوە كە كێ ئەوەی بەسەر هێناون؟ بێگومان ئاشكرایە كە مەبەستی(علیه السلام) لەم وەلامەدا لاقرتی كردنە بەو بت پەرستانە، كەواتە نابێ فەرموودەكەی بەدرۆ دابنرێ، هیچ پێویست نی یە بەو هەموو پینە و پەڕۆیە كە زاناكانی تەفسیر كردوویانە بۆ دوور خستنەوەی درۆ لێ ی، ناوبردنی بە درۆ وەكو لە حەدیسێك دا هەیە كە بوخاری و موسلیم و ترمزی ریوایەتیان كردووە لە ئەبو هورەیرەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیبراهیم پێغەمبەر هەرگیز درۆی نەكردووە لە سێ شوێن دا نەبێ، یەكێ لەو سیانە ئەمەیە كە لەم ئایەتەدا هەیە، ئەو ناوبردنە بە گوێرەی دیمەنی رووتە، لە رووی راستی دا درۆ نین و وێنەی ئەمانە پێیان ئەوترێ:(معاریض) واتە ئەو وتارانەی كە بە دیمەن راست نین، بەلام دیمەنەكەیان مەبەست نی یە، بەڵكو بارێكی تری مەبەستە كە راستە، ئەمانەیش شتێكی رەوا دراون وەكو لە حەدیس دا ئەفەرموێ: ﴿إن في المعاریض لمندوحة عن الكذب﴾ [1] لە پێغەمبەری ئازیزمانەوە(ﷺ) ئەم جۆرە وتەیانە رووی داوە، بە تایبەتی لەكاتی مەزاح و كردنی قسە بۆ خۆشی، وەكو ئەمە: پیاوێك هاتە خزمەتی و داوای حوشترێكی لێ كرد بۆ

---

[1] وتنی ئەو جۆرە وتانە رێگایە بۆ خۆپاراستن لە درۆ كردن.

ئەوەی سواریی پێ بکات، ئەویش فەرمووی: بێچووە حوشترێکت ئەدەمێ بۆ سواری، ئەویش وتی: جا بێچووە حوشتر چی لێ بکەم و کەی کەڵکی سواریی ئەگرێت؟ ئینجا پێغەمبەر(ص) مەبەستەکەی روون کردەوە و فەرمووی: ئایا هیچ حوشترێکت دەست ئەکەوێت کە لە پێش دا بێچووە حوشتر نەبووبێت؟ یان فەرمووی بە پیرە ژنێ: پیرەژن ناچێتە بەهەشت. لێرەدا ئافرەتەکە ترسا و غەمی لێ هات تا بۆی روون کردەوە کە بە پیری ناچێت، بەڵکو لە پێشەوە گەنج و جوان ئەکرێتەوە ئینجا ئەچێتە بەهەشت. بێگومان ئیبراهیم ویستی بەو لاقرتی پێ کردنە بێداریان بکاتەوە و سەرنجیان راکێشێ بۆ بێ کەڵکی و بێ نرخی ئەو بتانە، ئەو فەرمودەی ئەندازەیە کاری تێ کردن تا رادەیەك شەرم و خەجاڵەتی گرتنی وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ئینجا بیرو هۆشێکیان کردەوە لە دەروونی خۆیان دا و گەڕانەوە بۆلای ژیریی خۆیان و بێدار بوونەوە لەمەی کە شتێك نەتوانێ بەرگری زیان لە خۆی بکات، یان نەتوانێ تۆڵەی خۆی بستێنێ، یان نەتوانێ گفتوگۆ بکات ئەبێ چۆن بتوانێت بەرگری زیان لە خەڵکی تر بکات؟! یان ئەبێ چۆن بتوانێ سوود و قازانج بۆ خەڵك رابکێشێ؟ کەواتە شتی وا ئەبێ چۆن شیاوی پەرستن بێت؟! ﴿فَقَالُوٓاْ﴾ بەهۆی ئەو بیر کردنەوەوە وتیان بە هەندێکی تریان: ﴿إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بەڕاستی هەر ئێوەن زاڵم و ستەمکارن کە ئەو پرسیارە ئەکەن لە ئیبراهیم، یان کە شتی ئاوا بێ نرخ ئەپەرستن!! ئێوە زاڵم و ستەمکارن نەك ئەو کەسەی ئەم پەرستراوانەی پارە پارە کردوون!! ئەو تۆزە هۆشەیان کردەوە، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو هەڵگەڕانەوە وەکو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ﴾ لە پاشان سەر بەرەو ژێر کرانەوە و هەڵگەڕانەوە بۆ بارە چەوتەکەی خۆیان و دەستیان کردەوە بە دەمبازی و وتیان بە ئیبراهیم: ﴿رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ﴾ بێگومان تۆ زانیوتە و ئەزانی کە ئەمانە گفتوگۆ ناکەن، کەواتە چۆن پێمان ئەڵێیت پرسیاریان لێ بکەن؟! بەڕاستی هەر بە قورئان ئەکەوێ شت بڵێت، تەماشا کە لە یەکەم جارەوە فەرمووی: ﴿فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ئەم بت پەرستانە لەمەو پێش رۆیشتبوون و لای خۆیان نەبوون بەهۆی ئەوە بت پەرست بوون و خەریك بوون

به شتێ ئاوا پڕوپووچەوە، ئینجا گەڕانەوەو هاتنەوە بۆ لای خۆیان کاتێ کە زانی یان خۆیان زاڵم و ستەمکارن. لە یەکەم جارەوە بەو شێوە نیشانی دان و خستنی یە پێش چاو، ئینجا لێرەدا دەربارەیان فەرموی: ﴿ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ﴾ لەو کاتەدا کە بیریان کردەوە لە پڕو پووچی و بێ نرخی بت و بت پەرستی لەو کاتەدا ڕێك و ڕاست ڕاوەستان سەریان لە سەرەوە و قاچیان لای خواریانەوە بوو، ئینجا کاتێ پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوە بۆ بارە چەوتەکەی خۆیان، لەم کاتەدا پێچەوانەی باری ڕاستن وەکو کەسێ هەڵگەڕێنرێتەوە سەر بۆلای خوار و قاچ بۆلای سەر. ئەوانە ئاگایان لە خۆیان نەبوو، هەر بە قسەی خۆیان خۆیانیان پەك خست قسەی حەزرەتی ئیبراهیمیان زاڵ کرد بەسەر خۆیان دا، ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ﴾ دەی ئایا ئێوە جگە لەخوا و لە باتی خوادا شتێ ئەپەرستن کە سوودی هیچ شتێکیان پێ ناگەیەنێ ئەگەر بیپەرستن و زیانی هیچ شتێکیان لێ نادات ئەگەر نەیپەرستن؟ واتە شتی وا بێ کەڵك و بێ نرخ شایانی پەرستن نی یە، ﴿أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ پیسی و بۆگەنی و ناشیرینی لەخۆتان و لەوەش کە ئەیپەرستن لەباتی خوا، واتە بێزاری دەرئەبڕم لێتان، ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ژیر نین و تێ ناگەن لە خراپی کردەوەکەتان؟ واتە بیر بکەنەوە و ژیر بن تا تێ بگەن لە خراپی کردەوەکەتان بەڵکو وازی لێ بێنن، ئەوانەی کە یاخین و خاوەنی بیر و باوەڕی ناڕەوان باویان وایە، کاتێ پەکیان کەوت و هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نەما بۆ بەرگری کردن لە بیر و ڕا پووچەکانیان بەرامبەر بە تیشکی پرشنگداری باوەڕی ڕاستەقینە، ئەو کاتە پەلامار ئەدەن و ئەیانەوێ بە ئاگرو ئاسن باوەڕە ناڕەواکانیان بچەسپێنن و خەڵکیش وەکو خۆیان بکەن بە شەمشەمە کوێرە بەرامبەر بە تیشکی بەهێزی باوەڕ. جا بە پێی ئەم باوە یاخی یەکانی گەلەکەی ئیبراهیم فەرمانیان بەم جۆرەدا: ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿حَرِّقُوهُ﴾ ئیبراهیم چاك بسوتێنن ﴿وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمْ﴾ یارمەتی پەرستراوەکانتان بدەن،

بەم ڕەنگە تۆڵەیان بۆ بسێنن ﴿إِن كُنتُمْ فَـٰعِلِينَ﴾ ئەگەر ئیش کەرن و یارمەتی یان ئەدەن و بەباشی ئەوە بکەن. بەم بەم پەرستراوی چاکن، بەندەکانیان یارمەتی یان بدەن خۆیان ناتوانن بەرگری لە خۆیشیان بکەن، چ جای لەوانە کە ئەیان پەرستن!! بەڕاستی نەفامی و نەزانی تا ئەم ڕادەیە سەیرە!! ئەو ستەمکارانە قسەی خۆیانیان کرد بڕیاری ناڕەوای خۆیانیان دەرکردو ئاگری بەهێزو بەتینیان بۆ تاوداو خستیانە ناوی، خوایش بڕیار و فەرمودەی ئەمە بوو: ﴿قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ خوا ئەفەرموێ: ئێمەیش وتمان ئەی ئاگر سارد و سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم سارد بەرەوە لە ئاستی ئیبراهیم، بەڵام ساردێك وا زیانی پێ نەگەیەنێ، وەکو حەزرەتی عەلی – خوای لێ ڕازی بێت – ئەفەرموێ: ئەگەر خوا پێی نەفەرموایە سەلامەت بە، ئەوەندە سارد ئەبووەوە ئیبراهیمی ڕەق ئەکردەوەو لە سەرمان دا ئەمرد. ئەگێڕنەوە کە ئەو ئاگرە گەورەیان بۆ تاودا ئینجا دەست و قاچیان زنجیر کرد و خستیانە ناو مەنجەنیقەوە و بەهۆی ئەو مەنجەنیقەوە فڕێ یان دایە ناو ئەو ئاگرە گەورەیە، لەو کاتەدا جوبرەئیل هاتە لای و پێی فەرمو: هیچ پێویستی یەکت هەیە؟ ئەویش لە وەڵام دا فەرموی: پێویستی بە تۆ؟ نەخێر نیمە، جوبرەئیل فەرموی: دەی داوا لە خوا بکە فەرموی: خوا ئاگای لێمە، کەواتە پێویست بە داوا ناکات! بێگومان خوا بە دەسەڵات و توانایە بەسەر هەموو شتێك دا هەرشتێ ئەو بیەوێ هیچی ناوێ جگە لەوەی کە ویست و خواهیشی ئەو ڕووی تێ بکات، کەواتە نابێ هیچ سەر بکەینەوە لە سارد بوونەوەی ئەو ئاگرە لە ئاستی ئیبراهیم و هیچ پێویست نی یە پرسیار بکەین کە چۆن ئەو ئاگرە کاری لە ئیبراهیم نەکرد؟ ئەو کەسانەی ئەو جۆرە پرسیارانە ئەکەن ڕەنگە لە دەروونی خۆیان دا کردەوەی خوا لەگەڵ کردەوەی بەندەکانی دا بەراورد بکەن، گومانیان وابێ کە هەر شتێك بە گوێرەی باوی ئێمە نەگونجاو بێت بۆ خوایش ئەبێ هەر نەگونجێ، ئەگینا چۆن ئەبێ سەر بکرێتەوە لەو موعجیزانە و لەو جۆرە کردەوانە کە ویستی خوای بە دەسەڵات و بەهێزە؟ پێویستە لەسەرمان بە هەموو هێزی دڵەوە و بەوپەڕی ئارام و دڵنیایی یەوە بزانین و باوەڕمان ببێ کە ئاگری دروست کردووە و کردوویەتی بە سوتێنەر ئەو کەسە ئەتوانێ ئەو گەرمی و سوتاندنە نەمێڵێ.

وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَخۡسَرِينَ ﴿٧٠﴾ وَنَجَّيۡنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾

---

﴿وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَخۡسَرِينَ﴾ ئەو بت پەرستانە ویستیان پیلانێکی گەورە دەربارەی ئیبراهیم بکەن بۆ سزادان و لەناوبردنی ئینجا ئێمەیش ئەوانمان بە رەنجەڕۆ خەسارەت مەند ترین کەس گێڕا، چونکە هەموو هەوڵ و تێکۆشانیان لەو بارەیەوە بوو بە بەڵگە و نیشانەیەکی روون لەسەر راستی ئیبراهیم و ناراستی خۆیان و بوو بە هۆی سەربەرزی ئیبراهیم لە هەردوو جیهان دا، بەرز بوونەوەی رادەو پلەی لای خواو بوو بەهۆی سەرشۆڕی بت پەرستەکان لە هەردوو جیهان، بێجگە لەوەی خوا قاری لێ گرتن لە رەگ و ریشە دەری هێنان. ئەگێڕنەوە کە پادشاکەیان کە پادشای ئاری یەکان بوو لە عێراق دا بەخۆی و گەل و شوێن کەوتووەکانی یەوە لە ریشە هێنران بە سزایەك لە لایەن خواوە، سزاکەیشی بریتی بوو لە زاڵ کردنی مێشوولە بەسەریان دا، بەو گیان لەبەرە لاوازە بێ نرخە ئەو گەلە یاخی یە بەمێزەی بەرباد کرد. ئینجا ئەم هەموو چاکە و بەخششانەی رشت بەسەر ئیبراهیم دا، ئەفەرموێ:

١- ﴿وَنَجَّيۡنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا لِلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئیبراهیممان رزگار کرد خۆی و(لوط) ی برازای لەو وڵاتەی کە تیای دا بوون، واتە عێراق، بۆ خاك و وڵاتێك کە پیت و فەڕمان تێ خستووە بۆ هەموو عالەم و گەلەکان، واتە دەرمان کردن بۆ وڵاتی شام کە ماوەیەکی زۆر خوا کردی بە شوێن و جێگای ئایین و سروشی خۆی، لەوێوە بڵاو بووەوە بۆ وڵاتان و گەلانی تر کردی بە جێگا و شوێنی زۆر لە پێغەمبەران لە نەوەی ئیبراهیم و سێ یەم حەرەم و ماڵی خوا لەو خاکە بە فەڕەدایە، لەگەڵ ئەم هەموو پیت و فەڕەدا پیت و فەڕی ئاو و هەوا و خۆراك و میوەی چاك و بە لێشاوی تیادا فەراهەم هێناوە.

وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ نَافِلَةٗۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ
بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾
وَلُوطًا ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗا وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَت تَّعۡمَلُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَۚ

---

٢- ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ نَافِلَةٗۖ﴾ **بەخشیمان بە ئیبراهیم ئیسحاقی کوڕی و یەعقوبی کوڕەزای کە بەخششێکی تر بوو زیاد لەوەی خۆی داوای کرد، چونکە ئیبراهیم(علیه السلام) داوای کوڕێکی ساڵحی کرد لەخوا خوایش نزاکەی وەرگرت و ئیسحاقی پێدا و ئینجا ئیبراهیمی هێشتەوە تا یەعقوبی کوڕەزای پەیدا بوو.**

٣- ﴿وَكُلّٗا جَعَلۡنَا صَٰلِحِينَ﴾ **ئەو چوارە کە باس کران، ئیبراهیم، لوط، ئیسحاق، یەعقوب، هەموومان کردن بە ساڵح و پیاو چاك بە ڕێنموونی و فەراهەم هێنانی هۆی چاکە بۆیان، هانمان دان لەسەر چاکە لە دین و دنیادا تاکە ماڵیان وەرگرت و بوون بە پیاوی دین و دنیا.**

٤- ﴿وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا﴾ **هەر چوارمان کردن بە پێشەوا کە پەیڕەوی بکرێن و رابەری و ڕێنموونی خەڵکی بکەن بۆ حەق و ڕاستی و بانگیان بکەن بە فەرمانی ئێمە و بە پێی ڕاو ڕەزامەندی ئێمە، کەواتە بەجۆرێکمان کردن هەروەکو لە خۆیان دا تەواو بوون تەواوکەری خەڵکیش بوون.**

٥- ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ **سروشمان کردە لایان بە کردنی هەموو جۆرە چاکەیەك** ﴿وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ﴾ **بە کردن و بەجێ هێنانی نوێژ بە ڕێك و ڕاستی و بە زەکات دان. بێگومان هەموو جۆرە چاکەیەك کە لە پێشەوە فەرمانی پیادا نوێژو زەکاتیش ئەگرێتەوە، بەڵام بە جیاو بە تایبەتیش باسی ئەم دووانەی فەرمو، چونکە نوێژ گەورە ترینی هەموو چاکە لەشی یەکانە، هەروەکو زەکاتیش گەورەترینی هەموو چاکە ماڵی یەکانە** ﴿وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ﴾ **تەنیا ئێمەیان ئەپەرست بە پاك و خاوێنی بە بێ هیچ جۆرە گەرد و لەکەیەك کە ئەوەیش ئەوپەڕی پلە و رادەیە بەندە بیگاتێ. ئیبراهیم(علیه السلام) لەبەر خوا وازی هێنا لە نیشتمان و خزم و خوێش و هەموو گەلەکەی، خواش تۆڵەی هەموو ئەوانەی بۆ کردەوە لە جێی ئەوانەدا چاکتری پێدا،**

ئەوەبوو لەباتی ولآتە بێ فەڕەکەی کە بە تایبەتی لەو چەرخەدا جێگای بت پەرستی و ستەمکاری و هەموو جۆرە نارەوایی یەك بوو ئەم خاك و ولآتە بەفەڕەی پێدا و کردی بە نیشتمانی، لە بریتی ئەو کەس و کارە دوژمنە ستەمکارەی کوڕ و کوڕەزای وەکو ئیسحاق و یەعقوبی پێدا و لەباتی ئەو گەلە خراپە بت پەرستە هەر لە نەوەی خۆی ئوممەت و گەلێکی زۆری گەورەی پێدا، بێجگە لەوەی کردی بە باوکی هەموو پێغەمبەرانی پاش خۆی و باوکی هەموو موسڵمانان و خواپەرستان هەتا دنیا دنیایە، ئا بەو جۆرە خوا ئەو پاداشتە گەورەیەی دایەوە(علیه السلام).

لەپاش باسی ئیبراهیم ئینجا دێتە سەر باسی(لوط) ی برازای کە پێکەوە خوا رزگاری کردن و ناردنی بۆ ولآتی پاك و بەفەڕ. دەنگ و باس و بەسەرهاتی(لوط) تێپەڕی کرد لەمەوپێش و لێرەدا زۆر بە کورتی و بە هێمایەك بەسەری دا تێ ئەپەڕێ و ئەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا ءَاتَيْنَـٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ بەخشیمان و دامان بە(لوط) پێغەمبەرێتی و زانینێ کە پێویستە و شایانە بە پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – ئەم پێغەمبەرە کە لە عێراقەوە رۆیشت و لە شارێك نیشتەجێ بوو کە بە ناوبانگە بە(سەدوم) دانیشتوانی ئەم شارە پیاو خراپ و بەد کردار بوون کردەوەی زۆر پیس و نارەوایان ئەکرد کە بریتی بوو لە نێربازی بە ئاشکرا و بێ شەرم و شکۆ، ئینجا خوا بەربادی کردن بە خۆیان و ولآتەکەوە و لوط و ئیماندارانی رزگار کرد لەو سزایە وەکو لە شوێنی تردا بە درێژیی باسی فەرمووە، لێرەدا بە کورتی ئەفەرموێ: ﴿وَنَجَّيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ﴾[1] رزگارمان کردن لە سزای شارێ کە دانیشتووەکانی کردەوە پیسەکانیان ئەکرد کە پیس ترینیان نێر بازی بوو. لە حەسەنەوە ئەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ﴿عشر خصال عملتها قوم لوط بها اهلكوا، اتيان الرجال بعضهم بعضا، ورميهم بالملاجق، والخذف و لعبهم بالحمام، وضرب الدفوف، وشرف الخمور، وقص اللحية، وطول الشارب، والصفر والتصفيق، ولباس الحرير، وتزيدها، امتى بخلة اتيان النساء بعضهن بعضا﴾[2].

---

[1] هەندێ ئەفەرمون: مەبەست بە(الخبائث) تەنیا نێر بازی یەکەیانە و بە کۆ فەرموی بە گوێرەی زۆر روودانی ئەو کردەوە پیسەیە، بەلآم دیمەنی وشەی ئایەتەکە و ئەو حەدیسە کە لە تەفسیرەکەدایە بەرگری ئەکەن لە بڕینی بەسەر تەنیا ئەو کردەوەیەدا.

[2] واتە گەلەکەی(لوط) دە کردەوەی خراپیان کردبوو بەهۆی بەرباد بوونیان:

إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ وَنُوحًا إِذۡ
نَادَىٰ مِن قَبۡلُ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرۡنَٰهُ مِنَ
ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٧٧﴾ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ
يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾

---

**هۆی ئەم هەموو کردەوە خراپانەش ئەمە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَٰسِقِينَ﴾ بەڕاستی ئەوانە گەل و کۆمەڵێکی خراپ بوون و دەرچوو بوون لە سنووری خوا و گوێ رایەڵی بۆی و شوێن کەوتنی لوط پێغەمبەر(علیه السلام) ﴿وَأَدۡخَلۡنَٰهُ فِي رَحۡمَتِنَآۖ﴾(لوط) مان خستە ناو رەحمەتی خۆمانەوە، واتە گێڕامان بە یەکێ لەو تاقمەی کە شایانی رەحمەت و چاکەی ئێمەن یان خستنمانە ناو بەهەشتی خۆمانەوە، ﴿إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ چونکە بەڕاستی لوط یەکێك بوو لە چاکان و لەوانەی کە لەلایەن ئێمەوە بڕیاری چاك و شیرینی بۆ دەرچوو بوو. ئینجا زۆر بە کورتی باسێکی نوح پێغەمبەریش ئەکات(علیه السلام) لەبارەی وەرگرتنی نزاکەی و یارمەتی دان و رزگار کردنی لەو سزاو تەنگانە گەورەیەی کە بێ باوەڕەکانی تێ کەوت، ئەفەرموێ: ﴿وَنُوحًا إِذۡ نَادَىٰ مِن قَبۡلُ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی نوح بکە، باسی ئەو کاتە کە بانگی کرد لە ئێمە و نزای کر لەمەو پێش، پێش ئەم پێغەمبەرانەی کە باس کران، ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ﴾ ئینجا ئێمەیش نزاکەمان وەرگرت، ﴿فَنَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ بەم رەنگە خۆی و ئەوانەی باوەڕیان هێنا بوو رزگارمان کردن لەو غەم و دڵ تەنگی یەی زۆر گەورەیە کە بریتی بوو لەو تۆفانەی کە هات و وڵاتی داپۆشین، یان غەم و داخ و سزای گەلەکەی ﴿وَنَصَرۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ﴾ یارمەتیمان داو زاڵمان کرد و تۆڵەیمان**

---

**١.نێربازی. ٢.خڕکە گلێ گرتنە خەڵك. ٣.پەلە پیتکە گرتنە خەڵك و کۆتر بازی. ٤.دەف و تەپڵ لێدان. ٥.ئارەق خواردنەوە. ٦.ریش تاشین. ٧.بەردانەوەی سمێڵ تا درێژ بێت. ٨.فیکە کردن. ٩.چەپڵە لێ دان. ١٠.پۆشاکی ئاوریشم. ئینجا ئەفەرموێ: ئوممەتی من کردەوەیەکی زیاد لەمانەیش ئەکەن کە بریتی یە لەوەی ئافرەتان سواری یەکتر بن.**

سەند لەو گەلەی باوەڕیان نەهێنا بە ئایەتەکانی ئێمە و بە درۆیان ئەزانین، ﴿إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ چونکە ئەوانە گەل و کۆمەڵێکی خراپ بوون سەریان کردبووە تاوان و خراپەکاری، بەهۆی ئەوەوە هەموومان خنکاندن. ئینجا دێتە سەر باسی داودو سولەیمانی کوڕی – سەلامی خوایان لێ بێت – تا ئەندازەیە زنجیرەیەکی درێژ لە ژیانیان باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ﴾ باسی داود و سولەیمان بکە ﴿إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ﴾ باسی ئەو کاتەیان بکە کە حوکم و بڕیاریان دەرئەکرد لەبارەی پارچە کشتوکاڵێکەوە یان پارچە رەزێکەوە، ئەم بەسەرهاتە وەکو بە درێژیی ئەیگێڕنەوە بەم جۆرە بوو:

دوو کەس دێنە خزمەتی داود پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکیان خاوەنی کشتوکاڵ یان پارچە رەزێك بوو ئەوی تریان خاوەن ئاژەڵ بوو، خاوەن کشتوکاڵەکە وتی: ئاژەڵی ئەم پیاوە بەشەو کەوتووەتە ناو کشتوکاڵەکەمەوە و هیچی نەهێشتووە، داود(علیه السلام) بڕیاری دا کە کابرای خاوەن کشتوکاڵ ئاژەڵەکە ببات لەباتی زیانەکەیدا، کابرای خاوەن ئاژەڵ رابورد بەلای سولەیمان دا و ئەو هەواڵ و بڕیارەی دایە سولەیمانیش هاتە خزمەت باوکی و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو بڕیارە راست نی یە، ئەویش فەرموی: ئەی چۆن بکرێ راستە؟ سولەیمان عەرزی کرد: ئاژەڵەکە بدە بە خاوەن کشتوکاڵەکە تا سوود و بەرهەمی لێ وەرگرێت و کشتوکاڵەکەیش بدە بە خاوەن ئاژەڵەکە تا خزمەتی بکات و سەرپەرشتی بکات تا وەکو خۆی لێ دێتەوە، ئینجا هەرکەس بچێتەوە سەرماڵی خۆی. داود فەرموی: راست ئەکەیت، بڕیار ئەمەیە تۆ ئەیڵێیت. ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکان و لەبەر رووناکی ئەوان دا بەسەرهاتەکە باس بکەین. فەرموی: باسی ئەم کاتەیان بکە کە بڕیاریان دەرئەکرد لەبارەی پارچە کشتوکاڵێ، یان پارچە رەزێ، ﴿إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ﴾ لە کاتێك دا کە ئاژەڵی گەل و تاقمێ بەشەو کەوتبوونە ناوی و خواردبوویان و بڕیاری داودو سولەیمانیش بەو جۆرە بوو لە پێشەوە باس کرا ﴿وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ﴾ [1] خوا ئەفەرموێ: ئێمەیش ئاگادار بووین بە بڕیارەکەیان و بەدیارەوە بووین،

---

[1] راناوەکە کۆیە لەبەر ئەمەیە کە دوان لای خواروو کۆیە یان لەبەر رێزی داود و سولەیمان یان مەبەست داواچی یەکانیشە.

فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ
وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡۖ

﴿فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَ﴾ ئینجا سولەیمانمان تێگەیاند لە بڕیاری ڕێك و ڕاست و ئەوەی ڕاستە لە هەموو بارێکەوە خستمانە دڵی، بڕیاری هیچ کامیان لە ڕێگای سروشی خواوە نەبوو، بەڵکو لە گوێرەی بیرو تێڕوانین بوو، هەردوو بڕیارەکە بەجێ بوون، بەڵام بڕیاری سولەیمان بەجێ ترو ڕاست تر بوو. داود(علیه السلام) هەر بارێکی تەماشا کرد کە کابرای ماڵ خوراو زیانی لێ کەوتووە، ئەبێ ببژێرێ، دیارە ئەوەش شتێکی ڕێکە، بەڵام سولەیمان هەردووباری سەرنج دا و تەماشای هەردوولای کرد و ویستی زیانەکەیش ببژێرێ و ئەولایش بێ بەش نەبێت، کەواتە داودیش هەڵەی نەکردووە و جێگای لەکەو ڕەخنە نی یە وەکو لەم فەرمودەیشەوە دەرئەکەوێ: ﴿وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗا﴾ هەرکام لە داود و سولەیمان پێغەمبەرێتی و زانینێ کە شایان و پێویست بێت پێمان داون یان داد لە بڕیار و بڕینەوەی ئاژاوەدا، زانینێ کە شایانە بەوان. ئینجا باسی شتێك ئەکات کە تایبەتی یە بە هەرکام لەم دوو پێغەمبەرەوە. یەکەم دەست پێ ئەکات بەوە کە تایبەتی یە بە داودەوە کە باوکە ئەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَ﴾ چیاو شاخەکان و پەلەوەرمان ژێر بارو مل کەچ کرد کە لەگەڵی دا زیکرو یادی خوا بکەن و باسی پاکی و بێگەردی خوا بکەن. داود(علیه السلام) وەکو بەناو بانگە خوا دەنگ و ئاوازێکی زۆر خۆشی پێ بەخشی بوو، بەو ئاوازە خۆشەی هەموو جارێ زیکرو تەسبیحی خوای ئەکردو خوایش کارێکی وای کرد کە شاخەکان و پەلەوەرەکان بۆیان ئەسەندەوە، دیارە ئەوەش چاکە و بەهرەیەکی تایبەتی بوو خوا لەگەڵی کرد و ڕێزێکی گرنگ بوو دەربارەی، ئەبوو بەهۆی زیاد سۆزو شەوق و خۆشی دڵ و دەروونی، ئیتر ئەو دەنگی ئەوانە بە جۆرێك بووبێ خەڵکیش بیستبێتی وەکو زۆربە وا ئەفەرمون، ئەو بۆ سەندنەوەیە بەڵگەیەکی ڕوون و موعجیزەیەکی گەورە بووە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرێتی یەکەی، یان بیستنەکەی تایبەتی بووبێ بە خۆیەوە بۆ زیادە ئارام و خۆشی دەروونی وەکو هەندێ ئەڵێن، هەرکام لەمانە بێت بۆ خوا هیچی تێ ناچێت و جێگای سەر لێ کردنەوە نی یە، شتەکە ڕووی داوە و بووە وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ ئێمە ئەوەمان کرد و فەراهەممان هێنا بۆ داود. بەندەی باوەڕدار هەرکات دڵی ببەستێ بە خواوە هەست

ئەكات بە پەیوەندی خۆی لەگەڵ دروست کراوەکانی تری خوادا، پەردەی ئەستووری جیاوازی لە نێوان خۆی و دروست کراوەکان دا لائەچێ و سنوور و بەرهەڵست لە نێوان دا نامێنێ و یەکێتی دێتە پێشەوە لەو کاتەدا رۆحی ئەو بەندەیە بەهۆی رووناکی راستی و حەقیقەتەوە یەك ئەگرێ لەگەڵ رۆحی خواناسی هەموو بوونەوەردا و پێکەوە دەست ئەکەن بە زیکرو تەسبیح و هەست ئەکەن بە یەکترو سۆز و بەزەیی لە نێوانیان دا فەراهەم دێت.

داود(علیه السلام) لەگەڵ ئەوەشدا پادشاو پێغەمبەربوو و هەموو شت لەژێر دەستی دا بوو، لە خوا ترسی و پارێزەری لە رادەیەك دا بوو نەیئەویست هیچ لە سامان و دارایی دەوڵەت بەکاربێنێ لە پێویستی خۆی دا بەهۆی ئەوەوە داوای کرد لەخوا کە ئیش و کارێکی بۆ فەراهەم بێنێ تا بەو هۆیەوە رۆزی و پێویستی خۆی بەدەست بێنێ. خوایش داوا و نزاکەی وەرگرت و فێری دروست کردنی زرێ و تاس کڵاوی کرد، کە بکرێ بۆ بەرگری تیرو شیر و رم بە تایبەتی لەکاتی جەنگ دا، هەروەها لەسەر دەستی دا ئاسنی نەرم کرد کە بە بێ ئەرك و زەحمەت و بە ئارەزووی خۆی ئەو پۆشاکەی لێ فەراهەم ئەمێنا و ئەیفرۆشت و گوزەرانی خۆی لەسەر دابین ئەکرد، لەم بارەیەوە پێغەمبەرمان(ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿ما اكل احد طعاما خيرا من أن يأكل من عمل يده، و ان نبي الله داود كان يأكل من عمل يده.﴾ [1] جا دووەم شت کە چاکەیەکی تایبەتی بوو بۆ داود لە لایەن خواوە: فێرکردنی ئەم پیشەسازی یە بوو کە باس کرا، وەکو لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ﴾ داودمان فێری پیشەسازی دروست کردنی پۆشاکی زرێ و تاس کڵاو کرد کە بۆ ئێوەیە، واتە ئەو پیشەسازی ئەوە پەرەی سەند و لەناو خەڵك دا بوو بە باو، لەپاش ئەوە خەڵکی فێری بوون و بەکاریان هێنا، کەواتە ئەو پۆشاکەی ئەو دای هێنا بوو بەهی ئەمانەش کە یەکەم جار ئەم فەرموودەیان چوو بە گوێچکەدا و ئاراستەیان کرا، سوود و بەرهەمی ئەو کردەوەی داودە گەڕایەوە بۆ ئەمان، کەواتە لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡ﴾ فێری ئەو پیشەسازی یەمان کرد تاکو لە سزاو زامی جەنگی دوژمنەکانتان بتان پارێزێ، کەواتە ئەو کردەوەی ئەوەبوو بە بەهرە و چاکەی خوا بەسەر ئەمانیشەوە

[1] واتە هیچ کەس خۆراکێکی نەخواردووە چاکتر بێت لەوەی کە بە رەنجی دەستی خۆی فەراهەمی هێنابێ، پێغەمبەری خوا داود لە کردەوەی دەستی خۆی خۆراکی ئەخوارد – ریاض الصالحین –.

فَهَلۡ أَنتُمۡ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةٗ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦٓ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيۡءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾

**پاش ئەوە دێتە سەر باسی سولەیمان و دوو شتی تایبەتیش بەوەوە باس ئەفەرموێ:**

**١- ﴿وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةٗ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦٓ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۚ﴾ بای بەهێزو بە تەوژمان ژێر بار کرد بۆ سولەیمان، کە بە پێی خواست و فەرمانی ئەو بکەوێت و بڕوا بۆ خاك و ولآتێ کە پیت و فەڕمان تێ خستووە، واتە ولآتی شام کە نیشتەجێی سولەیمان بووە، لە زۆر لە پەڕاوەکانی تەفسیر و سیرەت دا دەربارەی سولەیمان(علیه السلام) قسەو باسی زۆر و زەبەندە نووسراوە و بلآو کراوەتەوە، زۆربەی ئەو قسەو باسانە ئیسرائیلی یاتن و بە خەیاڵ دروست کراون لەبەر ئەمە موسڵمانان پێویستە زۆر وریا و ئاگادار بن و خۆیان لەو جۆرە باسانە بپارێزن، نابێ بە گوێرەی ئەو باسانە قورئان تەفسیر بکرێت، بەڵکو پێویستە رێگای ترس و خەتەر بگیرێتە بەر کە راستە رێگای قورئانە کەیە بە بێ زیاد و کەم. لێرەدا دەنگ و باسێکی زۆر بەناوبانگ هەیە کە سولەیمان(علیه السلام) لە تەختە دار جێگاو شوێنێکی گەورەو فراوانی دروست کردبوو، کاتێ بیویستایە گەشت و گەڕانێ بکات بۆ ولآتێ بە خۆی و لەشکرو سوپا و هەموو پێویستی یەکەوە ئەچوونە سەر ئەو تەختانە و بەسەریەوە دائەنیشتن، ئینجا فەرمانی ئەدا بەبا هەڵی ئەگرتن، ئەی بردن بۆ هەر شوێنێك کە سولەیمان بیویستایە و ئەو بایە ئەوەندە بەهێزو خێرا بوو تاقی بەیانی ماوەی مانگێ رێگای - بە رۆیشتنی حوشتر - ئەبڕی، تاقی ئێوارە ئەگەڕایەوە بۆ شوێنی نیشتەجێی خۆی، لەگەڵ ئەم هێزو خێرایی یەدا لەخشەو تاسەو لەنگەرەی پێ نەئەکردن، وەکو لە سورەتی(ص) دا ئەفەرموێ: ﴿تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦ رُخَآءً﴾ [1] ئەم دەنگ و باسە هەرچەند گونجاوە لەخۆی دا، ئەگونجێ لەگەڵ دیمەنی ئایەتەکانی ئێرەو سورەتی(سبأ) و سورەتی(ص) دا بەلآم بەهۆی ئەوەی سەرچاوەیەکی دیاری باوەڕ پێ کراوی نی یە هیچ پێویست نی یە دڵی پێوە ببەسترێت، یان ئایەتەکەی پێ تەفسیر بکرێت، ئەوەی کە بێ ترس و خەتەرەیە ئەوەیە**

[1] واتە ئەو بایەمان ژێر بار کرد بە فەرمانی سولەیمان ئەگەڕا بەبێ لەخشەو تاسە.

کە لە ئایەتەکە لا نەدەین و بە پێی ڕواڵەت و دیمەنی ئایەتەکە بڵێین: خوا بای ژێر بار کرد کە بە پێی ویست و فەرمانی سولەیمان بڕوات بۆ وڵاتی پیت و فەڕدار. هەرچۆنێ بووبێت مرۆڤی ژێر پرسیار ناکات و سەرناکاتەوە و بڕیارێکمان پێ گەیشت ئەبێ باوەڕی پێ بکەین، ئیتر لێ ی تێکەین یان نە، چونکە ئێمە نازانین خوا خۆی ئەزانێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ﴾ ئێمە بە هەموو شتێك زانا و ئاگادارین و زانین و ئاگاداریمان هەر بووە.

٢- ﴿وَمِنَ الشَّيَاطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُ﴾ لە کۆمەڵ و تیرەی شەیاتین کەسانێکمان بۆ سولەیمان ژێر بار کردبوو کە بەناو دەریاکان دا بۆی ئەچوون بە قووت دا و شتی بەنرخ و نایابیان بۆ دەرئەهێنا ﴿وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ بێجگە لەوەیش ئیش و کاری تریشیان بۆ ئەکرد وەکو دروست کردنی شارو کۆشك و میحرابی گرنگ و داهێنانی پیشەسازی نایاب، وەکو لە سورەتی(سبأ) دا دەست نیشانی بۆ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَاتٍ﴾ [1] ئەڵێن حەمام و ئاشی ناو قسڵ و شوشە و سابونیش لە بەرهەم و کردەوەی ئەوانە. لە وشەی شەیاتینەوە دەر ئەکەوێ کە ئەو ژێر بارکراوانە کافرو بێ باوەڕ بوون، هەندێ ڕیوایەتی حەدیسیش لەسەر ئەوەیە، وەکو ئەم فەرمودەیەش ئەوە پیشان ئەدات. ﴿وَكُنَّا لَهُمْ حَافِظِينَ﴾ ئێمە پارێزەر بووین بۆ ئەوانە لەمەی سەر پێچی بکەن لە فەرمانی سولەیمان، چونکە ئەگەر موسڵمان بوونایە پێویستیان بە پارێزەری نەئەکرد، لە سورەتی(سبأ) دا ئەفەرموێ: ﴿ومن الجن﴾ لەباتی ﴿ومن الشياطين﴾ ی ئێرەدا، دیارە مەبەستی هەردووکیان یەك شتە، چونکە(جن) ناوە بۆ ئەو تیرە بەناوبانگە بە شێوەیەکی گشتی کافر بن یان موسڵمان، بەڵام شەیاتین تایبەتی یە بە کافرەکانیانەوە. ئێمە دەربارەی ئەم تیرەیە هیچ نازانین، جگە لەوەی لە لایەن خوا و پێغەمبەرەوە(ص) پێمان گەیشتووە، بەڵام پڕو پووچ و ئیسرائیلی یاتی زۆر و زەبەندە لەبارەی بەسەرهاتیانەوە لەگەڵ سولەیمان دا بەناو خەڵکی دا بڵاو بووەتەوە، هەندێ لە پەڕاوەکانی تەفسیر و سیرەتیش هەندێ لەو شتە بێ جێ و ڕێ یانە یان نووسیوە. جا بۆ ئەوەی تووشی هەڵخلیسکان و کەوتن نەبین چاك وایە، بەڵکو پێویستە لە ڕەوڕەی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر(ﷺ) دەرنەچین، هەر شتێ لە کتێبی باوەڕ پێکراودا، یان

[1] واتە دروستیان ئەکرد بۆ سولەیمان هەرچی بویستایە لە میحراب و وێنەو هەیکەل و دەفری گەورە وێنەی حەوزی ئاو و قازانی دامەزراو لەسەر سێ کوچکە، چونکە لەبەر گەورەیی بە ئاسانی دانەئەگیران.

له كۆڕی زانایانی ئیسلامەوە نەهاتبێت بایەخی نەدەینێ. ئینجا دێتە سەر باسی ئەیوب پێغەمبەر(علیه السلام) کە یەکێ بوو لە پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل، خوا دەسەڵات و سامان و دارایی فراوانی پێدا لەگەڵ ماڵ و ئەولادی زۆردا، لەپاشان ئەوانەی هەموو لێ سەندەوە و دووچاری نەخۆشیشی کرد بۆ ماوەیەکی زۆر، ئەڵێن: هەژدە ساڵ لەسەر ئەو بارە ناخۆشە مایەوە، بەڵام خوا یارمەتی داو لەو تاقی کردنەوە سەختەدا دەرچوو، بەجۆرێ بوو بە نموونە و وێنەیەکی نایاب لە ئارامی و خۆگرتن دا، تا ئەو رادەی خوا سەنای کرد و بە چاکە ناوی برد. لەبارەی ئەو بەسەرهاتەوە قسەو باس و شتی زۆر بڵاو بووەتەوە، بێگومان زیادە رەوی زۆر تیا کراوە، تەنانەت ئەڵێن دووچاری نەخۆشی گولی بووە و کرم تێی داوە تا رادەیەك قیزەون بووە لەشارو ئاوەدانی دەرکراوە، ئەو قسەو باس و بەسەر هاتانە هیچ پاڵپشتێکیان نی یە جگە لەمەیش ئەو جۆرە نەخۆش و قیزەونی یە لەگەڵ پێغەمبەرێتی دا ناگونجێ، کەواتە پتر لەوە ناڵێین کە لێرە و لە سورەتی(ص) دا هەیە، لەم سورەتەدا زۆر بە کورتی دەست نیشان ئەکات بۆ زیان و بەسەرهاتە ناخۆشەکەی و ئەوەی بە گرنگ نیشانی ئەدا نزا و لاڵەکەیەتی، لەگەڵ بە هاوارهاتنی خواوە بۆی و وەرگرتنی نزاکەی، چونکە شوێنەکە شوێنی روون کردنەوەی بەزەیی خوایە دەربارەی پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – مەبەست سەرپەرشتی و چاودێریی خوایە بۆیان لەکاتی تاقی کردنەوەیان دا، ئیتر تاقی کردنەوەکە بە سزادان و سەرکەشی و مل هوڕی گەلەکانیان بووبێت، وەکو لە بەسەرهاتی ئیبراهیم و لوط و نوح دا نیشانی دا، یان بە چاکە و بەهرەی فراوان بێت وەکو لە بەسەرهاتی داود و سولەیمان دا دەرکەوت، یان بە زیانی دەروونی و لەشی بێت وەکو لە بەسەرهاتی ئەیوب دا ئاشکرا ئەبێت، بۆیە هانی ئەمان ئەدات لەسەر سوپاس کردنی خوا لەسەر ئەو چاکەیە و داوایان لێ ئەکات بەم شێوە پرسیارە کە مەبەست پێی فەرمان پیادانە: ﴿فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ﴾ کەواتە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەم چاکەیە کە لەسەر دەستی داوددا فەراهەمی هێنا بۆتان. پێش ئەمەی خوا داود فێر بکات خەڵکی نەیان ئەزانی شتی وا دروست بکەن، کە لەبەرکردنی ئاسان و گونجاو بێت و بەرگریشیان بکات لە سزاو زام، بەڵکو لە ناچاریی دا ئاسنیان تەنك ئەکرد یەك پارچە ئەیانبەست بە خۆیانەوە دیارە ئەمەیش زۆر ئەرك و زەحمەتی بووەو نەگونجاوە لەگەڵ رۆیشتن و راکردن و گەلێ کردەوەی پێویستی تری خەڵك دا، ئەوەبوو باسی ئەو دوو شتەی کە تایبەتی بوون بە(داود)ەوە،

﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾ باسی ئەییوب بکە، باسی ئەو کاتە بکە کە ئەییوب هاواری کردە پەروەردگاری خۆی و بەم شێوە نزای کردە لای: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ [1] کە زیانی نەخۆشی و لاوازی و ئێش و ئازار دووچارم بووە و تۆیش بە بەزەیی ترینی هەموو خاوەن بەزەیی یەکانی. ئەو پێغەمبەرە بە ئارامە(علیە السلام) نزا کردنەکەیشی بە شێوەیەك بوو شایانە بکرێت بەسەر مەشق بۆ هەموو بەندەیەکی خواناس کە لەکاتی تەنگانە و ئازاردا پەیڕەوی ئەو بکات، نزاو لاڵە بە وێنەی ئەو بکات، ئەو شەرم و ئەدەبە شیرینە بەکار بێنێت:**

**١- هیچ بێزاری و تەنگی و تاڵی یەکی دەرنەبڕی، لەگەڵ ئەوەدا کە سزاو بەسەرهاتەکەی زۆر قورس و بەتین بوو، بەڵکو بە کورتی لاڵەی کرد کە سزا و ناخۆشی هەیە و جێگای بەزەیی یە.**

**٢- خوا بەو سیفەت و ناوە ناوبرد کە تایبەتی یە بە خواوە و جێگای ئومێد و چاوەڕوانی یە بۆ لابردن و چارەسەر کردنی هەموو سزا و ناخۆشی یەك.**

**٣- شەرمی کرد لەوەی داوای گۆڕینی بارو حاڵی بکات و راوێژ بکات بۆ خوا، بەڵکو خۆی گرت و شەرمی کرد لەوەی داوای لابردنی سزاو بەلایەك بکات، کارو بارەکەی حەواڵەی خوا کرد، چونکە خۆی ئەزانێ و باس وتنی پێویست نی یە. ئەو بەو شێوەیە نزاو لاڵەی کرد و خوایش ئەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ﴾ ئینجا ئێمەش نزاکەمان لێ وەرگرت ﴿فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ﴾ بەم رەنگە هەر نەخۆشی و ئازارو سزایەکی پێوە بوو لامان برد و نەمان هێشت، تا ساغ و سەلیم بووەوە، ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ﴾ ئەو ماڵ و منداڵەی کە نەمابوون پێمان دایەوە، بەم رەنگە زیندوو کرانەوە بۆی، یان هەرچەندی نەمابوو، خوا جێگای پڕ کردەوە،**

---

[1] وشەی(الضر) بە فەتحە مەبەست پێی زیانە بە شێوەی گشتی، بەڵام(الضر) بە ضمە، وەکو لە ئایەتەکەدایە مەبەست پێی زیانی گیان و لەشە بە تایبەتی.

وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ
كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِى رَحْمَتِنَآ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾

---

﴿وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ﴾ لەگەڵ ئەوانەدا وێنە و ئەندازەی ئەوان، واتە بۆی دوو چەندانە کردەوە بەم وێنە کوڕی هەبوو بۆی دوو قات کردەوە، ئیتر هەر لە رۆڵە، یان لە رۆڵە زاو نەوە، ﴿رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ﴾ ئەوانەمان هەموو پێدا لەبەر بەزەیی پێ ی لەلایەن ئێمەوە لەبەر بیر خستنەوە و تەمێ و ئامۆژگاری بۆ هەموو خواپەرستەکانی تر، تا ئەوانیش وەکو ئەیوب خۆگر و بە ئارام بن، پاداشت بدرێنەوە بە وێنەی ئەیوب(علیه السلام) ئینجا زۆر بە کورتی دەست نیشان ئەکات بۆ سێ کەسی تر لە چاکان و خواناسان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ﴾ باسی ئیسماعیل و ئیدریس و ﴿ذا الکفل﴾ بکە، ﴿كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ هەر یەکێ لەم سیانە لە کۆمەڵی خۆگرو بە ئارامەکانن. یەکەمیان ئیسماعیل بەناوبانگە، ئارام و خۆگری یەکەی تا ئەو رادەیە بوو بە بێ سەر لێ کردنەوە مل کەچ بوو بۆ سەر بڕین، وەکو لە سورەتی(الصافات) دا بەدرێژیی باسی ئەفەرموێ. بەڵام دووانەکەی تریان خۆیان و کات و شوێنیان ناسراو و بەناوبانگ نین، لە هەواڵ و چۆنیەتی بەسەرهاتیان دڵنیا نین، بەڵێ لە بابەت ئیدریسەوە وتراوە کە ئەو ئوزوریسەو میسری یەکان لە کۆن دا پاش مردنی پەرستوویانە، بە یەکەم مامۆستای ئادەمی یان داناوە هەروەها ئەڵێن کە ئەو کشتوکاڵ و پیشەسازی داهێناوە و خەڵکیشی فێر کردووە، یەکەم کەس بووە کە دوورینی پۆشاکی داهێناوە و لەبەری کردووە، یەکەم کەس بووە چەکی داهێناوەو هەڵی گرتووە، بەڵام بۆ ئەم هەموو قسەو باسانە هیچ بەڵگەو رابەرێکی بەهێز نی یە بەدەستمانەوە. هەروەها دەربارەی(ذو الکفل) چەند رایەك هەیە بە بێ بەڵگە و رابەری بەهێز، بەس زۆر لە زانایان لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەر بووە رای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە لە بەنی ئیسرائیلی یەکانە، کەواتە ئەوەی قورئان فەرمویەتی بەسە و پتر لەوە پێویست نی یە، ئەگەر پێویست بووایە قورئان ئەیفەرموو. قورئان لەبارەی ئەم سیانەوە لێرەدا تەنیا دوو شتی فەرموە، یەکەمیان ئەوەبوو [illegible] فەرموی: هەرسێکیان لە کۆمەڵی بە ئارام و خۆگرەکانن.

دووەمیش ئەفەرموێ: ﴿ وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ئەو سیانەمان خستە ناو رەحمەتی خۆمانەوە، واتە پێغەمبەرێتی، یان بەهەشت و ناز و رێزەکەی، چونکە بەڕاستی ئەوانە لە کۆمەڵی چاکان بوون لەوانە بوون کە لەلایەن ئێمەوە بڕیاری چاك و شیرینیان بۆ دەرچووە، ئینجا دێتە سەر باسی یونس پێغەمبەر(علیه السلام) کە بە(ذا النون) واتە خاوەنی ماسی. بەسەرهات و سەر گوزەشتەی یونس لە سورەتی(الصافات) دا بەدرێژیی باس کراوە، لێرەدا زۆر بە کورتی بەسەری دا تێ ئەپەڕێ، ئەمەیش بە گوێرەی مەبەستی سورەتەکە لە گێڕانەوەی ئەم سەرگوزەشتانەدا، کە ئەو مەبەستەیش بریتی یە لە روون کردنەوەی بەزەیی و چاودێریی خوا بۆ پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – جا بۆ ئەوەی بەسەرهاتی ئەم پێغەمبەرە بزانین و لێرەدا پەندی پێویستی لێ وەربگرین پێویستە هەندێ درێژ تر ئەو سەرگوزەشتەیە بگێڕینەوە: ئەم پێغەمبەرە(علیه السلام) کە بە(ذوالنون) واتە خاوەن ماسی ناوبراوە، چونکە ماسی یەك قووتی دا و لەپاش دا یەقی دایەوە و فڕێی دایەوە وشکی، بەسەرهاتەکەیشی ئەمەبوو رەوانە کرایە سەر شاری نەینەوا، بانگی کردن بۆلای خواو هەوڵی زۆری لەگەڵ دان بەڵام ئەوان هەر یاخی بوون و نەهاتنە سەر رێگای راست، بەهۆی ئەوەوە بێزار و دڵ تەنگ بوو لێ یان و بە رقەوە بەجێ ی هێشتن بێ ئەمەی خوا فەرمانی پێ بکات، خۆی پێ نەگیرا لەئاستی نالەباریی و بێ شەرمی و مل هوڕی ئەو گەلە، گومانی وا بوو خوا دەرووی لێ ئەکاتەوە و هەرگیز تەنگانەی بەسەردا ناهێنێ و وڵاتی لەسەر تەنگ ناکاتەوە، وڵاتی خوا زۆر فراوانە، با ئەم شارە نەبێت شارێکی تر بێت، با ئەو گەلە نەبێت گەل و تاقمێکی تر بێت، لای وا بوو ئەگەر گەلەکەی خۆی یاخی و سەرکەش بوون خوا رەوانەی ئەکات بۆ سەر گەلێکی تر. ئەو رق و دڵ تەنگی و بێزاری یە بەتینەی بێ ئارامی کرد، تا ئەو شارەی بەجێ هێشت و بەرەو کەناری دەریا رۆیشت، لەوێدا کەشتی یەکی پڕ لە خەڵکی دەست کەوت و چووە ناوی و کە گەیشتە ناو دەریا کەشتی یەکە قورس بوو، کەشتی یە وانەکە وتی: بەڕاستی پێویستە زەلامێ توڕبدرێتە ناو دەریا ئەگینا کەشتی یەکە نوقم ئەبێت و هەموو تیا ئەچین، بۆ ئەم مەبەستە قورعەیان راکێشا، لە قورعەکەدا یونس بەرکەوت، لەبەر ئەوە فڕێ درایە دەریاکە و نەهەنگێ هەڵیلوشی، لەناو سکی نەهەنگەکەدا یادی خوای کرد و دەستی کردبەنزاو لاڵە لێی، خوایش نزاکەی وەرگرت و رزگاری کرد، بەم رەنگە نەهەنگەکە یەقی دایەوە و فڕێی دایە شوێنێکی وشك لە قەراغی دەریاکەدا،

وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ
سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾

---

لێرەدا واز لە ماوەی بەسەرهاتەکە دێنێ بۆ سورەتی(الصافات) و ئەگەڕێینەوە بۆ تەفسیری ئایەتەکان: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا﴾ ئەی پێغەمبەر باسی یونس بکە کە نازناوی(ذا النون) ە باسی ئەو کاتە بکە کە ڕۆیشت و دەرچوو لەناو گەلەکەی بە رق و خەشمەوە لیێ یان، ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ﴾ گومانی وابوو ئێمە هەرگیز تەنگانە و ناخۆشی بەسەردا ناهێنین، بەڵام پێچەوانەی گومانەکەی بەدی هات، ئەوەبوو خوا خستی یە ناو تاریکی سکی ئەو نەهەنگە لەناو تاریکی بەتینی دەریادا و تاریکی شەویش بەسەردا هات ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ ئینجا لەناو ئەو تاریکی یانەدا هاوار و نزای کرد: ﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ کە هیچ پەرستراوێك نی یە بەڕاستی جگە لە تۆ ئەی خوایە، باوەڕم هەیە و ئەڵێم کە تۆ پاك و بێگەردی لەوەی کە دەستە پاچە و بێ دەسەڵات بی لەئاستی هیچ شتێك، یان پاکیت لەوەی کە بەبێ هیچ شتێ نەمەت بەسەر هێنابم، بەڕاستی من یەکێکم لەوانەی کە زاڵم و ستەمکارن لە خۆیان، واتە کاتی خۆی من زوڵم و ناڕەواییم لەخۆم کرد بەمەی لە خۆمەوە بێ فەرمانی خوا کۆچم کرد و گەلەکەم بەجێ هێشت بە پێچەوانەی ڕەوشتی پێغەمبەران کە لە هەموو کاروبارێکیان دا وەستاون بە دیار فەرمانی خواوە.

لە ئەنجامی ئەم نزایەدا خوا ئەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ﴾ ئینجا ئێمەیش نزا و لاڵەکەمان لیێ وەرگرت و رزگارمان کرد لەو خەم و تەنگی و تەنگەتاوی یەی کە تیای دا بوو. لەم ئەڵقەیەی بەسەرهاتی یونس پێغەمبەردا چەند سەرنج ڕاکێشانێ هەیە بیر لیێ کردنەوەیان پێویستە:

١- بێگومان یونس(علیه السلام) لەو کاتەدا خۆی پێ نەگیرا لەسەر ئەرکی ڕاگەیاندن و پێغەمبەرێتی یەکەی، بەهۆی ئەوەوە دڵ تەنگ و بێزار بوو لەگەڵ و ئوممەتەکەی و ئەو ئەرکەی لەسەر شانی خۆی لابردو بە خەشم و دڵتەنگی یەوە ڕۆیشت، بەهۆی ئەوەوە

خوا خستی یه تەنگی یەکی وا کە سزاو داخی بێ باوەڕەکان ئاسان بوو لەچاوی دا، ئەگەر نەگەڕایەتەوە بۆلای خوا و دانی نەنایە بەو ناڕێکی یەدا کە کردی هەرگیز خوا دەرووی لێ نەئەکردەوە، تا ڕۆژی دوایی لەو مەینەت و تەنگی یەدا ئەمایەوە.

٢- ئەوانە کە بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ ڕێگای خوا پێویستە لەسەریان دان بگرن بەخۆیان داو ئەو ئەرکە گرانە هەڵگرن، خۆگر بن لەئاستی بێ باوەڕیی و بە درۆ خستنەوە لە لایەن بانگ کراوە بێ باوەڕەکان، پێویستە هەمیشە بێ وچان هەوڵ بدەن و تێ بکۆشن و دامەزراو بن، پێویستە ماندوو نەبن و بانگ کردنەکەیان چەند بارە بکەنەوە، هەرچەند باوەڕ نەهێنان و بەدرۆ خستنەوە لەلایەن بانگ کراوە بێ باوەڕەکانەوە هێجگار ئێشی سەختە لەدڵ و دەروونی بانگ کەرە ڕاستەکان دا کە دڵنیان لە ڕاستی و پاکی خۆیان.

٣- بێگومان ڕەوا نی یە بۆ بانگ کەرانی ڕێگای خوا نائومێد بن لە چاك بوون و گوێ ڕایەڵی خەڵکی هەرچەندە یاخی بن و سوور بن لەسەر بێ باوەڕیی، کەواتە ئەگەر سەد جار یەکێکی بانگ کرد و نەهات بە دەمی یەوە و گوێ ڕایەڵ نەبوو، هەر نائومێد نەبێ و کۆتایی نەهێنێ، چونکە لەوانەیە لە جاری سەدو یەکەم دا گوێ ڕایەڵیی بکات، یان لە هەزاردا نەیکرد هەڵئەگرێ لە هەزارو یەکەم دا بیکات. بێگومان ئەرکی بانگ کەران و ڕابەران زۆر سەخت و گرانە، گوێ ڕایەڵی و نەرم کردنی دڵ و دەروون هەروا شتێك نی یە بە سووکو ئاسان فەراهەم بێت، چونکە تەم و ژەنگ و تاریکی بەتاڵ و گومڕایی دڵ و دەروونی داگیر کردوون، باوی داهاتوو و شوێن کەوتنی کوێرانەی خەڵك و دەق گرتن بە ڕژێم و یاسای ناڕەوا، ئەمانە هەموو بوون بە چەند پەردەیەکی ئەستوور بەسەر ژیریی و چاوی دڵەوە، بەرگری ئەکەن لە تێگەیشتن و بینینی شتی ڕاست و ڕەوا، دەی پێویستە ئەم هەموو تەم و ژەنگ و تاریکی یە نەهێڵرێن، ئەو هەموو پەردە ئەستوورانە لا ببرێن بەسەر ژیریی و دڵ و دەروونەوە، خۆ دیارە ئەوەش بە کاڵتە ناکرێت، بەڵکو هەوڵ و تێکۆشانی گرنگی دەوێت، تیمارو پزیشکی دەوێ، دەست لێدان و خستنە کار و ئیشی ئەوێ.

٤- ڕابەریی و ڕێنموونی کردن مەبەستێکی سەرەکی یە، نەك خودی بانگ کەرو ڕابەر!! کەواتە با دڵ تەنگ بێ و داخ و مەراق بچێژێت، بەڵام نابێ کۆتایی بێنێ، بەڵکو پێش بخواتەوەو هەر خەریك بێت، باشتر ئەوەیە کە خۆی بگرێ و گوێ نەدا بەوەی بێ

باوەڕان دەربارەی خۆی و بانگەوازەکەی دەیڵێن، خۆ ئەگەر بەو جۆرە بێت، پشت بکاتە بیّ باوەڕان و وازیان لیّ بێنیّ لەداخ و مەراق دا ئەو کاتە بانگەوازەکەی تیا ئەچێت و ناهەق و بەتاڵ دامەزراو و پتەو ئەبێت، کە ئەوەش ئەوپەڕی بەدبەختی و سیاچارەیی یە کە روو ئەکاتە گەل و وڵات. هەر رابەرو راگەیەنەر ئەبیّ ئەرك و پێویستی سەر شانی خۆی بەجیّ بێنیّ و سەر نەکاتەوە لە هیچ شتێکی تر لەو بارەیەوە ئەبیّ هیچ مەبەستێکی تر بۆ خۆی دانەنیّ جگە لە بەجیّ هێنانی فەرمانەکەی بە گوێرەی رەزامەندی خوا، ئیتر پاش ئەوە هەموو کاروبارێك حەواڵەی خوا بکات، ئەو خۆی ئەزانیّ چی ئەکات و چۆن ئەکات، لەم سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی(یونس) ەدا پەند و ئامۆژگاری زۆر گرنگی تیایە بۆ ئەوانەی بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ رێگای خوا و بێگومان لە گەڕانەوەی(یونس) دا بۆ لای خوا و دان نانی بە هەڵەی خۆی دا تەمیّ و ئامۆژگاری هەیە بۆ بانگ کەران، پێویستە چاك سەرنجی بدەن و لیّ ی ورد ببنەوە. بەڕاستی لەبەزەیی هاتنەوەی خوا بە(یونس) دا بە وەرگرتنی نزاکەی و رزگارکردنی لەو تەنگانەیە موژدەیەکی گەورە هەیە بۆ ئیمانداران.. بۆ ئەوانەی مەشخەڵی خواناسی یان هەڵگرتووە و ئەیانەویّ سە زەوی پڕ لە نەفامی و تاریکی رووناك بکەنەوە وەکو ئەفەرمویّ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُـجِي ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ هەرچۆنیّ(یونس) مان رزگار کرد، هەر بەو جۆرە ئیمانداران لە تەنگی وغەم و داماویی رزگار ئەکەین هەرکاتیّ بەڕاستی هاوار و نزامان لیّ بکەن. ئینجا بە کورتی باسێکی زەکەریا و یەحیای کوڕی ئەکات، ئەفەرمویّ: ﴿وَزَكَرِيَّآ﴾ باسی زەکەریا بکە ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ﴾ باسی ئەو کاتەی کە هاواری کردە پەروەردگاری خۆی ﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا﴾ ئەی پەروەردگارم مەمهێڵە بە تەنیا، بە بیّ رۆڵەیەك کە میرات و کەلەپووری زانین و پێغەمبەرێتیم وەرگریّ لەپاش خۆم. ﴿وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ﴾ تۆ باشترینی هەموو ئەو کەسانەی کە پاش من و هەموو مردوویەك ئەمێنیتەوە کەواتە ئەگەر رۆڵەیشم پیّ نەبەخشی باکم نی یە و گوێم لیّ نی یە، چونکە ئەزانم و باوەڕم هەیە کە خۆت خاوەنی هەموو شتێکی، هەموو شت ئەگەڕێتەوە بۆلای خۆت، خۆت پارێزگاری ئایینی خۆت ئەکەیت، بەڵام ئەمەویّ رۆڵەیەکم پیّ ببەخشیت کە بە جوانی گوێم بۆ بگریّ و بە گوێم بکات و ئەو کارە خێرانەی کە بە منت سپاردووە پاش خۆم بیسپێری بە رۆڵەکەم. لە وەڵامی ئەم لاڵە و پاڕانەوەیەدا،

فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩١﴾

---

خوا ئەفەرموێ: ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ﴾ ئینجا ئێمەش نزا و داواکەمان لێ وەرگرت، ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ﴾ یەحیامان پێ بەخشی، واتە کوڕێکمان دایە کە ناوی یەحیا بوو، ﴿وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓ﴾ ژنەکەیمان رێك و شیاو کرد بۆی و نەزۆکی یەکەیمان نەمێشت. باس و هەواڵی پێ بەخشین و پەیدا بوونی یەحیا بە درێژیی لە سورەتی(آل عمران) و سورەتی(مریم) دا باس کراوە لێرەدا هەر ئەندازەیەکی باس ئەکات کە بەزەیی و چاودێری خوا پیشان ئەدات وەکو سەرگوزەشتەکانی تر لەم سورەتەدا، هۆی وەرگرتنی ئەو نزا و بەخشینی ئەو کوڕە ئەمانە بوون:

١- ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ بەڕاستی ئەوانە، واتە زەکەریا و ماڵ و خێزانی، یان زەکەریا و ژنەکەی لە پێشەوە و لەگەڵ یەحیاش دا پاش پەیدا بوونی، پەلە و پێش دەستی یان ئەکرد لە کردەوە چاکەکان و گوێ ڕایەڵی خواو ئەو شتانەی هۆی نزیکین لەخواوە.

٢- ﴿وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ﴾ ئەوانە ئێمەیان ئەپەرست و نزاو هاواریان لێ ئەکردین بە ئومێد و چاوەڕوانی و ترس و لەرزەوە، ئومێد و چاوەڕوانی وەرگرتن و پاداشت و بەزەیی خوا، ترس و لەرزی وەرنەگرتن و تۆڵە و سزادان و خەشم و قاری خوا. پێویستە خواپەرستی لەسەر ئەو تەرزە بکرێت، ئەو ئومێد و ترسە بە یەکجار دڵ داگیر بکات.

٣- ﴿وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ﴾ ئەوانە مل کەچ بوون بۆ ئێمە و سام و ترسی ئێمە لە دەروونیان دا جێگیر بوو بوو.

بە کورتی بەهۆی ئەو سیفەتانەوە شایانی ئەوە بوون کە خوا ئەو رۆڵە چاکەیان بداتێ، لەو سیانە خێزانێکی بە پیت و فەڕ پێك بێت. ئینجا لە دوا دوایی دا دێتە سەر کورتەیەك لە هەواڵی عیسا پێغەمبەر(علیه السلام) بە بۆنەی ئەوەوە لە پێشەوە باسی مەریەمی دایکی

ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّتِىٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾ باسی ئەو ئافرەتە بکە کە خۆی پاراست و بەرگری خۆی کرد لە کردەوەی زِن و مێردی و نزیك کەوتنەوەی پیاوان چ بە حەڵاڵی و چ بە حەرامی. لێرەدا ئەم ئافرەتەی بە ناوەکەی خۆی ناو نەبردووە بەڵکو بەو سیفەتە پارێزەری یەی باس فەرمووە، چونکە لێرەدا مەبەست باسی عیسای کوڕیەتی لە نێوان کۆمەڵ و زنجیرەی ئەو پێغەمبەرانەی کە لەم سورەتەدا باس کراون، خۆی بە بۆنەی کوڕەکەیەوە باس کراوە کەواتە بەم سیفەتە باس بکرێ چاکترە، چونکە پەیوەندی بە پەیدا بوونی کوڕەکەیەوە هەیە، بێجگە لەوەش بەناوەکەی نی یە، چونکە بەم سیفەتە بەناوبانگ و ناسراوە و ناسراوە وەکو ناوەکەی. باس کردنی ئەم سیفەتە زۆر پێویستە با ناوەکەیشی بوترێ، وەکو لە سورەتی(التحريم) دا فەرموی: ﴿وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾ چونکە ئەبێتە بڕیارو شایەتی دانی خوا لەسەر داوێن پاکی مەریەم و بە درۆ خستنەوەی جوولەکەی نەفرین لێ کراو کە بوختان ئەکەن بۆ مەریەمی داوێن پاك، هەروەها دەست نیشان کردن و دڵنیا کردن لەم سیفەتە پێویستە، چونکە روون کردنەوەی پەیدا بوونی عیسایە(عليه السلام) لە مەریەم بە تەنیا و بەبێ باوك، ئەمەیش بەڵگە و نیشانەی گەورەیی خوا دەرئەخات لەم دوو کەسەدا، ئەفەرموێ: ﴿فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئینجا گیانمان کرد بە بەری عیسادا لە سکی دایکی دا لەو گیانە کە تەنها بە فەرمانی ئێمە پەیدا بووە، لە نێوان دروست کراوەکانمان دا پتر پەیوەندی هەیە بە ئێمەوە هەواڵ و بەسەرهاتی ئەو دایك و کوڕەمان گێرا بە بەڵگەو نیشانەیەکی روون بۆ هەموو عالەم، بە جۆرێك هەرکەسێك فام و ژیریی هەبێت و بیر بکاتەوە لەو بەسەرهاتە گرنگە، بێگومان دەسەڵات و توانینی بێ سنووری خوای بۆ ئاشکرا تر ئەبێت. بەڵێ بەڕاستی بەڵگەو نیشانەیەکە نە لەمەو پێش بووە و نە لەمەو پاش رووئەدات، تاقانە بەڵگەو نیشانەیەکە کە لە مێژووی ئادەمی دا رووی دابێت. لەپاش پیشان دان و خستنە پێش چاوی چەند نموونەیەك لە پێغەمبەران و چەند نموونەیەك لە تاقی کردنەوەو چەند نموونەیەك لە بەزەیی خوا، رووی فەرمودە ئەکاتە ئەم ئوممەتە بە تێکڕایی و سەرنجمان رائەکێشێت بۆ ئەمەی کە ئایینی پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – هەمووی یەك ئایینە و هەموو لەسەر یەك رێگا بوون کە رێگای پەرستنی خوایە بە تاك و تەنیا، ئەو ئایین و بەرنامەی هاتووە بۆ ئەم ئوممەتە هەر ئەوەیە کە بۆ پێغەمبەرانی تریش لەمەو پێش هاتووە کەواتە پێویستە لەسەر هەموو گەلانی جیهان بەجارێ بێنە ژێر سایەی ئەم ئایین و بەرنامەیە کە قورئان هێنای،

ئەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴾ بەڕاستی ئەم ئایینی ئیسلامە کە ئەم پیٚغەمبەرانە هیٚناویانە – واتە ئایینی پەرستنی خوا بە تەنیا – ئایینی ئیٚوەیە ئەی گرۆی ئادەمی، ئایینیٚکی تاك و تەنیا و بیٚ جیاوازی لە نیٚوان هەموو پیٚغەمبەران دا و تاقانە ئایینی خوایە کە پیٚویستە شویٚن کەوتنی بە تەنیا بیٚ تیٚکەلٚ و هاوبەش و تەنیا من خوا و پەروەردگارتانم، کەواتە من بپەرستن گویٚ رایەلٚ و مل کەچ بن بۆ من. بەلٚیٚ ئەوا روون بووەوە بە فەرمودەی خوا کە ئایینی خوا لەسەر زەوی دا تاقانەیە و هەموو پیٚغەمبەران یەك ئایین و باوەڕیان بووە و یەك ریٚگا و بەرنامەیان بووە کە بریتی یە لە روو کردنە خوا و گویٚ رایەلٚی بۆی بیٚ هاوبەش. تەنیا ئایین و میللەتیٚك لە زەوی دا و تەنیا خوایە بۆ هەمووان، تەنیا میللەتیٚك بە گویٚرەی بەرنامە و رەوشت شایەتە لەسەر ئەوە، تەنیا خوایش ئیش کەرە لە زەوی ئاسمان و هەموو بوونەوەردا، ئای چەند شتیٚکی ریٚك و راست و گونجاوە لەگەلٚ ژیریی و سروشت دا!! بەلٚیٚ بیٚگومان ئوممەتی هەموو پیٚغەمبەران – سەلامی خوایان لیٚ بیٚت – یەك عەقیدەو بیر و باوەڕیان هەبووە، کە بنەڕەتی لەسەر باوەڕە بە تاك و تەنیایی خوا و پەرستن و گویٚ رایەلٚی تەنیا خوا بەبیٚ هیچ جۆرە هاوبەشیٚك کە ئەمەش شتیٚکە رژیٚم و یاسای بوون و بوونەوەر شایەتە لەسەری و هیچ جیاوازی یەك نەبووە لەنیٚوان پیٚغەمبەران دا، لەو عەقیدەو بنەڕەتەدا، بەلٚکو هەر جیاوازی و کەمی یەك بووبیٚ تەنیا لە بەرنامەکانی ژیانی گەل و ئوممەتەکان دا بووە، کە ئەوەش بە گویٚرەی شیاوی و گونجاوی بەرنامەکان بووە لەگەلٚ ئامادەیی و لیٚزانین و تیٚگەیشتن و گۆڕانی باری ئوممەت و گەلە جیاوازەکان دا، بە پیٚی پیٚویستی جیاوازی تازە داهاتوویان بووە کە لە بەراورد کردن و هۆیەکانی گۆڕانی باری ژیانەوە پەیدا بوون و فەراهەم هاتوون. ئینجا لەگەلٚ یەکیٚتی ئایین و بنەڕەت دا زۆر لە شویٚن کەوتووی پیٚغەمبەران لە تاقە ریٚگا راستەکەی ئەوان لایان داو ئایینەکەیان بەش بەش کرد و قرت و پچڕیان کرد و هەر کۆمەلٚیٚك بەش و پارچەیەکی بۆ خۆی بڕیار دا، لە نیٚوان خۆیان دا کەوتنە ئاژاوە و بەربەرەکانی، تەنانەت شویٚن کەوتوو و ئوممەتی تەنیا پیٚغەمبەریٚ بوون بە چەند کۆمەلٚ و تاقم، جەنگ و کوشتار لە نیٚوانیان دا فەراهەم هات. ئەوەتا لە فەرمودەیەك دا ئەفەرمویٚ: ئوممەتی موسا لەپاش خۆی بوون بە حەفتا و یەك کۆمەلٚ، ئوممەتی عیسا بوون بە حەفتاو دوو، ئەم ئوممەتە بە حەفتاو سیٚ و لە نیٚوان کۆمەلٚەکانی هەر سیٚ ئوممەتەکەدا تەنیا کۆمەلٚیٚکیان بەڕیٚکی مایەوە و ئایینەکەی زیادوکەم وقرت وپچڕنەکردووە، بەڕیٚکی مایەوە لەسەر ئەو بەرنامەی پیٚغەمبەرەکەی هیٚنای.

وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾ فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ
مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا
يَرۡجِعُونَ ﴿٩٥﴾

---

جا لەم بارەیەوە خوا هەواڵی داو فەرموی: ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ﴾ خەڵکی کاروباری ئایینی خۆیانیان بەش بەش و پارە پارە کرد لە نێوان خۆیان دا، چەند ئاینێکیان داهێناو هەموو دەستیان نەگرت بە تاقە ئایینەکەی خواوە، ﴿كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ﴾ هەموو ئەوانە بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دوایی دا. بێگومان خوا ئاگای لە هەموو شتە و خۆی پرسیار ئەکات لە کردەوەی بەندەکانی و هیچ کردەوەیەك ون نابێت، بەڵکو ئەنووسرێت وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ﴾ ئینجا هەرکەس هەرچەند لە کردەوە چاکەکان بەجێ بێنێ لە کاتێك دا ئیماندار بێت و باوەڕی ڕێك و ڕاستی هەبێت بەوەی ئایینی ئیسلام پێی هاتووە، ئەو کەسە بێ بەش نابێت لە پاداشتی کۆشش و کردەوەی، شاردنەوە و دان پیانەنان نی یە بۆ کردەوەکەی، بەڕاستی ئێمە نووسەرین بۆی، واتە فەرمان ئەدەین بە فریشتەی تایبەتی بۆ نووسینی. ئەمەی لەم ئایەتەدا فەرموی یاسای کردەوەی چاك و پاداشتەکەیەتی، هەموو کردەوەیەکی چاك پاداشتی خۆی هەیە بە مەرجێ لەسەر بنەڕەتی ئیمان بێت و نووسراوە لای خوا و هیچی زایە نابێت و ون نابێت. ئیمان و باوەڕ پێویستە بۆ ئەوەی کردەوەی چاك نرخی هەبێ، بەڵکو بۆ ئەوەی بە کردەوە دابنرێ، کردەوەی چاك پێویستە بۆ ئەوەی ئیمان و باوەڕ بەرهەم و بەروبوومی هەبێ، بەڵکو بۆ ئەوەی ئیمان دەرکەوێ و ئاشکرا بێت. بێگومان ئیمان و باوەڕی ڕاست بنەڕەت و بناغەی ژیانە، چونکە هۆی پەیوەندی ڕاستەقینەیە لە نێوان ئادەمی و هەموو دروست کراوەکانی تری خوادا، هۆی پەیوەندی و بەستنەوەی هەموو ئەم بوونەوەرەیە بە پەروەردگاری یەوە، ئیمان ئەو بنەڕەتەیە و کردەوە چاکەکانیش کۆشك و خانوویەکە لەسەر ئەو بنەڕەتە دائەمەزرێ، کەواتە بە بێ ئەو بنەڕەتە خانووەکە دانامەزرێ، ئەگەر لە پێشەوە لەسەر ئەو بنەڕەتەش کرابێ هەرکات بنەڕەتەکە نەما خانووەکەش ئەڕوخێ. کردەوەی چاك بەر و بەرهەمی ئیمانە و نیشانەیە لەسەر بوون و ئیمانی ڕاستەقینە هەرکات دامەزرا و

جێگیر بوو له دەروون دا، به هیچ جۆر ناوەستێ، بەڵکو ئەکەوێته بزووتنەوه تا خۆی دەرئەخات له شێوەی کردەوەی چاك دا و بەرو بوومەکەی دەرئەکەوێت. جا لەبەر ئەوه قورئان هەموو جارێك ئیمان و کردەوەی چاك ئەکات به هاوسەرو پێکەوه باسیان ئەکات لەکاتی بەڵێن و موژده به ئەجر و پاداشت دانەوه، کەواته ئیمانی وەستاوی نەجوڵاوی بێ بەروبوم هیچ نرخ و پاداشتێکی بۆ دیاریی نەکراوه، وەك هیچ نرخ و پاداشتێك نی یه بۆ کردەوەی چاك به بێ ئیمان. هەر کردەوەیەکی پاك و چاك له ئیمانەوه نەهاتبێ و لەسەر ئەو بنەڕەته نەبێ پشتی پێ نابەسترێ، چونکه لەسەر بەرنامەیەکی دیاریی و نەخشەیەکی کێشراو نی یه، بەڵکو وەك رێکەوت و دەست ترازان وایه و یاسا و رژێم پێکی ناهێنێت. جا هەر کردەوەیەك ئاوا ئارەزووکاری بێت و پاڵ پێوه نەرێکی دامەزراوی وەك ئیمانی لەگەڵ دا نەبێت، بۆ مەبەست و ئامانجێکی رێك و راست و نەگۆڕاو نەبێت، بێگومان ئەو کردەوەیه جێگای ئومێد نی یه، بەڵکو جێگای تۆڵه و سزای رۆژی دوایی یه، خۆ ئەگەر هەندێکیش له تۆڵەکەی پێش خرابێت لەم جیهانەدا ئەوه تەنیا بەشێکی کەمی تۆڵەکەیەو رۆژی دوایین تۆڵەکه تەواو ئەکرێ، کەواته ئەو گەل و تاقمانەی بەهۆی تاوانی گەورەوه لەم جیهانەدا سزا دراون و له ریشه هێنراون رۆژی دوایین زیندوو ئەکرێنەوه بۆ ئەمەی دووچاری تۆڵەی خۆیان بکرێن، نەگەڕانەوه و نەهاتنەوەیان به هیچ جۆر و کلۆج ناگونجێ، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَحَرَامٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ دانیشتوانی هەر شارو وڵاتێکمان بەرباد کردبێت لەم جیهانەدا قەدەغەیه لەسەریان و به هیچ رەنگ ناگونجێ كه نەگەڕێنەوه بۆلامان له رۆژی دوایی دا و زیندوو نەبنەوه، واته هەرچەنده لەم جیهانەدا سزای سەخت درا بن پێویسته بگەڕێنەوه تا تۆڵەی تەواو بدرێن. بێگومان هەموو کەس ئەبێت بگەڕێتەوه، چاك و خراپ، ئەوانەی سزای سەخت درا بن یان نەدرا بن، وەکو له پێشەوه فەرموی: ﴿كُلٌّ إِلَيْنَا رَاجِعُونَ﴾ بەڵام لەناو هەمووان دا به تایبەتی باسی گەڕانەوەی ئەو گەله بەرباد کراوانەی کرد نەوەك گومان ببرێت كه ئەوانه لەم جیهانەدا به سزا و تۆڵەی خۆیان گەیشتوون و تازه پێویست نی یه به گەڕانەوەیان، جا لەبەر ئەوه هەواڵی گەڕانەوەی دان به شێوەیەکی دڵنیا کەر – ئەو هەواڵەی دا به شێوەیەکی تایبەتی و نایاب، بەم رەنگه نەگەڕانەوەی به قەدەغه پیشان دا، ئینجا به بۆنەی پاداشت و رۆژی دوایی یەوه شێوەیەك له شێوەکانی ئەو رۆژه پیشان ئەدات، له یەکەم جارەوه دەست پێ ئەکات به نیشانەیەك لەو نیشانانەی كه بەڵگەن لەسەر نزیکی هاتنی ئەو رۆژه،

حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ
ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا
ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ﴾ ئەوانە ناگەڕێنەوە و زیندوو نابنەوە هەتا کاتێك کە بەرهەڵستی یاجوج و ماجوج تەخت ئەکرێت و نامێلرێ و ئەوانیش لە هەموو شوێنێکی بەرزەوە بە گورجی و گورگە لۆق دێن ﴿وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾ ئەوەی بەڵێنی پێ دراوە راستە، کەواتە رۆژی دوایی نزیك ئەکەوێتەوە ئینجا کاتێ ئەوانەی کە وترا بەدی هاتن ﴿فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئیتر لە کوت و پڕێك دا هەموو مردووەکان زیندوو ئەکرێنەوە و ئەوانەی کە کافرن لە هەیبەت و سام و ترسا چاویان ئەوەستێ و پێڵوەکانیان بەرز ئەبێتەوە نانوقێن. ئەو کافرانە لەو کاتەدا هاواریان لێ هەڵ ئەستێ و پەشیمان ئەبنەوە کە تازە هیچ سوودیشی نی یە، دان ئەنێن بە تاوانی خۆیان دا، بەم جۆرە ئەڵێن: ﴿يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا﴾ ئای مەرگ و مردنەکەی ئێمە وەرە بۆ لامان!! ئەمە کاتی خۆتە و کاتی هاتنتە،بەڕاستی ئێمە لە دنیادا لە بێ ئاگایی یەکی تەواودا بووین، بێ ئاگا بووین لەم رۆژە و لەم بەسەرهاتە نەمان زانی کە شتێکی راستە ﴿بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ نەخێر، بێ ئاگا نەبووین، چونکە ئاگادار کراین و هەواڵی ئەم رۆژەمان پێ درا، بەڵکو خۆمان زاڵم و ستەمکار بووین کە گوێمان نەدا بە ترسێنەرەکان و بیرمان نەکردەوە لەو هەموو بەڵگەو نیشانە روونانە کە پیشانمان دران و باوەڕمان نەهێنا تا ئەوا خۆمان بەد بەخت و بەش بڕاو کرد، کەواتە خۆمان دەست درێژییمان لەخۆمان کرد، لە سورەتی(الکهف) دا ئەندازەیەك بە درێژیی دواین لە یاجوج و ماجوج، کەواتە پێویست نی یە بە دووبارە کردنەوەی ئەوەی لەوێ وتراوە، بەڵام وەکو لەوێ دەست نیشانمان کرد لێرەش ئەڵێین: کات و چەرخ لای خوا و لە حیسابی خوادا جۆرێکی ترە و جیاوازە لەوەی ئێمە ئەیزانین و باوە لامان، ئەو شتەی بە گوێرەی باوی ئێمە دوورە و بە دووری سەیر ئەکەین لای خوا نزیکە،**

چونكه كات و چەرخ لە خوا كار ناكات و بەسەر ئەوداتیٚ ناپەڕیٚ، تێپەڕینی كات و چەرخ بەسەر كەسێك دا ئەبێت كە سەرەتا بۆ بوون و دوا هاتنیشی ببیٚ، دەی بوونی خوا پاكە لە سەرەتا و دوا هاتن، دووری و نزیكی و بەر و دوا بە پیٚی ئەم جیهان و عالەمەی ئێمەیە كە شەو و رۆژ و مانگ و سالّمان هەیە، لەمە بەدەر كار بە جۆرێكی ترە و جیاوازە لە هەموو شت و هەموو رووداوێكی لەمەوپێش و ئێستا و لەمەوپاش چوار دەور دراوە بە زانین و خواهیش و توانا و دەسەلاّتی خوا و هەموو شت و هەموو رووداوێك هەموو كات لای خوا ئامادەن پێكەوە. ئینجا هەركات ئەمەی كە وترا لە دەروون دا جێگیر بوو ئەو كاتە ئەزانین ئەو نزیكی یەی كە قورئان لێرە و لە سورەتی(الكهف) دا پیشانی ئەدات ئەگونجیٚ. لە نێوان نەمانی بەرهەلّستی یاجوج و ماجوج و هاتنی رۆژی دوایی دا نزیكی یەك نی یە كە لای ئێمە باوە، كەواتە ئەگونجیٚ رووداوی یاجوج و ماجوج تێپەڕی كردبێت و ئەوانە بریتی بووبن لە تەتار و مەغۆل، كە هاتن بە ولاّتان دا و تەخت و بەختی هەموو ولاّتیان بەرباد كرد، وەكو بە درێژیی لە سورەتی(الكهف) دا باس كرا. بەلّگەی تر لەسەر ئەوە كە نزیكی لای خوا جۆرێكی ترە و جیاوازە لەوەی باوە لای ئێمە ئەمەیە: خوای گەورە لە چەرخی پێغەمبەردا فەرموی: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾[1]. فەرموی: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ﴾[2] رەوانە كردنی پێغەمبەرمان(ﷺ) كراوە بە یەكەم نیشانەی نزیكی رۆژی دوایی، دەی ئەوەتا لەو كاتەوە پتر لە هەزار و چوار سەد سالّ تێپەڕی كرد و هێشتا رۆژی دواییش هەر نەهات، خوایش ئەزانیٚ كە چەند ماوەی تریشی ماوە، كەواتە زۆر جێگای باوەڕە كە مەبەست بە هاتنی رۆژی دوایی لێرەیش دا ئەو جۆرە نزیكی یە بێت كە ئێستا باس كرا. لە پاش نیشان دانی شێوەیەكی پڕ سامی كافرەكان لە رۆژی دوایی دا، لەگەلّ هاوارو نالّە و دان نانیان بە خراپی و تاوانباری خۆیان، ئینجا رووی فەرمودە ئەكاتە كافرە بت پەرستەكان، بڕیاری سزای سەختیان ئاراستە ئەكات بە جۆریٚ وەكو ئێستا ئەوكاتە بێت كە لە ساحەی دادگای ئەو رۆژەدا وەستاون،

---

[1] رۆژی دوایی نزیك كەوتەوە و مانگ لەت بوو – سورەتی القمر.

[2] نزیك كەوتەوە لە خەلّكی یەوە حیساب و پرسیاریان – سورەتی الأنبیاء –.

إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ
هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ بەڕاستی ئێوەو هەموو ئەو شتانەی کە ئەیانپەرستن کە جیاوازن لەخوا و ئێوە تێپەڕ ئەکەن بۆ پەرستنی ئەوانە، ئێوە و ئەوانە هەموو سوتەمەنی و هەڵگرێنەری دۆزەخن، ئێوە و ئەوان فڕێ ئەدرێن بۆ ناو دۆزەخ بۆ هەڵگراندنی ﴿أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾ ئێوە و ئەوان ئەچنە ناوی یەوە. ئەو بت و پەرستراوانە لەگەڵ بت پەرستەکان دا لە دۆزەخ دا ئەکرێن بە هاوسەر بۆ زیادە سزادانی دڵ و دەروونیان، چونکە ئەو بتانە بوون بە هۆی گومڕایی یان یان تا سەریان لە ئاگری دۆزەخەوە دەرچوو، دەی داخی سەخت ئەوەیە کە هەمیشە هۆی بەد بەختی کابرا بە پێش چاوی یەوە بێت وهاو مل بێت، بەڕاستی وتەیەکی راستە کە ئەڵێن: تەماشا کردنی دوژمن جۆرێکە لە سزا و عەزاب کەواتە با هەمیشە بیان بینن و هاوسەریان بن تا داخ و رقیان دەربارەیان بەتین بێت لەباتی ئەوەی کە لە دنیادا زۆریان خۆش ویستن بە ناحەق و ناڕەوا و جگە لەمانەیش فڕێ دانی بتەکانیان بۆ ناو ئاگر لاقرتی کردنە بە خۆیان و بت و ئایینە پڕ و پووچەکەیان کە ئەوەیش سزایەکی ترە، ئینجا بەڵگەیان بۆ ئەهێنێتەوە لەسەر ناڕاستی ئەو بتانە و ناڕەوایی پەرستنیان، کەواتە هەڵە بوون کاتی خۆی لەو باوەڕەدا کە بوویان، بەڵگەکەیشی فڕێ دانیانە بۆ ناو دۆزەخ لە ڕۆژی دوایی دا، بەڵام قورئان بە پێی باوی خۆی کە زۆر جار شتی داهاتوو بە ڕووداوی لەمەوپێش پیشان ئەدات، لێرەیش دا شتەکە وا پیشان ئەدات وەکو ئێستا ڕۆژی دوایی بێت و ئەو بتانە خرابنە دۆزەخەوە، ئەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا﴾ ئەگەر لە مەرجێك دا ئەو بتانە پەرستراوی راستەقینە بوونایە نەئەچوونە ناو دۆزەخەوە، بەڵام چوونە ناوی یەوە، کەواتە خوا نین و پەرستراوی راستەقینە نین، چونکە خوا تۆڵەی لێ ناسێنرێ و سزا نادرێ و ریسوا ناکرێ. ئینجا هەر لەسەر ئەو تەرزە ئەڕوا بۆ باسی بار و وەزعی دۆزەخی یەکان و ئەفەرموێ: ﴿وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ هەموو بت و بت پەرستەکان تیای دا ئەمێننەوە بە یەکجاری و بێ بڕانەوەو دوا هاتن،

لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا
مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا
يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ
﴿١٠٣﴾ يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا
عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾

---

﴿لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ﴾ بۆ ئەو دۆزەخی یانە لە دۆزەخ دا نکە و ناڵە و دەنگی هەناسەی توند هەیە، بەهۆی ئەو هەموو سزای سەخت و بەتینەوە کە داگیریان ئەکات، ئەوانە لە دۆزەخ دا نابیستن و بیستنیان نامێنێ. ئەوەش بۆ زیادە سزا دانیان، چونکە بیستن جۆرە ئارامێك ئەدات و نەبیستن بێ ئارامی و بەتین تر ئەکات. لێرەدا کۆتایی ئەهێنێ بە باسی سزای کافران و تاوانباران، تا بزانین چاکان و پاکان چۆنن و چی یان بەسەر دێت، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ﴾ بەڕاستی کەسانێ کە پێش کەوتووە بۆیان لەلایەن ئێمەوە شتی زۆر شیرین و بەفەڕ، واتە بڕیاری بەختەوەری و باوەڕ و گوێ ڕایەڵی و خستنە سەر ڕێگای ڕاست ئەوانە دوور خراوەن لە دۆزەخ، ﴿لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ﴾ قرچە و دەنگی بڵێسە و سوتاندنەکەی نابیستن. بێگومان ئەو دەنگە ترس و داچڵەکاندن پەیدا ئەکات، موچرکە بە لەش و دەروون دا ئەهێنێ، مو گرژ ئەکات جا خوای خاوەن بەزەیی نایەڵێ ئەو دەنگەیش ببیستن لە دووریشەوە چ جای ئەوە بچنە ناو ئاگرەکەوە. ئینجا چاکەی خوا بەسەریانەوە هەر ئەوە نی یە کە ڕزگاریان ئەکات لەو سزایە، بەڵکو بەم جۆرەیش کە ئەفەرموێ: ﴿وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە هەمیشەیین بێ بڕانەوە لەناو هەموو ناز و نیعمەتێك دا کە نەفسیان ئارەزووی ئەکات. ﴿لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ﴾[1] ترس و داچڵەکاندنی هەرە گەورەی ڕۆژی دوایی ئەوانە غەمبار

---

[1] چەند ڕایەك هەیە لە مەبەست بەو داچڵەکاندنە: ١.کاتی فو کردن بەسوردا جاری دووەم کە خەڵکی لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە. ٢.کاتی ناردنی خەڵك بەرەو دۆزەخ. ٣.کاتی داخستنی دۆزەخ لەسەر دۆزەخی یەکان. ٤.کاتی سەر بڕینی مردن. ٥.کاتی پێچەوانەی ئاسمان. ٦.کاتی بەرگری دۆزەخی یەکان لە گفتوگۆ.

ناكات، واتەخوا دڵخۆشیان ئەكات و ناهێڵێ، غەمبار بن ﴿وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ﴾مەلائیكە دێن بە پیریانەوە بە سڵاو لێ كردن و پیرۆزبایی یەوە، پێ یان ئەڵێن: ﴿هَـٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ ئەمە رۆژەكەتانە كە لە دنیادا بەڵێنتان پێ درا، ئەمە رۆژەكەتانە كە پاداشت ئەدرێنەوە لە لایەن خواوە. بە كورتی ئەو خوا پێداوانە لە هەموو ناخۆشی یەك رزگار ئەبن و ئەگەن بە هەموو ئامانج و خۆشی یەك لە لوتف و بەزەیی خوا بە زیاد بێت، خوا بێ بەشمان نەكات لەو خۆشی یە. ئینجا دوایی باسەكە ئەهێنێ بە باسی بەسەرهاتێكی زۆر سامناك و گرنگ كە روو ئەكاتە ئاسمان، ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ﴾ باسی رۆژێ بكە كە ئێمە ئاسمان ئەپێچینەوە و تۆماری ئەكەین وەكو پێچانەوە و هەڵگێرانەوەی پەڕەی كتێب، واتە ئەم جیهان و بوونەوەرەی كە ئێستا هەیە نایهێڵین و جیهان و بوونەوەرێ تر ئەهێنینە كایەوە بە وێنەی هەڵدانەوەی پەڕەیەك لە كتێبێ و هێنانی پەڕەیەكی تر، وەكو ئەفەرموێ: ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ﴾ ئەوەی لە یەكەم جارەوە دروستمان كرد لە نەبوون نایهێڵین و دووبارەی ئەكەینەوە بە وێنەی یەكەم جار. ئینجا زۆر بەتین و بەهێز دڵنیامان ئەكات لەسەر ئەو دووبارە كردنەوەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ﴾ ئەو دووبارە كردنەوەیە بەڵێنمان پێداوە، بەڵێنێ كە هێنانە دی لەسەرمانە ﴿إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ﴾ بێگومان ئێمە ئەوە ئەكەین و بەدی هێنەرین بۆ ئەو دووبارە كردنەوەیە. خوای گەورە ئەم جیهانەی بەم هەموو پیت و خێرو بێرەوە دروست كردووە، تایبەتی نەكردووە تەنیا بە چاكانەوە، بەڵكو چاك و خراپ، كافرو موسڵمانی لەم جیهانەدا بەشدار كردووە، بەڵام پاشان لەناوبردنی ئەم جیهانە و هێنانی جیهانێكی تر تازە، كە پێی ئەوترێ رۆژی دوایی، خوای گەورە هەموو خۆشی و باشی و ناز و رێزی ئەو جیهانە تایبەتی ئەكات بە چاكان و پاكانەوە، كافرو بێ باوەڕانی لێ بێ بەش ئەكات، ئەمەیش بڕیارێكە لە لایەن خواوە لە(لوح المحفوظ) دا نووسراوە، لەو كتێبانەیش دا كە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – باسی فەرمووە،

وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ
فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾

---

وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ سوێند بەخوا بڕیارمان داوە و نووسیومانە لە کتێبی خۆمان دا کە ناردوومانەتە سەر پێغەمبەران لەپاش ئەمەی لە(لوح المحفوظ) دا نووسراوە: کە بەندە چاکەکانم زەوی بەهەشت وەرئەگرن بۆ خۆیان و تایبەتی ئەبێ پێ یانەوە، بە وێنەی کەلەپوور و میراتێ کە تایبەتی یە بە خاوەنەکەیەوە. [1] ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە پێی باوە شیرینەکەی قورئان بە چەند ئایەتێك کە رێك و گونجاوە لەگەڵ ئایەتەکانی سەرەتای سورەتەکەدا، لە هەمان کات دا رێك و پێك و موناسیبن لەگەڵ ئایەتەکانی سەرەتای سورەتەکەی دوایی دا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ﴾ بەڕاستی لەم قورئانەدا هەیە لەبارەی تەمێ و رێنموونی و ئاگادار کردنەوە ئەندازێ کە بەسەو هۆی گەیشتنە بە مەبەست و ئامانجی هەردوو جیهان، بەڵام بۆ کەسانێ کە ئامادەن بۆ بە پیرەوە چوون و وەرگرتنی رێنموونی خوا، کە ئەوانەش کەسانێکن لەخواترس و گوێ رایەڵن. ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەی محمد لەبەر هیچ هۆیەك تۆمان رەوانە نەکردووە مەگەر لەبەر بەزەیی و رەحم کردن بە هەموو عالەم و جیهانیان، لە هەموو چەرخ و تاقم و چینێك دا، چونکە ئەو ئایین و شەریعەتەی پێی رەوانە کراوی هۆی خۆش بەختی و کامەرانی یانە، هۆی باشی هەردوو جیهانیانە. بەڵێ بێگومان خوای گەورە پێغەمبەری رەوانە کرد لەبەر رەحم و بەزەیی بە هەموو کەس بۆ ئەوەی رێنموونی یان بکات، دەستیان بگرێت بۆ رۆیشتن بە رێگای راست دا، ئەو بەرنامەی بۆ ناردن بەرنامەیەکە کە هەموو خۆش بەخت و کامەران بکات لەهەردوو جیهان دا و بیانگەیەنێتە پۆپە و پلەی هەرە بەرزی ژیان، بەڵام ئەم تەمێ و رێنموونی یە شیرینەی وەرنەگرت و ئەم رێگا راستەی نەدایە بەر جگە لەوانەی ئامادەیی یان تێدایە، ئەگەر چی

---

[1] ئەم رستەیە بە چەند جۆرێك تەرکیب کراوە، بە گوێرەی ئەو جۆرانە تەفسیر کراوەتەوە، هەموو هەر ئەگونجێ، بەڵام ئەمەی تەفسیرەکەم بە نزیك تر زانی، خوای خۆی باش ئەزانێ.

پیت و فەڕی ئەم ئایینە کافریش ئەگرێتەوە و بەشدار ئەبێت تیای دا لەم جیهانەدا. ئەم ئایینە پیرۆزە هات بە کتێبێکی کراوە بۆ هەموو ژیریێ لە هەموو چەرخ و چینێك دا، بنەڕەتێکی دامەزراوی نەگۆڕاوی هێنا بۆ ژیان، بەجۆرێ ئامادەیە بۆ بەجێ هێنانی هەموو پێویستی یەك کە ڕەوا و بەجێ بێت لە هەموو کات و چەرخێك دا، ئەوەیش بە گوێرەی حیکمەت و زانینی خوا، کە خۆی زانایە بە دروست کراوەکانی خۆی و هەر شتێك کە شایان و پێویست بێت بۆیان. ئەم قورئانە بەفەڕە بنەڕەتی بەرنامەیەکی هەمیشەیی دانا بۆ ژیانێکی ئادەمی یانە، ئیتر هەرچەند جۆری ئەو ژیانە بگۆڕێ بە گوێرەی جیاوازی چەرخ و وڵات و گەلە جیاوازەکان، ئادەمی سەربەست کرد بە گوێرەی ئەو یاسا و بنەڕەتە تا لەبەر ڕووناکی ئەودا چارەسەر بدۆزێتەوە بۆ هەموو کێش و بارێك کە لە ئەنجامی گۆڕانی ژیان دا دێتە کایەوە، بە مەرجێ چارەسەرەکان دژ و پێچەوانەی یاسا بنەڕەتی یەکە نەبن. سەرچاوەکە تەنیا یاسا بنەڕەتی یەکە بێت، بەناوی ئەوەوە بێت. بێگومان بە گوێرەی لێکدانەوە و بەراوردی ئادەمی ڕوونە کە بەرنامەی ئەم قورئانە لەمەوبەر و ئێستایش پێشی هەنگاوەکانی ئادەمی کەوتووە، دەست ئەدات بۆ ئەمەی ژیان لە سایەی دا بە هەمیشەیی پەرە بسێنێ تا ئەگاتە ئەوپەڕی ڕادە و پلەی بەرزی ژیان لەم جیهان و زەوی یەدا، هەمیشە جڵەوی ژیان بگرێتە دەست و بەرەو پێش کەوتنی ببات. ئەم بەرنامەیەی کە ئەم قورئانە هێنای دان ئەنێ بە هەموو هێزو وزە و داخوازی و ئارەزووی ئادەمی دا، دەست ناگرێ بەسەر دەمی دا تا هەناسەی لێ بسێنێ!! بەڵکو ئارەزوو و داخوازی هەموو هێزو وزەیەك ڕەوا ئەدات و پێکی ئەهێنێ، بە شێوەیەکی پاك و خاوێن، دوور لە هەموو چڵك و چەپەڵی یەك، نرخ و فەڕی ئەم بەرنامەیە لەمەدا دەرئەکەوێ کە لە هەموو شتێك دا ناوەڕاستی گرتووە بەڕێکی، بێ زیادە ڕەوی و کەم و کوڕی، هاوتایی ئەخاتە نێوان هەموو بار و ڕوویەکی ژیانەوە، هەموو شتێك ماف و نرخی خۆی بۆ دائەنێ، لەش سزا نادات و بێبەشی ناکات لە بەجێ هێنانی ئارەزوو و پێویستی یەکان لەپێناوی ڕۆح دا، هەروەکو دەست بەرداری ڕۆحیش نابێت لە پێناوی ڕابواردنی لەش دا، دەست ناگرێت بەسەر هێزو وزەی ئەندامی گەل دا و بەرگری ناکات لە خواست و ئارەزووە سروشتی یە پاك و خاوێنەکانی لەبەر بەرژەوەندی و خواستی گەل، بەریش بەرەڵا ناکات بۆ ئەندامی گەل بە ئارەزووی خۆی بجوڵێتەوە و سەر بکاتە ڕابواردن و

خۆشی و خواستی ئاڕەوا تا سەری لە ژیانی گەل و دەوڵەتەوە دەرچێت، هەر ئەرك و داوایەكیش ئەم بەرنامەیە خستویەتی یە سەر شانی خەڵكی هەموو گونجاوە و لە سنووری توانادایە و هەمووی بەرژەوەندی تێدایە، بێگومان ڕەوانەكردنی پێغەمبەر(ص) ڕەحمەت بوو بۆ گەل و تاقمەكەی لە چەرخی خۆی دا، بۆ هەموو ئادەمی یەك لە پاش خۆی، ئەو بیر و باوەڕانەی كە لە یەكەم جارەوە هێنای نەناسراو و بێزراو بوون لەدڵ و دەروونی خەڵكی دا، لەبەر زۆر دووری یان لە واقیع و ڕووداوی ژیانی خەڵكی و هەست و فامیانەوە، بەڵام دوای یەكەمجار بەرە بەرە ئادەمی نزیك كەوتەوە و ئەكەوێتەوە لە سنووری ئەو یاسا و بیر و باوەڕانەی كە ئیسلام هێنانی، تا بێت ناسراو و وەرگیراو ئەبن لای خەڵكی و باوەڕیان پێ ئەمێنن و ئەیانەوێ بەدی بهێنن، بەڵام بە ناوێكی ترەوە و لەژێر پۆشاكێكی تردا و بە دروشم و ناونیشانێكی تر جگە لە ئیسلام. شتێكی ئاشكرایە كە ئیسلام هات جاڕی دا بە یەكێتی ئادەمی، بە بێ تەماشا كردنی جیاوازی ڕەنگ و تیرە و زمان و وڵات، تا هەموو یەك بگرن بە تەنیا عەقیدە و باوەڕێكەوە بژین و یەك یاسا و ڕژێمی كۆمەڵایەتی یان هەبێت، ئەم باوەڕە پاكە بە شتێكی نەناسراو سەیر ئەكرا، لەبەر ئەوەی واقیعی ژیانیان لێ یەوە دوور بوو لێ ی بێزار بوون، بەڵكو بە ناڕەوایش سەیر ئەكران لە لایەن زۆربەوە بە تایبەتی كاربەدەستان و زۆرداران و سامان داران، تەنانەت لەناو هەندێ گەلان دا پیاو ماقوڵ و سەرۆكەكان بە تیرەیەكی جیاواز سەیر ئەكران جگە لە تیرەی ژێر دەستان و بێ نەوایان، بەڵام لەم چەرخانی دوایی یەدا خەڵكی بیر و هۆشێكیان كردەوەو لە ئیسلامەوە فێری ئادەمێتی بوون و ئەیانەوێ شوێنی ڕێبازی ئیسلام بكەون لە ڕەوادان و دان نان بە یەكێتی ئادەمی دا و لە ڕەگ هێنانی ڕەگەزایەتی، بەڵام پێ یان هەڵئەكەوێ و هەڵئەخلیسكێ، چونكە شتەكە لەبەر ڕووناكی ئیسلام دا بەجێ ناهێنن. بەڵام گەیشتوون بە بەشێ لەو بەرنامە گرنگەی ئیسلام. با بە قسەی ڕووتیش بێت و كردەوەی لەگەڵ دا نەبێت، وەكو ئەبینرێ تا ئێستاش هەندێك لە گەلانی ئەورووپا و ئەمریكا لەسەر باوەڕی ڕەگەز پەرستین و دانیان گرتووە بەو ڕژێمە بۆگەنەدا كە ئیسلام چواردە چەرخ لەمەوبەر قەدەغەی كردووە لە زۆر كاتیش دا ڕیشە كەنی كردو شوێنەواریشی نەهێشت. ئیسلام هات خەڵكی یەكسان كرد لەبەردەم یاسا و دادگادا، لە كاتێك دا بەش بەش بوون بە چەند چین و تاقمێك، هەریەكەیان

یاسای تایبەتی بۆ دانرابوو، بەڵکو لە چەرخی دەرە بەگی و بەندەیی دا ویست و ئارەزووی ئاغا یاسا بوو، کەواتە ئەوەی کە ئیسلام دای هێنا شتێکی ناسراو و ڕەوا نەبوو لەناو گەلانی جیهان دا، بەڵام ئەوەتا لەم دوا دوایی دا بیریان کردەوە و لە ئیسلامەوە فێری ئادەمێتی بوون و ئەیانەوێ – با بە باوەڕی رووتیش بێت – بگەن بە بەشێ لەوەی کە ئیسلام چواردە چەرخە دایهێناوە و بە کردەوەش هێناویەتی یە دی لە شیرین ترین شێوەی دا. ئەمانە کە باس کران و جگە لەمانە شتی زۆری تریش شایەتی ئەوەن کە ئیسلام بەهرەو نیعمەتێکی گەورەیە بۆ هەموو ئادەمی، ڕەوانە کردنی پێغەمبەرمان(ﷺ) ڕەحمەتێکە لەلایەن خواوە بۆ هەموو عالەم، ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە و ئەوانەی باوەڕیان پێ نەهێناوە بەشدارن لەو ڕەحمەتەدا، چونکە ئادەمیزاد سوود و فەڕی وەرگرت لەو بەرنامەیەی کە ئەم پێغەمبەرە هێنای، ئیتر خەڵکی پێی خۆش بێت یان نەء. پێی بزانێ یان نەء. هەمیشە سێبەرو سەهەندی ئەم ڕەحمەتە پان و فراوانە بۆ ئەوەی ئەیەوێ لە سایەیدا بحەوێتەوە و بۆ هەرکەس ئەیەوێ بۆن و هەناسەی خۆش و نەسیمی ناسك و فێنك وەرگرێ لەکاتی قرچەی گەرمای سوتێنەری ژیانی ئەم زەوی جیهانەدا، بێگومان ئادەمێتی ئەمڕۆ کە بەسەر گەردانی و بێ ئارامی ئەژی لە چۆڵ و بیابانی ماددیەت و دۆزەخی جەنگ و ئاژاوە و وشك و برین و بێ خێر و بێری ڕۆح و دڵ و دەروون دا، ئەم ئادەمێتی یە کە ئەمڕۆ سەری لێ شێواوە پێویستی زۆر بەتینی هەیە بە هەست کردن بەم ڕەحمەتەی کە خوا ناردی تا لە سایەو پەنای دا ئارام بگرێ و بحەوێتەوە. پاش ئەوەی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانانەی هێنایەوە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ) بە ڕێکی جاڕی دا کە ڕەوانە کردنی ڕەحمەتە بۆ هەموو عالەم، ئینجا فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە کورتە و خولاسەی ئایین و پەیامەکەی خۆی روون بکاتەوە بۆ بێ باوەڕەکان و بانگیان بکات بۆ مل کەچی و گوێ ڕایەڵی، ئینجا ئەگەر ملیان وەرگێڕا و گوێ ڕایەڵ نەبوون بیانترسێنێ و هەواڵیان بداتێ بە خراپی پاشەڕۆژیان و بە نەمانی عوزر و بەهانەیان، .

قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ
ءَاذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ وَإِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ
مِنَ ٱلْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنْ أَدْرِى لَعَلَّهُۥ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١١١﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ بڵێ: سروش هاتووەتە لام کە ئێوە هیچ پەرستراوێکتان نی یە جگە لەو خوایەی کە تاک و تەنیایە. بێگومان پەرستنی خوای تاک و تەنیا کورتە خولاسەی هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوایە، کە هاتووەتە سەر هەموو پێغەمبەران - سەلامی خوایان لێ بێت - و باوەڕ بە خوا و پەرستنی تەنیا ئەو، بنەڕەت و هۆی ئەو ڕەحمەتەیە کە پێغەمبەرمانی پێ ڕەوانە کراوە، ناسین و پەرستنی خوا هۆی ڕزگاری یە لە شتی پڕو پووچ و نەفامی و لەباری قورس و گران و دوو دڵی بت پەرستی، هۆی ڕاست و ڕێکی و دامەزراوی ژیانە، هۆی سەربەرزی مەردومە لەم بوونەوەرەدا، چونکە خاوەنی ئەو باوەڕە سەر بۆ کەس ناخەفێنێ جگە لە خوای تاک و تەنیا. ئەوەبوو ڕێگای ئەو ڕەحمەتەی کە هەموو عالەم بەشداره تیای دا، کەواتە زۆر بەجێ یە تاک و تەنیایی خوا ببێتە هۆی ئەم داوایە لە بێ باوەڕەکان کە بە شێوەی پرسیار ئاراستەیان ئەکات، ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ کەواتە هەموو مل کەچ بن بۆ ئەوەی سروش کراوەتە لای من. ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ ءَاذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ﴾ ئینجا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا و گوێ ڕایەڵی یان نەکرد پێیان بڵێ: ئەوەی فەرمانم پێ دراوە هەواڵم دا پێتان و ئاگادارم کردن پێی، بە جۆرێ هەمووتانم یەکسان کردووە لەوەدا و کەسێتانم تایبەتی نەکردووە. یەکێ لەو شتانەی کە فەرمانی پێ دراوە ترساندنیانە بە سزای خوا ئەگەر باوەڕ نەهێنن و گوێ ڕایەڵی نەکەن، یەکێ تر لەو هەواڵانەی پێی داون هەواڵی هاتنی سزای خوایە بۆ سەریان، بەڵام خوا کاتی هاتنی ئەو سزایەی دیاریی نەکردووە، لەبەر ئەوە فەرمانی دا کە پێیان بفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ﴾ من نازانم ئایا ئەوەی هەڕەشەتان لێ کراوە پێی نزیکە یان**

دووره؟ چونکە شتێکی نهێنی و غەیبی یە تەنها خوا خۆی ئەیزانێ. ﴿إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ﴾ بەڕاستی خوا ئاگادارە و ئەزانێ بە هەر وتە و قسەیەکی خراپ و ناڕەوا کە دەری ئەبڕن و بە ئاشکرا ئەیڵێن دەربارەی ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر و ئەزانێ بە هەر شتێك کە دەری نابڕن و ئەیشارنەوە، بە هەر کینە و رقێ لە دەرونتان دایە دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان، کەواتە هەموو شتێکتان لای خوا روون و ئاشکرایە و کاتێ کە سزاکەتان ئەدات سزادانەکەی لە زانینەوەیە، بە پێی تاوان و گوناهی ئاشکرا و نهێنی خۆتانەوەیە، ئەگەر سزاتان پێش بخات خۆی باش ئەزانێ و کاتێ پەلە نەکات لە سزاتان و دوای بخات ئەوەش هەر خۆی ئەزانێ و بێگومان لەبەر حیکمەت و بەرژەوەندی یەکە، وەکو خۆی ئەفەرموێ: ﴿وَإِنۡ أَدۡرِي لَعَلَّهُۥ فِتۡنَةٞ لَّكُمۡ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ﴾ من نازانم رەنج و مۆڵەت دانتان بۆ ئەمە بێت ببێتە تاقی کردنەوە بۆتان، تا دەرکەوێ بۆ خەڵکی کردەوەتان چۆنە؟ یان تا هۆی سەر لێ تێك دانتان بێت بۆ ئەمەیە بژین و رابوێرن تا کاتێك کە بڕیار دراوە و دیاریی کراوە بە پێی خواهیش و حیکمەتی خوا بۆ ئێوە و ژیانی ئێوە. ئەو دیاریی نەکردنی کاتی سزایە زۆر بەتین و بەهێزە بۆ بێدار کردنەوەی هەر دڵێ کە کوێر و داخرا و نەبێ، ترس و بیمێکی هەموو کاتی فەراهەم ئەهێنێ بەهۆی ئەوەوە چاوەڕوانی هاتنی ئەو سزایەیە لە ناکاو، دڵی ئادەمی بێ هۆش و بێ ئاگایە و ژیان و رابواردن بە خۆشی و لەزەتی ئەم جیهانە ئەیخەڵەتێنن بەهۆی ئەوەوە بێ باك و بێ ترسە لە بەسەرهاتی خراپ و سزای خوا، کەواتە پێویستی بە هەڕەشە و داچڵەکان هەیە، ئەم هەڕەشە و ترساندنەی قورئان دڵ بێدار ئەکاتەوە لە خەوی بێ ئاگایی بە مەرجێ ئەو دڵە مردوو نەبێت و هیچ بەهانەیەکیش ناهێڵێتەوە بۆ هەرکەسێ ئەو هەڕەشە و ترساندنەی پێ گەیشتبێ. ئینجا پێغەمبەرمان(ﷺ) روو ئەکاتە خوای خۆی پاش ئەوە سپاردەکەی بەجێ هێنا و پەیامەکەی گەیاند و بێ باوەڕانی ئاگادار کردو ترساندنی لە هاتنی سزای خوا لەناکاو دا، پاش ئەمە نزای کردە لای خوای خۆی و ئەم داوایەی کرد کە بۆمان ئەگێڕێتەوە

قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾

﴿قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ﴾ پێغەمبەر وتی: ئەی پەروەردگارم بە داد و حەق بڕیار بدە لە نێوان من و ئەم بێ باوەڕانەدا، بێگومان داد و حەق لەوەدایە کە خوا سزای بەتین داباریێنێ بەسەر بێ باوەڕەکان دا موسڵمانان و ئایینەکەی زاڵ بکات بەسەر کوفر و کافران دا، ئەو نزایەی وەرگیرا و ئەوەندەی پێ نەچوو ئەو هەموو کافرو مل هوڕانەی لەناوبرد بە سزای کوشتن و بڕین و ریسوایی لە رۆژی بەدرو رۆژانی رووداوەکانی پاش بەدر، لە دوای سزای ئەم جیهانە کەوتنە سزای نەبڕاوەی پاش مردن و خوا ئایینی ئیسلامێ زاڵ کرد و جیهانی سارا کردەوە. پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەو نزایەی کرد و ئینجا رووی کردە بێ باوەڕەکان و ئەم رستەیەی ئاراستە کردن: ﴿وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ تەنیا پەروەردگاری ئێمە میهرەبانە و خاوەنی بەزەیی فراوانە و داوای یارمەتی و کۆمەکی لێ کراوە بۆ ئێمە لەسەر ئەو هەموو وتارە خراپ و ناڕەوایەی کە ئێوە ئەیڵێن بەرامبەر بە خوا و ئایینی ئیسلام. سیفەتی رەحمەتی لێرەدا زۆر تر بەجێ یە تا سیفەتێ تر، چونکە خوا پێغەمبەری(ﷺ) ناردووە تا رەحمەت بێ بۆ هەموو عالەم، ئینجا ئەو بێ باوەڕە سەرکێشانە باوەڕیان پێ نەهێنا و لاقرتی یان پێ کرد، کەواتە رەحم ئەکات بە پێغەمبەرەکەی بەم رەنگە ئەم رەحمەتە کە پیای دا نارد بڵاوی ئەکاتەوەو رێگری ئەو رەحمەتە نەبێ لەناوبەرێ وەکو وایشی کرد.

خوا بە کەرەمی خۆی لە سایەی ئەم رەحمەتەدا نەرمان نەکات آمین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ

## سورەتی (الحج)
## مەدینەیی یە و (٧٨) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە هەرچەندە تێکەڵە و پێك هاتوە لە ئایەتی مەککەیی و مەدینەیی، هەرچەندە لە چەند شتێك ئەدوێ کە تەنها لە سورەتە مەدینەیی یەکان دا باسیان لێ ئەکرێ، وەکو بڕیاری جەنگ و کوشتار و فەرماندان بەجیهاد لەرێگای خوادا، بەڵام زۆربەی باس و دوانی لەو شتانەیە کە مەبەست و ئامانجن لە زۆربەی سورەتە مەککەیی یەکان دا، وەکو تاك و تەنیایی خوا و زیندوو بوونەوە و ترساندن لە رۆژی دوایی و شێوەی بەسەرهاتەکانی و بەڵگەونیشانەکانی خوالەم بوونەوەرەدا، مەبەستە سەرەکی یەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ سێ شت:

١- زیندوو بوونەوە و بەڵگە هێنانەوە لەسەری.

٢- حەج و ماڵی خوا لە مەککە.

٣- چەند یاساو کاروبارێکی تر کە پەیوەندی بە گشتی یەوە هەیە.

لەیەکەم جارەوە بانگ ئەکاتە تیرەی ئادەمی و ئەیانترسێنێ لە تۆڵە سزای خوا، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ﴾ ئەی ئادەمی بترسن و خۆتان بپارێزن لە تۆڵە و سزای پەروەردگارتان، بە گوێ رایەڵی فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوە لەو شتانەی کە قەدەغەی کردوون. بێگومان تەنها خوا شایانە کە ترس و بیمی لێ بکرێت و خۆپارێزی بکرێت لەهەر شتێ کە هۆی قارو خەشمی ئەوە، تەنانەت با بەهەشت و دۆزەخیشی دروست نەکردایە و سزای کەسی نەدایە، کەواتە کاتێ کە خاوەنی سزای بە سۆ و تۆڵەی سەختیشە ئەبێ زیاتر ترس و بیمی لێ بکرێ و خۆپارێزی لێ بکرێت، جا لەبەر ئەوە بەسەرهاتێکی یەکجار سامناك ئەکات بەهۆی ئەم فەرمانە کە دای، بەسەرهاتێك کە سزایەکی بەهێز ئەهێنێ بۆ سەر ئەم جیهان و بوونەوەرە، قاپی کردنەوەیە لە سزاو تۆڵە سەختەکانی رۆژی دوایی،

إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ
وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ
ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ﴾ بترسن و خۆتان بپارێزن،چونکە بەڕاستی بومەلەرزەی هاتنی رۆژی دوایی شتێکی زۆر گەورەیە، واتە: ئەی ئادەمی ئێوە بەسەرهاتی وا سەخت و رۆژی وا سامناك لە پێش دەمتانەوەیە، بۆ ئەو رۆژەیش تەنها لە خوا ترسان و خۆپارێزیی ئەمڕۆی ئەم جیهانە کەڵکی هەیە، کەواتە فریای خۆتان بکەون تا هەلتان لە دەست نەچووە، ئینجا بە درێژتر سامناکی ئەو رووداوە روون ئەکاتەوە بۆ ئەم مەبەستە سێ شتی زۆر گرنگ ئەمێنێ:

١- ﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ﴾ لەو رۆژەدا ئێوە ئەو بوومەلەرزەیە ئەبینن هەموو شیر دەرێ لە تاوا بێ ئاگا وبێ هۆش ئەبێت لە رۆڵە و بێچووە شیر خۆرەکەی لە کاتێك دا کە مەمکی لە دەمی دایە!

٢- ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا﴾ هەموو ئاوسێ بەر ئەخات و بەرەکەی فڕێ ئەدات.

٣- ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ﴾ خەڵك ئەبینی لە بێ هۆشی و سەر لێ شێواوی دا وەکو مەست و سەرخۆش وان ﴿وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ﴾ ئەوانە لە راستی دا سەرخۆش نین ﴿وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾ بەڵام سزای خوا زۆر بەتینە هۆش و فامی نەمێشتوون!

بەڕاستی سەرەتای ئەم سورەتە یەکجار سامناکە و دڵی بێدار ئەهێنێتە لەرزە و چرکە ئەهێنێ بە لەش دا، وەرە بیر بکەرەوە لەو رووداو و بەسەرهاتە کە ئەوەندە بەتین و بەهێز بێت دڵی دایك بپچڕێنێ لە کۆرپەی شیرە خۆرەی لە کاتێك دا کە مەمکی لە دەمی دا بێت بەو هەموو سۆز و رەحمەوە، کەچی هۆشی بەلایەوە نەمێنێ و بەر بە بەردار بخات و هۆش و فامی خاوەن هۆشان نەمێڵێ!!

وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٤﴾

**خوا خوایەکی ئەوەندە بێ باك و گەورە و خاوەن دەسەڵاتە کە بەسەرهاتی ئاوا ئەهێنێ بەسەر ئەم بوونەوەرەدا کەچی زۆر لە ئادەمی هەن بە نەفامی و نەزانی دەم درێژیی دەکەن بەرامبەر بە خوا وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ هەندێ لە ئادەمی دەمبازی و موجادەلە ئەکەن لە بارەی خواوە، ئیتر لە تاك و تەنیایی خوا، یان لە توانا و دەسەڵاتی بێ سنووری یان لە زانین و ئاگاداری بە هەموو شتێ یان لە هەرباریکی تر و هەر سیفەت و نیشانەیەکی تر لە سیفەت و نیشانەکانی خوا، ئەم دەمبازی یەش کە ئەیکەن ئەگەر لە رووی ناسین و زانین و باوەڕەوە بوایە بەهەر جا،**

**بەڵام بەو جۆرەیش نی یە، بەڵکو ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ بە بێ هیچ جۆرە زانین و ناسینێك، واتە هەر لە خۆوە بە نەفامی دەم ئەکوتێ، ئەوەش دژی ژیریی و ئادەمێتی یە، ئەو جۆرە کەسە لەبارەی خواوە بە ئارەزوو کاری دەم ئەکوتێ ﴿وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ﴾ شوێنی هەموو شەیتان و یاخی و سەرکێشێ ئەکەوێ کە لێبراوە بۆ خراپەکاری و سەرکێشی ﴿كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ﴾ کە بڕیار دراوە و نووسراوە لەسەر هەر کەسێك ئەو بە دۆست و کاربەدەستی خۆی دانێ، ﴿فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾[1] بەڕاستی ئەو یاخی یە گومڕای ئەکات و لە ڕێگای ڕاست لای ئەدات و جڵە و گیری ئەکات و رای ئەکێشێ بۆلای سزای ئاگری زۆر بەتینی هەڵگڕاوی بەتاوی دۆزەخ، خوا پەنامان بدات لێ ی. ئینجا دوو جۆر بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکرا ئەهێنێتەوە لەسەر گونجاوی و ڕێك و ڕاستی زیندوو بوونەوە لە ڕۆژی دوایی دا:**

**١- دروست کردن و گیان بەبەردا کردنی ئادەمی لە یەکەم جارەوە.**

**٢- دروست کردن و گیان بەبەردا کردنی هەموو ئەو شتانەی کە لە زەوی دا ئەڕوێن کە شتێکە وا بە پێش چاوەوە، هەموو جارێ ئەمرێ و وشك ئەبێت و دووبارە ئەکرێتەوە.**

---

[1] وشەی هیدایەت بۆ شتی خێر و چاکەیە، بەڵام لێرەدا کە لە سزاو خراپەدا بەکار هاتووە مەبەست لاقرتی پێ کردنە، ئەوەش سزادانێکی دەروونی یە.

ئەفەرمویٚ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەی ئادەمیزاد بە تێکڕایی ﴿إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ﴾ ئەگەر ئێوە لە گومان و دوو دڵی دان لەبارەی زیندوو کردنەوەی پاش مردن دەی بیر بکەنەوە و سەرنجێکی پەیدا بوونی خۆتان بدەن، تا ئەو گومان و دوو دڵی یەتان نەمێنیٚ ﴿فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ﴾ چونکە بەڕاستی ئێوە نەبوون و ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لە خاك بەهۆی دروست کردنی باوکی هەمووان کە ئادەمە و لەڕێوە لە خاك دروست کراوە، هەروەها بێجگە لە ئادەم ئیتر هەموو ئادەمی یەك لە خۆراك پەیدا ئەبێت کە خۆراکەکەش لە زەوی پەیدا ئەبێت، کەواتە بەهەر جۆر تەماشا بکرێت ئادەمی رۆڵەی ئەم زەوی یە یەو لە خاکی ئەم زەوی یە پەیدا بووە و پێك هاتووە. لەو خاکەدا ئەژی و ژیانی بەو خاکەیە، هەموو کەرەسە و بەشێکی لەش لە کەرەسە و بەشەکانی زەوی پێك هاتووە جگە لەو گیان و رۆحەی کە شتێکی نهێنی یە، خوا کردوویەتی بە بەری ئەم لەشەدا و بەهۆی ئەوەوە لە خاك جویٚ بووەتەوە. بەڵام با بیر بکەینەوە، خاك لە کویٚ و ئەم ئادەمی یە نایابە سەر سوڕهێنەرە لە کویٚ؟! ئەو خاکە نەزانە بیٚ هەستە بیٚ دەسەڵاتە لە کویٚ و ئەم ئادەمی یە ژیرە زانا توانا بەکارە خاوەن هەست و فامە لە کویٚ؟!! بەڕاستی ئەم دوو قۆناغە یەکجار دوورن لە یەکەوە و بە گوێرەی تێگەیشتنی ئێمە هیچ پەیوەندی یەکیان بە یەکەوە نی یە، بەڵام بە سووك و ئاسان و بیٚ ئەرك دەستی قودرەتی خوا ئادەمی لە قۆناغی خۆڵی یەوە ئەهێنیٚ بە چەند قۆناغێکی تردا تا ئەیگەیەنیٚ بە پلەی هەرە بەرزی و ئەیکات بەم ئادەمی یە!! وەکو ئەفەرمویٚ: ﴿ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ﴾ پاش ئەمەی دروستمان کردن لە خاك ئینجا دروستمان کردن لە(نطفة) واتە: ئەو دڵۆپە ئاوە قیزەونە کە هەموومان ئەیناسین. پێویستە بیر بکەینەوە لە دووری نێوان ئەم دوو قۆناغە لەم قۆناغەی کە ئادەمی پیاو ئەڕوات، چونکە بەو بیر کردنەوە گومان و دوو دڵی نامێنیٚ لە راستی و گونجاوی زیندوو کردنەوەدا، مەگەر بۆ کەسی یەکجار سادە و تیٚ نەگەیشتوو بێت و ژیریی یەکەی نابینا بێت، ئەوەش مەگەر تەنها خوا

چارەسەری بکات ئەگەر بیەوێ، چارەسەری لای هیچ پزیشکێك نی یە. با بیر بکەینەوە لە گۆڕانی ئەو خاکە سادە بێ گیانە بەو ئاوە، کە لە چەندەها سێڵ و خانەی زیندوو پێك دێت کە ئەو رۆحەیان تیادا پەیدا ئەبێت کە ▪ ئێستا کەس هیچی لێ نازانێ و بێ ئاگایە کەچی یە و چۆنە و چۆن پەیدا ئەبێت و لەچی پەیدا ئەبێت؟ بەڕاستی ئەو گۆڕانە زۆر سەر سوڕهێنەرە!

ئینجا با بێینە سەر قۆناغی سێ یەم، کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾ لە پاش ئەو ئاوە دروستمان کردوون لە خوێن پارە. با بزانین ئەو(نطفة) و ئاوە چی یە و چۆن ئەگۆڕێ بە خوێن پارە؟ بێگومان ئەو دڵۆپە ئاوە هینی پیاوە و تەنیا نوختەیەك لەو ئاوە هەزاران گیانلەبەری تۆوی(حیوان منوی) تیایە و تەنیا گیان لەبەرێك لەوانە پێوەن ئەبێت لە گەرایەك(بویضة) لە گەراکانی ئاوی ئافرەت، ئەم دووانە جووت ئەگرن و ئەنووسێن بە دیواری منداڵدانەوە و زامداری ئەکەن و خوێنی لێ ئەمژن هەتا پەرە ئەسێنن و ئەبن بە پارچە خوێنێکی خەستی وەکو جگەر، سەیر تر لە هەموو شت ئەمەیە کە ئەو تەنیا نوختەیە کە پێك دێت لە گیان لەبەرێکی تۆوی پیاو و تەنیا گەرایەکی ئافرەت نووساوە بە دیواری منداڵدانەوە، لەو تەنیا نوختەدا ئادەمی یەکی تێرو تەواو بە هەموو ئەندام و بەش و کەرەسە و سیفەتیانەوە جێ کراوەتەوە و داشاردراوە، ئیتر چ سیفەت و نیشانەیەکی لەشی وەکو کورتی و درێژیی و قەڵەویی و جوانی و ناشیرینی و تەندروستی و نەخۆشی و... هتد، چ سیفەت و نیشانەیەکی دەماری و ژیریی وەکو زیرەکی و کەودەنی و چالاکی و ترسنۆکی و بەکاری و بێ کارەیی... هتد.

دەی ئایا شتی وا بەدڵی کێدا گوزەر ئەکات؟ کێ باوەڕ ئەکات کە ئەو هەموو شتە لەو تەنیا نوختەدا کۆکراوەتەوە و جێگای بووەتەوە؟ ئایا کێ بەدڵی دا دێت کە ئەو تەنیا نوختەیە ئەو ئادەمی یەی لێ دەرئەچێت کە هەموو ژیریی یەك تیای دا سەرسامە و ئەو ئادەمی یەی کە بە درێژایی تەمەنی لە هیچ چەرخ و وڵاتێك دا رێك نەکەوتووە هیچ دوو کەسێك وەکو یەك دەرچن، تەنانەت با دووانەش بن و لە یەك باوك و دایك بن!!

ئینجا قۆناغی چوارەم ئەخاتە پێش چاو ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ﴾ لەپاش خوێن پارە ئینجا دروستمان کردوون لە گۆشت پارە بە ئەندازەی ئەوەی کە لە دەم دا ئەجورێت، ئەم گۆشت پارەیە خۆی لە خۆی دا هیچ نیشانە و شێوەیەکی ئادەمی پێوە نی یە، بەڵام ئەکرێ بە دوو جۆرەوە:

١- ﴿مُّخَلَّقَةٍ﴾ شکڵ و شێوە کێشراوە و ئەکرێ بە قەبارە و هەیکەلی ئێسکی و ئینجا گۆشتی بەسەردا ئەهێنرێ.

٢- ﴿وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾ شکڵ و شێوە نەکێشراوە و منداڵ فڕێی ئەدات کاتێ بڕیار نەدرابێ رێك و پێك و تەواو کرێ. بێگومان بۆ خوا ئاسانە و هیچی تێ نەئەچوو لە رێوە یەکسەر ئادەمی دروست بکردایە بە بڕینی ئەم قۆناغانە و گۆڕانی لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر بەرە بەرە، بەڵام بەم جۆرەی ئێستا بەڵگە و نیشانە روونەکانی توانین و زانین و کار دروستی خوا ئاشکرا ترە بۆ بەندەکانی، وەکو ئەفەرموێ: ﴿لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾ ئێوەمان دروست کرد لەسەر ئەو بارو شێوەیە کە باس کرا، تاکو روونی بکەینەوە بۆ ئێوە ئەم شتانەی کە زۆر گرنگن، روونی بکەینەوە بۆتان توانین و لێزانین و بەجێ یی و کاردروستیمان و روونی بکەینەوە کە هەر شتێ جارێ دەست بدات بۆ گۆڕان و نەمان و فەراهەم هێنانەوە جارێ تریش دەست ئەدات، ئەو کەسەی لە یەکەم جارەوە ئەو گۆڕین و فەراهەم هێنانە ئەکات توانایە جارێکی تریش بیکات، کەواتە دووبارە کردنەوەی ئادەمی و زیندوو کردنەوەی شتێکی گونجاوی ئاسانە، بە گوێرەی باوی ئێمە دووبارە کردنەوەی ئاسانترە تا فەراهەم هێنانی یەکەم جار. بەڵام بۆ خوا ئەوە ناوترێ، چونکە هەموو شت بۆ خوا وەك یەك ئاسانە. ئینجا دێتە سەر بار و حاڵی بێچووەکان کە لە سکی دایکیان دان.

وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْ وَمِنكُم
مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا وَتَرَى
ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٥﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ ئەو بێچوانەی بمێنن و لەبار نەچن ئەیان هێڵینەوە لە منداڵدانەکان دا تا کات و ماوەیەکی دیاریی کراو پێش لەدایك بوونیان، کە لای خوارووی شەش مانگە و لای ژووروی چوار ساڵە یان دوو ساڵە ﴿ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا﴾ پاش کۆتایی هاتنی ئەو ماوەیە دەرتان ئەهێنین لە سکی دایکتان بە ساوایی، ئەوەیش بار و قۆناغی پێنجەمی ئادەمی یە. پاکی و بێگەردی بۆ خوای بێ وێنە: ئەو نوختە ئاوە کە بە چاوی روون نابینرێ لەو شوێنە تەنگ و تاریکەدا ئەیژیەنێ و ئەو هەموو بار و گۆڕانەی بەسەر ئەهێنێ لەماوەی چەند مانگێك دا و ئەیکات بەو منداڵە بەو هەموو کەرەسە و کۆئەندام و هێز و وزەوە لە پاشان ئەو ئادەمی یە نایابەی لێ دەرئەچێ!! ئەو ساوایە کە لە تاریکی هاتە دەرەوە بۆ ئەم جیهانە رووناکە و رووناکی بینی، پاش ئەوە یان بە منداڵی ئەمرێت، یان ئەمێنێ هەتا گەورە ئەبێت و ئەبێتە خاوەنی هێزو بازووی خۆی، ئینجا لەو کاتەدا ئەمرێ، یان ئەمێنێ بۆ دواتر تا ئەگاتە پیری و پەك کەوتوویی و هەندێ ئەگاتە رادەیەك هۆش و گۆشی نامێنێ و وەکو منداڵی لێ دێتەوە، ئەم چەند بارو گۆڕانەیش بەسەر منداڵ دا دێت پاش لە دایك بوونی، ئەم بار و گۆڕانەش بەڵگەیەکی روون و شایەتێکی راستن لەسەر توانین و زانین و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا و هۆی باوەڕ هێنانە بە زیندوو بوونەوە ئەوا باسی ئەم بارو حاڵانەیش ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْ﴾ لەسکی دایکتان دەرتان ئەهێنێ بۆ ئەمەی بەرە بەرە گەورە بن تا لە پاشان ئەگەنە تەواوی هێزو وزە و ژیرییتان، ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ﴾ هەندێکتان ئەمرێنرێت و ئیتر پێش گەیشتنی بەم پلەی تەواوی یە، یان پاش گەیشتن ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ﴾ هینی واتان هەیە تەمەنیان درێژ ئەکرێ تا ئەگەیەنرێن بۆ پەست ترین و بێ کەڵك ترین تەمەن کە کاتی پەك کەوتەیی و گۆڕانی زانین و هۆش و فامە، ﴿لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا﴾ بۆ ئەمەی هۆش و فامی نەمێنێ و لەپاش زانینی کە بوویەتی هیچ شتێ نەزانێ، واتە تا ئەگەڕێتەوە بۆ رادەی ساوایی. ئەوانەی کە**

ئەمرن زۆر جێگای بیر کردنەوە نین، چونکە پاش مردن پاشە ڕۆژی هەموو زیندوویەکە لەم جیهانەدا، بەلاّم ئەوانەی کە ئەمێننەوە و ئەو گۆڕانەیان بەسەردا دێت بەڕاستی زۆر جێگای بیر لیّ کردنەوەن، بەڕاستی ئەم گۆڕانانەی پاش لەدایك بوون بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکران لەسەر زیندوو بوونەوە بە وێنەی گۆڕانەکانی پێش لەدایك بوون، وەرە بیر بکەرەوە منداڵێکی ساوای نەفامی بیّ هێز و دەسەلاّت بگۆڕیّ بەو پیاوە خاوەن هێزو بازوو دانا و زانایە، ئینجا بگەڕێتەوە بۆ حاڵی منداڵی و ساوایی، بێگومان هەرکەس عەقڵی لەکاردا بێت تیّ ئەگات ئەو کەسەی توانای ئەم گۆڕاندنەی هەبێت، توانای زیندوو کردنەوەی مردوویشی هەیە. لێرەدا بەڵگەو نیشانەی جۆری یەکەم دوایی ئەهێنیّ و دێتە سەر جۆری دووەم کە بریتی یە لە دروست کردنی گیان بەبەردا کردنی ئەو شتانەی کە لە زەوی ئەڕوێن، ئەفەرمویّ: ﴿وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً﴾ ئەبینی زەوی وشك و برینە و هیچ نیشانەی گیا و کشتوکاڵی پێوە دەرناکەوێت ﴿فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ﴾ ئینجا کاتێك بارانمان بەسەردا باراند ئەکەوێتە بزووتنەوە و لەرزە بەهۆی ئەو شتانەوە کە لیّ ی ئەڕوێن ﴿وَرَبَتْ﴾ ئە ئاوسیّ ﴿وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾ لە هەمووجۆرێکی جوان و شیرین ئەڕوێنیّ. بەڕاستی شتەکە یەکجار نایاب و سەر سوڕهێنەرە، بەلاّم بەهۆی دەق پێوە گرتنەوە فەرامۆش ئەکریّ و بیری لیّ ناکرێتەوە. زۆر شتێکی سەیرە بە چاوی خۆمان ئەیبینین کە لەو خاکە مردووە ئەو هەموو گیاو سەوزە و کشتوکالّ و درەختانە ئەڕوێن و دێنە دەرەوە، بەردار و بیّ بەر، هەر جۆرێك شێوە و شکڵێکی هەیە و هەر یەکە بۆن و رەنگێکی تایبەتی هەیە، لەم خاکە مردووە بە پێش چاومانەوە ئەو هەموو شتە زیندووە فەراهەم دێت، دەی ئەمە چ جیاوازی یەکی هەیە لە روان وسەوز بوونەوەی مردووەکان و دەرپەڕینیان لەگۆڕەکانیان، بەڕاستی بەڵگەو نیشانەیەکی زۆر بەهێزە لەسەر راستی و گونجاوی زیندوو بوونەوە بۆ هەر کەسێك هێزی ژیریی نەکوژابێتەوە. خوای گەورە لەم ئایەتەدا شتێکی زۆر گرنگی پیشان داین بە چەند چەرخێك پێش ئەمەی ئادەمی ریّی پیّ ببات بەهۆی زانیاری تازەوە، ئەویش بێگومان بێگانەکان بەهۆی قورئانەوە پیّیان زانی، ئەو شتە نایابەش بریتی یە لە بزووتنەوە و بە لەرزە کەوتنی زەوی، کە شتێکە بە چاوی رووت نابینریّ!! پاکی و بێگەردی لە هەموو لەکەیەك بۆ خوای بیّ وێنەیە.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا
وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا
كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٩﴾

---

پاش هێنان و پیشاندانی ئەو دوو بەڵگەو نیشانە روونە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی کە باس کرا بۆتان لەبارەی دروست کردنتان و هێنانتان بەو هەموو تەور و بارە جیاوازە کە بە دیمەن دوورن لە یەکترەوە، هەروەها ئاگادار کردنەوەتان بە گۆڕان و بەسەرهاتی زەوی یە وشکە مردووەکان، ئەوانە هەموو ﴿بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە کە خوایەك کە ناوی ﴿الله﴾ یە راستە و هەیە و بوونی راستەقینە تەنیا بۆ ئەو هەیە، بوونی ئەو لە خۆیەوەیە و دەست نادات بۆ نەمان، بێجگە لەو هەرچی بووە و هەموو لەمەوپاش ئەبێت ئەوانە هەموو بوون و مانەوەیان و راگیر بوونیان بەو تەنیا خوایەیە و لەوەوە پەیدا بووە، واتە ئەگەر خوایەکی وا نەبوایە ئادەمی چۆن لە خاك پەیدا ئەبوو؟ چۆن ئەو هەموو قۆناغانەی ئەبڕی و ئەو هەموو گۆڕانەی بەسەردا ئەهات؟ هەروەها گیا و کشتوکاڵەکەیش.. هەرکەس بێ بەش نەبێت لە ژیریی و تێگەیشتن ناچارە ئەبێ باوەڕی وای هەبێ، ئایا ئادەمی خۆی خۆی دروست ئەکات؟ ئایا بە رێکەوت ئەو شتە نایابە دروست بووە؟ ئایا لە خۆیەوە گۆڕاوە و ئەو قۆناغانەی بڕیوە؟ بێگومان هەرکەس رێزی خۆی بەلاوە بێت هیچ لەم بارانە ناڵێت و شەرمەزار ئەبێت لە وتن و بیستنی شتی وا، کەواتە تەنیا بارێکی تر هەیە و ئەبێ هەر ئەوە بوترێ، کە خوا لە خۆڵ ئەم ئادەمی یەی دروست کردووە. ﴿وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ ئەوانەی هەمووی بە هۆی ئەوەوەیە کە خوا مردووەکان زیندوو ئەکاتەوە و دەسەڵاتی بەسەر ئەوەدا هەیە، واتە ئەگەر خوا توانای نەبوایە بەسەر زیندوو کردنەوەی مردوودا هەرگیز نەی ئەتوانی لە

خۆڵی مردوو ئادەمی زیندوو فەراهەم بێنێ، لەخۆڵی مردوو ئەو هەموو گژ و گیا و درەخت و کشتوکاڵەی بۆ فەراهەم نەئەهات، ﴿وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ﴾ بەهۆی ئەوەیە کە خوا توانا و دەسەلاّت دارە بەسەر هەموو شتێك دا، ﴿وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا﴾ بەهۆی ئەوەیە کە ڕۆژی دوایی دێت و شایانی ئەوە نی یە گومان و دوو دڵی هەبێ تیای دا، چونکە خوا بەڵێنی پێداوە، هەرچی خوا بەڵێنی پێ بدات ئەبێ بەدی بێت، نەهاتنی ئەو ڕۆژە پێچەوانەی دادو لێزانین و کار دروستی خوایە، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾ خوا مردووەکانی ناو گۆڕەکان زیندوو ئەکاتەوە، تا هەموو کەس بگات بە پاداشت، یان بە سزای خۆی، کەواتە زیندوو کردنەوەی مردووان کارێکە داد و حیکمەتی خوا پێویستی ئەکات و ئەبێ هەر ببێ. واتە ئەو هەموو بار و تەورە کە بەسەر ئادەمی دا تێپەڕ ئەکات پێش لەدایك بوون و پاش لەدایك بوون، ئەوانە هەموو بەڵگەو نیشانەن کە ئادەمی بۆ ئەوە دروست کراوە بگات بە رادە و پلەی هەرە بەرزی، ئەوەیش لەم جیهانەدا ناگونجێ، چونکە ئەوەتا پاش پیر بوون بەرە و دوا ئەگەڕێتەوە و تا بێت کەم و کوڕی ڕووی تێ ئەکات، کەواتە هاتنی جیهانێ تر پێویستە تا رادەو پلەی هەرە بەرزی ئادەمی تیا بەدی بێت. کەواتە ئەو بار و تەورانە لە دوو لاوە بەڵگە و نیشانەن لەسەر زیندوو بوونەوە، یەکەم: کەسێك توانای فەراهەم هێنانی ئادەمی هەبێت لە خۆڵ توانای دووبارە کردنەوەیشی هەیە پاش ئەوەی بووەوە بە خۆڵ. دووەم: لەم ڕووەوە کە پێویستە ژیان و جیهانێکی تر هەبێت تا پلەی هەرە بەرزی ئادەمێتی تیای دا بەدی بێت. لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە زۆر و ڕوونانەدا هێشتا تاقمێك ئادەمی هەن کە گومڕا و سەر لێ تێك چوون، دەربارەی خوا دەمبازی ئەکەن، بە خۆیانەوە ناوەستن ئەیانەوێ خەڵکی تریش لە ڕێگە بترازێنن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾ لەناو ئادەمی دا هەندێ کەس دەمبازی ئەکات لەبارەی خواوە بە بێ زانینێکی سروشتی کە بۆ مەردوم پەیدا ئەبێت بە ناچاری و بە بێ پێویست کردن و بە تێڕوانین و بیر کردنەوە ﴿وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ﴾ بە بێ زانینێك کە لە ئەنجامی سروشتی خواو کتێبی خواوە کە ڕووناك کەرەوەی

دەروونە پەیدا ئەبێ، واتە لە پاش ئەمەی کە خوا ئەو بەڵگە و نیشانە و رابەرە روونانەی داناوە لەسەر خوایەتی خۆی ئیتر هەر دەمبازی و موجادەلەیەك بکرێ لەبارەی خواوە یەکجار بێ جێ و ناڕەوایە، بە تایبەتی کاتێ دەمبازی کەر، بێ بەش بێت لە هەموو جۆرەکانی زانین بەرامبەر ئەو شتەی کە دەمبازی یەکەی تیادا ئەکات، بەڕاستی ئەوپەڕی نەفامی و تێ نەگەیشتنە و هیچ هۆیەکی نی یە جگە لە لوت بەرزی و خۆ بە زل زانی، وەکو لەم فەرمودەیشەوە دەرئەکەوێت: ﴿ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ﴾ دەمبازی ئەکات بە دەمار و کەشخە و لوت بەرزی یەوە و خۆی بەزل ئەزانێ، کەواتە روو وەر ئەگێڕێ لە ئامۆژگاری و حەق وەرناگرێ، لەبەر ئەوە باوەڕی پێ ی نی یە و بە بێ نرخی دائەنێ. مەبەستی ئەو دەمبازی کەرەش ئەمەیە: ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بۆ ئەمەی خەڵکی گومڕا بکات و لایان بدات لە ڕێگای خوا، واتە تەنیا بە گومڕایی خۆی واز نامێنێ، بەڵکو ئەیەوێت خەڵکیش گومڕا بکات. ئەم گومڕای گومڕا کەرە پەیڕەوی شەیتانی کردووە و پیشەی ئەوی گرتووە، کەواتە لە دوو بارەوە تاوانبارە و پێویستە بدرێ لە دەماخی و هەر لەم جیهانەدا بشکێنرێ. جگە لە سزای ئەو جیهانیش، لەبەر ئەوەی خوای گەورەیش بەو جۆرەی لەگەڵ ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ﴾ بۆ ئەو دەمبازی کەرە هەیە لەم دنیادا ریسوایی و سەرشۆڕی. ئەم ریسوایی و سەرشۆڕی یە بەرامبەر دەمار و لوت بەرزی یەکەی، چونکە خوا بەسەر ئەو جۆرە کەسانەدا نابورێ، ئەبێ سەرشۆڕیان بکات هەرچەندە ماوە و مۆڵەتیان بدات، هەندێ جار مۆڵەتیان ئەدات تا سەرشۆڕی و ریسوایی یەکەیان گەورەتر و قورستر بێت، لەم جیهانەدا ئەوەیان بەسەر دێنێ، لەو جیهانیش بەم جۆرەیان لێ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ ئەیچێژین پێ ی لە ڕۆژی دوایی دا سزایەکی زۆر بەهێز لە سووتان دا، خوا پەنامان بدات. ئینجا باری فەرمایشتەکە ئەگۆڕێ بۆ قسەی روو بە روو، رووی فەرمودەکە ئەکاتە ئەو تاوانبارە بە جۆرێك وەکو ئێستا ڕۆژی دوایی بێت، ئەویش لەناو ئاگردا بسووتێ و ئەمیش تەشەری لێ ئەدا،

ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٠﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ

---

**ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ﴾ ئەو سزا سوتێنەرەت بەهۆی کوفرو تاوانێکەوەیە کە پێشت خست لەدنیادا، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە خوا زاڵم و ستەمکار نی یە بە بەندەکانی، واتە بە خۆڕایی و بە بێ هۆ سزایان نادات، بەڵکو سزایان بە گوێرەی کردەوەیانە. لە پێشەوە دوو نموونەی لە ئادەمی باس کرد: یەکەم: گومڕای نەفامی شوێن کەوتوو، دووەم: گومڕای سەرکێشی مل هوڕی گومڕا کەر، ئینجا دێتە سەر باسی نموونەیەکی تر کە لە هەموو چەرخ و چینێك دا هەیە، ئەوەش کەسێکە تەماشای عەقیدەو باوەڕ ئەکات بە وێنەی شت و مەکی بازرگانی فرۆش و کڕین ئەگەر قازانجی تێدا بینی، لەسەری ئەڕوا بە خۆشی یەوە ئەچێ بە دەمی یەوە، ئەگەر نا دوور ئەکەوێتەوە لێ ی و نایەوێ، ئەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ﴾ هەندێ لە ئادەمی خوا ئەپەرستێ بە بێ ئارام وبە دوو دڵی و لە کەنارەوە ئەوەستێ، بە وێنەی کەسێك لە کەناری لەشکرێکەوە ئەوەستێ، ئەگەر هەستی بە سەرکەوتنی لەشکرەکە کرد ئەوا باشە و ئەمێنێتەوە ئەگەر نا رائەکات و خۆی ئەشارێتەوە یان خواپەرستی ئەکات و دامەزراو نی یە بە وێنەی کەسێ لەسەر قەراغی لوتکەی شاخێکەوە بێت دامەزراو نی یە و هەموو کات ئامادەیە بۆ کەوتن، بە هەر جۆر بێ مەبەستەکە روون ئەکاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ﴾ ئەو کەسەی لە کەنارەوە ئەوەستێ و نایەتە ناو جەرگەی ئایینەکەوە، ئەو کەسە ئەگەر خێرو سوودی دنیایی دەست کەوت بوو ئەوە دڵ ئارام ئەبێ پێ ی و ئەڵێ: ئایینی خوا چاکە، ﴿وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ﴾ ئەگەر بەسەرهاتی خراپی دووچار بوو بەسەر روودا هەڵئەگەڕێتەوە**

واته لەو ئایینە پەشیمان ئەبێتەوە و ئەگەڕێتەوە بۆ کوفر. ئەگێڕنەوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی هەندێ عەرەبی کۆچەری هاتووەتە خوارەوە کە هاتن لە مەدینە جێگیر بوون، جا هەرکامیان ساغ و تەندروست بوایە، ماینەکەی بزایە، جوانووی چاکی بهێنایە، ژنەکەی کوڕی ڕێك و پێکی ببوایە، ماڵ وماڵاتی زۆر بوایە، دڵ ئارام ئەبوو و ئەیوت: لەو کاتەوە هاتوومەتە سەر ئەم ئایینە جگە لە چاکە هیچم دووچار نەبووە بەڵام ئەگەر یەکێکی تریان بە پێچەوانەی ئەو بوایە ئەیوت: لەو کاتەوە ئەم ئایینەم وەرگرتووە جگە لە خراپە هیچم دووچار نەبووە، لەبەر ئەوە ئەگەڕایەوە بۆ کوفرو ئەچووەوە دۆزەخی جارانی. بێگومان عەقیدە و باوەڕ ئەبێ یەکەم شتی دامەزراو و نەگۆڕاو بێت لە ژیان دا، ئەگەر هەموو جیهان تێك بچێ ئەو خاوەن باوەڕە دڵ ئارام بێت و گومانی بۆ پەیدا نەبێت، ئەگەر هەموو هێزێکی سەر زەوی - ڕاکێشەر بێت یان پاڵ پێوە نەر - چوار دەوری بدات ئەبێ لانەدات و ڕانەکێشرێ بۆ هیچ لایەك و ئەگەر هیچ پاڵپشت و یارمەتی دەری نەبێت لەم جیهانەدا ئەبێ گوێی لێ نەبێ و تەنها پشت بەڕاستی عەقیدە و باوەڕەکەی ببەستێ. عەقیدەو باوەڕی ڕاستەقینە ئەبێ وابێت، سوود و نرخیشی ئەوەیە لە ژیان دا کە خاوەن و هەڵگرەکەی ئەکات بە مرۆڤێکی نموونەیی هەڵکەوتوو، خاوەن عەقیدەی ڕاستەقینە بەو جۆرە هەڵکەوتووە و بەشدارە لە پیت و فەڕی هەردوو جیهان دا، بەڵام ئەو تاقمەی کە لەم ئایەتەدا باسی ئەکەین، ئەگەر خوا بۆی ڕێك خست هەر بە خۆشی و کامەرانی یەوە مایەوە ئەوە چاکە و هەرچەندە عەقیدە و باوەڕەکەی بەهێز نی یە و مانەوەی بەهۆی ئەو خۆشی و کامەرانی یەیە کە لەسەریەتی، بەڵام ئەگەر خوا بۆی نەکرد و دووچاری سزا و نارەحەتی بوو، بەهۆی ئەوەوە هەڵگەڕایەوە،

ئەوە بەش و دەستکەوتی هەردوو جیهانی ئەمەیە ﴿خَيۡرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَ﴾ زیانی ئەم جیهان و رۆژی دواییشی کردووە و هەردووکیانی لە دەست چووە، ئەم جیهانی لەکیس چوو بەهۆی ئەو بەلاّ و بەسەرهاتەوە کە دووچاری بوو، خۆگر و خاوەن سەبر نەبوو، نەگەڕایەوە بۆلای خوا تا ئارامی و دڵخۆشی بخاتە دەروونی، بەڵکو بە ژان و داخەوە تلایەوە تا مرد، رۆژی دواییشی لە کیس چوو، چونکە لە عەقیدەو باوەڕەکەی هەڵگەڕایەوە. بێگومان حیسابی قازانج و زیان شایانە بۆ بازرگانی و مامەڵەی ئەم جیهانە بۆ ئەمەی بیکات یان نەء؟ لەسەری بڕوا یان نەء؟ بەلاّم شایانی عەقیدە و باوەڕ نی یە، چونکە عەقیدەو باوەڕ شتێکی راستە و لەخۆی دا بە نرخە و هەر تەنها خۆی ئەگیرێتە گەردن، چونکە پیت و فەڕی هەردوو جیهانی تیایە، بۆ ئەم جیهانە هەر هیچ نەبێ دڵ و دەروون پڕ ئەکات لە ئارامی و دامەزراوی و ئاسوودەیی و رەزامەندی کە خۆشی راستەقینە ئەوەیە، هەرچی نازو نیعمەت و خۆشی تر هەیە بێ ئەوە هیچ نرخی نی یە، بۆ ئەو جیهانیش ئاشکرایە کە هۆی گەیشتنە بە پۆپەی هەرە بەرزی ئامانج و ئاوات و ناز و رێزی نەبڕاوەی بەهەشت، کەواتە عەقیدەو باوەڕی راست گەورەترین بەهرەو بەخششە لەلایەن خواوە. ئیمانداری راستەقینە خوای خۆی ئەپەرستێ زۆر بە شەرم و سوپاسەوە لەبەر ئەوە خوا بەزەیی پیا هاتووەتەوە و رێنمونی کردووە بۆلای خۆی، دڵ ئارامی کردووە بە یادی خۆی، جا ئیتر جگە لەو بەهرە گەورەیە هەر شتێکی تری بداتێ ئەوە ئەوپەڕی لوتف و بەزەیی یە. ئیمانداری راستەقینە خۆی تاقی ناکاتەوە، چونکە هەر لە سەرەتاوە رازی یە بە هەموو شتێکی و ئامادەیە بۆ ئەمەی شان بداتە ژێر هەموو بارو بڕیارێکی، مل کەچە بۆ هەر شتێك بیدات بەسەری دا، ئیمان و پەیمانێك کە ئەیدات بە خوای خۆی نایکات بە وێنەی مامەڵە و کڕین و فرۆشتن، ئەگەر سوود و قازانجی دنیایی تیادا بوو ئەوە چاکە ئەگەر نا پەشیمان بێتەوە لێ ی، بەڵکو ئەزانێ ئیمان و پەیمانەکەی بریتی یە لە مل کەچی بەندە بۆ پەروەردگاری خۆی کە خاوەنی هەموو کارو فرمانێتی و سەرچاوەی بوونی هەموو ناز و نیعمەتی یەتی، ئەو کەسە یاخی ئەبێت و پاشگەز ئەبێتەوە لە بەندەیی کاتێ کە دووچاری سزاو ئازارو بەسەرهاتی خراپ دێت ئەو کەسە خەسارەت مەند و رەنجەڕۆیە، خەسارەت مەندی یەکەی زۆر روون و ئاشکرایە، چونکە بەجارێ هەردوو جیهانی لەکیس چووە،

ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ذَٰلِكَ هُوَ
ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدْعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ﴿١٣﴾
إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ

---

لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ﴾ تەنیا ئەوەیە خەسارەت مەندی روون و ئاشكرا، چونكە زیانەكە لە هەموو بابەت و لە هەموو روویەكەوەیە، زیانی دڵ تەنگی و دڵ رەشی و بێ ئارامی لەگەڵ زیانی سامان و دارایی و تەندروستی یان هەر شتێكی تری ئەم جیهانە لەگەڵ لە دەست چوونی رۆژی دوایی و هەموو ناز و رێز و خۆشی یەكی بێجگە لە دەست چوونی رۆژی دوایی و هەموو ناز و رێز و خۆشی یەكی بێجگە لە زیانی هەرە گەورە كە هیچ زیانێ تر هاوتای ناكات، ئەوەش بریتی یە لە زیانی لەدەست چوونی نزیكی لە خوا و رەزامەندی خوا و بێ بەش بوون لە بەزەیی بێ سنووری و كەوتنە ناو بەد بەختی و خەشم و غەزەبی نەبڕاوەی. ئینجا زیاتر گەورەیی ئەو زیانە روون ئەكاتەوە بەمەی كە لە پەرستنی خوا دوور ئەكەوێتەوە و تێپەڕ ئەكات، ئایا روو ئەكاتە كوێ؟ بۆلای كێ ئەڕوات؟ كێ ئەپەرستێ؟ ئەفەرموێ: ﴿يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ﴾ ئەو هەڵگەڕاوە لە خواپەرستی كاتێ كە پشت لە خوا ئەكات شتێ ئەپەرستێ و نزا و هاوار لە شتێ ئەكات كە هیچ زیانێكی پێ ناگەیەنێ ئەگەر ئەو هاوار و پەرستنە نەكات، هیچ سوودی پێ ناگەیەنێ ئەگەر بیكات، چونكە ئەو پەرستراوانە ئەگەر لە جۆری دارو بەرد و بێ گیانن ئەوە ئاشكرایە، ئەگەر لە جۆری مەلائیكە و جین و گیان لەبەرانن ئیتر ئادەمی بێت یان نەء، ئەمانیش هەروا، چونكە سوود و زیانی خۆیشیان بە دەست نی یە، چ جای خەڵكی تر، بەڵكو تەنیا بە دەست خوایە، بەڕاستی ئەو هەڵگەڕانەوە و ئەو پەرستنی ناڕەوایە، هەر ئەمەی شایانە كە قورئان ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ﴾ تەنیا ئەوە گومڕایی زۆر دوور لە مەبەست و لە ئامانج، بە وێنەی كەسێك لە چۆڵ و بیابانێك دا ون بووبێت و چاوەڕوانی رێگا دەركردن نامێنێ بۆی، بت پەرستەكان هیوایان وابوو كە ئەو بتانە نزیكیان ئەكەنەوە لە خواوە و تكایان بۆ ئەكەن لای، جا لە پێشەوە تەشەری دا بەمەی كە ئەم كابرای هەڵگەڕاوە شتێ ئەپەرستێ سوود و زیانی نی یە بۆی، ئینجا وا لێرەدا ئەدا لەو هیوا و ئومێدەیش و پلەیەتر بەرز

ئەبێتەوە لە تەشەردان دا، ئەفەرموێ: ﴿يَدْعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ﴾ كەسێك ئەپەرستێ و هاواری لێ ئەكات كە بەهۆی ئەو پەرستنەوە زیان گەیاندنی نزیك ترە بۆی تا سوود و قازانج، كەواتە پەرستنی شتی وا ئەوپەڕی نەفامی یە، بێگومان پەرستنی شتی وا زیانی هەرە گەورەیە بۆی لە هەردوو جیهان دا، بە هیچ كلۆجێك سوود و قازانجی تێدا نی یە، بەلاّم قورئان حەكیمە و زۆر جار ئەوپەڕی شێوەی شیرین و نەرم و ناسك بەكار ئەهێنێ لە تەمێ كردن و رێنموونی دا، بۆ ئەوەی هەركەسێك بەتەواوی دڵ مردوو نەبێت و دەمارێكی تەڕی تیادا بێت زیندووی بكاتەوە و بیهێنێتەوە سەر رێگای راستی خۆی، جا لەبەر ئەوە بەو جۆرەی فەرمو كە فەرموی. لە رێوە نەیدا لە دەماخی و بفەرموێ پەرستنی زیانی زۆر و هیچ سوودیشی تیا نی یە، چونكە زۆر گومڕای سەركێش هەن بە توند و تیژیی و لە دەماخ دان یەكجاری ئەتارێن و لە پەت بەرەلاّ ئەبن، ئەم ئایەتە هیچ وا ناگەیەنێ كە بت زیان یان سوود ئەگەیەنێ بەخەڵكی، بەڵكو ئەوە ئەخاتە دڵەوە كە لە واقیع دا هیچیان نی یە، بەلاّم زیان گەیاندنی نزیكترە، ئەمەیش راستە، ئەوەتا پەرستنەكەی هۆی بەدبەختی یە لە هەردوو جیهان دا، كەواتە هیچ دژ و پێچەوانەی ئایەتی پێشوو نی یە كە فەرموی: نە زیان ئەگەیەنن و نە سوود، ئەم ئایەتەش نافەرموێ: زیان و سوودی هەیە، بەڵكو ئەفەرموێ: زیانی نزیكترە لە سوودی، واتە هیچیانی نی یە، بەلاّم زیانەكەی نزیكترە، دەی ئەمە چی تیایە؟ بێگومان هیچ تۆزو غوباری نی یە و هیچ پێویست نی یە بەو وەلاّمانەی كە دراونەتەوە. ئەو هەڵگەڕاوە لە رێگای خوا و خواپەرستی شتی ئاوا ئەپەرستێ كە باس كرا، كەواتە شایان ترین رستە كە بەرامبەر پەرستراوەكەی بەكار بهێنرێ ئەمەیە كە قورئان بە لاقرتی یەوە پێی ئەفەرموێ: ﴿لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ﴾ بەڕاستی ئەو پەرستراوە یارمەتی دەرێكی خراپە، چونكە هیچ دەسەلاّتێكی نی یە لە هیچ زیان و سوودێك دا، بەڕاستی هاوسەرێكی خراپە، چونكە پەرستنی ئەبێتە هۆی زیان وەكو باس كرا. ئینجا با بزانین خوا پاداشتی ئیماندارە راستەكان چۆن ئەداتەوە؟ ئەو ئیماندارانەی كە دامەزراون لەسەر بارو رێگای راستی خۆیان، لە خۆشی و ناخۆشی دا، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بەڕاستی ئەوانەی كە ئیمانی راستەقینەیان هێنا و بە گوێرەی ئیمانەكەیان كردەوە چاكەكانیان بەجێ هێناوە لەم جیهانەدا، خوا لەو جیهان دا ئەیان خاتە ناو بەهەشتانێكەوە كە رووبارەكان دێن و ئەچن لەژێر كۆشك و جێ و شوێن و درەختەكانیان،

إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى
ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ
وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ
وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ

---

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ بەڕاستی خوا هەرشتێکی بوێ ئەیکات و بەدی ئەهێنێ، کەواتە کۆمەڵی چاکان و پاکان باکیان چی یە؟ با ئەم جیهانە هینی ئەوانە بێت و لە کیسیان چووبێت و بێ بەش بووبن لێ ی. کەواتە هەر ئیمانداری دووچاری هەر سزا و ناخۆشی یەك بوو، با خۆگر و دامەزراو بێت و لەخشە نەکات و با دڵنیا بێت بە بەزەیی و یارمەتی خوا، دڵ ببەستێ بە توانای خوا بەسەر نەهێشتنی ئەو سزاو ناخۆشی یە، چاوەڕوانی پاداشتی ڕۆژی دوایی بکات بە تیمار و چارەسەری هەموو زام و دەردێکی، بەڵام هەرکەسێك ئەو باوەڕەی نی یە بە بەزەیی و یارمەتی خوا و نائومێدە لە کۆمەکی خوا لەکاتێك دا کە سزاو تەنگی زۆری پێ ئەهێنێ، هەرکەسێك ئاوایە دەی بڕوات چی ئەکات بیکات!! حەز ئەکات پەتێ بۆ خۆی هەڵخا و خۆی بخنکێنێ! تا بزانێ هیچ سوودی هەیە؟ وەکو ئەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ هەرکەسێك گومانی وابردووە و گومانی وایە کە هەرگیز خوا یارمەتی نادات لەم جیهان و ڕۆژی دوایی یەدا ﴿فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ دەی حەبلێ هەڵخا بۆ لای سەروی خۆی، یان لە سەقفی خانووەکەی، خۆی لێ هەڵواسێ، یان خۆی پێ بخنکێنێ، ﴿ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ﴾ لە پاشان با حەبلەکە بپڕێ تا بکەوێتە خوارەوە، یان هەناسەی لە خۆی بپڕێ تا ئەخنکێ، ﴿فَلۡيَنظُرۡ﴾ ئینجا لە دڵی خۆی دا تێفکرێ و بیر بکاتەوە، ﴿هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ﴾ ئایا ئەو کردەوەیەی داخی دڵی لائەبات؟ واتە نەخێر، هەرچی بکات بێ سوودە و هەرچی خوا نەیکات نابێت، با بزانێ کە هیچ ڕێگایەك نی یە بۆ خۆگرتن لە ژێر باری گرانی ژیان و بەسەرهاتی خراپ دا جگە لە ئومێد و چاوەڕوانی یارمەتی خوا، هیچ ڕێگایەك نی یە بۆ ڕزگار بوون و دەروو لێ کردنەوە جگە لە پەنا و ڕوو کردنە خوا، هیچ

ڕێگایەك نی یە بۆ زاڵ بوون بەسەر تەنگی و ناخۆشی دا جگە لە داوای کۆمەکی لە خواو بە بێ ئەم ڕێگایانە هەموو کردەوەو هەوڵ و پەلامار و جوڵانەوەیەك بێ سوودە و هیچ بەرهەمێکی نابێ، بێجگە لە زیادە دڵ تەنگی و تەنگەتاو بوون، کەواتە با کابرای لێ قەوما و ئاگای لەخۆی بێت، ئەو کون و کەلەبەرە لە خۆی نەگرێت و خۆی لەو ڕووناکی یە بێ بەش نەکات، لە نەسیمی هەناسەی خۆشی ئەم ڕێگایە خۆی نائومێد نەکات. ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ ئا بەو جۆرە ئایابە قورئانمان هێناوەتە خوارەوە بە چەند ئایەتێکی ڕوون و ڕەوان لەبارەی ڕوون کردنەوەی ڕێنموونی و گومڕایی و هەرشتێك کە پێویست بێت یان بۆ ئەمەی هەرکەسێك خوا بۆ کردوو بێت ڕێنموونی وەرگرێت، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ﴾ بەو جۆرە قورئانمان هێناوەتە خوارەوە بۆ ئەمەی خوا بەهۆی ئەم قورئانەوە ڕێنموونی هەرکەس بکات کە خوامیش و مەیلی هەیە لە ڕێنموونی کردنی، یان دامەزراوی بکات لەسەر ڕێگای ڕاستی خۆی، بێگومان هەرکەس بە حەز و ئارەزووی خۆی داوای ڕێنموونی بکات و بە دوای دا بگەڕێ خوا ڕێنموونی ئەکات، هەروەها هەرکەس بە ئارەزووی خۆی داوای گومڕایی بکات و بەدوای دا بگەڕێ خوا گومڕای ئەکات، بڕیاری خوا بە گوێرەی ویست و هەڵبژاردنی بەندەیە. لێرەدا تەنیا ڕێنموونی بە بۆنەی ئایەتە ڕوونەکانەوە کە هۆی ڕێنمونین و هەرگیز نابنە هۆی گومڕایی، ئینجا بە بۆنەی ئەم ئایەتەوە کە فەرموی: هەرکەس خوا بیەوێ و مەیلی لێ ی ببێ ڕێنموونی ئەکات، بەم بۆنەیەوە باسی شەش تاقم ئەکات کە هەر یەکەیان ئایینێکی هەیە، لەم شەشە یەکێکیان ئایینی خوایە و ئەو پێنجەکە ئایینی شەیتانن، کەواتە لەم شەشە خوا تەنیا یەکێکیانی ئەوێ، هەر ئەوەیان ڕێنموونی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بەڕاستی کەسانێ کە باوەڕیان هێنا بەوەی خوا ناردوویەتی یە خوارەوە بۆ سەر محمد(ﷺ) ﴿وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟﴾ ئەوانەی کە جوولەکەن ﴿وَٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾ ئەستێرە پەرستەکان ﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ نەسرانی یەکان کە ئێستا پێیان ئەگوترێ گاور، ﴿وَٱلْمَجُوسَ﴾ مەجوسی یەکان کە دوو خوا بڕیار ئەدەن: خوای ڕووناکی و خوای تاریکی، ﴿وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟﴾ ئەوانە کە هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوا داوە، واتە بت پەرستەکان،

إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ
يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ
وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍۚ إِنَّ
ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾

---

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ بەڕاستی ئەم شەش تاقمە لە ڕۆژی دوایی دا خوا حوکم و بڕیار ئەدات لە نێوانیان دا، جیاوازی ئەخاتە نێوانیان بە دەرخستن و سەرخستنی ئەوانەی لەسەر حەقن و ڕێگای ڕاستیان گرتووە بە سەرخستنی ئەوانەی کە لەم جیهانەدا بەتاڵ و شتی پڕو پووچ و ڕێگای چەوتیان داوەتە بەر و بێگومان لە پاداشت و چارەنووسیش دا جیایان ئەکاتەوە و هەریەکەیان پاداشتی شیاوی خۆیی پێ ئەدات ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ چونکە بێگومان خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێک دا و شایەت و چاودێرە لەسەر هەموو شتێک. کە هەندێک لەو شتانە وتار و کردار و بیر و باوەڕی بەندەکانێتی. ئینجا شتێکی ڕاستی زۆر گرنگ ئەخاتە پێش چاو کە شایانە ببێتە هۆی مل کەچی و گوێ ڕایەڵی هەموو بەندەکانی بە تێکڕایی، بەڕاستی تانەیە بەسەرچاوەی ئەوانەی مل کەچ و گوێ ڕایەڵ نین بۆ پەروەردگارێ، خۆیان ئەو شتە گرنگەیش ئەمەی کە هەرچی لەم بوونەوەرەدایە هەمووی مل کەچە و کڕنووش ئەبات بۆ خوا جگە لە کۆمەڵێ کە ئەبن بە سووتەمەنی ئاگری دۆزەخ، ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەی کەسێ کە شایانی ڕووی وتارت تێ بکرێت ئایا نەتزانیوە کە کڕنووش ئەبات بۆ خوایەک کە ناوی ﴿الله﴾ یە هەرکەسێ وا لە ئاسمانەکان و هەرکەسێ وا لە زەوی دا، ﴿وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ﴾ خۆر و مانگ ﴿وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ﴾ ئەستێرەکان و شاخ و چیاکان، ﴿وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ﴾ درەخت و گیانلەبەرەکانی تر کە لە زەوی دا ئەژین، ﴿وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ زۆر کەس لە ئادەمی وەرن با زۆر بە وردی بەچاوی دڵ سەرنج بدەین لەو هەموو دروست کراوانەی کە خوا فەراهەمی

هێنان، ئەو هەموو دروست کراوانەی جگە لە خوا کەس ژمارەیان نازانێ، هەروەها با سەرنج بدەین لە مانگ و ئەستێرەکان، ئەوانەی کە ئەیان ناسین، ئەوانەی کە نایان ناسین، هەروەها با سەرنج بدەین و ورد بینەوە لەو هەموو شاخ و چیا و دارو درەخت و گژ و گیا و کشتوکاڵە و ئەو هەموو جۆرو جانەوەر و گیان لەبەرانەی کە وان لەسەر ئەم زەوی یە پان و فراوانە، یان وان لە ناوسکی دا، وەرن با بیر بکەینەوە لەم هەمووە کە بە یەکجار رووی کردووەتە پەروەردگاری خۆی و مل کەچ و گوێ رایەڵە بۆی، تەنیا ئەو ئەپەرستن پێکەوە بە یەک تاقم و یەک کۆمەڵ جگە لە ئادەمی و جنۆکە کە ئەمان دوو تاقم و دوو بەشن، بەشێکیان ژێر و خوا بۆ کردوون، خۆیان جیا ناکەنەوە لەو کۆمەڵە بەختیارەی بوونەرەوە، ئەوی تریان نەفام و بەد بەخت و سیا چارەن، خۆیان جیا کردووەتەوە، با بە وردی بیر بکەینەوە تا گوناهو تاوانی هەرە گەورەی ئەم تاقمە سەر لێ تێك چووە روون ببێتەوە، هەتا دەرکەوێ کە بە راستی شایانی ئەمەن کە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ﴾ زۆریش هەن کڕنووش نابەن بۆ خوا و مل پێچی ئەکەن لە پەرستنی، بە هۆی ئەوەوە ماف سزایان هەیە و بڕیاری سزا لەسەریان درا و جێگیر بوو، بێگومان هەرکەسێ بەو جۆرە شایانی سزا بێت، ئەو کەسە خوا ئەیەوێ ریسواو بێ ئابڕووی بکات، ﴿وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ هەرکەسیش خوا ریسواو بێ ئابڕووی بکات بۆ ئەو کەسە نی یە هیچ رێز گیرێ، چونکە هیچ رێزێ دەست ناکەوێت لەلایەن خواوە نەبێت، هیچ گەورەیی و سەرکەوتن و زاڵ بوونێ نابێ و ناگونجێ لەخواوە نەبێ، بێگومان هەرکەسێك سەرپێچی بکات لە بەندایەتی خوایە کە هەموو شتی بەدەستە ئەبێ ئەو کەسە هەر ریسوا و سەر شۆڕ بێت، خۆ ئەگەر بە دیمەن گیفە و کاڵەیەکیشی هەبێت ئەوە هەر کرو فرێکە و ئەو کەف و کوڵە بە زویی دائەمرێتەوە، وەکو بە هەزارەها بینراوە و ئەبینرێ، ئیتر هەرچەندی پێ بچێ پاشەرۆژەکەی هەر ئەوەیە! ئینجا شێوەیەك لە شێوەکانی رۆژی دوایی نیشان ئەدات کە رێزی ئیماندار و ریسوایی کافرانی تیا روون ئەبێتەوە،

﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ
رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾
كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ
أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾

**ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ﴾ ئەم دوو تاقمە دوو کۆمەڵن دژی یەکتر ئاژاوە و بەر بەرەکانێ ئەکەن. لەبارەی پەروەردگاری خۆیانەوە ئیمانداران باوەڕیان هەیە پێی بەو ئاین و بەرنامەی کە ڕەوانەی کردووە و تێکۆشان ئەکەن بۆ چەسپاندنی ئاینەکەی، کافرانیش دژ و پێچەوانەی ئەوانیان ئەوێت، خوایش لە ڕۆژی دوایی دا جیاوازی ئەخاتە نێوانیان، بڕیاری پاشەڕۆژ و بەرهەمی ئاژاوەکەیان بەم جۆرەیە: ﴿فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ﴾ ئەوانەی لەم جیهانەدا کافر بوون و باوەڕیان نەهێنا لە ڕۆژی دوایی دا جل و پۆشاکیان بۆ ئەبڕێ لەئاگر بە ئەندازەی لەش و قەبارەیان، سەرباقی ئەوە ﴿يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ﴾ بە زۆری ئەڕژێنرێ بەسەر تەوقی سەریان دا ئاوی بە کوڵی زۆر گەرم، کە ﴿يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ﴾ ئەتوێنرێتەوە بەو ئاوە هەرچی لەناو سکیان دایە و پێستەکانیان، واتە گەرمی ئەو ئاوە لە ڕادەیەك دایە کار ئەکات لە دیوی ناو و ناوسکیان بە وێنەی دیوی دەرەوە و پێستیان، هەموو وەك یەك ئەتوێنێتەوە هەر بەوە وازیان لێ ناهێنرێ، بەڵکو ﴿وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ﴾ چەند گورز و پیك و قامچی یەکیان هەیە لە ئاسن، دیارە ئەو ئاسنەش سوور کراوەتەوە بەو ئاگری دۆزەخە، ئەوەیش بۆ لێدانیان ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ﴾ هەموو جارێ کە خەریکن و ئەیانەوێ دەرچن لەو ئاگرە، دەرچن لەو خەم و داخە بەتینەی کە وان تیای دا، ﴿أُعِيدُوا۟ فِيهَا﴾ ئەکرێنەوە بە قوت دا و بەناو ئەو ئاگرەدا ئەگێڕێنرێنەوە کە شەپۆلی بڵێسەی ئاگر لە بێخی دۆزەخەوە بەرزیان ئەکاتەوە تا**

ئەکەونە سەر بە وێنەی خنکاوێ کە شەپۆلی ئاو ئەیخاتە سەر ئاو، لەو کاتەدا ئەیانەوێ وزاق بدەن و دەرچن لێ ی، ئینجا مەلائیکە بەو گورز و پیکانە ئەدەن بە تەوقی سەریان دا و ئەیانکەنەوە بە قوت دا و بەم رستەیەش تەشەریان لێ ئەدرێ و ریسوا ئەکرێن: ﴿وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ پێیان ئەوترێ: بچەژن سزای ئاگرێ لە سووتاندن دا گەیشتووەتە ئەوپەڕی، خوا پەنامان بدات. بەڕاستی هەڕەشەکە یەکجار سامناکە، حەق وایە بە بیستنی قوت قڕمیش ببێ و تیکە لە گەرودا بگیرێ، یا الله پەنامان بدە. هیچ پەنایەك نی یە جگە لە پەنای بێ سنووری بەزەیی تۆ. سەختی و سامناکی ئەم هەڕەشە یە روونتر ئەبێتەوە کاتێ بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەم موژدەیەدا کە خوا ئەیدات بە کۆمەڵی ئیمانداران، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بە گوێرەی ئیمانەکەیان کردەوە چاکەکانیشیان بەجێ هێناوە خوا ئەیانخاتە ناو چەند بەهەشتێکەوە کە لە ژێر دار و درەخت و کۆشکەکانی دا رووبارەکان دێن و دەچن، ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا﴾ ئەوانە لەو بەهەشتانەدا ئەرازێنرێنەوە بە خشڵ و زێوەر و بە بازنی ئاڵتوون کە ئەکرێتە دەست و قۆڵیان، بە مرواری کە لەم جیهانەدا شتێکە زۆر نایاب و بەنرخە، لەناو سەدەف دایە و لە بێخی دەریاکان دا دەست ئەکەوێت. ئەوەش بە وێنەی پادشاکان کە لە کۆن دا بە تاج و زێرو زیو ئەرازێنرانەوە ﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ بەرگ و پۆشاکیان لە بەهەشت دا ئاوریشمە. ئەم جیهانە جیهانی بەربەرەکانێ و تێکۆشانە، مەردی چالاکی بەکار ئەبێ نەوەستێ، تێکۆشان بکات بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی جێنشینی کە خستوویەتی یە سەر شانی، کەواتە پیاوی پیاوانە نابێ لەم جیهانەدا سەر بکاتە خۆشی و رابواردنی خانمانە، لەبەر ئەوە هەندێ شت قەدەغە کراوە لە پیاو، وەکو هەندێ خشڵ و پۆشاك، چونکە رایئەکێشێ بۆ سەرکردنە رابواردن و دووری ئەخاتەوە لە کار و فرمانی راستەقینەی، نارێکە لەگەڵ پیاوەتی و چالاکی یەکەی دا، بەڵام بەهەشت جێگای ناز و رێز و رابواردنە بەوەی دڵ ئارەزووی بکات، بەهۆی ئەوەوە کە هەندێ شت لەم جیهانەدا قەدەغەیە لەوێ رەوا ئەدرێ وەکو خشڵی ئاڵتوون و پۆشاکی ئاوریشم،

وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ٱلَّذِي جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ
بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٥﴾ وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا
تُشۡرِكۡ بِي شَيۡـٔٗا وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾

---

﴿وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ﴾ ئەو خوا پێداوانە ڕێنموونی کراون لەم جیهانەدا بۆ وتەی پاك و خاوێن کە وشەی شایەتمان و خواپەرستی یە بە تاك و تەنیا، یان لە ڕۆژی دوایی دا کە سوپاس کردنی خوایە لەسەر خستنە بەهەشت، یان هەموو وتەیەکی پاك و خاوێنی تر لە بەهەشت دا، چونکە لەوێ هیچ جۆرە وتەیەکی تیا نی یە کە دڵ پێی گەرد بگرێ. ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ ڕێنموونی کراون لەم جیهانەدا بۆ ڕێگای خوایە کە سوپاس کراوە، ئەو ڕێگایەش بریتی یە لە ڕێگای ئایینی خوا کە ئیسلامە، یان لە ڕۆژی دوایی دا ڕێنموونی ئەکرێن بۆ ڕێگای بەهەشت، کە بە بێ ئەرك و ناڕەحەتی ئەکەونە سەری. ئەوە بوو بە کورتی پاشەڕۆژی ئەو دوو تاقمە کە لەم جیهانەدا ئاژاوە و بەربەرەکانێ ئەکەن لەبارەی خوای خۆیانەوە و با بزانرێ کە هەر کەسێ بە دوای هەر پاشەڕۆژێك دا ئەگەڕێ لەم دووانە با بگەڕێ و شتەکەی بۆ روون کراوەتەوە، پاش ئەم روون کردنەوەیە دێتە سەر کردەوەی هەندێ لە بێ باوەڕان لەوانەی کە بەرەنگاری ئیسلام و بانگەوازەکەی پێغەمبەریان کرد لە مەککەدا، بەرگری خەڵکیان لێ ئەکرد، بەرهەڵستی پێغەمبەرو موسڵمانەکانیان ئەکرد لە هاتوچۆ کردنی یەکەم مزگەوت و ماڵی خوا کە لە بنەڕەت دا بۆ هەموو ئادەمی دروست کراوە تا خواپەرستی تیادا بکەن، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی کەسانێك کە باوەڕیان نەهێنا بە ئایینی خوا و بەرگری خەڵك ئەکەن لە ئایینی ئیسلام کە تاقانە ڕێگای خوایە بۆ گەیاندنی بەندەکانی خوا بە خوای خۆیان، تاقانە شەریعەتێکە کە خوا خۆی دایناوە بۆ بەندەکانی ڕەفتاری پێ بکەن، تەنیا بەرنامەیەکە کە بۆی هەڵبژاردوون، ئەو بەرگری یەش بە هەمیشەیی پیشەی بێ باوەڕان و سەرکەشانی قورەیش بوو لە یەکەم جارەوە و دوای ئەوان بوو بە پیشەی جێگرەکانیان لە هەموو چەرخ و چینێك دا ﴿وَٱلۡمَسۡجِدِ

﴿ٱلۡحَرَامِ﴾ بەرگری موسڵمانان ئەکەن لە چوونە مەککە و خواپەرستی و عومرە کردن لە ماڵی خوادا، کە مزگەوتێکە خاوەنی قەدر و رێزە لای خوا ئەو بەرگری یەش ئەوەبوو قورەیش کردی لە ساڵی شەشەمی کۆچی دا، کە بەساڵی(الحديبية) بەناوبانگە، ﴿ٱلَّذِی جَعَلۡنَـٰهُ لِلنَّاسِ﴾ ئەو مزگەوتە بەرێزەی کە گێراومانە و فەراهەممان هێناوە بۆ ئادەمیزاد، بە جۆرێ ﴿سَوَآءً ٱلۡعَـٰكِفُ فِیهِ وَٱلۡبَادِۚ﴾ یەکسانە تیای دا نیشتەجێ و ئەو کەسەی تازە لە رێوە ئەڕوات. واتە بۆ هەمووانە و تایبەتی نی یە بە هیچ کەسێکەوە، ئەو کەسانەی کە ئەم بەرگری یانە ئەکەن، خوا ئەفەرموێ: بەڕاستی ئێمە سزایەکی سەختی ئازار دەری ئەدەین وەکو روون ئەبێتەوە لەم فەرمودەیەوە: ﴿وَمَن یُرِدۡ فِیهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٍ﴾ هەرکەس بیەوێ و نیازی هەر شتێ یان هەر کەسێ بکات لەو مزگەوتەدا بەجۆرێ لە راستی لابدات بەهۆی جەور و تاوان و ستەم کردنەوە واتە نیازی هەر گوناهو بێ شەرعی یەك بکات ﴿نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِیمٍ﴾ ئێمە پێی ئەچێژین و دەرخواردی ئەدەین هەندێ سزای ئێش و ئازار دەر. دیمەنی ئایەتەکە وا نیشان ئەدات کە ئەم هەڕەشەیە لەسەر نیازی کردەوە خراپەکەیە، وەکو کۆمەڵێ لە زانایانیشی لەسەرە، ئیتر با کردەوەیشی لەگەڵ دا نەبێت، خۆ ئەگەر کردەوەیشی لەگەڵ بوو ئەوە تاوانەکەی گەورەتر و سزاکەیشی زۆر سەخت تر و بە سۆ ترە، ئەوەیش لەبەر گەورەیی و رێزی تایبەتی شوێنەکەیە، چونکە بێگومان شوێن و کاتەکان جیاوازیان هەیە، بۆ چاکە و بۆ خراپە، وەکو زانراوە لە ئاینی پاکی ئیسلام دا، بۆ نموونە نوێژێکی ئەو مزگەوتە بەفەڕە خێری دە نوێژی مزگەوتی قودسی هەیە [1] نوێژێکی مزگەوتی قودس خێری هەزار نوێژی شوێنەکانی تری هەیە، جا کەواتە زۆر بەجێ یە و ماڵی خۆیەتی تاوان کردنیش تیای دا چەند چەندانە بێت. ئەم وشە پیرۆزە(المسجد الحرام) ناوە بۆ ئەو جێگایەی کە تەوافی تیا ئەکرێت بە دەوری کەعبەدا و ناسراو و دیاریی کراوە لەو ناوچە بەفەڕەدا، هەندێ جار بەکار ئەهێنرێ بۆ هەموو خاکی پاکی حەرەم کە ئەویش بریتی یە لە هەموو شاری مەککە و چەند میلێك بە چوار دەوری مەککەدا، کە ئەمیش ناسراوە و سنووری دیاریی کراوە، خوا کردوویەتی بە ناوچەی بێ ترس و ئەمان و پەنا و جێگای ئاشتی و شوێنی ئارام و بێ

---

[1] دەقی فەرمودەکە بەم شێوەیە: یەك نوێژ لە مزگەوتی مەدینەدا خێری لە هەزار نوێژی تر زۆر ترە کە لە مزگەوتەکانی تردا بکرێ، نوێژێك لە مزگەوتی حەرام دا بکرێ گەورەترە لە سەد هەزار نوێژی تر کە لە مزگەوتەکانی تردا بکرێ، نوێژێك کە لە مزگەوتی قودس دا بکرێ خێری پێنج سەد نوێژی مزگەوتەکانی تری هەیە.

ترسی یە بۆ گشت ئادەمیزاد. نابێ هیچ تاوان و خراپەکاری و خوێن ڕێژیی تیادا بکرێ و ئەمە بەرنامەیەکە کە خوای گەورە دایمەزراندووە بۆ بەندەکانی پێش ئەمەی شتی وا بە دڵی هیچ کەسێك دا گوزەر بکات تا ئەم دواییە یە بێگانەکان لە ئیسلامەوە ئەم دەرسەیان وەرگرت و لە وڵاتی خۆیان بەکاریان هێنا، ئەوەتا ناوچەی بێ چەك لە وڵاتان دا دیاریی ئەکەن. ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ دواوە و لە بنەڕەتەوە باسی پەیدا بوونی ئەمماڵە بەفەڕەی خوا ئەکات – واتە کەعبە – کە لە پیرۆزی و فەڕی ئەوەوە، ئەو ناوچەیە بەفەڕ بووە، کراوە بە جێگا و پەنا و قەڵای ئارام و ئاشتی بۆ ئەو ماڵە بەفەڕەی کە بە فەرمانی خوا دروست کرا بۆ ئادەمیزاد لەسەر دەستی ئیبراهیم دا(علیه السلام) کە باوکە گەورەی قورەیشە، لەسەر بنەڕەتی پاکی و خواناسی و خاوێن کردنی لە هەموو بت و هاوبەشێك دروستی کردووە، جا لەم باسەوە باشتر روون ئەبێتەوە کە تاوانی ئەو کۆمەڵە بت پەرستە چەند گەورەیە کە لە ئایینی پاك و خاوێنی خواپەرستی باوکە گەورەیان لایان دا، بەرگری خواپەرستانیش ئەکەن لەو ماڵەی کە دروستی کرد بۆ خواپەرستی، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ﴾ ئەی پێغەمبەر باس بکە بۆ ئەو بت پەرستانە کە بەرگری باوەڕ داران ئەکەن لە خواپەرستی و لەو ماڵەی کە جێگای خواپەرستی یە، باسی ئەو کاتە بکە کە شوێن و جێگای کەعبە مان دیاریی کرد بۆ ئیبراهیم و کردمان بە جێگایەك کە خەڵکی بگەڕێتەوە بۆلای بۆ خواپەرستی و پێمان وت: ﴿أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا﴾ کە هیچ شتێك نەکەیت بە شەریك و هاوبەش بۆ من، ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾ ماڵەکەم پاك و خاوێن بکە و بە پاکی رایگرە بۆ ئەوانەی تەواف ئەکەن بۆ نوێژ کەران کە ئەوەستن و رکوع و سوژدە ئەبەن، کەواتە ئەو ماڵە لە یەکەم جارەوە بۆ خواپەرستی دروست کراوە و خوا ئەم شوێنەی پیشانی ئیبراهیم دا و کاروباری خستە ژێر دەستی بۆ ئەمەی لەسەر ئەو بنەڕەتە دایرێژێ، چونکە ماڵەکە ماڵی خوایە بە تەنیا کە ئەبێ بە تەنیا خوای تیا بپەرسترێ و تەنیا بۆ خواپەرستان دانراوە نەك بۆ بت پەرستان. ئینجا خوا فەرمانی دا بە ئیبراهیم کە کاتێ لێ بووەوە لە دروست کردنی لەسەر ئەو بنەڕەتەی کە داوای لێ کرابوو، فەرمانی دا کە جاڕ بدات بەناو ئادەمیزاددا بۆ حەج کردن و بانگیان بکات بۆ هاتن بۆلای ئەو ماڵە بەفەڕە، بەڵێنیشی دا کە خەڵکی گوێ رایەڵی ئەکەن و دێن بەدەم بانگ و بانگەوازەکەیەوە،

وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾
لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ

فەرمووی پێ‌ی: ﴿وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ﴾ جاڕ بدە و بەناو ئادەمی دا و بانگیان بکە بۆ حەج کردنی ئەم ماڵی منە ﴿يَأْتُوكَ رِجَالًا﴾ دێن بۆ لات بە پیادە ﴿وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ بەسواری لەسەر پشتی هەموو حوشترێکی لاواز کە دێن لە هەموو رێگایەکی دوورەوە و دووری رێگا ماندووی کردبن و لاوازی کردبن، خوای گەورە بەڵێنی دا بە ئیبراهیم(علیه السلام) کە خەڵکی دێن بە دەم بانگ و بانگەوازەکەیەوە و ئەم بەڵێنە لەو چەرخەوە تا ئێستا و لەمە و پاشیش بەدی هات و بەدی دێت و هەمیشە دڵ و دەروونی زۆر لە ئادەمی بە سۆزە بۆ ئەو ماڵی خوا، ئەیانەوێ بە بینینی شاد بن و تەواف بکەن، چ سامان و دارایی دار کە ولاغی سواری بووە و هەروەها هەر شتێکی تر کە هۆی گەیشتن بێت ئەو شوێنە بەفەڕە وەکو تەیارە و سەیارەو پاپۆڕی ئێستا. چ هەژاری بێ ئەوا کە هیچی دەست نەکەوتووە جگە لە هەردوو پێ و بە سواری هەردوو پێ‌ی بە سۆز و پەرۆشەوە چووە، ئێستاش هەیە ئەچێ، ئێستاش هەزاران کەس دائەبارن بە پیادە لە دانیشتوانی وڵاتی نیوەدورگە، ئینجا هۆ و بەرهەمی ئەو جاڕدان و بانگ کردنە یان ئەو هاتنی خەڵکە روون ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ﴾ بۆ ئەمەی ئەو خەڵکە حازری چەند سوود و قازانجێکی گرنگ و گەورە بن کە هەیانە و دەست کەوتیان دەبێ لەو شوێنە پیرۆزەدا ئیتر چ سوود و قازانجی ئەم جیهانە بێت یان هی رۆژی دوایی. ئەم سوود و قازانج و بەرهەمە گرنگەی کە دەست کەوت ئەبێ بۆ حاجی یەکان لە حەج کردن دا ئەگەر بە شێوە راستە شەرعی یەکەی بەجێ بهێنرێت زۆرە، چونکە حەج کاتێکی تایبەتی یە بۆ بازرگانی و دەست کەوتی دارایی و بۆ عیبادەت و پەرستنی خوا، حەج کۆنگرەی گرنگی ساڵانەیە، کۆنگرەی یەك گرتن و دۆستایەتی و ئاشنایی یە، کۆنگرەی یەکخستن و یارمەتی و کۆمەکی یە، حەج فەرزێکە لە فەرزەکانی ئیسلام کە هەردوو جیهان یەك ئەگرن تیای دا هەرچۆنێ یاد و بیرەوەری ئایین و عەقیدەی تیایە لە کۆن و تازەدا، هەروەها بازرگانەکان و کڕیارو

فرۆشیارەکان بازاڕێکی گشتی گرنگیان لە حەج دا دەست ئەکەوێت کە بە ئارەزووی خۆیان کڕین و فرۆشتن و ئاڵ و گۆڕی شت و مەکی خۆیان تیادا بکەن، چونکە موسڵمانان لە هەموو کون و قوژبنێکی جیهانەوە دێن، روو ئەکەنە ئەو شارو ناوچە بەفەڕە و هەریەکە لە وڵاتی خۆیەوە چی بەر دەست بکەوێت و بۆی هەڵسوڕێ لەگەڵ خۆی دا ئەیبات، ئینجا بیرێک بکەینەوە لەو هەموو شتە جیاوازە لە هەموو وڵاتێکەوە بێت بە یەکجار کۆببێتەوە و لەو چەند رۆژەدا لەو خاکە بەفەڕەدا، کەواتە بازاڕێکی گشتی جیهانی ساڵانە فەراهەم دێت کە وێنەی نی یە لە هیچ وڵاتێکی تردا، بێگانەکان لەو بازاڕی ئێمەوە فێر بوون ئەیانەوێ شتی وا فەراهەم بێنن بۆ وێنە بازاڕی گشتی ئەوروپا کە پێك هێنراوە لە بەشداری هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپا، حەج کاتێکی تایبەتی یە بۆ خەریك بوون و لێ بڕان بۆ خواپەرستی و کاتی عیبادەت و پەرستنێکی تایبەتی یە کە تەنیا لەو شوێنە پیرۆزەدا دەست ئەکەوێت کە گیان و دڵ و دەروونی پێ پاك و خاوێن ئەبێتەوە لە چڵك و چەپەڵی و هەست ئەکرێت بە نزیکی لە خواوە، چونکە کابرا خۆی فرێ داوەتە ماڵی خوا و پەنای پێ بردووە کاتێ چەرخە ئەکات بە دەوری ئەو ماڵە بەفەڕەدا نەسیم و هەناسەیەکی خۆشی چەند یاد و بیرەوەری یەك ئەدات لە مێشك و دەماخی، یاد و بیرەوەری کۆن و تازە و نزیك و دوور.

بەندەی باوەڕداری خواناس چەرخە ئەکات بە دەوری ئەو ماڵە پیرۆزەدا و بیر ئەکاتەوە لەو کاتەی کە ئیبراهیمی خەلیل(علیه السلام) پارچە جگەری خۆی هێنا کە ئیسماعیلە لەگەڵ هاجەری دایکی لەو شوێنە چۆڵ و بیابان و وشك و بێ ئاوەدا دایبنان، بیر ئەکاتەوە لەوە کە بە دڵە لەخوا ترسەکەی رووی کردە پەروەردگار و ئەم نزا شیرینەی کرد ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾. بیر ئەکاتەوە لە رادەی باوەڕی بەرز و بەهێزی دایکی ئیسماعیل و پشت بەستنی بە خوای خۆی کە توانی بە ئارامەوە لەو شوێنە چۆڵەدا بمێنێتەوە لەگەڵ تەنیا ئەو رۆڵە شیرە خۆرەی دا، بەڕاستی کارەکە یەکجار سەر سوڕهێنەرە، جگە لە خواناسی راستەقینە هیچ کەس ئەوەی لە دەست نایەت، یادی ئەم ئافرەتە خواناسە ئەکات لە کاتێك دا لەتاو تینویەتی خۆی و رۆڵە شیرینەکەی هەڵسا و رۆڵەکەی خۆی بەجێ هێشت و رۆیی بگەڕێ بە شوێن ئاودا و بۆ ئەو مەبەستە حەوت جار گەڕا و هاتوچۆی کرد لەنێوان

کردۆلکەی سەفا و مەروەدا بە پەلە و هەروەلە کردن و لە جاری حەوتەم دا بە ماندوویی و نائومێدیی گەڕایەوە بۆلای رۆڵە ئازیزەکەی، بەڵام هەرگیز خوا بەندەی وا نائومێد ناکات ئەوە بوو رێی خست لە کانیاوی رەحمەت لەو چۆڵ و بیابانی نائومێدی یەدا، لەبەر دەست و ژێر پێی رۆڵە شیرینەکەی دا ئاوی زەمزەمی بۆ هەڵقوڵاند کە تا ئێستاش هەر هەیە و پەرە ئەسێنێ بەجۆرێ مەکینەی ئاو دەرهێنەری لێ دامەزراوە لەوانەیە ئەو ناوچەیە ئاو بدات ئینجا یادی ئیبراهیم(علیه السلام) کاتێ کوڕە نازدارەکەی گەورە بوو گەیشتە ئەوە ئیش و کار بکات لەگەڵ باوکی دا، لەو کاتەدا لە خەودا پێی وترا کە خوا فەرمانت پیا ئەدات بە سەربڕینی ئەم کوڕەت ئەویش بێ گیرو گرفت و سەر لێ کردنەوە پەلاماری دایە، ئەو کارە کەس نەدیوە و کوڕیش وەکو باوکی بە ئارامەوە مل کەچ بوو بۆ فەرمانی خوا، ئینجا خوایش ئەو لوتفەی لەگەڵ کرد و قوربانی بۆ نارد. ئینجا یادی ئەو باوك و کوڕە – سەلامی خوایان لێ بێت – لە کاتێك دا کە پایە و دیواری ماڵە بە فەڕەکەی خوایان بەرز ئەکردەوە بە ئەوپەڕی بەندەیی و مل کەچی یەوە دەم بەم نزا و شیرینەوە بوو: ﴿وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٢٧ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ هەروەها ئەو یاد و بیرەوەری یانە بەدوای یەك دا تا دێتە سەر عبدالمطلبی باپیری پێغەمبەرمان(ﷺ)، کاتێ کە نەزری کرد لەسەر خۆی ئەگەر خوا دە کوڕی بداتێ دەیەمیان بکات بە قوربانی، ئەو کوڕە دەیەمە عبدالله دەرچوو، ئینجا عبدالمطلب سوور بوو لەسەر بەدێ هێنانی نەزرەکەی، بەڵام کەس و کاری ئەیانویست(فدیة) بدات بەو قورعە خستن لە نێوان عبدالله و دە حوشتردا، ئەگەر بەر عبدالله کەوت دە دە بۆی زیاد بکەن تا هەرچەند ئەڕوا ئەوانیش بەم بڕیارە رازی بوون و قورعەیان خست هەر بەر عبدالله کەوت تا گەیشتە سەد حوشتر ئینجا بەری سەد حوشترەکە کەوت، ئەو سەد حوشترەیان سەربڕی لە قوربانی عبدالله دا، عبدالله رزگار بوو تا ببێتە باوکی گەورەترین و بەرێزترین ئادەمی، ئینجا یادی زۆر و زەبەندەی تر دێت بەدوای یەك دا لە پەیدا بوون و گەورە بوونی بە دەوری ئەو ماڵە بەفەڕەدا، یادی ئەو کاتەی کە قورەیش کەعبەیان تێك دا دووبارەیان کردەوە، ئینجا لەسەر دانانی ﴿الحجر الأسود﴾ بوو بە ئاژاوەیە لەناویان دا خەریك بوو دەست بدەنە چەك لە یەکتر تا پێغەمبەری ئازیزمان کە لەو کاتەدا تەمەنی

پیرۆزی(٣٥) ساڵ بوو کرا بە حەکەم ئەویش بەو شێوە بەناوبانگە ئاژاوەکەی بڕی یەوە و بەدەستی بەفەڕی، خۆی بەردەکەی دانا، یادی ئەوە کە پاش پێغەمبەرێتی نوێژی کردووە لەو مزگەوتە بەفەڕەدا و تەواف کردووە و خوتبەی خوێندەوە. هەروەها هەموو کارە گرنگەکانی تری کە لە دەروونی شوێن کەوتووە ڕاستەقینەکانیدا ئەوەندە تەڕ و تازەن هەروەکو ئێستا ئەو کاتە بێت و بە چاوی سەر ڕاستی ڕووداوەکان ببینین، ئینجا یاد و بیرەوەری هاوەڵ و یارە ڕاستە هەڵکەوتووەکانی کە هەنگاو بە هەنگاو ڕێبازەکەی ئەویان دایە بەر - خوا لە هەموویان ڕازی بێت - لەپاش ئەوانە هەموو، حەج گرنگی یەکی تری هەیە، کە کۆنگرەیەکی گشتی کۆکەرەوەی هەموو چین و تاقم و جۆرەکانی موسڵمانانە، کۆنگرەیەکە موسڵمانان بنج و بنەڕەتە دامەزراوەکەی خۆیان ئەناسنەوە هەر لە چەرخی باوکە گەورەیانەوە، ئەو مەڵبەندەی کە هەموویان پێکەوە ئەبەستێ کە بریتی یە لەو قیبلەیەی کە هەموویان ڕووی تێ ئەکەن و لەسەری یەک ئەگرن، ئاڵای بەرزی خۆیانیان بۆ ڕوون ئەبێتەوە ئاڵای عەقیدە و باوەڕێ کە لە ژێر سایەی دا تۆوی ڕەگەزایەتی و جیاوازی تیرە و ڕەنگ پەرستی نامێنێ، نیشتمان و وڵات نابێتە هۆی دووبەرەکی و پچڕانیان و هەست ئەکەن بە هێزی یەکێتی و بەستنەوە و پەیوەندی لەنێوان ئەم ئوممەتە گەورەیەدا، ئەم ئوممەتەی کە هیچ هێزێك لەبەر دەمیان خۆی ناگرێت بە مەرجێ بەڕێکی دەست بگرن بە تەنیا ئاڵاکەیانەوە. حەج کۆنگرەی برایەتی و پرس و ڕاوێژ و یەك گرتنی هەموو هێزەکانی موسڵمانانە بۆ یەك مەبەست و لەسەر یەك ئامانج کە پێك هێنانی بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانانە کە خێری هەموو جیهانی تیادایە و کۆنگرەی ئاڵ و گۆڕی زانست و بەراورد کردنێتی لە نێوان موسڵمانان دا، کۆنگرەی هۆنینەوەی جیهانی ئیسلامی و هەموو موسڵمانانە لە جیهان دا هەموو ساڵێك جارێ، ئەمەیش لەژێر سایەی خوا و لە نەورووبەری ماڵە بەفەڕەکەی دا، لە سایەتی پەرستنی خوا و ئەو هەموو یاد و بیرەوەری یە دوور و نزیکانەی خواناسن لە ڕێکترین جێگا و لە ڕێك ترین کات دا. ئەمە بوو هەندێ لەو بەرهەمانەی کە فەرمودەی ﴿ لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴾ ئەیگەیەنێ و نیشانی ئەدات. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆهەندێ خواپەرستی حەج و هەندێ نیشانەی خواپەرستی لە حەج دا،

**ئەفەرموێ: ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ﴾[1] جاڕ بدە بەناو خەڵك دا بە حەج کردن بۆ ئەمەی یادی خوا بکەن و ناوی خوا ببەن لە چەند ڕۆژێکی ناسراوی زانراودا، کە دە ڕۆژی یەکەمی مانگی قوربانە ئەویاد و ناوبردنەش لەکاتی ئامادەکردنی ئەو حوشتر و ماڵاتەدا کە ئەبرێ بۆ مەککە بۆ سەربڕین تا بکرێن بەخێر، هەروەها لەکاتی سەربڕینیان دا، لەکاتی ئامادەکردنی قوربانی و سەربڕینی، یان مەبەست لەو ڕۆژە زانراوانە جەژنی قوربانە و سێ ڕۆژی پاش ئەو کە ئەو چوار ڕۆژە کاتی قوربانی کردن و یاد و ناوی خوا بردنە، یادی خوا بکەن، ناوی ببەن: ﴿عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾ لەسەر ئەوەی کە خوا بەشی داون لە حوشتر و مەڕ و بزن و ڕەشە وڵاخ، واتە: ماتوڵ خوا لەوانە بەشی داون دەی با ئەوانیش یادی خوا بکەن و ناوی ببەن و شوکر و سوپاسی بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە گرنگە و لە ڕێگای خوادا خێرو قوربانی یان لێ بکەن. یادی خوا و ناوبردنی بەهەر جۆرێ کە شایانە باشە، بەڵام بەهەر جۆر و شێوەیەك یادی کرابێ لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوە چاکترە، کەواتە لە هەموو کاتێك دا، حەج بێت یان نا، چاك وایە موسڵمانان بگەڕێن بەدوای ئەو زیکرە تایبەتی یانەدا، بۆ وێنە سەربڕی قوربانی بڵێ: ﴿بسم الله والله اکبر اللهم منك و إليك﴾ یان لەکاتی سەربڕین دا بڵێ: ﴿إن صلاتي و نسكي و محياي و مماتي لله رب العالمين﴾ قوربانی کردن یاداوەری قوربانی ئیسماعیلە(علیه السلام) کەواتە سەرباقی ئەوە خێرو سەدەقەیە و عیبادەتی خوایە، یادی نیشانەیەکە لە نیشانە گرنگەکانی خوا، یادی گوێ ڕایەڵی و مل کەچی دوو بەندەیە لە بەندە هەڵکەوتووەکانی خوا، ئیبراهیم و ئیسماعیل - سەلامی خوایان لێ بێت - ئینجا ڕووی فەرمودە ئەکاتە بەندەکانی و بۆیان ڕەوا ئەدات کە لە گۆشتی قوربانی یەکەیان بخۆن و بەدژ و پێچەوانەی باوی جاهیلی یەکان کە قوربانی یەکانیان نەئەخوارد،**

---

[1] زەمەخشەری و کۆمەڵێ تر ئەفەرمون: مەبەست لە یادی خوا لەم ئایەتەدا قوربانی کردنە، بەزیکری خوا ناوی برد،چونکە سەربڕینی موسڵمانان بە تایبەتی قوربانی بەبێ زیکری خوا نابێت، ئەو کاتە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەبێ بڵێین: جاڕ بدە بە حەج با خەڵکی بێن قوربانی بکەن لەبەرئەوەی خوا بەشی داون لە حوشتر و مەڕ و بزن و ڕەشە وڵاخ، بەم جۆرەیش زۆر جوانە و خوایش چاکتر ئەزانێ.

فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ

---

**ئەفەرموێ: ﴿فَكُلُوا۟ مِنْهَا﴾ ئینجا زیکر و ناوی خوا لەسەر قوربانی یەکانتان ببەن و لیێ یان بخۆن، ئەم فەرمانە بۆ رەوادانی رووتە بۆ پێچەوانەی جاهیلی یەکان وەکو وتمان، یان سوننەتە لەبەر دڵ نەوایی هەژاران و یەکسانی یان، بێگومان ئەم لیێ خواردنە بۆ قوربانی یەکە کە واجب نەبێ، بۆ قوربانی واجب و باقی واجبەکانی تر ئەوە خیلافی ئیمامەکانی تیادا هەیە، بەلاَم ئەم فەرمانەیان بۆ وجوبە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ﴾ ئەبێ لە گۆشتی ئەو قوربانی یانە دەرخواردی تەنگ گوزەرانی بێ نەوا بدەن ﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ﴾ پاش سەر برینی قوربانی با حاجی یەکان چڵك و چەپەڵی یەکەیان لابەرن، بە لابردنی هەر موویەك کە لای شەرع لابردنی پەسەندە وەکو بەر سمێڵ و بن باخەڵ... هتد، بە نینۆك کردن ﴿وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ﴾ با بەجێ بێنن هەر نەزر و واجبێ کە لەسەریانە ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ با تەواف روکنی حەج بکەن، کە بەناوبانگە بە(طواف الإفاضة) تەواف پاش وەستانی عەرەفات، پێش تەواف خوا حافیزی، تەواف بکەن لە ماڵێك دا کە ئازاد کراوی خوایە لە دەست ستەمکار و زۆردار، ئازاد کراوی خوایە لە وێرانی و چۆڵی، ئەوەتا لە چەرخی ئیبراهیمەوە هەتا ئێستایش تابێت رێك و پێك تر و ئاوەدان تر ئەبێت. هەروایش ئەبێت تا هاتنی رۆژی دوایی، مەبەست لە(البیت العتیق) ئەو ساحەیە بە دەوری کەعبەدا و تەوافگایە و بەناوبانگە بە(المسجد الحرام) ئەوەبوو دەنگ و باسی ماڵی خوا، ئەوەبوو ئەو بنەرەتەی کە ئەو ماڵە پیرۆزەی لەسەر دامەزرا، ئەو ماڵەی کە بە چاودێریی خوا و بە فەرمانی ئەو ئیبراهیمی خەلیل(علیه السلام) دایمەزراند و خاوێنی کرد لە هەموو بت و هاوبەشێك، جاڕی دا بەناو خەڵك دا کە بێن بۆ حەج کردن بۆی، ئەمەش بۆ ئەوەی یادی خوا بکەن و ناوی ببەن بە تەنیا – نەك ناوی جگە لە خوا – لەسەر ئەو ماڵاتانەی کە سەریان ئەبڕن لە رێگای خوادا، خۆیشیان لە گۆشتەکانیان دەخۆن. کەواتە ئەو ماڵە ماڵێکی بەرێز و**

رێز گیراوە و ئەبێ رێزی رێز گیراوەکانی خوای تیادا بگیرێ، کە یەکەمیان بیر و باوەڕی تاك و تەنیایی خوایە، کردنەوەی قاپی ئەو ماڵەیە بۆ هەموو کەسێك کە تەواف بکات و نوێژ و خواپەرستی تیادا بکات، لەگەڵ پاراستنی قەدەغە کردنی خوێن رێژی تیای دا، پاراستنی هەموعەهدوپەیمانێك وریزی ئارام و ئاشتی و وازهێنان لە هەموو ئاژاوەو خراپەکاری یەك.

﴿ذَٰلِكَ﴾[1] کار ئەوەیە باس کرا، ﴿وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ﴾ هەرکەس بڕیارەکانی خوا بە گەورە بگرێ، ئەو بە گەورە گرتنەش بەوە ئەبێت کە شارەزایان بێت و رەفتاریان پێ بکات و لە سنووریان دەرنەچێت، جا هەرکەس بەو جۆرە بکات ئەوە چاکە بۆی بەلای پەروەردگاری یەوە، چونکە ئەجرو پاداشتی ئەداتەوە، جگە لەوەیش هەر ئەوە چاکە بۆی بۆ پاك و خاوێن کردنی دڵ و دەروونی لەوانەی کە خوا قەدەغەی کردوون کە هۆی چڵك و چەپەڵی دەروونن، هەروەها ئەوە باشە بۆی لە ژیانی دا، چونکە ژیانێك پارێزگاری بڕیارەکانی خوای تیا بکرێت بێگومان هەر ئەوەیە ژیانی بەختەوەری و کامەرانی، چونکە ئەو کاتە دوور ئەبێت لە هەموو ناڕەوایی و دەست درێژیی یەك، مەترسی نامێنێ و ئارام و ئاشتی راستەقینەی لەو ژیانەدا دەست کەوت ئەبێ، بت پەرستەکان باویان وا بوو چوار جۆر حوشتریان قەدەغە ئەکرد:(بحيرة، سائبة، وصيلة) وەك لە سورەتی(الأنعام) دا باسیان هاتووە، خوا قەدەغەی نەکردوون، هەندێ شتیان رەوا ئەدا کە لای خوا قەدەغەن وەك خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، ئەوەی بە ناوی بتەوە سەر ئەبڕا و لەباتی(بسم الله) ئەیان وت:(بسم اللات)، ئاشکرایە کە لە ئایینی ئیسلام دا رەوادان و قەدەغە کردن ئەبێ لەلایەن خواوە بێت، ئیتر هیچ کەسێکی تر مافی ئەوەی نی یە، جا وا لێرەدا جگە لە قەدەغە کراوەکانی خۆی کە لە سورەتی(المائدة) دا باسی ئەفەرموێ، ئیتر سەر بڕین و خواردنی هەموو حوشتر و مەڕ و بزن و رەشە وڵاخێك رەوا ئەدات،

---

[1] وشەی(ذلك) یان(هذا) لە نێوان دوو رستەدا یان لە نێوان دوو مەبەست دا بەکار ئەهێنرێ بۆ جیاکردنەوەیان لە یەکتر و بە گوێرەی رێزمانی عەرەبی یان(خبر) بۆ(مبتدأ) ێکی لابراو، یان(مفعول) بۆ فعلێکی ئەمری لابراو، واتە ئەوە وەرگرە.

وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ
وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ
ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ ڕەوا دراوە و حەلاڵ کراوە بۆتان سەربڕین و خواردنی ئەو چوار جۆرە حەیوانە، جگە لەو قەدەغە کراوانەی کە ئەخوێنرێنەوە بەسەرتان دا لە سورەتی ناوبراودا، ئینجا بە بۆنەی حەلاڵ کردنی ئەو چوار جۆرە حەیوانەوە فەرمان ئەدات بە دوور کەوتنەوە لە پەرستنی ئەو بتانەی کە ئەیان تاشین و وێنەیەکیان لێ فەراهەم ئەهێنان و حەیوانیان بەسەرەوە سەر ئەبڕین بە نیازی خۆ نزیک خستنەوە لێ یانەوە، ئەفەرموێ: ﴿فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ﴾ ماتوڵ بە گەورە گرتنی فەرمانەکانی خوا پێویستە لەسەرتان، هەروەها دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی، کەواتە خۆتان دوور بخەنەوە لە پیس و چەپەڵی یەك کە بتەکانتانە و پەرستنەکەیانە، بێگومان بت پەرستی و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دان سەر دەستەی هەموو قەدەغە کراوەکانە، پیسی یەکە ئەکەوێت لە دەروون و دڵ پیس و چەپەڵ ئەکات بە وێنەی پیسی ئاشکرا کە جل و بەرگ و لەش پیس و چەپەڵ ئەکات و بێگومان هاوبەش ڕەوادان گەورەترین درۆیە بەرامبەر بەخوا، جا بەو بۆنەیەوە ئەمان ترسێنێ لە هەموو وتەیەکی درۆ، ئەفەرموێ: ﴿وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ﴾ خۆتان دوور بخەنەوە لە قسەی درۆ، ئیتر شایەتی درۆی مەبەست بێت وەك هەندێك لەسەر ئەوەن، یان هەموو جۆرە درۆیەکی مەبەست بێت وەك دیمەنی ئایەتەکە وا ئەگەیەنێ و زۆربەیش لەسەر ئەوەن، بەهەرجۆر بێت ڕوون ئەبێتەوە کە درۆ تاوانێکی یەکجار گەورەیە، ئەوەتا لێرەدا کراوە بە هاوسەری هاوبەش ڕەوادان بۆ خوا. خوای گەورە ئەیەوێ کە بەندەکانی خۆیان لابدەن لە بڕیار دانی هەموو جۆرە هاوبەشێك و دوور کەونەوە لە هەموو جۆرە درۆیەك، ڕێك ڕاوەستن لەسەر ڕێگای خواپەرستی ڕاستی خاوێن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ﴾ خۆتان دوور خەنەوە لە کاتێك دا و بەجۆرێ لادەر بن لە هەموو ئایین و ڕێگایەکی تر لەبەر خوا، ڕاوەستاو و دامەزراو بن لەسەر ڕێگای خوا، بڕیار دەری هیچ هاوبەشێك مەبن بۆ خوا، واتە ئەم فەرمانانە بەجێ بێنن لەبەر خوا و بە نیازی پەرستن و گوێ ڕایەڵی خوا بە تەنیا، بێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، کەواتە هەر کردەوەیەکی چاك بەجێ**

بێت لەبەر خوا نەبێت و بە نیازی پەرستنی ئەو نەبێت هیچ نرخی نی یە بەلای خواوە و خوا نایەوێ. ئینجا بە شێوەیەکی سەختی ئەو کەسە پیشان ئەدات کە پێی هەڵخلیسکێ لە پۆپەی بەرزی خوا پەرستی یەوە و بکەوێتە ناو چاڵی بت پەرستی. ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ﴾ هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دانێ ئەو کەسە وەکو لە ئاسمان کەوتبێتە خوارەوە وایە، دیارە هەر کەسێك لە شوێنی وا بەرزەوە بکەوێتە خوارەوە دەست بەجێ پارە پارە ئەبێت، ﴿فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ﴾ ئینجا باڵداری گۆشت خۆر بە گورجی بیفڕێنێ و هەر پارچەیەکی بکەوێتە چیکڵدانەی باڵدارێ، ﴿أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ یان بای بەهێز فڕێی بدات بۆ شوێنی زۆر دوور. بەڕاستی ئەمە وێنەیەکی زۆر رێك و راستە بۆ ئەو کەسەی لە سروشت لابدات و هاوبەش بۆ خوا رەوا بدات و لەسەر رێگای راستی تاك و تەنیایی خوا نەبێت، چونکە ئەو کاتە لە ئاسمانی بەرزی ئیمان دا دائەخزێ و ئەکەوێتە خوارەوە بۆ چاڵی قوڵی کوفر، بەجۆرێ بە تەواوی تیا ئەچێ و لە جیهانی ئادەمێتی راستەقینە دەرئەچێ، چونکە ئەو کاتە بنکەیەکی دامەزراو نی یە بۆ دڵ و دەروونی تا ئارامی لابگرێ، کەواتە ئارەزووی جۆر جۆری جیاوازی نەفس ئەیفڕێنن و دڵ و دەروونی بەش بەش ئەکەن بە وێنەی چەند باڵدارێکی گۆشت خۆر کە بەر ببنە لەشی و پارە پارەی بکەن، هەروەها ئەو بت پەرستە نیشتەجێ یە نی یە بۆ دڵ و دەروونی، کەواتە خەیاڵ و ئەوهام وەکو بای بەهێز لێ ی هەڵ ئەکات و دووری ئەخاتەوە لە رێگای راست. لەپاش باسی بە گەورە گرتن و رێز گرتنی بڕیارەکانی خوا ئینجا دێتە سەر باسی رێز و نرخ دان و بە گەورە گرتنی ئەو حوشتر و ولاخ و ماڵاتانەی کە لە حەج دا سەر ئەبڕرێن لەبەر خوا، لە پێشەوە بە وێنەی باسی پێشوو وشەی ﴿ذلك﴾ ئەهێنێ بۆ جیا کردنەوەی مەبەستی پێش و پاشی، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ کار ئەوەیە کە باس کرا ئینجا دێتە سەر مەبەستە تازەکە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ﴾[1] هەرکەس بە گەورە بگرێ ئەو حوشتر و ماڵات و رەشە ولاخانەی کە لە کاتی حەج و عومرەدا ئەبرێن بۆ خاکی پاکی حەرەم بۆ سەربڕین و کردنیان بەخێر لە رێگای خوادا، ﴿فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ﴾ بێگومان ئەو بە گەورە گرتنە لەلایەن خاوەنەکانیانەوە بەهۆی

---

[1] (شعائر) کۆیە و تاکەکەی(شعیرة) یە، واتە نیشانەدار بەو حەیوانانە ئەوترێ، چونکە نیشانەی حەج و عەمرەن، یان نیشانەی گوێ رایەڵی خوان، یان نیشانە دار و دیاریی کراون لەلایەن خاوەنەکانیانەوە بە پارچە ئاسنێکی بچووك زامداریان ئەکەن تا نیشانە بێت لەسەر ناردنیان بۆ ئەو خاکە پاکە، بۆ ئەو مەبەستەی باس کرا، ئەم وشەیە تەفسیر ئەکرێتەوە بە ئایینی خوا، بە فەرزەکانی حەج و عەمرە، بە شوێنی بەجێ هێنانی ئەم فەرزانە: بەلام بۆ ئەم شوێنە ئەوەی لە تەفسیرەکەدا وترا رێك ترە لەگەڵ ئایەتەکانی پاش دا.

لەخواترسی دڵەکانیانەوەیە. فەرموی دڵەکانیان، چونکە لەخوا ترسان لەدڵەوە هەڵئەقوڵێ و هەرکەس بە لە خواترس دابنرێ بەهۆی لەخوا ترسی دڵی یەتی. مەبەست لە بە گەورە گرتنیان ئەوەیە کە دەست بژێن و قەڵەو و نرخ گران بن، موسڵمانان لەچەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) بەو جۆرە زۆر بە گرنگ ئەیانگرتن، تاکو دەری بپڕن کە فەرمانی خوا بەلایانەوە زۆر گرنگ و بەرێزە،(ئیبن و عومەر) – خوا لێ یان رازی بێت – ئەفەرموێ: کە(عمر) ی باوکی حوشترێکی هەڵکەوتووی ئامادە کرد بۆ ئەو مەبەستە، حوشترەکەی ئەوەندە چاك بوو خەڵکی داوایان کرد کە بە سێ سەد دینار بیفرۆشێ پێ یان، ئەویش ویستی بیفرۆشێ و بەو پارە چەند حوشترێك بکڕێ، چونکە گۆشتی ئەوانە زۆر ترو باشترە بۆ هەژارەکان، بۆ ئەو مەبەستە پرسی بە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئەویش رێگای نەدا فەرموی: هەر ئەوەی خۆت سەر ببڕە، چونکە ئەو چاکە هەڵکەوتووە لەدڵ دا بەنرخ تر و خۆشەویست ترە، کەواتە سەربڕینی ئەوە نیشانەی باشترە بۆ رێز گرتنی فەرمانی خوا لەدڵ دا، کەواتە سەربڕینی ئەوە نیشانەی لەخوا ترسی دڵە، کە ئەوەش مەبەست و ئامانجی سەرەکی یە لە هەموو(شعائر) و(مناسك) ی حەج دا، ئەو هەموو کردەوە جۆر جۆرە لە حەج و عومرەدا ئەکرێن هەموو نیشانە و رەمزی روو کردنە خوا و مل کەچی و گوێ رایەڵین بۆ خوا، بەڵێ وەکو لە پێشەوە باس کرا چەند یاد و بیرەوەری یەکیان تێدایە، ئەوانەش لە راستی دا هەمووی یادی گوێ رایەڵی خوا و گەڕانەوەن بۆلای خوا، کەواتە ئەوانەیش بە وێنەی نوێژ و نزاکان بریتین لە خواپەرستی، ئەو حەیوانانە پاش ناونانیان و دیاریی کردنیان بۆ ئەو مەبەستی سەربڕینە لەخاکی پاکی حەرەم دا، پاش ئەوە ئیتر پەشیمان بوونەوە نی یە، پێویستە لەسەر خاوەنەکانیان بیبەن و سەری بڕن لەو شوێنی خۆیە، ئیتر لە موڵکی خاوەنەکانیان دەرئەچن، بەڵام تاکاتی سەربڕینیان دروستە سوودیان لێ وەربگیرێت، وەکو ئەفەرموێ: ﴿ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ ﴾ بۆتان هەیە و رەوایە بۆتان لەو حەیوانە دیاریی کراوانە چەند سوود و کەڵکی دنیایی وەر بگرن، کە بریتین لە سواری پێ کردن و خواردنی شیر و بێچووەکانیان و بەکارهێنانی خوری و مووەکانیان ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەتا کات و ماوەی دیاریی کراو و ناوبراویان، کە کاتی سەر بڕینیانە لە رۆژی جەژنی قوربان دا، ئەو سوود لێ وەرگرتنە بە پێی پێویستی و ناچاری یە، وەکو زۆربەی لەسەرە،

ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ

---

یان با ناچاریش نەبیٚ وەکو هەندیٚ لە زانایان ئەفەرمون ﴿ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ لە پاش ئەو کەڵك و سوودە دنیایی یانە ئینجا سوود و کەڵکی ئایینی یان بۆ هەیە، کە سەر برینیانە لە کاتێك دا کە گەیشتنە دەوروبەری ماڵە ئازاد کراوەکەی خوا، واتە کاتیٚ گەیشتنە خاکی پاکی حەرەم، ئیتر لە مینادا بێت، یان لە هەر شوێنێکی تری حەرەم. ئەم قوربانی یانە کە قورئان ناوی بردن بە(شعائر) تایبەتی نیٚن بەم ئوممەتەوە، بەڵکو لە ئوممەتەکانی تری پێشوویش دا هەر بوون، کەواتە ئەم ئایینی ئیسلامی دوایی یە داینەهێناون، بەڵکو ئەم باری رێك و راست کردنەکەی روون ئەکاتەوە، چونکە بێگومان لەلایەن خەڵکی یەوە دەستی تیٚ خرابوو، لەبارە راستەکەی ترازابوو، ئەفەرمویٚ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾ بۆ هەموو ئوممەت و خاوەن ئایینیٚ لەمەو پێش قوربانی و سەربرینی حەیوانمان بریار داوە، ﴿لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ﴾ بۆ ئەمەی زیکری خوا بکەن و ناوی خوا ببەن، ﴿عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ لەسەر ئەو چوار جۆرە چوار پیٚ یەی کە خوا پیٚ ی داون، واتە ناوی تەنیا خوا ببەن لەکاتی سەر برینیان دا، کەواتە مەبەست لەوانە یادی خوا و ناوبردنی خوایە بە جۆریٚ کە شایانی خوایە و خوا ئەیەوێت. ئیسلام هەموو هەست و بیرو نیاز و کردەوەیەك کۆ ئەکاتەوە و یەکێتی ئەخاتە نێوانیان و بە یەکجار روویان ئەکاتە خوا، لەبەر ئەوە زۆر سوورە لەسەر تەمیٚ کردن لەو بارەیەوە، زۆر بە گرنگ گرتوویەتی، بێگومان هەرکات بە پیٚ ی ئەو تەمیٚ یە رەفتار کا هەموو ژیان رەنگ و تام و بۆنی عەقیدە و باوەڕ و تاك و تەنیایی خوا وەرئەگریٚ، هەموو کاروباری ژیان و جیهان ئەبێتە خواپەرستی. جا لەسەر ئەم بنەڕەتە لەکاتی سەربرینی حەیوان دا قەدەغەی کردووە ناوی هیچ کەسێك یان هیچ شتیٚ ببریٚ جگە لە خوا، هەر حەیوانیٚ کە سەر بڕرا لە کاتی سەربرینی دا ناوی غەیری خوا برا گۆشتی ئەو حەیوانە حەرامەو خواردنی قەدەغەیە هەرچۆنیٚ ناوبردنی خوای پێویست کردووە لەکاتی سەر برینی ئەو حەیوانانەدا کە ئەکرێن بە قوربانی – ئەو ناوبردنەشی کردووە بە مەبەستی سەرەکی – وەکو باس کرا. هۆی دانانی قوربانی لەسەر ئوممەتان ئەمەیە کە یادی خوا بکرێت و تەنیا ناوی ئەو ببریٚ لەو کاتانەدا،

فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ
وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا
لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا
وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ

---

**هۆی ناو بردنەکەی ئەویش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ چونکە خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنیایە ﴿فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟﴾ کەواتە تەنیا بۆ ئەو خوا تاك و تەنیایە مل کەچ و گوێ رایەڵ بن. ئینجا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر مژدە بدە بە مل کەچ و گوێ رایەڵەکان، یان ئەوانەی نیاز و ئایین و کردەوەکانیان پاك و خاوێن ئەکەن بۆ خوا. ئینجا ئەم کۆمەڵە بەختەوەرە ئەناسێنێ و دیاریی یان ئەکات بەم چوار سیفەت و نیشانەیە:**

**١- ﴿ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ کەسانێکن کە کاتێ باس و ناوی خوا برا دڵیان ئەترسێ و سام و ترسی تێ ئەکەوێ سام و بیمی گەورەیی خوا و سام و ترسی تۆڵەی سزا، کەواتە باوەڕیان ئەوەندە پتەو و بەهێزە بە ناوبردنی رووت سام و ترس داگیریان ئەکات.**

**٢- ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ﴾ ئەوانەی کە خۆگر و بە ئارامن لەسەر هەر ئەرك و سزاو بەسەرهاتێکی خراپ کە دووچاریان بێت، کەواتە بەشەرمن و هیچ رەخنە و دوو دڵی یەکیان نی یە لە هیچ بڕیارێکی خوادا.**

**٣- ﴿وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ ئەوانەی کە بەجێ هێنەری نوێژن بە رێك و پێکی، کەواتە خواپەرستی راستەقینەن.**

**٤- ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ هەندێ لەوەی کە بەشمان داون و پێمان داون بەکاری ئەهێنن لە دەست گیرۆیی و خێرو چاکەدا، کەواتە چاوبرسی و چنگ قوچراو نین، ئا بەم جۆرە**

پەیوەندی ئەخاتە نێوان باوەڕ و ئەو شتانەی کە نیشانەی بەندەیی و خواپەرستین، کەواتە ئەبێ هەموو ئەو نیشانانە لە بیر و باوەڕەوە هەڵقوڵێن بۆ وێنە قوربانی و سەربڕینی ئەو حەیوانانە، کە ئەبرێن بۆ خاکی پاکی حەرەم بە بۆنەی حەج و عەمرەوە کە یەکێکن لەو نیشانانە ئەبێتە هۆی بیر و باوەڕ و هەڵقوڵینی بە نیازی خوا و تەنیایی خوا بکرێ، بە کورتی ئەوەی گرنگ و مەبستە ئەمەیە کە ژیان بە هەموو کاروبارێەوە رەنگ و تام و بۆنی بیر و باوەڕ رایگرێ ئەو کاتە ئادەمی بەش بەش نابێ، بەڵکو بە هەموو هەست و هێزو وزەکانی یەوە یەکبار ئەبێ و بۆ یەك شوێن روو ئەکات، ئەو کاتە ئاشتی دەروونی راستەقینە بەدی دێت.

لەپێشەوە بە شێوەی گشتی فەرمانی دا بە قوربانی کردن و سەر بڕینی ئەو چوار جۆرە حەیوانە، ئینجا بە تایبەتی فەرمان ئەدات بە جۆرێکی گرنگیان کە حوشترە چونکە ئەمان گەورەتر و بە نرخ تر و بە سوود ترە، کەواتە باشترین بەڵگە لەسەر لەخوا ترسی دڵ کە ئەوەش مەبەستی سەرەکی یە لەم قوربانی کردنەدا ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ﴾ ئەو حوشترەی کە لە مەککە و خاکی حەرەم سەری ئەبڕن گێڕاومانە بۆ ئێوە بە نیشانەیەك لەو نیشانانەی کە خوا کردوونی بە نیشانەی ئاینەکەی ﴿لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەو حوشترانەدا پیت و کەڵکی گرنگ. وەکو لە پێشەوە باس کرا ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ﴾ کەواتە ناوی خوا بەرن لەسەریان لە کاتێك دا ئامادە کراون بۆ سەر بڕین بەم رەنگە وەستاون بە پێوەو دەست و قاچیان ریز کردووە و یان لەسەر سێ پەل وەستاون و دەستی راستیان بەستراوەتەوە، ئەوەش بە گوێرەی باوی سەربڕینی حوشتر، ﴿فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا﴾ ئینجا کاتێ کەوت بەسەر لادا واتە گیانی تیا نەما ﴿فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ﴾ ئەو کاتە خۆیان لێ یان بخۆن و دەرخواردی ئەو کەسەی بدەن کە داوا ناکات و ئەوەیش کە دێت بۆلاتان خۆیتان پیشان ئەدات بۆ ئەمەی بەشی بدەن،

كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ
ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٧﴾

﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ﴾ ئا بەو جۆرە ژێر بارمان كردوون بۆ ئێوە كە سوودیان لێ وەرئەگرن بە زیندوویی و مردوویی و بەو هەموو هێز و قەبارە گەورەوە ژێر بارمان كردوون بۆتان لە ئاستتان هیچ سەرپێچی ناكەن ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بەڵكو سوپاسی بەهرەو چاكەی ئێمە بكەن بەسەرتانەوە بە گوێ رایەڵی و پەرستنێكی پاك و خاوێن لە هەموو هاوبەشێك، ئینجا روونی ئەكاتەوە مەبەست لەو قوربانی یانە و ئەوەی كە رەزامەندی خوای لێ یە، ئەفەرموێ: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا﴾ گۆشتی ئەو قوربانی یانە كە ئەكرێن بە خێرو خوێنەكانیان كە ئەرژێنرێن هەرگیز بەری خوا ناكەون و جێگای رەزامەندی خوا نابن ﴿وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡ﴾ بەلأم ئەوەی كە بۆ خوا بێت و جێگای رەزامەندی ئەو بێت بریتی یە لە لەخواترسی لەلایەن ئێوەوە، واتە مەبەست لە قوربانی كردن رێز گرتن و بە گەورە گرتنی فەرمان و بڕیاری خوایە، ئەوەی پاڵ ئەنێ پێتانەوە بۆ ئەو مەبەستە لە خوا ترسیتانە، كەواتە گۆشت و خوێن و رژاندنی رووت هیچ نرخێكی نی یە لای خوا نەك وەكو بت پەرستەكانی قورەیش كە ئەو گومانە پڕ و پووچەیان بوو، خوێنی قوربانی یەكانیان ئەتلان لە بتەكانیانەوە، ئینجا دووبارە بەندەكانی بێدار ئەكاتەوە بە گرنگی و گەورەیی ژێر بار كردنی ئەو حوشترانە، ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ﴾ ئا بەو جۆرە خوا ئەو حوشترانەی ژێر بار كرد بۆ ئێوە ﴿لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ﴾ بۆ ئەمەی خوا بە گەورە بگرن و بە گەورە بیناسن لەسەر ئەوەی رێنموونی كرد بۆ رێگای ژێر بار كردنی ئەوانە و چۆنیەتی پەرستنی خوا و نزیك كەوتنەوە لە خواوە، بەهۆی ئەوانەوە ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر موژدە بدە بەوانەی كە گوێ رایەڵن و خواپەرستی ئەكەن بە پێی رەزامەندی خوا، لەهەر شتێك دا مەبەستیان رەزامەندی خوایە لە پێشەوە هەڕەشەی كرد لەوانەی كە بەرگری خەڵكی ئەكەن لە ئایینی خوا و ماڵی خوا كە بۆ هەموو دانراوە، ئینجا باسی حەجی كرد بەو هەموو سوود و كەڵكانەی كە تیای دا هەیە بۆ هەردوو جیهان، ئینجا لێرەدا باسی شتێ ئەكات كە بەرگری كەران نەهێڵێ و

باوەڕداران بتوانن هەڵسن بە گوێ ڕایەڵی و بەجێ هێنانی ئەو فەرزە گەورەیە بەڕێکی، بێجگە لەوەش بەرگری کردن لە ئازادی و سەربەستی بیروباوەڕ و خواپەرستی و پاراستنی جێگای خواپەرستی و ئەو شتانەی کە نیشانەی ئایینن، جا لەبەر ئەوە ڕێگای موسڵمانەکانی دا لەپاش کۆچ کردنیان بۆ مەدینە کە جەنگ بکەن لەگەڵ بەرگری کەران دا بۆ بەرگری کردنی دەست درێژیی کەران کە گەیشتبوونە ئەوپەڕی پلە لە تاوان و ستەمکاری دا و بۆ ئەمەی سەربەستی و ئازادی باوەڕ و خواپەرستی فەراهەم بێنن بۆ خۆشیان و بۆ خەڵکی تریش لەسایەی ئایینی خوادا و خوای گەورە بەڵێنی پێدان بە یارمەتی دان و سەرخستنیان بەمەرجێ هەڵسن بە ئەرکی ئەو فەرمانەی کە داویەتی بەسەریان دا، بێگومان هێزی شەڕ و گومڕایی بێ وچان دەستیان ئیش ئەکات لە وڵات و جیهان دا و جەنگ و ئاژاوە بە هەمیشەیی هەیە لە نێوان خێرو شەڕدا، لەوەتەی خوا ئادەمی دروست کردووە لەم زەوی یەدا زۆران و کێ بەرکێ هەیە لە نێوان هێزی باوەڕو هێزی بێ باوەڕی دا و شەڕ و بەتاڵ سەرکێش و چەکدارە، بێ بەزەیی و سەر لێ کردنەوە دەست ئەوەشێنێ، ئەتوانێ سزای خەڵکی بدات کاتێك کە خێرو ڕاستی و باوەڕیش هێزێکیان ببێ بەرگری دەست درێژیی یان لێ بکات و بیان پارێزێ لە سزا، ڕێگاکەیان بۆ پاك بکاتەوە لە دڕك و داڵ، خوا نەیویست واز لە باوەڕ و خێرو ڕاستی بێنێ بێ چەك بەرگری هێزی سەرکێشی و شەڕ و بەتاڵ بکەن، پشت ببەستێ تەنها بە هێزی باوەڕ و جێگیر بوونی ڕاست لە سروشت دا و گرنگی خێر لە دڵ و دەروون دا، چونکە ئەو چەکە ماددی یە بە دەست بەتاڵەوە هەیە لەوانەیە دڵ ئەمێنێتە لەرزەو دەروون ئەگۆڕێ و سروشت لائەدات لە ڕێگا ڕاستەکەی، خۆ ئارام و خۆگری سنوورێکی هەیە و هەڵگرتنی باری گران ڕادەیەکی هەیە و هێزی ئادەمی ئەندازەیەکی هەیە و ئیتر تەواو ئەبێت و خوا خۆی ئاگادارە بەدڵ و دەروونی بەندەکانی، جا لەبەر ئەوە خوا نەیویست واز لە باوەڕداران بێنێ لەژێر باری قورسی سزا و ئازاردا بمێنێتەوە مەگەر تا ڕادەیەك ئامادە ئەبن بۆ بەربەرەکانی و بەرگری و هۆی جەنگ و تێکۆشانیان چنگ ئەکەوێ، لەوکاتەدا فەرمان ئەدات بە جەنگ و کوشتار بۆ گێڕانەوەی دەست درێژیی کەران، پێش ئەمەی کە فەرمانیان پێ بدات بۆ ڕاپەڕین و دەرچوون بۆ مەیدانی جەنگ پێی ڕاگەیاندن کە بەرگری یان لێ ئەکات و ئەیانخاتە پەناو پارێزگاری خۆی،

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾

---

**پێی فەرمون: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ﴾ بەڕاستی خوا بەرگری ئەکات لەوانەی بڕوایان هێناوە، بەرگری سزا و پیلان و خراپەکاری بت پەرستەکان و زاڵیان ئەکات بەسەر ئەو بت پەرستانەدا، چونکە ئەوانە زۆر خراپەکارن لە سپاردەی خوا کە فەرمان و قەدەغەکانیەتی و زۆر یاخی و سپڵە و بەد نەمکن و چاو لەبەری ئەو هەموو چاکە و بەهرەیەی نین کە خوا رشتوویەتی بەسەریان دا خوایش ئەو جۆرە کەسانەی ناوێ وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ﴾ بەڕاستی خوا هیچ خیانەت بازێکی ناوێ کە بە هیچ رەنگ دان نانێ بە چاکەکانی خوادا بەسەری یەوە و هیچ چاو لەبەری نی یە، کەواتە ئەبێ پەکیان بخات لە دەست درێژیی و زێریان بخات و ستەم لێ کراوەکان سەرخات بەسەریان دا، ئەم باوەڕدارانە لە چەرخی مەککەدا ئەو هەموو سزاو ستەمەیان لێ ئەکرا، ئەوانیش جار بەجارێ دادی خۆیان ئەهێنایە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش ئەیفەرمو بە ئارام و خۆگر بن، چونکە پێم نەسپێرراوە جەنگ و کوشتار، بەو جۆرە مانەوە هەتا کۆچی کرد لە مەدینە و دامەزران، ئینجا خوا رەوای جەنگ و کوشتاری دا بە شێوەیەك روونی کردەوە کە بەرگری و جەنگیان زۆر بەجێ یە و دڵنیای کردن بە یارمەتی دان و زاڵ کردنیان فەرموی: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ﴾ ئەوا رەوادرا بۆ ئەو موسڵمانانەی کە جەنگیان لەگەڵ دا ئەکرێ و رێگایان درا کە جەنگ و کوشتار بکەن ﴿بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ﴾ بەهۆی ئەوەوە کە جەور و ستەمیان لێ کراوە ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ﴾ بێگومان خوا توانای هەیە بەسەر یارمەتی دان و زاڵ کردنیان.**

ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا

﴿ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم﴾ ئەو جەنگ لەگەڵ دا کراوانە کەسانێکن دەرکراون لە وڵاتی خۆیان، واتە [redacted] ﴿بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ بەبێ هیچ هۆیەك و بێ تاوان ﴿أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ﴾ مەگەر ئەمە [redacted] ئەڵێن: خوا و پەروەردگارمان کەسێکە کە ناوی ﴿الله﴾ یە [redacted] ئەوەش راست ترین وشەیە [redacted] بوترێ و بەجێ ترین وشەیە [redacted] بە دەم دا بێت و دەرکردنیشیان تەنها لەبەر ئەو وشە بە فەرە راستەیە، کەواتە لە لایەن دەست درێژیی کەرانەوە جەور و ستەمێکی پەتی یە و بۆنی هیچ جۆرە رەوا و راستی لێ نایە، لەلایەن دەست درێژیی لێ کراوانیشەوە هیچ مەبەست و ئامانجێکی شەخسی نی یە، کەواتە مەبەستیان باوەڕەکەیانە نەك بەربەرەکانێ لەسەر مەبەستێکی ئەم جیهانە و ئەم زەوی یە کە دژی بەرژەوەندی دەست درێژیی کەران بێت، بێجگە لەو هۆیانەش کە باس کران بیر و باوەڕ پێویستی هەیە بە بەرگری لێ کردن ئەگینا کافر و بت پەرستەکان شوێنێکیان نەئەهێشتەوە، کە خواپەرستی تیا بکەن، جا لەبەر ئەوە خوا لە پێش ئەم ئوممەتانەیش دا پێویستی کرد لەسەر موسڵمانان جەنگ و کوشتاری دوژمنە بەرگری کەرەکانی ئایینەکەی، وەکو روونە لەم فەرمودەیە ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ ئەگەر بەرگری خوا نەبوایە بۆ هەندێ لە ئادەمی بە هەندێ تریان بەم رەنگە ئیمان دارانی زاڵ نەکردایە بەسەر بێ باوەڕ و کافران دا ﴿لَّهُدِّمَتْ﴾ بێگومان ئەڕوخێنرا ﴿صَوَٰمِعُ﴾ چەند خەلوەخانە و جێگای تایبەتی خواپەرستی بۆ گشتی لە ئوممەتی عیسادا ﴿وَبِيَعٌ﴾ چەند کەنیسە و جێگای خواپەرستی بۆ گشتی لە ئوممەتی ناوبراودا ﴿وَصَلَوَٰتٌ﴾ چەند کەنیسە و جێگای خواپەرستی لە ئوممەتی موسادا ﴿وَمَسَٰجِدُ﴾ چەند مزگەوتی موسڵمانەکانی ئەم ئوممەتە ﴿يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ کە بە زۆری ناوی خوای تیا ئەبرێ و زیکری تیا ئەکرێ، واتە پێویستە لەسەر خاوەن عەقیدە و باوەڕ بەهێز و چەك بوەستن بەرامبەر هێز و چەکی دوژمنانی ئایین ئەگینا دوژمن کۆتایی ناهێنن لە دەست درێژیی کردن تەنانەت بۆ جێگا و شوێنی خواپەرستی [redacted] تایبەتی کراوە بۆ پەرستنی خوای هەمووان، بەرێز تر و پاك ترە لە دەروونی خەڵکیش دا. پێویستە وەستان و بیر کردنەوە بۆ وەڵامی

پرسیارێك كە دێت بە دڵ و دەروون دا، بێگومان خوا هەواڵی دا كە بەرگری ئەكات لە ئیمان داران، هەركەسیش خوا بەرگری لیٚ بكات ئەبیٚ هەر زاڵ بێت و كەس نەتوانیٚ دەست درێژیی لیٚ بكات، كەواتە بۆچی ئیزنی جەنگ و كوشتاری دا و هانی ئیماندارانی دا لەسەری؟ ئایا بۆچی ئەو ئیماندارانە بخرێنە سزا و مەینەت و دووچاری كوشتن و برین و ئێش و ئازار بن و خوا خۆی توانایە بەسەر شتەكەدا بیٚ ئەرك و مەینەتی ئەمان؟ لەوەلاٚم دا ئەڵێین: كاردروستی خوا لەمەدا و لە هەموو كارو فەرمانی دا زۆر بەرز و بڵندە و هەموو بریاری بەجیٚ یە، ئێمە بگەین لە هۆ و بەرژەوەندی كارەكانی یان نە، ئەوەی رێی پیٚ ببەین لەم بارەیەوە ئەمەیە خوا نەیویست هەڵگرانی ئالاٚی ئایینەكەی و بانگ كەرانی خەڵكی بۆ سایەی كۆمەڵیٚ لە تەمەڵ و تەوەزەل بن، بیٚ باك و بە ئارام دانیشن پاڵ و پشت بكەن، ئینجا هەركات دەست درێژیی یان لیٚ كراو دووچاری هەر سزایەك بوون دەست بەجیٚ كۆمەكی و یارمەتی خوا بباریٚ بەسەریانەوە بە سوك و ئاسان و بیٚ ئەرك لەبەر ئەمە كە ئەوانە نوێژ و فەرزەكان بەجیٚ ئەهێنن و قورئان ئەخوێنن و روو ئەكەنە خوا و نزا و لاڵەی لیٚ ئەكەن، بەڵیٚ پێویستە لەسەریان بەرێكی نوێژ و فەرزەكان بەجیٚ بێنن و قورئان بخوێنن و پارە و لاڵە بكەنە لای خوا لە خۆشی و ناخۆشی دا، بەلاٚم بە تەنها ئەمانە نابن بە شایانی ئەوە ئالاٚی ئایین بەرز بكەنەوە و ببن بە پارێزەری ئایینی خوا و راگەیەنەر و جارچی خوا لەناو بەندەكانی دا، ئەو پەرستن و یاد و پەیوەندی یە بە خواوە ئەبیٚ توێشوو بێت بۆیان لە برینی رێگای ژیانیان، چەكیٚ بێت بە دەستیانەوە بۆ زاڵ بوونیان بەسەر نەفس و شەیتان دا بۆ پاك كردنەوەی رێگای ژیانیان لە هەموو درك و داڵی ئەم جیهانە، هەروەها چەكێكی پەك نەكەوتوو بێت و هەمیشە هۆی ئارامی دڵ بێت و پشت بەو ببەستیٚ و لەكاتی جەنگ و ئاژاوە لەگەڵ بەرگری كەران و دوژمنانی ئایین، نەك پشت بەو چەكە جیهانی یەی كە لە جۆری چەكی دوژمنە، خوای گەورە ویستی بەرگری بكات لە ئیمانداران لە رێگای ئیماندارەكان خۆیانەوە بۆ ئەمە بێنە بەرهەم و پیٚ بگەن لە كاتی جەنگ و ئاژاوە و بەربەرەكانیٚ و بەگری دوژمن دا، چونكە هێز و وزەكانی ئادەمی لەكاتی سام و ترس دا رائەپەرن و هەموو خەبەریان ئەبێتەوە چاكتر لە هەموو كاتێكی تر، بە یەكجاری پێكەوە ئەكەونە ئیش و بەربەرەكانیٚ و بەرەنگاری، ئەو كاتە ئادەمی تێر و تەواو ئەبێت و ئەگات بە وێنەی میوەیەك كە هەموو هۆی پێگەیشتنی فەراهەم هاتبیٚ. هەر سەركەوتن و زاڵ بوونیٚ بەبیٚ ئەرك و سزا دەست كەوت ببیٚ هەموو

هێزەکان لە ئیش ئەخات و بە ئێجگاری ئەیانوەستێنێ، بێجگە لەوەش هەر سەرکەوتن و زاڵ بوونێ بەسووك و ئاسان و بێ ئەرك دەست بکەوێت و بەزوویی و بە بێ بەرك دەستی پێوە ئەنرێ و لە دەست دەرئەچێ، یەکەم: چونکە هەر شتێك بە هەرزان دەست کەوت بە هەرزانیش دەستی پێوە ئەنرێ، دووەم: چونکە ئەو سەرکەوتووانە رام نەکراون و فێری خۆگری و پارێزکاری نەبوون، کەواتە بە سووك و ئاسان لە دەستیان دەرئەچێ.

لەپاش ئەوانە هەر زات بوون و سەرکەوتنێ کە بە سزا و ئەرك و فیداکاری دەست کەوت ببێ ئەبێتە هۆی پێگەیاندن و پەروەردە کردنی دەروون، لەبەر کردەوە لێزانی و شارەزایی، فەراهەم دێت بۆ هەموو جۆر بەسەرهاتێك، چونکە تێکۆشەران و قوربانی دەران لەو رێگادا هەموو خۆشی و ناخۆشی یەك ئەچەژن، زاڵ بوون، تێك شکان، هەڵمەت دان، راکردن، پێش کەوتن، گەڕانەوە پاشەڵپاش، ئومێد، نائومێدی، ئێش و ئازار، خۆشی، داخ و دوو، ئارامی، بێ ئارامی، هەست بەمێز و دەسەلات، هەست بە داماوی و بێ دەسەلاتی، لەگەڵ ئەوەدا رام بوون و فێربوونی یەکگرتن و فیداکاری لە پێناوی عەقیدە و گەل دا، دۆزینەوەی هۆی هێز و بێ هێزی دەروون، دۆزینەوەی چارەسەریی لە هەموو کات و بەسەرهاتێك دا. بێگومان ئەمانەش هەموو پێویستن بۆ هەر گەل و ئوممەتێك کە هەڵگری بانگ و بانگەوازێ بن و بیانەوێ خۆیان و خەڵکیش لەسەری راگیر بکەن، جا لەبەر ئەمانەی باس کران، لەبەر هەر هۆیەکی تر کە خوا خۆی ئەیزانێ خوا ویستی کە بەرگری کردن لە ئیمانداران بەدی بێت لە رێگای ئیماندارەکانەوە، ئەو بەرگری یەی نەکرد بە شتێ کە لە ئاسمانەوە بیخات بەسەریان دا بە بێ ئەرك و مەینە ت. لەگەڵ ئەوەیش دا وەنەبێ جەنگ و کوشتار مەبەست و ئامانجی ئیسلام بێت، بەڵکو تا دەست بدات و بگونجێ جەنگی ناوێ، رەوای نەداوە لەبەر مەبەستێك نەبێ کە گەورەترە لە ئاشتی و خوێن نەڕشتن، بێگومان ئاشتی و ئارامی مەبەست و ئامانجی ئیسلامە وەکو لە چەند ئایەتێك دا روون کراوەتەوە، بەڵام ئاشتی یەکی ئەوێ کە دەست درێژیی و جەور و نارەوایی تیا نەبێ بۆ سەر هیچ شتێکی راست و رەوای بەنرخ بۆ ئادەمی وەکو سەربەستی و باوەڕ و خواپەرستی و داد لە حوکم و داد لە پاداشت و تۆڵە و داد لە دابەش کردنی زیان و قازانج لە ماف و ئەرك دا، هەم وەکو پاراستنی خو و رەوشت و رێکی گەل و ئەندامی گەل، بەڵام هەرکات جەورو دەست درێژیی بوو بۆ سەر هەر شتێك لەمانە کە ئادەمی بەوانە راگیراوە – هەرکات دەست درێژیی وا بوو لەلایەن هەرکەس و هەر گەل و

کۆمەڵێکەوە – ئەوە ئیسلام ڕێگا نادات بەبێ دەنگ و وازهێنان و ئاشتی بەرامبەر ئەو دەست درێژیی یانە، بەڵکو ئاشتی ئاوا بە تاوانێکی گەورەی وا دائەنرێ کە چاوپۆشی لێ ناکرێ، کەواتە ئاشتی لە ئیسلام دا بریتی نی یە لە بێ دەنگی و خوێن نەڕشتن، بەڵکو ئاشتی لە ئیسلام دا بریتی یە لە پێك هێنانی خێرو دادپەروەری ئەو بەرنامەی کە خوا دایناوە و نەخشەی کێشاوە بۆ بەندەکانی. ئینجا ئەو بەرگری و یارمەتی دانی خوا زۆر جار درەنگ دێت و بە سستی دێت لەپێش چاوی ئیمانداره ستەم لێ کراو و ئاوارە کراوەکان: واتە ئەبێ ئەو دواکەوتن و دێر هاتنە لەبەر هۆ و حیکمەتێك بێت کە خوا ئەیەوێ، هەندێ جار دێر دێت، لەبەر ئەوە ئیمانداره‌کان هێشتا پێ نەگەیشتوون و هەموو هێز و توانا و دەسەڵاتی خۆیان بەخت بکەن لە ڕێگای خوا، چونکە باوەڕ مافی ئەوەی هەیە هەموو فیداکاری و تێکۆشانێکی بۆ بکرێ، هەندێ جار دێر دێت بۆ ئەمەی ئوممەتە باوەڕدارەکە دواترین پلەی هێز و دەسەڵاتی خۆی بەکاربێنێ و بێ ئەمەی سەر بکەوێ، جا ئەو کاتە تێ ئەگات کە هیچ هێز و دەسەڵاتێ بە تەنیا هیچی پێ ناکرێ بە بێ پشتیوانی و یارمەتی، ئەو کاتە فێر ئەبێ کە پشت تەنیا بە خوا ببەستێ کە بە بێ ئەوەش ئیمان تەواو نابێ و تا تێ ئەگات کە سەرکەوتن و زاڵ بوون تەنیا لەلایەن خواوە دێت بەڵام ئەبێ بەندە دواترین دەسەڵاتی خۆی بەکاربێنێ و دوای ئەوە پشت بەخوا ببەستێ و هەموو کاروباری خۆی هەواڵەی خوا بکات، هەندێ جار دێر دێت بۆ ئەمەی ئیمانداره‌کان پەیوەندی یان بە خواوە بەهێز و پتەوتر بکەن لەو کاتەدا کە ئەکەونە تەنگانە و دەردی سەری، دووچاری سزا و ئازار ئەبن لەلایەن دوژمنانی ئایینەوە، هیچ پەنایەکیان نی یە جگە لە پەنای خوا، هیچ شوێنێك شك نابەن ڕووی تێ بکەن لای خوا نەبێ، جا لەو کاتەدا بێ باوەڕیش پەنا ئەمێنێ و ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ، جای ئیمانداران کە بێگومان لەو کاتەدا بە تەواوی خۆیان ئەخەنەوە ناو پەنای خوا و ئەپچڕێن لە هەموو شتێکی تر، بێگومان ئەو پەیوەندی یەیان ئەبێتە هۆی ڕێکی و دامەزراوی لەسەر بەرنامەی خوا کاتێ کە خوا سەری خستن و زاڵی کردن، کەواتە سەرکێشی ناکەن و لانادەن لێ ی، هەندێ جار یارمەتی و زاڵ کردن دێر دێت، چونکە ئیمانداره‌کان هێشتا بە تەواوی لێ نەبڕاون بۆ خوا لەو تێکۆشان و فیداکاری یەی کە ئەیکەن، خۆیان یەك بار و یەك تەن نەکردووە بۆ خوا بەم ڕەنگە جەنگ و تێکۆشانە یان نیازی غەنیمەت و سامانێکی تێدایە کە دەست کەوت ببێ، یان غیرەت و پیاوەتی پێ ئەدەن، یان ئازایی و چالاکی پیشان ئەدەن،

خوایش ئەیەوێ جەنگ و تێکۆشان کە تەنها لەبەر خۆی بێت و لەڕێگای ئەودا بێت و دوور لە هیچ نیازێکی تر، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) روونی کردەوە لە وەڵامی پرسیارێ کە لێ ی کرا، عەرزیان کرد پیاوی وا هەیە جەنگ ئەکات لەبەر غیرەت و پیاوەتی، وا هەیە ئەیکات لەبەر ئازایی و چالاکی، هینی وا هەیە بۆ ناوبانگ و شۆرەت و رووپامایی، ئەمانە کامیان لە رێگای خوادایە؟ ئەویش لە وەڵام دا فەرموی: هەرکەس جەنگ و کوشتار بکات بۆ ئەمەی ئایینی خوا بەرز ببێتەوە تەنها ئەمە لە رێگای خوادایە، هەندێ جار دێر دێت، چونکە ئەو شەڕ و خراپەی کە ئیمانداران بەرگری ئەکەن و جەنگی لەگەڵ ئەکەن ئەندازێ خێر و چاکەی تێدایە، خوا ئەیەوێ ئەو توزە رووناکی یەی تێدا نەمێنێ و رووت ببێ لێ ی ئینجا بڕوا، هەندێ جار ئەو یارمەتی یە دێر دێت، چونکە ئەو باوەڕە پڕ و پووچەی کە ئیمانداران بەرگری ئەکەن قەڵبی و خراپی و ناڕاستی بە تەواوی روون نەبووەتەوە بۆ خەڵکی، کەواتە ئەگەر لەو کاتەدا ئیمانداران زاڵ بن و لەناوی بەرن لەوانەیە لەناو گەل دا یارمەتی دەر و کۆمەکی بکرێ و بمێنێ لەدڵی هەڵخەڵەتاوان دا کە هێشتا دڵنیا نین لە خراپی و پێویستی نەهێشتنی، کەواتە لەپاش نەمانی ریشەی نەمێنێ لە دەروونی ناشارەزا و تێ نەگەیشتووان دا، بەهۆی ئەوەوە خوا ئەیەوێ ئەو بەتاڵە بمێنێ تا بە تەواوی روون ببێتەوە و بناسرێ، کاتێ نەما هیچ داخی بۆ نەخوا. هەندێ جار ئەو یارمەتی و زاڵ کردنە دێر دێت، چونکە هێشتا وڵات ئامادە نەبووە و شیاوی پەیدا نەکردووە بۆ بە پیرەوە چوونی حەق و خێرو راستی یەك کە ئیمانداران تێکۆشانی بۆ ئەکەن و ئەیانەوێ بین بە نوێنەری، کەواتە ئەگەر لەو کاتەدا زاڵ بین دووچاری دژی و بەربەرەکانێ ئەبن و دامەزراو نابن، کەواتە با جەنگ و تێکۆشان بەردەوام بێت تا هەموو دڵ و دەروون ئامادە ئەبن بۆ بە پیرەوە چوون و وەرگرتنی ئەو خێرو راستی یەی کە دێتە وڵات، لەبەر ئەم چەند هۆیە کە باس کرا لەبەر چەند هۆیەکی تر کە خوا ئەیزانێ زۆرجار یارمەتی و سەرخستنی ئیمانداران دێر دێت و دوا ئەکەوێ لە پێش چاویان جا ئەو کاتە فیداکاری چەند چەندانە ئەبێتەوە و ئێش و ئازار و دەردو مەینەت پتر ئەبێت، لەگەڵ ئەوەدا بەرگری خوا لە ئیمانداران و سەرخستنیان مسۆگەرە کە پاشە رۆژدا بە مەرجێ کۆتایی نەبێ لە تێکۆشان، یارمەتی دانی خوا بۆ ئیمانداران و سەرخستنیان هەرچۆنێ هۆی بەدی هاتن و پێك هێنانی هەیە، هەروەها کاتێ بەدی هات چەند ئەرك و مەرجێکی تری هەیە وەکو روون ئەبێتەوە لەم چەند وشە و رستەیەوە،

وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ
ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوۡمُ إِبۡرَٰهِيمَ
وَقَوۡمُ لُوطٖ ﴿٤٣﴾ وَأَصۡحَٰبُ مَدۡيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰۖ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ
كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾

---

**خوا ئەفەرموێ: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ﴾ سوێند بەخوا هەرکەسێك یارمەتی ئاینی خوا بدات خوا یارمەتی ئەو کەسە ئەدات و سەری ئەخات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ بێگومان خوا توانایە و زاڵە بەسەر هەموو شتێك دا بە جۆرێ هیچ شتێك توانای نی یە سەرپێچی لێ بکات، بەڵکو هەر شتێك ئەو بیەوێ ئەبێ هەر ئەوە ببێ، ئەو بەڵێنەی خوا دای چەند جار بەدی هات، یەکەم جار ئەوەبوو خوا پێغەمبەر و یارەکانی زاڵ کرد بەسەر سەرۆکەکانی قورەیش دا لەپاش ئەوە زاڵی کردن بەسەر عەرەبەکانی نیوە دورگەدا، ئینجا لەپاش ئەوە زاڵی کردن بەسەر کیسرا و قەیسەردا، جێ و شوێن و وڵاتەکانیانی سارا کردەوە بۆ ئیمانداران و یارمەتی دەرانی خوا، هەروەها چەند جاری تر ئەو بەڵێنە بەدی هات لە تەمەنی ئەم ئوممەتەدا، هەروەها ئەو بەڵێنە بەردەوامە تا دنیا دنیایە بە مەرجێ ئیماندارەکان رێبازی پێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی بدەنە بەر،ئینجا ئەوا ئەرك و مەرجی ئەو سەرکەوتوو و یارمەتی دراوانە روون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەوانە کەسانێکن ئەگەر ئێمە دەسەڵات و توانامان پێدان لە زەوی و وڵات دا و گێرامانن بەکار بەدەست ئەوانە بەم جۆرە ئەبن:**

**١- ﴿أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بە رێك و راستی نوێژ بەجێ ئەهێنن. واتە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ خوادا بەتین ئەکەن و بە مل کەچی و زەلیلی رووی تێ ئەکەن.**

**٢- ﴿وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکات ئەدەن، کەواتە هەڵئەسن بە بەجێ هێنانی ماڧی دارایی و سامانیان و زاڵ ئەبن بەسەر چرووکی و چاوبرسێتی دا و پاك ئەبنەوە لە تەماع بازی و**

زاڵ ئەبن بەسەر مەترسی لە بێ نەوایی کە شەیتان ئەیخاتە دەروونیان، کون و کەلەبەری گەل و کۆمەڵ ئەگرن و چارەسەری ئەکەن، ئەرکی لاواز و بێ نەواکان ئەگرنە ئەستۆ و ئەبن بە هۆی یەکێتی گەل تا رادەیەك وەکو یەك لەش بن هەرچۆنێ پێغەمبەری مەزنمان وێنەی بۆ هێناوە کە ئەفەرموێ: ئیمانداران لە سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی دا بە وێنەی تەنیا لەشێکن کە هەر هەموو پارچەیەکی ئێش و ئازاری هەبووهەموولەش ئەچێ بەدەمی یەوەو بەشداری ئەکات بە خەو لێ نەکەوتن و تاو تێ.

٣- ﴿وَأَمَرُواْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ فەرمان ئەدەن بە چاکە و هانی خەڵکی ئەدەن بۆی و ﴿وَنَهَوْاْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ بەرگری خەڵك ئەکەن لە گوناهو تاوان و خراپەکاری کە ئەم دوو شتە هۆی رزگاری و کامەرانی گەل و ئەندامی گەلن.

بەم دوو شتە سیفەت و نیشانەی ئوممەتی موسڵمان پێك دێت، کە ئەبێ بەسەر هیچ خراپەیەك دا تێ نەپەڕێ و هەوڵ بدات بۆ گۆڕان و نەهێشتنی بە گوێرەی توانا، بەرامبەر هیچ چاکەیەك نەوەستێ و هەوڵ بدات بۆ پێك هێنانی، کەواتە ئەو یارمەتی دراوانە خۆیان لە خۆیان دا تەواون، خەڵکیش پێ ئەگەیەنن بۆ ئەمەی ناتەواوی یان نەمێڵن، ئا ئەوانە کە خوا یارمەتی یان ئەدات کاتێ کە ئەوان یارمەتی ئایینی خوا و ئەو بەرنامەیە ئەدەن کە خوا دایناوە بۆ ژیان و خۆیان بە بەختەوەر ئەزانن لەو تێکۆشانەدا کە ئەیکەن، سەرکەوتن و یارمەتی تەنیا لەخوا داوا ئەکەن و ئەیناسن، ئەوانەن کە وا ئەو بەڵێنەیان پێ ئەدات و دڵنیایی لەسەر ئەکات، کەواتە ئەو یارمەتی و سەرخستنە لەسەر ئەو هۆ و مەرجانە راگیرا کە باس کرا... ئینجا پاش ئەوە هەموو کاروبارێ ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا خۆی چۆنی ویستی کاروبار ئەگۆڕێ، کەواتە شکان ئەگۆڕێ بە سەرکەوتن، سەرکەوتن ئەگۆڕێ بە شکان، کاتێ کە هۆیەکان گۆڕا، یان ئەرك و پێویستی یان نەبرا بەڕێوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ تەنها بۆ خوایە و تایبەتی یە بە خواوە پاشەڕۆژی هەموو کارەکان. لەم فەرمودەیەدا بەڵێنێکی ئاشکراهەیەبۆبەرزکردنەوەی ئایینی خواو یارمەتی و زاڵ کردنی دۆستەکانی خوا.

لەپاش باسی ستەم و تاوانی بت پەرستەکان دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) و یارەکانی و ئیزن دانی خوا بە جەنگ و کوشتار لەگەڵ ئەو تاوانبارانەدا، ئینجا دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات بەوەی کە ئەو تەنیا پێغەمبەرێك نی یە ناڕەوایی و تاوانی دەربارە کرابێ، بەڵکو لە

پێش ئەوەوە پێغەمبەرانی تریش بەو جۆرەیان لەگەڵ کراوە، لەپاش دا دەستی قودرەت هاتووەتە کار بۆ ئەوانەی کە سەرپێچی یان کردووە بەرامبەر بە پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – و بەرباد کردنی دوژمنەکانیان، کەواتە پاشەڕۆژی ئەم و دوژمنەکانی بە وێنەی پاشە ڕۆژی ئەوان و دوژمنەکانیانە، هەروەك دوژمنەکانی پێغەمبەر ئەترسێنێ و هەڕەشەیان لێ ئەکات و سەرنجیان رائەکێشێ بۆ بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژی سەخت و سامناکی وێنە و هاوسەرەکانیان لەو گەلە رابوردووانەی کە باسیان ئەکات. ئەفەرموێ: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾ ئەگەر ئەو بت پەرستانە باوەڕ ناهێنن بەو ئایینە راستە کە بۆت هێناون و لایان وایە تۆ درۆ ئەکەیت و ئەوەی پێیان رائەگەیەنی درۆیە بەوە دڵ غەمگین مەبە، ﴿ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ﴾ چونکە ئەوەی دەربارەی تۆ کراوە هەروا بوو بۆ پێغەمبەرانی تریش ئەوەتا لە پێش ئەوانەی تۆ گەلەکەی نوح پێغەمبەریان بە درۆزن دانا و باوەڕیان پێ نەکرد ﴿وَعَادٌ ﴾ تایفەی عاد هودی پێغەمبەریان بە درۆن دانا ﴿وَثَمُودُ﴾ تایفەی سەمود ساڵح پێغەمبەریان بە درۆزن دانا ﴿ وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ﴾ گەلەکەی ئیبراهیم باوەڕیان پێ نەکرد و بە درۆزنیان دانا، ﴿وَقَوْمُ لُوطٍ﴾ هۆزەکەی لوط پێغەمبەریان بە درۆزن دانا ﴿وَأَصْحَٰبُ مَدْيَنَ﴾ خاوەن و دانیشتوانی شاری مەدیەن، شوعەیب پێغەمبەریان بە درۆزن دانا ﴿وَكُذِّبَ مُوسَىٰ﴾ باوەڕ نەهێنرا بە موسا و بە درۆزن دانرا، موسای جیا کردەوە بە شێوەیەکی تایبەتی باسی کرد جیاواز لە شێوەی باسی پێغەمبەرەکانی تر، یەکەم ئەم وەکو ئەوانە لەلایەن قەومەکەیەوە بێ باوەڕی نەئەکرا، بەڵکو لەلایەن فیرعەون و کۆمەڵەکەیەوە بوو، دووەم موعجیزەکانی موسا زۆربەی روون و ئاشکرا بوون، جیاواز لە موعجیزەی ئەوانی پێشوو. ﴿فَأَمْلَيْتُ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ ئینجا منیش پەلەم نەکرد لە تۆڵە و سزادان دا، بەڵکو ماوە و مۆڵەتم بەو کافرانەدا تا کاتی دیاریی کراوی خۆیان، ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ﴾ لە پاش ئەوە قارم لێ گرتن و بەربادم کردن ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ دەی ئایا چۆن بوو ئینکاری بەتینی من دەربارەیان، بەم رەنگە گۆڕانێکی تەواوم بەسەردا هێنان: ناز و نیعمەتەکەم گۆڕین بە سزاو مەینەت، ژیانم گۆڕین بە مردن و لەریشە هێنان، ئاوەدانی و وڵاتم گۆڕین بە کاول و وێران کردن، بە پەلە بەرباد بوونی ئەو چەند گەل و کۆمەڵەی خستە پێش چاو ناوی بردن، ئینجا بە شێوەی گشتی و بێ دیاریی کردن بەرباد بوونی گەلە پێشووەکان ئەخاتە پێش چاو،

فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ
وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ ٤٥ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ

---

**ئەفەرموێت: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا﴾ ئینجا شار و وڵاتی زۆرمان چۆڵ و وێران کرد بە مراندن و لەریشە هێنانی دانیشتوانەکانیان ﴿وَهِيَ ظَالِمَةٞ﴾ لەکاتێك دا کە ئەو دانیشتوانە ستەمکار بوون و خواپەرست نەبوون، ﴿فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ ئینجا ئەو شارانە کە چۆڵ و بێ خاوەن مانەوە خانووەکانیان وێران بوون بە جۆرێ دیوارەکانیان کەوتبوون بەسەربانەکانیان دا، بەڕاستی شێوەیەکی دڵ غەمگین کەرە کاتێ بیری لێ بکرێتەوە کە ئەو خانوانە لە کاتێك دا ئاوەدان و تێر و تەواو و سەربانەکانی راگیر و وەستاو بەسەر دیوارەکانەوە و ئێستا چۆڵ و بێ خاوەنە و خانوو بە پێوە نەماوە و هەموو بانەکان کەوتوونەتە خوارەوە و ﴿وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ﴾ ئینجا دیوارەکان رووخاون و دانیشتوانی دەوروبەری ئەو بیرانەی کە لەکاتی خۆی دا ئیشیان پێ ئەکرا و ئاو داشتی ئەو دەوروبەرەیان پێ ئەکرا و لەپاش دا لە ئیش خران و بە بێ کەس و بە بێ خاوەن مانەوە ﴿وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ﴾ هەروەها لەناومان برد و نەمان هێشت دانیشتوانی کۆشکی بەرز کە لە کاتی خۆی دا بە هەموو کەشخە و دڵخۆشی یەکەوە رابواردنیان تیا ئەکرا بێ باك و بێ سام و ترس و ئێستا چۆڵ و هۆڵ و بێ کەس و بێ خاوەن، لەو شێوە سامناکەدا نیشانی دان و ئینجا بە بێزاری یەوە پرسیار ئەکات لەکار کردن و بەرهەمی ئەو پیشاندانە، لە دەروونی بت پەرستەکان دا ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ئایا ئەوانە نەگەڕاون بە زەوی و وڵاتان و سەرنجێکی جێ و شوێنە وێرانەی هاوسەر و وێنەکانی خۆیانیان نەداوە لە بێ باوەڕ و بت پەرستەکانی گەلە رابوردووەکان ﴿فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ﴾ تا دڵیان بێدار ببێتەوە بەو دڵانەیان بیر بکەنەوە لەهۆی ئەو وێران بوونانە کە لادان و مل پێچی یە لە ئایینی خوا و بزانن کە هەرکەس وێنەی ئەوانە سەرکێش بێت بە وێنەی ئەوانی بەسەر دێت.**

أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾
وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ

---

﴿أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ یان ئایا نەگەڕاون بە وڵاتان دا، تاکو بە گوێچکەی خۆیان سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی ئەو وڵاتە وێران و چۆڵانە و دانیشتوان و خاوەنەکانیان ببیستن، تا بەهۆی ئەوەوە ئەم بێ باوەڕانە بیر بکەنەوە و لەوانەوە تەمێ خوار بن، ئەم بێ باوەڕانە هەرگیز بیر ناکەنەوە و تەمێ خوار نابن، چونکە ئەوە بە چاوی دڵ ئەکرێ و ئەمانیش نیانە وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾ واتە قسە و باسەکە ئەوەیە کە ئەوانە چاویان کوێر نی یە، بەڵکو دڵەکانیان کوێرە کە وا لەناو سنگیان دایە، بێگومان هەرکات دڵ کوێر و نابینا بوو هیچ بەڵگە و نیشانەیەکی ژیریی یان بوونەوەریی کاری تێ ناکات، ئەگەر دڵەکانیان بینا بوایە بێگومان تەمێ خوار ئەبوون و مەیلی ئیمان هێنانیان ئەکرد لە ترسی دووچار بوونی ئەو پاشەرۆژە سامناکەی کە دووچاری ئەو گەلە رابوردووانە بوو، کە زۆریان لە دەورو بەر و نزیکی وڵاتەکەی ئەمانن، بەناوبانگیشن لەناویان دا، بەڵام لەباتی بیرکردنەوە و تەمێ وەرگرتن و روو کردنە باوەڕ هێنان و لەخوا ترسی، لەباتی ئەوە پەلەیان ئەنایەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) بە هاتنی ئەو سزایەی کە هەڕەشەی ئەکرد پێی لێ یان و ترسی ئەخستە بەریان وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ﴾ واتە بت پەرستە یاخی یەکانی قورەیش پەلەت لێ ئەنێنەوە بە هاتنی ئەو سزای کە ئەیانترسێنێ پێی، چونکە باوەڕیان پێی نی یە و گاڵتەیان پێ یە و ئەیانەوێ بەرت لێ ببڕنەوە لە کاتێک دا کە ئەو سزایە شتێکە خوا بەڵێنی پێ داوە ﴿وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ﴾ خوایش هەرگیز خیلافی وادە ناکات و بەڵێنی خۆی ئەباتە سەر بەو جۆرەی خۆی ئەیەوێ، بەڵام هەموو شتێ کاتی تایبەتی دیاریی کراوی خۆی هەیە لای خوا بە پێی زانینی و کاردروستی خۆی بە موو لەو کاتە لانادات و دوا و بەری نی یە.

وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ
أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾

**حیسابی کات و چەرخ لای خوا زۆر جیاوازە لەوەی لای خەڵکە وەکو بەم فەرمودەش ئەوەمان پیشان ئەدات: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ بە راستی تەنیا رۆژێك لای خوای تۆ – واتە لەو رۆژانەی کە ئاسمان و زەوی تیا دروست کرد – وەکو هەزاران ساڵ وایە لەو ساڵانەی کە ئێوە ئەیان ژمێرن لەم جیهانەدا، مۆڵەت دان و دوا خستنی سزای ستەم کاران چەند حیکمەت و بەرژەوەندی تێدایە، نابێتە نیشانە لەسەر بەدی نەهاتن و رزگار بوونی تاوانباران وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ﴾ دانیشتوانی زۆر شار و وڵاتی مۆڵەتدا لەکاتێك دا کە ستەم کار و خاوەن جەور بوون، بەو مۆڵەت دانە قوتار نەبوون و لەدەست دەرنەچوون، ئەوە بوو ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهَا﴾ لەپاش دا قارم لێ گرتن و سزای بەتینی لە ریشە هێنەرم دان لەم جیهانەدا ﴿وَإِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ﴾ تەنیا بۆ لای من و بڕیاری من ئەگەڕێتەوە پاشە رۆژی هەموو کەس و هەموو شتێك لە هەردوو جیهان دا، کەواتە ئەو پەلە کەرانە با بزانن کە ئەمانیش پاشەرۆژیان بە وێنەی پاشەرۆژی تاوانبارەکانی رابردوو ئەبێت. لەم کاتەدا کە بەرباد بوونی گەلە بێ باوەڕە رابوردووەکانی خستە پێش چاو، باوی خوای روون کردەوە دەربارەی یاخی یە بێ باوەڕەکان لەم کاتەدا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمان ئەدات کە خەڵکی هەموو بترسێنێ و رووونی بکاتەوە بۆیان پاشەرۆژێ کە بە پیریەوە ئەچن. ئەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ بڵێ ئەی ئادەمیزاد من هیچ نیم جگە لەوەی ترسێنەرێکم بۆ ئێوە روون کەرەوەی هەر شتێکم کە پێویست بێ روون کردنەوەی بۆتان، واتە هیچ شتێکی تری ئێوەم بە دەست نی یە، پێشخستن و دواخستنی سزاتان وەکو هەموو کاروباریێ ترتان بە دەست خوایە. بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) هەرچۆنێ ترسێنەرە موژدە دەریشە، بەڵکو لە پێشەوە موژدە دەرە، بەڵام ئەم شوێنە و ئەم چەند ئایەتی رابوردووە هاتە خوارەوە لەبارەی ئەو کۆمەڵە بت پەرستە بێ باوەڕە، کە لاقرتی یان ئەکرد بە ئایینی خواو بە لاقرتی یەوە پەلەیان ئەنایەوە بە هاتنی سزای خوا، دەی کۆمەڵی وا تەنها ترساندنی شایانە و شایانی موژدە نین، تەنانەت زانایانی تەفسیر ئەفەرمون باسی پاداشت و پاشەرۆژی بەختەوەری باوەڕداران لێرەدا بۆ داخی دڵ و**

سزای دەروونی ئەو بێ باوەڕانەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئینجا ئەوانەی لەم جیهانەدا ئیمان و باوەڕیان هێناو بە پێی باوەڕەکەیان کردەوەو چاکەکانیان بەجێ هێنا ﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لەلایەن خواوە سڕینەوەی هەموو گوناهەکانیان و کەم و کوڕی یەکانیان، ڕۆزی و بەشێکی بەڕێز و پاك و خاوێن کە ناز و ڕێزی بەهەشتە ﴿وَٱلَّذِينَ سَعَوۡاْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾ کەسانێك کە تێکۆشانیان کردوە لەم جیهانەدا لە بەرگری و وەستاندنی ئایەتەکانی ئێمە لەوەی بچنە ناو دڵ و دەروون و بەدی هاتنیان لە ژیانی خەڵکی دا ئەوەش بە فاك و فیك و پڕ و پاگەندە و دڵ کرمین کردنی خەڵکی لە ئاستیان و بە هەر جۆرێك لە دەستیان هاتبێ ﴿مُعَٰجِزِينَ﴾ لە کاتێك دا مل ملان و بەر بەرەکانێمان لەگەڵ ئەکەن و وا تێ ئەگەن کە لە دەستمان دەرئەچن. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ ئەوانەی کە لەم جیهانەدا ئەوە کردەوەیان بووە کە باس کرا، ئەوانە لە ڕۆژی دوایی دا خاوەنی ئاگرێکی هەڵگڕاوی بڵێسە دارن و پێ یەوە نوساون و لێ ی جوێ نابنەوە. ئەو خوایەی کە ئاین و بانگەوازەکەی خۆی ئەپارێزێ لە بە درۆ خستنەوەی بێ باوەڕەکان و لە پەك خستن و بەرگری کردنی دوژمنان، هەروەها ئەو خوایە ئەیپارێزێ لە فڕ و فێڵی شەیتان و هەموو پیلانێکی کە ویستبێتی تێکەڵی بکات لە ڕێگەی هەندێ ئاوات و ئامانجی پێغەمبەران – درودی خوایان لێ بێت – کە بوویانە و داخوازی یان لێ کردووە و هەڵقوڵاون لە ڕووی سروشتی ئادەمێتی یانەوە، ئەو کۆمەڵە هەڵبژێرراوی خوا هەرچەند لەلایەن خواوە بەرگری کراون لە شەیتان و شەیتان نەیتوانیوە لەپاش پێغەمبەرێتی هیچ کارێکی ناڕەوایان پێ بکات، بەڵام ئەوانە ئادەمی بوون و بە پێی سروشتی ئادەمێتی جار بەجارێ هەندێ پەلە و بێ ئارامی ڕووی تێ کردوون لەبارەی فەرمان و بانگەوازەکەیانەوە، ویستوویانە بە زوویی و بە پەلە بڵاو ببێتەوە و زاڵ ببێ بێ هیچ پلە و دڕك و داڵێ لە ڕێگایان دا، زۆرجار داخ و مەراقی زۆریان خواردووە لە یاخێتی و ڕوو وەرگێڕانی بێ باوەڕە سەرکێشەکان، ئەو پەلە و بێ ئارامی و داخ و مەراقە هەرچەند لەبەر خوا و ئایینی خوا بوون، بەڵام شایانی پلە و ڕادەی بەرزی ئەوان نەبوو، چونکە ئەوان ئەبێ بە گوێرەی باو و سوننەت و سیفەتی خوا بجوڵێنەوە. جا لەم بارەیەوە شەیتان هەوڵ و تێکۆشانی کردووە کە فەرمان و بانگەوازەکەیان بە گوێرەی ئەو ئاوات و ئامانجە ئادەمی یانە بڕوا و لەسەر ڕەوڕەوە و شەقامە ڕاستەقینەکەی خۆی نەڕوا، ئینجا خواش ئەو فڕ و فێڵی شەیتانەی نەهێشتووە و ئاین و بانگەوازەکەی پاراستووە و ڕوونی کردووەتەوە بۆ پێغەمبەرەکانی بارە ڕێك و ڕاستەکە کە

خوا خۆی ئەزانێ ئەو بارە شایانە و بەجێ یە وەکو دەرئەنجامی لەم چەند ئایەتەوە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ﴾ تا ئەگاتە ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ پێش تەفسیری ئەم ئایەتە بە جوانی ئەزانم لێکۆڵینەوە لەوەی کە کراوە بەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە کە بلاو بووەتەوە لە کتێبەکانی تەفسیردا. لەم بارەوە ریوایەتی زۆر هەن و زۆر لە زانایانی تەفسیر باسیان کردووە.(ابن کثیر) لە تەفسیرەکەی دا ئەفەرموێ: بەڵام ئەو ریوایەتانە سەرجەم مورسەلن، واتە هیچ کام هیچ هاوەڵێکی پێغەمبەریان تێدا نی یە، هیچ کامیانم نەدیوە کە بە رێکی و لە رووی راستی یەوە تەواو بن. لەناو ئەو ریوایەتانەدا ریوایەتی(ابن ئەبی حاتەم) لە هەموویان درێژ ترە ئەڵێ:(موسای کوڕی موسای کوفەیی بۆی گێڕاوینەوە لە محمدی کوڕی ئیسحاقی شەیبی یەوە، ئەویش لە محمدی کوڕی فولەیحەوە، ئەویش لە موسا کوڕی عوقبە و ئەویش لە ئیبن شیهابەوە کە ئەڵێ: بت پەرستەکان بێزاری یان دەرئەبڕی لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەیان وت: ئەگەر ئەم پیاوە بە چاکە ناوی پەرستراوەکانی ئێمەی ببردایە ئێمە دانمان ئەنا بەخۆی و هاوەڵەکانی دا، بەڵام باسی جولەکە و نەسرانی یەکان ناکات کە زۆر پێچەوانەی ئایینەکەینی بە جوێن و خراپە، بە رادەی پەرستراوەکانی ئێمە، ئەوان بەو جۆرە بێزار بوون و ئاواتیان بوو کە ئەم رێك کەوێ، پێغەمبەریش(ﷺ) بە دەست بێ شەرمی و سزای ئەو سەرکێشانە بە گیر هاتبوو، دڵتەنگ بوو بەهۆی گومڕایی و باوەڕ نەهێنانەوە و ئاواتی بوو کە ئەوانە بێنە سەر رێگای راست، ئینجا کە سورەتی(النجم) هاتە خوارەوە خوێندیەوە بەسەریان دا، کاتێ ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ﴾ شەیتان لەناو بە ناوی خوێندنەوەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەم چەند وشەیەی وت: ﴿وإنهم لمن الغرانيق العلى، و إن شفاعتهن لترتجى﴾ ئەم چەند وشەیە لە هەڵبەست و هۆنراوەی شەیتان، ئینجا ئەم دوو وشەیە جێگیر بوو لە دڵی هەموو بت پەرستێك دا لە مەککە، زوبانیان بە وتنیان راهاتوو هەموو پێیان موژدە بەخش بوون، وتیان: محمد گەڕایەوە بۆ ئایینەکەی گەل و نەتەوەکەی، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە دوایی سورەتەکە و سوژدەی برد و هەموو ئەو کۆمەڵە بە موسڵمان و بت پەرستی یەوە سوژدەیان برد. بەس تەنیا وەلیدی کوڕی موغەیرە لەبەر پیری و قەڵەوی نەیتوانی سەرخاتە زەویی، پڕی مشتی کرد کرد لە خۆڵ و تەوێڵی نایە سەر لەباتی سوژدەدا، موسڵمانان سەریان سوڕما لە سوژدە بردنی بت پەرستەکان، چونکە ئەمان ئەم وتارەی شەیتانیان نەبیستبوو کە بت پەرستەکان بیستبوویان. بت پەرستەکانیش لایان وابوو کە ئەوەی وترا

هینی پێغەمبەره(ﷺ) لەبەر ئەوە لە دڵشادی یەوە سوژدەیان برد لەبەر ڕێزی بتەکانیان، ئینجا ئەمە دەنگی دایەوە و بڵاو بوویەوە تا گەیشتە حەبەشە و لەوێ هەواڵ درا کە مەککەیی یەکان هەموو موسڵمان بوون و لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژیان کردووە، موسڵمانەکان هیچ مەترسی یەکیان نەماوە لە مەککەدا، بەهۆی ئەوەوە ئەو موسڵمانانەی کە کۆچیان کرد بوو بۆ حەبەشە بە چەسپانی یەوە بەرە و مەککە گەڕانەوە، پێش ئەوەی بگەنە بەرەوە خوای گەورە شتەکەی ڕوون کردەوە و ئەوەی شەیتان وتی سڕی یەوە، قورئانەکەی خۆی ڕوون کردەوە و جویێ ی کردەوە لە دەست هەڵبەستەکەی شەیتان، لەو ڕووەوە بۆ دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم چەند ئایەتەی پێیەوە خەریکین هێنایە خوارەوە. ئینجا بت پەرستەکان لەو ئارام و ئاشتی یە پەشیمان بوونەوە و دەستیان کردەوە بە دوژمنایەتی و سزا و ئازار دانی موسڵمانەکان و توند و تیژیی یان بەهێز تر بوو لە ئاستیان، جا بەهۆی ئەوەوە ئەوانەی حەبەشە گەڕانەوە بۆ حەبەشە و نەیان توانی بمێننەوە لە مەککەدا. دوایی هات ڕیوایەتی(ئیبن و ئەبی حاتەم) و خۆمان خەریك ناکەین بە هەندێ لە ڕیوایەکانی ترەوە، چونکە پڕو پووچی و دەلەسەیی ئەوان زۆر ئاشکرایە، ئەوانەی بەو شێوەیە هەڵیان بەستووە زۆر نەفام و نەزان بوون، چونکە هەموو خاوەن ژیریی یە لە ڕێوە ئەزانێ کە شتەکە نەگونجاوە و دەست هەڵبەستە، کەواتە مەبەستە بۆگەنەکەیان بەجێ نایەت، بەڵێ(ابن کثیر) ئەفەرموێ: بەغەوی لە تەفسیرەکەی دا چەند ڕیوایەتێکی کۆ کردووەتەوە لە فەرمایشتی ئیبن و عەباس و محەمدی کوڕی کەعب و چەند کەسی تر و ئەو ڕیوایەتەی ئیبن و ئەبی حاتەم کە بە درێژیی هێنامان، لەپاشان پرسیارێك ئەکات: کە ئایا چۆن ئەم ڕیوایەتانە یەك ئەکەون لەگەڵ ئەمەدا کە پێغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بێت – لەلایەن خواوە پارێزراون و بەرگری کراون لە هەموو هەڵە و ناڕەوایی یەك لە ڕاگەیاندنی ئاین و فرمانی خۆیان دا؟! ئینجا چەند وەڵامێك ئەهێنێ لە لایەن هەندێ لە زانایانەوە بۆ پینە و پەڕۆی ئەم ڕیوایەتانە و گونجاندنی ئەم هەواڵە، ئاسکترینی ئەو وەڵامانە ئەمەیە: کە ماتوڵ ئەو دوو وشەیە لەلایەن شەیتانەوە بوو بە بێ ئاگایی پێغەمبەر(ﷺ) و تەنیا بە گوێچکەی بت پەرستەکان دا چووە و موسڵمانان نەیان بیستووە، هیچ زیانی نی یە و دژ و پێچەوانەی سیفەتی پارێزراوی و بەرگری کراوی پێغەمبەران نی یە، بە تایبەتی کە خوایش شتەکەی ڕوون کردەوە و هەڵبەستەکەی شەیتانی سڕی یەوە و بەتاڵی کردەوە. ئەمە بوو پاڵفتە کراوی ئەو ڕیوایەتانە، لەم قسە و باسەدا کە بەناوبانگە بە قسەو باسی غەرانیق. موستەشریقەکان و

تانەدەران لە ئەم ئایینە پاکە زۆر بە بەسۆز و خۆشی یەوە ئەم هەواڵ و باسەیان وەرگرت و بڵاویان کردەوە، بە تایبەتی دوو ریوایەتی تر جگە لەوەی وتمان بە درێژیی کە زۆر ئاشکرایە دەلەسەو پڕوپووچن، وەك ئەو ریوایەتەی کە ئەڵێ: شەیتان ئەم دوو وشەی هێنا بەدەمی پێغەمبەردا بەبێ ئاگایی خۆی. یان ئەو ریوایەتەی کە بۆگەن ترە لەمەو کوفرێکی ئاشکرایە کە ئەڵێ: ئەم وشەیانە پێغەمبەر(ﷺ) بە قەست وتی و مەبەستی ئەوەبوو کافرەکان راکێشێ بۆ لای ئاینی!! ئەو دوژمنە بەد نیهادانە ئەم ریوایەتانە و قسەو باسەیان گرت بە دەستەوە و کردیان بە بەڵگە بۆ تێك دانی مێشکی بێ ئاگا و نەشارەزاکان، بۆ ئەو مەبەستە تەپ و تۆزی زۆریان کرد و لایان وا بوو ئەگەن بە مەبەست و ئامانجی پیس و گڵاوی خۆیان، نەیان زانی کە دەریای بێ پەیی ئیسلام بە دەمی ئەوان پیس نابێ، نەیان زانی ئەو هەموو پڕو پاگەندەی ئەوان کردیان ئەڕوا بە با لەکاتی لێکۆڵینەوەو روون کردنەوەی راستی و حەقیقەت دا، نەیان زانی کە لە دەشتی چۆڵ و بیابانی گومڕایی دا شوێن سەراب کەوتوون، کەواتە لێرەدا پێویستە لە سێ بارەوە بدوێین:

١- لەبارەی راستی و ناڕاستی ئەم ریوایەتانەوە.

٢- تەفسیری ئەم چەند ئایەتە بە شێوە راستەقینەکەی کە بە هیچ جۆرێك پەیوەندی نی یە و نەبەستراون بەم باس و ریوایەتانەوە.

٣- هۆی سوژدە بردنی بت پەرستەکان کە شتێکە حەدیسی سەحیحی لەسەرە، هەروەها هۆی گەڕانەوەی موسڵمانەکانی حەبەشە.

جا بەڕێز هەرسێ مەبەستەکە بهێنین: لەبارەی یەکەمەوە ئەڵێین: کۆڕ و جەماوەری زانا بەهێز و باوەڕ پێ کراوەکان لە کۆن و تازە ئەم هەواڵ و ریوایەتانەیان بەلاوە دەلەسە و دەست هەڵبەستە لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە، بە چەند بەڵگە و نیشانەی روونی بەهێز روونیان کردووەتەوە ناڕاستی و پڕو پووچی سەرجەمی ئەو ریوایەتانە، هەرشتێك وتراوە لەبارەی راستی یانەوە هەمووی بەرپەرچی دراوەتەوە بە جۆرێ بەڕاستی هیچ رەوا نی یە بۆ هیچ کەس گومانی راستی یان پێ ببات. هەرکەس ئەیەوێت خۆی شارەزا بکات با تەماشای هەندێ لە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکان بکات بۆ وێنە وەکو(التفسير الكبير) و(روح المعاني). بۆ ئەمەی شتەکە بە کورتی کۆتایی پێ بێنین - چونکە پێویست نی یە بەو درێژە پێدانە - ئێمە لێرەدا تەنیا دوو نوختە ئەگرین بەدەستەوە، تەنیا دوو بەڵگە ئەهێنینەوە لەسەر

ناڕاستی و دەلەسەیی ئەو ڕیوایەتانە بە هەموو جۆرەکانیانەوە، دڵنیاین کە تەنیا ئەم دوو شتە بەسە و ڕێگای هیچ تەك و جمێ ناهێڵێتەوە بۆ هیچ زانا و تێگەیشتوویەك:

١- سەرجەمی ئەو ڕیوایەتانە لەبارەی سەنەدەوە - واتە ئەو کەسانەی کە هێناویانە و ڕیوایەتیان کردووە - بێ هێزو لاوازن و جێگەی باوەڕ نین، چونکە هیچ کامیان ناچنەوە سەر هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و هەرچی یەکیش بەو جۆرە بێ لای کۆڕ و جەماوەر پشتی پێ نابەسترێ و ناکرێت بە بەڵگە و رابەر، مەگەر قوڵ گیر و پشتیوانێکی هەبێ، بێگومان کۆڕ و جەماوەری زانا و پێشەواکان دژیانن چ جای قوڵ گرتن، بێجگە لەوەش زانایانی عیلمی حەدیس ئەفەرمون: هیچ کام لەوانەی خاوەنی حەدیسی سەحیحن ئەم ڕیوایەتانەیان نەهێناوە و وەریان نەگرتوون و لەبارەی مانا و مەبەستەوە دژ و پێچەوانەی دوو بەندن لە بەندەکانی ئایینی ئیسلام، ناگونجێ بە هیچ کلۆجێ لەگەڵ دوو بنەڕەت لە بنەڕەتەکانی ئایینی ئیسلام، یەکەم: تاك و تەنیایی خوا بە بێ شەریك و هاوبەش، دووەم: عیصمەتی پێغەمبەر(ﷺ) واتە بەرگری کراوی و پاراستنی لە هەموو هەڵەیەك لەبارەی راگەیاندن و پێغەمبەرێتی یەکەیەوە لە هەموو درۆ و دەلەسە و پیلان و دەست تێ خستنی شەیتانەوە.

٢- ئەم وتراوە دەست هەڵبەستە بە هیچ ڕەنگ ناگونجێ و جێگای نابێتەوە لەو شوێنەدا کە بۆی هەڵبەستراوە، چونکە سورەتەکە بە تێکڕایی و بە تایبەتی ئەو چەند ئایەتەی کە ویستوویانە ئەم وتراوەی تێکەڵ بکەن. ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴾ تا ئەگات ﴿وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا﴾ ئەمانە هەمووی باسی بێ نرخی و پووچی ئەو بتانە ئەکەن، کەواتە چۆن هەر لەو شوێنەدا نرخیان پێ ئەدرێ و ڕەوای بت پەرستی ئەدرێ؟! ئەو وتراوە بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ و جێگای نابێتەوە لەو شوێنەدا تەنانەت لەسەر ئەو ڕیوایەتەش کە ئەڵێ: تەنها شەیتان وتی و هەر بت پەرستەکانیش بیستیان ، چونکە شەیتان شەیتانە و فرە زانە کاری بێ سوود و بێ هودە ناکات و ئەیزانێ کە کەس بە شتی وا ناخەڵەتێ، هەروەها بت پەرستەکانیش عەرەب بوون و تێ ئەگەیشتن و حاڵی ئەبوون لە ئایەتەکانیش و لە وتراوەکەش، وەکو ئیفتراچی یەکان کەوەدەن و نەفام نەبوون و نەیان زانی کە ئەو ئایەتانە و ئەو وتراوە دژ و پێچەوانەی یەکترن، کەواتە چۆن دڵخۆش ئەبوون بەوە لە لایەکەوە وەسف و سەنای بتەکانیان بکرێ و هەر لەو کاتەدا بە پروپووچ دەرکرێن و ناڕەوایی یان ڕوون بکرێتەوە، خوا پەنامان بدات لە تێ

نەگەیشتن، بەم ئەندازە لێکۆڵینەوە گومان نامێنێ کە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم چەند ئایەتە ئەوە نەبووە کە لەو ڕیوایەتانەدا دەست هەڵبەست کراوە بەڵکو دیمەن و ڕواڵەتی ئایەتەکە وا پیشان ئەدات کە هۆی هاتنە خوارەوەیان شتێکی ترە کە بە شێوەیەکی گشتی ڕووی کردووەتە هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – و لە ڕەوانە کردنی هەموودا ئەو شتە ڕووی داوە، کەواتە ئەبێ هۆی هاتنە خوارەوەیان شتێك بێت کە هەموو پێغەمبەران تیای دا بەشدار بووبن بە پێی سروشتی ئادەمێتی یان بە بێ ئەمەی دژ و پێچەوانەی سیفەت و فرمانەکەیان بێت.

ئەو شتە گشتی یەش ئەمەیە کە بە یارمەتی خوا بە پێی تێگەیشتن و زانینمان ڕوونی ئەکەینەوە: بێگومان پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – کاتێ کە کراون بە پێغەمبەر و ئەو کار و ئەرکە گەورەیان خراوەتە سەرشان لە هەموو شت خۆشتر و مەبەست تر بۆیان ئەمە بووە کە خەڵکی کۆببنەوە لەسەر ئەو ئایینە پیرۆزەی کە بانگی مەردومیان بۆ ئەکرد، هەموو گوێ ڕایەڵ بن و بەشدار بن لەو پیت و فەڕەی کە لە لایەن خواوە بۆیان هاتووە، بەڵام کۆسپ و پلەی زۆر بەتین لە ڕێگایان دا بووە، پێغەمبەران ئاشکرایە لە ئادەمین و ئەبێ پاش ماوەیەك نەمێنن و کۆچی دوایی بکەن لەم جیهانەدا جا لەبەر ئەوە هەموو ئاواتیان ئەوە بووە کە بە زوویی خەڵکی ڕاکێشن بۆ لای ئایینی خوا، ویستویانە و پێ یان خۆش بووە کە لە هەندێ شت دا بە گوێرەی دڵیان بجوڵێنەوە و چاوپۆشی بکەن لەباو و داواو کرداریان بۆ ئەمەی ڕایان کێشن، ئینجا لە پاش دا بە پاك و خاوێنی پەروەردەیان بکەن، بە پێی ژیریی و لێزانی ئادەمی هەندێ کردەوەیان کردووە نیازی چەند شتێکیان کردووە بۆ بەرژەوەندی فرمانەکەیان کە ئەو کردەوە و شتانەش هەموو دروست و ڕەوا بوون، بەڵام بڕیاری باری باشتر و ڕێگای ڕاست تر هەبووە کە ئەوە بەجێ تر و پڕ لە بەرژەوەندی تر بووە بەلای خواوە، خوا لە یەکەم جارەوە ئاگاداری نەکردوون بەسەری دا، جا لەو جۆرە شتانەدا شەیتان هەوڵ و تێکۆشانی کردووە و پیلانی گێڕاوە بۆ لادانی فرمان و بانگەوازەکەیان لەبار و ڕێگا ڕاستەقینەکەی خوا، بەڵام لە پاش دا خوا پیلانەکانی شەیتانی بەتاڵ کردووەتەوە و بار و ڕێگا ڕاستەکەی خۆی زاڵ کردووە و پێغەمبەرەکانی ئەو ڕێگا و بارەیان داوەتە بەر کە خوا ویستوویەتی. ئینجا بۆ ڕوون کردنەوە چەن نموونەیەك ئەهێنین کە ڕوویان داوە لە ژیانی پاکی پێغەمبەردا(ﷺ) و لە مێژووی بانگەوازەکەی دا، یەکێ لەوانە ڕووداوی ئیبن و أم مکتوم: ئەوەبوو ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) خەریك بوو بە کۆمەڵێك لە سەرۆکەکانی قورەیشەوە و

بانگی ئەکردن بۆ ئیسلام، لەو کاتەدا ئیبن و ام مکتوم هاتە خزمەتی و چاوی نەبوو بەهۆی ئەوەوە نەیزانی بە خەریك بوونەکەی بەو کۆمەڵەوە، عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا فێرم بکە و زانام بکە بەوەی خوا فێری کردوویت و زانای کردویت پێی، چەند جارێك ئەو داوای دووبارە کردەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) وای لێ هات شتەکەی پێ ناخۆش بوو بە گرژی یەوە رووی لێ وەرگێڕا، دەی بە گوێرەی باوی خەڵکی ئەو کردەوەیەی کوڕی ام مکتوم زۆر بێ جێ و ناڕەوا بوو، بە پێی زانین و ژیریی ئادەمی ئەو گرژ بوون و روو وەرگێڕانە زۆر رێك و بەجێ بوو، خەریك بوونەکەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر گرنگ و پێویست بوو، چونکە یەکەم پلەی سەخت لە بەر پێی بانگەکەی ئیسلام دا لەو کاتەدا ئەو سەرۆکانە بوون، ئەگەر ئەوە نەمایە خەڵکی بە فراوانی موسڵمان ئەبوو، لەگەڵ ئەوەدا لای خوا خەریك بوونی بەو کوێرە لاوازە داماوەوە گرنگ ترو پێویست تر بوو، لەبەر ئەوە خوا شتەکەی روون کردەوە و بارە راستەکەی نیشان دا و کردەوەکەی پێغەمبەری(ﷺ) گێڕایەوە بۆ سەر ترازووە راستەکەی خۆی، ئەو گلەیی و عیتابە بەتینەی ئاراستەی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە کرد بە ناردنە خوارەوەی سەرەتای سورەتی(عبس): ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخۡشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنۡهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾ خوای گەورە پیلانی شەیتانی لەناو برد و ئایەتەکانی خۆی دامەزراو و جێگیر کرد و دڵی ئیماندارانی ئارام کرد بە ئایەتەکانی خۆی. پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەپاش ئەو رووداوە رێزی ئەگرت لە ام مکتوم کاتێك ئەیدی پێی ئەفەرمو: ﴿مرحبا بمن عاتبني فيه ربي﴾ لە هەندێ غەزادا ئەوی ئەکرد بە جێنشینی خۆی لە مەدینەدا بۆ پێش نوێژیی. نموونەیەکی تر ئەمەیە کە ئیمامی موسلیم لە پەڕاوە سەحیحەکەی دا ئەیهێنێ لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ئەفەرموێ: ئێمە شەش کەس بووین لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)، من و بیلال و کوڕی مسعود و سێ کەسی تر لە هەژار و بێ نەواکان، سەرۆکەکانی قورەیش داوایان کرد کە ئەم شەش کەسە دەربکات لە کۆڕی خۆی و ئەوان بێنە لای، ئەویش بە ئومێدی موسڵمان بوونی ئەو کۆمەڵە کەوتە دڵی و خەریك بوو بە گوێ یان بکات، ئینجا خوا فەرموی: ﴿وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ﴾ گێڕایەوە بۆ سەر ترازووە راستە نەگۆڕاوەکەی خۆی، پیلانی شەیتانی بەتاڵ کردەوە، بێجگە لەم دووانە چەند وێنەی تر هەن و پێویست نی یە هێنانیان، بۆ مەبەستەکەی ئێمە ئەم دووانە بەسە.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٢﴾ لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤۡمِنُواْ بِهِۦ فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٤﴾

---

ئینجا دێینه سەر باسی دووەم کە بریتی یە لە تەفسیر کردنەوەی ئایەتەکان کە هیچ پەیوەندی یان نەبیّ بەو ریوایەتانەوە، لەبەر رووناکی ئەو دوو نموونە و وێنەیە کە وتران، ئەڵێین: خوای گەورە دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات و دڵگرانی نامێڵیّ بەرامبەر بەو جۆرە نیاز و ئاواتانە کە رووی تیّ ئەکرد کە پێچەوانەی ئەوانە لای خوا چاکتر بوون، ئەفەرمویّ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ﴾ هەر پێغەمبەرێکمان لە پێش تۆ رەوانە کردبیّ چ پێغەمبەریّ کە ئایین و شەریعەتێکی بۆ هاتبیّ و فەرمان درا بیّ بە راگەیاندنی، چ پێغەمبەرێك کە بەو جۆرە نەبووبیّ، هەرکام لەمانە کاتیّ بڕیاری شتێکی دا بیّ لە دەروونی خۆی دا کە خواست و ئاواتی خۆی بووبیّ شەیتان شتی ناڕەوای خستووەتە ناو خواست و ئاواتەکەیەوە ﴿فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ ئینجا خوا ئەوەی شەیتانی سڕیوەتەوە و نەیهێشتووە بەمەی پێغەمبەرەکەی پاراستووە لە مەیل و ئارەزووی هینەکەی شەیتان، رێنموونی کردووە بۆ باریّ کە خوا خۆی پیّ ی خۆش بووە و هۆی نەهێشتنی بارەکەی شەیتانە، ﴿ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ﴾ لەپاش دا خوا رابەر و نیشانە روونەکانی خۆی چەسپاندووە، دایمەزراندوون کە پاڵپێوەنەر و هۆی راوەستان و دامەزرانن لەسەر بارو رێگا راستەکەی خۆی، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ خوا زانا و ئاگادارە لە هەموو کارو بارو بەسەرهاتی خەڵکی، لێزان و کاردروستە لە هەموو کار و کرداری دا، زۆر لە زانایان ئەفەرمون: وشەی ﴿تمنى﴾ یەکە لەگەڵ ﴿قرأ﴾ واتە: خوێندی، لەسەر ئەم بار و رایەش ئەڵێین: خوا ئەفەرمویّ:

هەر پێغەمبەرێکمان لە پێش تۆوە رەوانە کردبێ لە کاتێك دا کە سروش کراوی خوای خوێندبێ بەسەر خەڵك دا شەیتان گومان و دوو دڵی و شتی پڕ و پووچی ئەخستە ناو خوێنراوەکەیەوە، واتە هەوڵی ئەدا خەڵکی لە ئاستی بێ باوەڕ و دڵ کرمێن بکات، بۆ وێنە لە بارەی ئەم پێغەمبەر و قورئانەوە ئەیخستە دڵیان کە محمد جادوبازە و ئەمەی ئەیڵێ جادووە، یان دەست هەڵبەستی خۆیەتی، یان لە خەڵکی یەوە فێر بووە، یان هەر بڕیارێ کە پێچەوانەی باو و بڕیاری خۆیان بوایە چەند شتی پڕ و پووچی ئەخستە دڵیانەوە، بۆ وێنە: کاتێ مردارەوە بوو و سەر براوی بۆ بتەکان قەدەغە کرد شەیتان ئەیخستە دڵیان کە چۆن کوژراوی خوا قەدەغە ئەکات و کوژراوی خۆی رەوا ئەدات؟ هەروەها لەم بابەتانە شتی پڕو پووچی زۆر هەن، بەڵام خوا هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکانی شەیتانی لەناوبرد و ئایەتەکانی خۆی جێگیر و دامەزراو کرد بە جۆرێ ١٤٠٠ ساڵە شەیتان بەخۆی و هەموو جێگیر و جێنشینەکانی یەوە لە ئادەمی لە کۆن و تازەوە و لە ناوخۆ و لە دەرەوەی وڵاتی ئیسلام دا هەوڵ و تێکۆشانیان کرد و پیلانیان گێڕا و پڕ و پاگەندەیان بڵاو کردەوە بۆ ئەمەی باوەڕی باوەڕداران لاواز بکەن و بەرگری بڵاو بوونەوەی ئیسلام بکەن، کەچی بە کوێرایی چاویان تا بێت گەورەیی و راستی و گونجاوی ئیسلام روون ئەبێتەوە، باوەڕی باوەڕداران بەهێز تر ئەبێت، بێگومان تا جیهان بەرە و پێشکەوتن بڕوات لە زانین و زانیاری دا ئیسلام جێگیر تر و دامەزراو تر ئەبێت و هەموو فیك و فاك و پڕ و پاگەندەی دوژمنان بۆش تر و بێ نرخ تر دەرئەچن، ئینجا روونی ئەکاتەوە هۆی ئەو رێگادان بە شەیتان و بەر بەرەڵا کردنەی، تا توانی دەست بخاتە کارو باری پێغەمبەران – درودی خوایان لێ بێت – ئەفەرموێ:

١- ﴿لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِي ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ خوا ئەو دەسەڵاتەی دا بە شەیتان و رێگای دا تا ئەوەی شەیتان کردی خوا بیکێڕێ بە هۆی گومڕایی و سزا، یان بەهۆی تاقی کردنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە نەخۆشی گومان و دوو دڵی و ناپاکی هەیە لە دڵیان دا و بۆ ئەوانەی دڵیان رەقە لە ئاستی ئایینی خوا و هەرگیز باوەڕ ناهێنن ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾ ئەو دوو کۆمەڵە کە زاڵم و ستەم کارن لە

دوژمنایەتی و بەرامبەر کێ یەکی زۆر دوور دان، واتە زۆر دوژمن و دژ و پێچەوانەی ئایینی خوا و پێغەمبەر و باوەڕدارانن، کەواتە چاوەڕوانی خێرو بێریان لێ ناکرێ و گەڕانەوەیان نابێ لە گومڕایی یەك کە وان لەسەری.

٢- ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ بۆ ئەمەی ئەوانەی کە زانینیان پێ دراوە – واتە باوەڕ داران – بزانن کە ئەو ڕێگا دان بە شەیتانە شتێکی ڕاستە و بەجێ یە و بەرژەوەندی تێدایە لە لایەن پەروەردگارتەوە ﴿فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ﴾ بەهۆی ئەو زانینەوە بەردەوام و دامەزراو ئەبن لەسەر باوەڕ بە پەروەردگارت ﴿فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ﴾ ئینجا بەهۆی ئەوەوە دڵەکانیان مل کەچ ئەبێ بۆ خوا و سام و ترسیان ئەبێ، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بەڕاستی خوا ڕێنموونی کەری ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە و ڕابەریانە بۆ ڕێگای ڕاست، واتە بەهۆی باوەڕەکەیانەوە خوا نایەڵێ سەریان لێ بشێوێ و گومڕا ببن، هەر کرێ و کۆسپێ بێتە ڕێگایان خوا ڕابەری یان ئەکات بۆ کردنەوە و تەخت کردنی، کەواتە هەرگیز سەرگەردان و سەر لێ شێواو نابن و گومان و بێ ئاگایی دڵیان داگیر ناکات، بە فاك و فیك و پڕ و پووچ و تورەهاتی دوژمنانی ئاین پێ یان هەڵناخلیسکێ، لێکۆڵینەوە و دوان لەباری یەکەم و دووەم لەو سێ بارەی کە وتمان لێرەدا دوایی هات.

ئینجا ماوەتەوە دووان لەباری سێ یەم کە بریتی یە لە هۆی سوژدە بردنی کافرەکان لەگەڵ پێغەمبەر و یارانی دا و بوو بەهۆی گەڕانەوەی ئەو تاقمەی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە. بۆ ئەم مەبەستەش ئەڵێین: شتێکی ئاشکرایە کە ئەم قورئانە هێز و دەسەڵاتێکی زۆر گرنگ و بەتینی هەیە بەسەر دڵ و دەروون دا و گەلێ جار بەجۆرێ کاری کردووە لە هەندێ دڵ و دەروون، مەردوم سەرسام و سەرگەردان ئەکات. بۆ نموونە با تەماشای ئەو چوار ڕووداوە بکرێ کە لە سورەتی(ص) و(حم) ی سوژدەدا نوسیمان لەکاتی تەفسیریان دا کە خوا وای ڕێك خست لەپێش ئەم سورەتەوە ئەوانم تەفسیر کردەوە، با تەماشای ئەو چوار ڕووداوە بکرێ کە پیشانی ئەدەن تا چ ڕادەیەك ئەم قورئانە بەهێز و کاریگەرە تەنانەت لە دەروونی

ئەو کۆمەڵە مل هوڕە سەرکێشەی قورەیشدا؟! ئەوانە مەترسی یان لەکار کردنی ئەم قورئانە لە رادەیەك دا بوو لەکاتی قورئان خوێندنی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەیان کرد بە هۆسە و چەپڵە لێدان و وتارو شیعر و وێژە وتن تا گوێ ی لێ نەگیرێ و کاریان لێ نەکات، کەواتە راست نی یە کە سەر سوڕ بمێنێ لەو سوژدە بردنەیان، لەگەڵ موسڵمانەکان دا لەکاتی بیستن و گوێ گرتنیان لەسورەتی(النجم). بە تایبەتی لەکاتێك دا کە قورئان خوێنەکە پێغەمبەر بێت(ﷺ) کە ویستبێتی بە تایبەتی بیخوێنێ بەسەریان دا بەو رۆح و هەستەی کە پێ ی وەرگرتووە لە جوبرەئیلەوە، ویستبێتی بەو رۆحە تایبەتی یە بیخوێنێ بەسەریان دا بۆ کار لێ کردنیان، بێگومان زۆر جێ ی خۆیەتی کە بەو جۆرە کاری لێ کردبن و تا ئەو رادەیە خۆیان پێ نەگیرێ سوژدە بەرن و بکەون بە روودا بۆ ئەو خوایەی کە باوەڕیان هەبوو بە بوون و پەروەردگارێتی بۆ خۆیان و ئەو بوونەوەرەی تیای دا ئەژین و بتەکانیان ئەپەرست بە نیازی ئەوە نزیکیان بخەنەوە لە خواوە، ئینجا دیارە ئەو هەواڵی سوژدە بردنە کاتێ گەیشتە موسڵمانەکانی حەبەشە دڵنیای کردن کە هەموو قورەیش موسڵمان بوون و باوەڕیان هێناوە ئیتر چۆن لە خۆشی دا بە چەسپانی نەگەڕێنەوە بە تایبەتی لە پێش ئەو رووداوەدا حەزرەتی عومەر موسڵمان بوو بەهۆی ئەوەوە موسڵمانەکانی مەککە دەسەڵات و هێزێکیان پەیدا کرد و ئەو هەواڵەیشیان پێ گەیشتبوو، لێرەدا دوایی هات ئەم باسە کە بەناوبانگە بە مەسەلەی غەزانیق، باوەڕم وایە هەرکەس بەچاوی ئینسافەوە ورد بێتەوە لەمەی کە لەم بارەیەوە نووسیمان و وەرمان گرت لە فەرمایشتی زانا بەرزەکانی ئیسلام، هەرکەس بەو چاوە راستی یەوە ورد بێتەوە هیچ جۆرە گەرد و گرێ یەك نامێنێ لەدڵی دا لەبارەی دەست هەڵبەستی و دەلەسەیی ئەم هەواڵە و ئەم مەسەلە ناڕاستەوە، ئەزانێ کە ئەم ئایەتانە هیچ پەیوەندی نی یە بەم مەسەلەیەوە، تەفسیرە راست و بێگەردەکەی ئەمەیە کە وتراوە، خوا بمان پارێزێ لە شوێن کەوتن و باوەڕ بە شتی پڕ و پووچ.

وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ
عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى
جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥٧﴾

---

ئینجا حاڵ و پاشەرۆژی تاقمی یەکەم باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ﴾ ئەوانەی کە کافر و بێ باوەڕن کۆتایی ناهێنن و هەمیشە لە گومان و دوو دڵی دان لە قورئان و باوەڕی پێ ناهێنن ﴿حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً﴾ هەتا ڕۆژی دوایی یان بۆ دێت ﴿أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ﴾ یان سزای ڕۆژێکیان بۆ دێت کە بێ پیت و فەڕە بۆیان و ڕۆژی تری بە دوادا نایەت، بەڵکو نەبڕاوە و هەمیشەیی یە ﴿ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾ پاشایەتی و دەسەڵات لەو ڕۆژەدا تەنیا هینی خوایە و تایبەتی یە بە خواوە، واتە بە وێنەی ئەم ڕۆژ و جیهانە نی یە کە بە دیمەن و ڕواڵەت خەڵکی موڵک و دەسەڵاتیان هەیە، بەڵکو لەو ڕۆژەدا هیچ کەس هیچی بەدەست نی یە بە دیمەن و ڕواڵەتیش، ئینجا با بزانین لەو ڕۆژەدا خوا چی ئەکات دەربارەی خەڵکی؟ ﴿يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ بڕیارو حوکم ڕانی ئەکات لە نێوانیان دا، پاداشت و تۆڵەی ئەداتەوە و ئەیسێنێ وەکو بە کورتی ڕوونی ئەکاتەوە بەم فەرمودەیە: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ ئەوانەی لەم جیهانەدا باوەڕیان هێناوە بە ئایینی خوا و کردەوەی چاکیان کردووە ئەوانە وان لە بەهەشتانی ناز و نیعمەت دا، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەوانەی کە کافر بوون و باوەڕیان نەهێنا و ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دائەنا ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ ئەوانە بەهۆی ئەوەوە لەم جیهانەدا بەو جۆرە بوون سزایەکی ڕیسواکەریان بۆ هەیە کە بێ ئابڕوو سەر شۆڕیان ئەکات بێجگە لە ئێش و ئازارەکەی ئەوەش لە تۆڵەی مل هوڕی و لوت بەرزی ئەم جیهانەیان. ئینجا بە تایبەتی باسی پاداشتی تایبەتی ئەو کۆمەڵەی کە کۆچیان کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە لە پێش گرتنی شاری مەککە و هاتنی ئەو بۆ ژێر ئاڵای ئیسلام،

وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ
وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ
حَلِيمٞ ﴿٥٩﴾ ذَٰلِكَۖ وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ
لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ﴿٦٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ﴾ ئەوانەی کە کۆچیان کرد لە ڕێگای خوادا و بەسە لەبەر ڕەزامەندی خوا لە پاش دا کوژران، یان مردن بەبێ کوشتن ﴿لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ﴾ سوێند بە خوا ئەوانە خوا بەش و ڕۆزی یەکی چاك و شیرینیان ئەداتێ کە تایبەتی یە بەوانەوە ئیتر لەم ماوەی کە پێی ئەوترێ بەرزەخ، واتە ماوەی مانەوەی گۆڕ و دوای مردن تا کاتی زیندوو بوونەوەی ڕۆژی دوایی، یان ڕۆزی یەکی جیاوازی تایبەتی لە بەهەشت دا ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ بێگومان خوا باشترینی ڕۆزی دەرانە، چونکە خوا بە بێ حیساب و ژمارە ئەیدات، خوا بەبێ پێویست و چاوەڕوانی پاداشت و بریتی ئەیدات، ئەوەی خوا ئەیدات خۆی دروستی کردووە و هینی خۆیەتی و تەنیا خوا ڕۆزی دەری ڕاستەقینەیە، بەڵام خەڵکی هەر شتێك بدا بە چاوەڕوانی شتێك و بریتی ئەیدات، هەرچی ئەدات بە حیساب و ژمارەیە و بە ڕواڵەت نەبێ خاوەنی هیچ شتێك نی یە کە ئەیدات بەڵکو هەرچی ئەدات هینی خوایە، ﴿لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۚ﴾ سوێند بەخوا خوا ئەوانە ئەخاتە جێ و شوێنێ کە خۆیان پێی ڕازین، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾ بەڕاستی خوا زانا و ئاگادارە بە هەموو بارو حاڵێکی ئەمانیش و دوژمنەکانیشیان، ئەمانە بەو جۆرە پاداشت ئەداتەوە و تۆڵەش ئەسێنێ لەو دوژمنە ستەم کارانەیان، بەڵام وەکو ئاگادارە زۆر بە دەروونە و پەلە ناکات لە تۆڵە سەندن دا، ئەو کەسانەی کە کۆچ ئەکەن لە ڕێگای خوادا خۆیان ڕووت ئەکەن لە هەموو شتێك دا دەروون حەزی لێ بکات، لە هەموو شتێك کە شانازی پێوە ئەکات و سوورە لەسەری، سامان و دارایی و خزم و کەس و کار و وڵات و نیشتمان، دەست لەمانە هەموو هەڵئەگرن لە ڕێگای ڕەزامەندی خوادا و لە پێناوی

ئایینی خوادا، کەواتە مافی خۆیانە بەو جۆرە بە گرنگ بگیرێن ئیتر با لەو ڕێگایەدا نەکوژرێن و لەسەر ڕێگای خۆیان بمرن، چونکە هەموو گیانی خۆیان خستووەتە سەر دەستیان بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە. جا ئیتر ئەگەر خوا کوژرانی بە نسیب نەکا ئەو بڵێ چی؟ ئەوانە دەستیان نا بە هەموو بەش و ڕۆزی یەکیانەوە لەم جیهانەدا، کەواتە خوای خاوەن بەزەیی ئەو بەش و ڕۆزی یە گەورەیان ئەداتێ لە بریتی دا کە گەورەتر و بەڕێز ترو خۆشتر و بە نرخ ترە لەوەی لە دەستیان چووە، ئەوانە لە جێگا و شوێنی خۆیان دەرچوون بۆ شوێنێك کە خوا پێی خۆشە، کەواتە خوایش لە بریتی ئەوەدا ئەیانخاتە جێ و شوێنێك کە دەروونیان حەزی پێ کات و ڕازی بێت پێی. ئینجا بە شێوەی گشتی باسی حوکم و بڕیارێکی گشتی ئەکات لەبارەی ئەو کەسانەی کە دەست درێژیی یان لێ کراوە، بۆ گەیاندنی دوا هاتنی مەبەستی پێشوو، دەست کردن بە مەبەستێکی تری سەربەخۆ و وشەی ﴿ذلك﴾ ئەهێنێ کە بە گوێرەی زمانی عەرەبی لەم جۆرە شوێنانەدا ئەو وشەیە بەکار ئەهێنێ بۆ جیا کردنەوەو پچڕینی دوو مەبەست و وتار لە یەکتر، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ کار ئەوەبوو کە باس کرا و دوایی هات ئەوا دەست ئەکرێ بەم مەبەستی ترە: ﴿وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ﴾ هەرکەسێك تۆڵە بسێنێ لە دەست درێژیی کەر بە وێنەی تاوان و دەست درێژیی یەکە کە لێ ی کراوە ﴿ثُمَّ بُغِىَ عَلَيْهِ﴾ لە پاشان هەمی تر دەست درێژیی لەسەر کرا ﴿لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ﴾ بێگومان خوا یارمەتی ئەدات و زاڵی ئەکات بەسەر ئەو دەست درێژیی کەرەدا. بێگومان چاوپۆشی و لێ بوردن بەلای خواوە چاکترە و جێگای لێ خۆش بوونە و هۆی ڕەزامەندی خوایە، بەڵام ئەگەر هات و دەست درێژیی لێ کراو ئەو بارە چاکەی نەگرت و شوێنی پێ خۆش بوونی دڵ و دەروونی خۆی کەوت، و تۆڵەی سەند، خوا هەر یارمەتی ئەدات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ چونکە خوا زۆر لێ بوردە و داشاردەرە، ئەبورێ و چاوپۆشی ئەکات لەو تۆڵە سێنەرە کە شوێنی پێ خۆش بوونی خوا نەکەوت و شوێنی ئارەزووی خۆی کەوت و ئەو بارە ناڕاستەی دائەشارێ و ئەیسڕێتەوە. ئینجا دڵ بەهێز ئەکات و دڵنیای ئەکات لەسەر ئەو یارمەتی دانە بە پیشاندان و سەرنج ڕاکێشان بۆ چەند بەڵگە و نیشانەیەکی گرنگ لەم بوونەوەرەدا کە هەندێکن لە بەرهەم و دروشمی دەسەڵات و توانای بێ سنووری خوا،

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ
(٦١) ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ
ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ (٦٢) أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ مُخۡضَرَّةًۚ إِنَّ
ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ (٦٣)

---

ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾ ئەو یارمەتی دان و زاڵ کردنە بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا شەو ئەخاتە ناو ڕۆژ و ڕۆژ ئەخاتە ناو شەو، بەم ڕەنگە لە شەو ئەخاتە سەر ڕۆژ لە هەندێ وەرزدا و لە ڕۆژیش ئەخاتە سەر شەو لە هەندێ وەرزی تردا، یان تاریکی شەو ئەهێنێ بەسەر شوێنی ڕووناکی ڕۆژدا و ڕووناکی ئەهێنێ بەسەر شوێنی تاریکی شەودا، واتە ئەو یارمەتی دان و زاڵ کردنە بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا توانا و دەسەلأت دارە بەسەر زاڵ کردنی هەندێ لە دروست کراوەکانی بەسەر هەندێکی تردا کە دژی یەکترن، بە نۆبە هەر جارێك یەکێ زاڵ ئەکات، بۆ وێنە وەکو شەو و ڕۆژ. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ﴾ ئەو زاڵ کردنە بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا بیسەر و بینایە، قسەی دەست درێژیی کەر و دەست درێژیی لەسەر کراو ئەبیستێ و کردەوەیان هەموو ئەبینێ!! بێگومان شەو خستنە ناو ڕۆژ و ڕۆژ خستنە ناو شەو بە هەر جۆر و بارێ بیگری بە ڕژێمێکی زۆر تێرو تەواو و ساڵ دوانزەی مانگ دێن ئەچن لە پێش چاومانەوە، بەڕاستی ئێجگار شتێکی سەر سوڕهێنەرن، نیشانە و بەڵگەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکران لەسەر زانین و توانین و لێزانی و کاردروستی خوای گەورە، بەڵام بەهۆی ئولفەت و شێوە گرتنەوە دڵ بێ هۆش و بێ ئاگا ئەبێت لە نایابی و سەر سوڕهێنەرێتی یەکەیان لەبەر ئەوە قورئان هەموو جارێ سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئەم جۆرە شتە گرنگانە و دڵ بێدار ئەکاتەوە و باوەڕ بە پەروەردگار بەهێز و دامەزراو تر ئەکات، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ ئەو زانین و توانینە تەواوەش بەهۆی ئەوەوەیە کە تەنیا خوا ڕاست و خۆی بەخۆی هەیە و ئەبێ هەر بێ و نەبوونی بە هیچ کلۆج ناگونجێ،

تەنیا ئەو خوایە سەرچاوەیە بۆ بوونی هەموو شتێك و تەنیا ئەو خوایە و جگە لەو شایانی پەرستن نی یە ﴿وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ﴾ ئەوەی کە خەڵکی هاواری لیٚ ئەکەن و ئەیپەرستن بێجگە لەخوا ئەوە ناڕاستە و نەبوونی و نە هیچ شتێکی بەخۆی نی یە و لەخۆیەوە نی یە و بە هیچ جۆرێك شایانی پەرستن و داوا و هاوار لیٚ کردنی نی یە. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ تەنیا خوا بڵندە بەسەر هەموو شتێك دا و گەورەیە، کەواتە هیچ کەس و هیچ شت شایانی ئەوە نی یە بکریٚ بە هاوبەش بۆ خوا. ئینجا بە بۆنەی باسی شەو و ڕۆژەوە ئەڕوا بۆ باس و پیشاندانی هەندیٚ تر لە بەڵگەو نیشانە ڕوونەکانی و بەرهەمە نایابەکانی توانین و زانینی خوا لەم بوونەوەرەدا، ئەفەرمویٚ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ ئایا نەت زانیوە و نابینی کە خوا لەلای سەرووەوە ئاوی باران ئەبارێنیٚ و ئەیهێنێتەوە خوارەوە ﴿فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً﴾ بەهۆی ئەوەوە زەوی ئەگەڕیٚ بە خاوەن سەوزی و لەگیا و گژە و کشت و کاڵ و دار و درەخت، لەپاش ئەوەی ئەو زەوی یە بە پێش چاوەیە وشك و برنگ و بیٚ هیچ سەوزی یە، هاتنە خوارەوەی باران و بینینی زەوی بە سەوزی لە ماوەی شەو و ڕۆژێك دا بەو شێوە شیرینە کە هەمووەمان ئەزانین، بەڕاستی وەکو شەو و ڕۆژە کە زۆر زۆر هۆی سەرسامی یە ئەمیش وەکو ئەوان ئولفەت پێوە گرتنی نایابی یەکەی لە پێش چاو ناهێڵیٚ، بەڵام کە کاتیٚ چاو و هەست کرایەوە بێگومان ئەو شتە نایابە و شێوە شیرینە دڵ و دەروون ئەهێنێتە سۆز و پەرۆش و جۆش و هەندیٚ جار کە ئەو چڵە گیا سەوزە ئەبینیٚ لەو قوڕە ڕەشە دێتە دەرەوە دڵ وا هەست ئەکات کە ئەو چڵە سەوزانە هەموو بێچوو ڕۆڵەیەکی ورد و بچکۆلانەن زەردە خەنە ئەکەن بەدەم تەماشا کەرانەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا زانینی ئەگات بە هەموو شتێکی ورد و درشت و ئاشکرا و شاراوە، یان خاوەن لوتف و بەهرەیە بە بەندەکانی، سوود و قازانجیان پیٚ ئەگەیەنێت بە نەرم و ئاسکی و ئاگادار و زانایە بە چارەسەر و تەگبیری هەموو شتێك، ئاشکرا و نهێنی و بە زانین و ئاگاداری و سەرپەرشتی خوا هەموو کاروباریٚ ئەڕوات بەڕێوە،

لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ

---

﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ﴾ هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دا هینی خوایە بە دروست کردن و بە خاوەنی و موڵکایەتی. ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ بەڕاستی تەنیا خوا بێ پێویستە بە هیچ شتێك، شایانی سوپاسە لە ئاسمان و زەوی دا لە لایەن هەموو بەندەکانی یەوە، چەند نیشانە و بەڵگەی تری ئاشکرا ئەمانەن کە لەم دوو ئایەتە کورتەدا پیشانیان ئەدات: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا نەت زانیوە کە خوا ژێر باری کردووە بۆ ئێوە هەرچی وا لە زەوی دا، ئامادەی کردووە بۆ سوود و بەرژەوەندی ئێوە لەم زەوی یەدا چەند هێز و چەند سەروەت و سامان هەیە کە خوا ژێر باری کردووە بۆ ئەم ئادەمی یە، کە ئەمیش بێ ئاگایە و لەبیری ئەچێ ئەو هەموو ناز و نیعمەت و چاکەی کە شەو و رۆژ ئەم دیو دیو ئەکات تیای دا!! بەڵێ هەرچی وا لەم زەوی یە پان و فراوانەدا خوای گەورە هەمووی ژێر بار کردووە خزمەت چی یەکی کەمەر بەستەیە بۆ ئەم ئادەمی یە، هەموو شتی ئەم زەوی یەی رێك و پێك کردوە لەگەڵ سروشت و هێز و وزە، ئەگەر خوا بەم جۆرە رێك و پێك و گونجاوی نەکردایە ئادەمی هەر ژیانی بۆ نەئەکرا چ جای سوود و کەڵك وەرگرێ لە زەوی و ئەوەی وا لە زەوی دا، ئەگەر پێك هێنان و پێکەوە نانی لەشی ئادەمی بەم جۆرەی ئێستای نەبوایە کە رێك و پێکە لەگەڵ ئاو و هەوا و خۆراکەکەی دا ژیانی بۆ نەئەکرا، ئەگەر هەوا لە رووی زەوی دا نەبوایە، یان جیاواز بوایە لەم بارەی ئێستای لە ئاسکی و سووکی و ئەستووری و قورسی و قەڵەوی دا ئادەمی ئەخنکا، یان دەستە پاچە ئەبوو لەوەی هۆی ژیان هەڵمژێ بەهۆی هەواوە، هەروەها هەموو شتەکانی تری ئەم زەوی یە و ئەوەی وا لەم زەوی یەدا کە لێك دانەوەی زۆر درێژە ئەکێشێ و پێویستیش ناکات بەو درێژە پێدانە لە هەموو شوێنێك دا جا ئەم رێکی و پێکی و گونجاوی یە، بەهۆی ژێر بار بوونی زەوی یە و ئەوەی وا لە زەوی دا،

دیارە ئەوەش بە بڕیار و فەرمانی خوایە، خوای گەورە زەوی و ئەوەی وا لە زەوی دا ژێر باری کردووە بۆ ئادەمی بەهۆی ئەوەوە ئادەمی کردووە بە خاوەنی ئەو هەموو هێز و وزە و ژیریی و لێزانی یە، کە دەست ئەدەن و شیاون بۆ دۆزینەوە و دەست خستنی ئەو هەموو سەروەت و سامان و هێزەی کە خوا لەم زەوی یەدا دروستی کردووە کە بەرە بەرە ئادەمی ڕێی پێ بردن و ڕێ یان پێ ئەبەن و ئەیدۆزنەوە یەك لە دوای یەك بە جۆرێ هەرکات پێویستی پەیدا بکات بە شتێکی تازە قاپی لێ ئەکاتەوە بۆ دۆزینەوە و دەست خستنی ئەوەی پێویستی پێ هەیە و هەر جارێ بیم و ترس پەیدا بکات لە نەمان و دوا هاتنی ئەوشتە، کە پێویستی یەتی، خوا شتی تری بۆ دەرئەخات لە بریتی و جێگای دا، بۆ وێنە نەوت و ئەوەی لە نەوت فەراهەم دێت کە ژیانی ئەمڕۆی لەسەرە خوا بۆی دەرخست، شتەکە بیم ئەکرێ لە نەمان و دواهاتنی، خوا قاپی غەزنەیەکی تری لێ کردەوە کە بریتی یە لە غەزنەی هێزی زەڕە و هایدرۆجین، ئەگەرچی هێشتا بە وێنەی منداڵ وایە کە لاقرتی و دەست بازی بکات بە ئاگر، کە لەوانەیە خۆیشی و خەڵکیش بسووتێنێ مەگەر خوا فێری بکات، ڕێنموونی بکات بۆ ڕێگای بەکار هێنانیان بۆ سوود و بەرژەوەندی و ئاوەدان کردنەوەی وڵات.

﴿وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ﴾ خوا کەشتی ژێربار کرد بۆ ئێوە کە لە کاتێك دا لە دەریادا ئەگەڕێ و هات و چۆ ئەکات بەفەرمانی خوا، بێگومان چەند هۆیەکی تایبەتی هەیە بۆ پێك هاتنی ئەم کارە گرنگە کە ئادەمی پێویستی هەیە پێی وەکو لە چەند شوێنێکی تردا باس کرا، ئینجا خوا ئادەمی فێر کرد و ڕابەریی کرد بۆ پێك هێنان و بەکارهێنانی کەشتی لە بەرژەوەندی ژیان دا، ئەگەر یەکێك لەم هۆیانە نەبوایە یان ئادەمی فێر نەکردایە ئەم کارە گرنگەی بەدی نەئەهات، کەواتە ئەم ژێر بار کردنە هەرچۆنێ بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر زانین و لێزانینی و کاردروستی و تەواوی خوا، هەروەها چاکە و بەهرەیەکی ئێجگار گەورەیە، بە بێ ئەو ژیان لەم جیهانەدا ناڕێك و ناتەواوە،

وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ

﴿وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ﴾ **خوا ئاسمانی راگیر کردووە لەمەی بکەوێ بەسەر زەوی دا مەگەر بە مەیلی و خواهیشی خۆی وەکو لە کاتی وێران بوون و تێك چوونی ئەم جیهان و هاتنی رۆژی دوایی دا، خوای گەورە ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە بە گوێرەی ئەو رژێمەی بۆی داناوە و هەڵی بژاردووە بۆی، بەپێی ئەو رژێم و ناموسە ئەو هەموو ئەستێرە و مانگ و رۆژەی راگیر کردووە و بەرزی کردوونەتەوە و دوور لە یەکتر و هەر یەکە خولگەی تایبەتی خۆی هەیە بێ وەستان و وچان و گەردش و خولانەوەی تیا ئەکات، بە بێ ئەمەی یەکێ یەکێ هەڵکەوێ یان دوا و بەری ببێ بۆ هیچ کام، بەبێ ئەمەی ئەم قەبارە گەورانە - کە راگیری کردوون بەلای سەرەوە - رۆژێ لە رۆژان یەکێکیان یان بەشێك لە یەکێکیان چ جای هەموو، بکەوێتە خوارەوە بەسەر ئەم زەوی یەدا، خەڵکی لەم چاکە و بەهرەیە بێ ئاگایە و نرخی نی یە لە پێش چاوی مەگەر لای کەسێك کە ژیریی تێر و تەواو بێ و بیر بکاتەوە، یان لە هەندێ کات دا کە زانایانی ئاسمان هەواڵ ئەدەن بەمەی کە بەشێ لە ئەستێرەیەك کەوتووەتە رێگا بەرە و زەوی لەو کاتەدا بیم و ترس پەیدا ئەبێت و دانیشتووی هەموو وڵاتێ مەترسی ئەکات کە بکەوێ بەسەر وڵاتەکەیان دا، وەکو ئەو هەواڵەی کە بڵاو بووەوە و چوار ساڵ لەمەو پێش و ترس و بیم کەوتە نێوان خەڵکی یەوە، زانایانی ئاسمانی لەبارەی ئەم رژێمە تێر و تەواوە نەگۆڕاوەی بوونەوەرەوە قسەو باسی زۆریان کردووە و وتووە، بەڵام هیچی ناگاتە ناوەڕۆك و بنج و بنەڕەت، بەڵکو هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆ روون کردنەوەی بوونی ئەو ناموس و هێزە راگیر کەر و راکێشەرەی کە دانراوە لەم بوونەوەرەدا، ئیتر بەبێ ئەمە هیچ کەس لە هیچی تر حاڵی بوویێ و ئەو هەموو قسە و باس و لێکۆڵینەوە حەق وایە باشتر ببێتە هۆی بەهێزی و پتەوی باوەڕ بەو خوایەی**

کە ئەم بوونەوەرەی داهێناوە بەو هەموو رژێم و هێز و ناموسەوە ئەگەرچی زۆریان مەبەستیان لەو لێکۆڵینەوەیە دوور خستنەوەی قودرەتی خوایە لەو مەیدانەدا!! بێگومان ئەو نیاز و مەبەستە زۆر لار و چەوت و ناڕەوایە و بە راستی هۆی ئەو نیاز و مەبەستە سەر لێ شێوان و لادانە لە راستە شەقامی ژیریی، چونکە رێگا بردن بەو شتە نهێنی یە نایابانە باشترین نیشانە و بەڵگەی روون و ئاشکران لەسەر بوون و زانین و دەسەڵات و کاردروستی داهێنەر و دانەرەکەیان. خوای گەورە ئەو هەموو شتەی ژێر بار کردووە بۆ ئادەمی، قاپی هەموو پیت و فەڕێکی لێ کردوونەتەوە و بە فراوانی هۆی رێنموونی بۆ فەراهەم هێناون، ئەو ئاسمانە گرنگەی بۆ راگیر کردوون با تاوان و خراپەکاریشییان هەبێت، چونکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زۆر میهرەبان و خاوەن بەزەیی یە بە ئادەمی، لەپاش پیشاندانی ئەو چەند بەڵگە و بەرهەمی توانا و دەسەڵاتی خوا لەم بوونەوەرەدا، ئینجا دێتە سەر باسی ئادەمی خۆیان: باو و رەوشتی ژیان و مردنی خۆیانیان ئەخاتە پێش چاو و هەر ئەو رەوشت و باوە ئەکات بە نیشانە لەسەر زیندوو بوونەوەیان، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ﴾ خوا کەسێکە کە لە یەکەم جاردا کردنی بە زیندوو و گیانی کردن بە بەردا، ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ئەتان مرێنێ هەر کاتێ ماوەی ژیانتان دوایی هات، گیان بە بەردا کردنی یەکەم جار موعجیزەیەکی زۆر گرنگە، هەموو کات تازە و دووبارە ئەبێتەوە بە شەو بە رۆژ و شتێکی نهێنی وایە هەموو ژیریی یەك سەرگەردانە تیای دا و هەروەها مردنیش شتێکی نهێنی وایە کە هیچ کەس نازانێ چۆنە و چۆن پەیدا ئەبێت، رادەی جیاوازی ئەم دوو شتە نهێنی یە هێجگار زۆرە و جێگای بیر لێ کردنەوەیە، ئەم دوو شتە پەیدا بوونیان ئاشکرایە، بەڵام زیندوو بوونەوەی دووەم وەك ئەم دوانە روون و ئاشکرا نی یە، چونکە نی یە بە پێش چاوەوە، بەڵام بەڵگە و نیشانەی راست و گونجاوی ئامادە و حازر و بزرە هەر لە پەیدا بوونی یەکەم جارەوە روون ئەبێتەوە،

لەبەر ئەوە ئەیهێنێ بەدوای ئەم دوانەدا و ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ ئینجا لە پاش مردنتان زیندووتان ئەکاتەوە بێگومان هەرکەس بێ بەش نەبێ لە ژیریی هەرگیز سەر ناکاتەوە لە زیندوو بوونەوە، چونکە لە یەکەم جارەوە چۆن پەیدا بوو هەر بەو جۆرە ئەشبێتەوە، لە یەکەم جارەوە زیندوو نەبوو ئەو بێ گیانەی کرد بە گیان دار هەر ئەو کەسە ئەیکاتەوە بە گیان دار بەلاّم زۆر بەداخەوە زۆر کەس هەیە هەر بەسەر شێوە ئادەمی یە لە هۆش و ژیریی دا بێ بەشە لە ئادەمیێتی، لەبەر ئەوە بیر کردنەوە و تێفکرانی نی یە لەم هەموو بەڵگە و نیشانە روونانە و ئەو هەموو شتە نهێنی یانە وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ﴾ بەڕاستی ئادەمی – واتە ئەوانەیان کە لەسەر رێگای راستی خوا نین – زۆر داشاردەر و دان نەنێنەرە بە چاکە و بەهرەکانی خوای خۆی دا، لەپاش پیشان دانی ئەم هەموو بەڵگە و نیشانانە، ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) بەمە کە لەسەر رێگای خۆی بڕوا و گوێی لێ نەبێ و لا نەکاتەوە بۆلای بت پەرستەکان و دەم بازی و مجادلەیان و رێگای ناڕاوە و دەمە دەمێ یان نەدات لەو بەرنامەی خوا هەڵیبژاردووە بۆی، فەرمانی داوە بە راگەیاندنی ئەفەرموێ: ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ﴾ بۆ هەموو میللەتێك بەرنامە و شەریعەتێکمان داناوە کە ئەو میللەتە رەفتاریان پێ کردووە و لەسەری رۆیشتوون و لایان نەداوە بە لایەکی تردا، بۆ وێنە لە رەوانە کردنی موساوە تا عیسا بەرنامە و شەریعەتی ئەو میللەتە ئەوە بوو کە تەورات هێنای و لە عیساوە تا رەوانە کردنی محمد – سەلامی خوا لە هەموویان بێت – بەرنامە و شەریعەتیان ئەوە بوو کە ئینجیل هێنای، لە دوای ناردنی محمد(ﷺ) تا رۆژی دوایی بەرنامەی هەمووان ئەمەیە کە قورئان هێنای جا هەر میللەتێك دڵی خۆی کردبێتەوە بۆ هۆی رێنموونی و بەڵگە و نیشانە و رابەرەکانی خوا ئەو میللەتە لەسەر رێگای خوا بووە، هەرکام دڵی قوفڵ درابێ لە ئاستی ئەوانەی کە خوا کردوونی بەهۆی رێنموونی و کەوتنە سەر رێگای راستی خوا، هەرکام بەو جۆرە بووبن ئەوە گومڕا و سەرگەردان بووە، کەواتە دوای ناردنی قورئان ئیتر هەموو رێگایەك بەستراوە لە خەڵکی جگە لەوەی کە قورئان هێنای، ئەبێ هەموو بێینە ژێر سایەی ئەو و نابێ لێ ی لابدەین بۆ هیچ بەرنامە و شەریعەتێکی تر کە لەمە و پێش نێرراوە بۆ چین و کۆمەڵێ تر لە چەرخێکی تردا،

فَلَا يُنَـٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ ۚ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَـٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ
أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾

---

چونکه تازه خوا ئەمەی قورئانی [redacted] و دیاریی کرد بۆ هەموو ﴿فَلَا يُنَـٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ﴾ کەواته با خاوەن ئایینەکانی تر ئاژاوه و دەمە دەمێت لەگەڵ نەکەن له کاروباری ئایینەکەت دا، واته گوێ [redacted] بۆ قسەیان و ماوەیان مەده له موجادەله و [redacted] دەمێ یان، ﴿وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ بانگی خەڵکی بکه بۆلای پەروەردگارت و پەرستنی به تاك و تەنیا. ﴿إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ﴾ چونکه به راستی و بێگومان تۆ لەسەر رێگایەکی راستی که هەر کەسێك ئەو رێگایه بداته بەر ئەیگەیەنێ به ئامانج و کامەرانی له هەردوو جیهان دا، ﴿وَإِن جَـٰدَلُوكَ﴾ ئەگەر ئەوانه مجادەله و [redacted] دەمێ یان لەگەڵ کردی ﴿فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ئەوەیان پێ بڵێ: خوا زاناتر و ئاگادار تره به هەموو کردەوەیەك که ئێوه ئەیکەن، کەواته تۆڵەیان لێ ئەسێنێ لەسەر ئەم دەمە دەمێ و ئاژاوه و سەرکێشی یه که بەکاری ئەهێنن، واته خۆت خەریك مەکه بەوانەوه و کاتی خۆی به فیڕۆ مەده به هۆی ئەوانەوه، به کورتی ئەو وەڵامەیان بدەرەوه، چونکه ئەوانه مەبەستیان ئەوه نی یه رێگایان له حەق و راستی بکەوێ حەواڵەی خوایان بکه و بڵێ پێ یان: ﴿ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ خوا لەرۆژی دوایی دا حوکم و بڕیار ئەدات له نێوانتان دا له هەر شتێك [redacted] راتان جیاوازه و به ئاژاوه و دووبەرەکین تیای دا، بێگومان خوا حاکمێکی وایه کەس توانای نی یه دەم بازی بکات له هیچ حوکم و بڕیارێکی دا، چونکه لەو رۆژەدا دەم بازی نامێنێ و کەس نیزاع و ئاژاوەی نی یه له بڕیارەکانی رۆژی دوایی دا، خوای گەوره هەر بڕیارێك ئەدا له زانین و ئاگاداری تەواوەوەیه، چونکه هیچ هۆ و نیشانه و رابەرێ یاخی نابێ له زانینی ئەو، هیچ شتێ شاراوه و نهێنی نابێ لەو، تەنیا خوا زانایه به هەرچی وا له ئاسمان و زەوی دا، که هەندێ لەوانه کردەوه و نیازی خەڵکی یه،

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا﴾

---

**وەکو ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئایا نەت زانیوە کە بێگومان خوا ئەزانێ و ئاگادارە بە هەرچی وا لە ئاسمان و زەوی دا؟ زانینەکەی خوا وەکو تێر و تەواوە، هیچ کەم و کوڕی تیا نی یە بە هیچ کلۆج لاوازی و نەمان و لەبیرچوون ڕووی تێ ناکات، بەڵکو هەر بووە و بەبێ سەرەتا هەر هەمیشە و هەر ئەبێ بە بێ بڕانەوە و دوایی هاتن، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ﴾ هەرچی وا لە ئاسمان و زەوی دا هەرچۆنێ زانینی خوا دەوری داوە هەروەها هەمووی لە کتێبێك دا نووسراوە، واتە(لوح المحفوظ) وەکو کۆڕ و جەماوەری زانایانی لەسەرە بێگومان هەست و ژیریی ئادەمی کول و کۆڵێ و ماندو ئەبێ لە بیر کردنەوە لە هەندێ لەوەی کە لە ئاسمان و زەوی دا هەیە، جا وەرە بیر بکەینەوە لەوەی کە ئەو هەمووە بە بێ بەر و دوا و بە بێ جیاوازی لە هەموو کات دا یەکسەر لە زانینی خوادا بووە و هەیە و ئەبێ بە بێ کۆتایی. ئەوەش بە سووك و ئاسان و بە بێ ئەرك و زەحمەت وەکو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بەڕاستی زانینی ئەوەی وا لە ئاسمان و زەوی و نووسینی لەو کتێبەدا، سووکو ئاسانە لەسەر خوا. لە پاش ئەوە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە لەسەر بەرنامەی ڕێك و ڕاستی خۆی بڕوا ئینجا باسی هەندێ لار و چەوتی و نەفامی و ناڕەوایی بەرنامەی ئەو بت پەرستانە ئەکات کە ئەیان ویست دەمبازی بکەن لە ئاییینی خوادا و ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەوانە بێ بەشن لە کۆمەکی خوا، بێ بەشن لە هیچ یارمەتی دەرێك، ئەفەرموێ: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا﴾ ئەو بت پەرستانە جگە لە خوا شتی تر ئەپەرستن کە خوا هیچ نیشانە و ڕابەرێکی نەناردووەتە خوارەوە لەسەر ڕەوا دانی پەرستنی ئەوانە.**

وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَاۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾

---

﴿وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌۗ﴾ شتێ ئەپەرستن کە خۆیان هیچ جۆرە زانینێکیان نی یە پێی، نەزانینێ کە روون و ئاشکرا بێت لای ژیریی، نەزانینێ کە بەهۆی تێڕوانین و بیر لێ کردنەوە و بەڵگەی ژیریی لەسەر هێنانەوە بێت، واتە عەقیدە و باوەڕ و پەرستن ئەبێت لە زانینەوە هەڵقوڵێت و خاوەنەکەی دڵنیا و ئارام بێت لە ئاستی، ئەوەش بەوە ئەبێت یان بەڵگە و رابەرێکی ئاسمانی لەسەر بێت، یان شتێکی وا بێت کە بە هۆی ژیریی یەوە بزانرێ، خۆ ئاشکرایە کە بتەکان لەوانە بێ بەشن لە هیچ کام لەو دوو نیشانە و رابەر چ نیشانە و رابەری ئاسمانی و چ رابەر و نیشانەی ژیریی، بەڵکو پێچەوانەن، هەردوو جۆرە رابەرەکەی دژی ئەو عەقیدە و پەرستنەیە، کەواتە ئەوانە زاڵم و ستەم کارن، ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ هیچ جۆرە یارمەتی دەرێك نی یە بۆ ئەو زاڵم و ستەم کارانە لە رۆژی دوایی دا، سەیر تر ئەمە یە ئەو سەر لێ تێك چووانە هەرچۆنێ خۆیان ناکەونە سەر رێگای راست و رێ یان ناکەوێت لە راستی، گوێ ناگرن بۆ ئامۆژگاری راست و بانگ کەر و جار چی خوا، قسەی راست وەرناگرن، بەڵکو کاتێ ئامۆژگاری بکرێن و رێنموونی بکرێن، باشتر سوور ئەبن لەسەر بار و رێگا چەوتەکەی خۆیان و بێزاری دەر ئەبڕن لە رێنموونی کەران و لەوانەن پەلاماریان بدەن و دەست و دەمیان بۆ درێژ بکەن وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ هەرکاتێ ئایەتەکانی ئێمە بخوێنرێ بەسەریان دا کە روون و ئاشکران و رێنموونی ئەکەن بۆ عەقیدە و باوەڕی رێك و راست و دوور کەوتنەوە لە باوەڕی لار و خێچ، کاتێ بەو جۆرە رێگای راستیان پیشان بدرێ ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَۖ﴾ ئەبینی و ئەناسی لە روو و نێو چاوانی ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە، روو گرژی و ناشیرینی و روو گۆڕان و نیشانەی بێزاری و کینە و خەشم ﴿يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ بەجۆرێ خەریکن پەلامار بدەن و دەست درێژیی بکەن و دەست بوەشێنن لەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمە ئەخوێننەوە

بەسەریان دا، واتە هەمیشە ئەوە کردەوە و رەوشتیانە، مل هوڕ و ستەم کاران هیچ بەڵگە و شتێکیان بە دەستەوە نی یە کە پشتی پێ ببەستن بۆ بەرگری کردنی حەق و راست و کۆتاییش ناهێنن و گەڕانەوەیان نی یە و مل شۆڕ ناکەن، کەواتە ئەبێ توند و تیژیی و هەڕەشە و تاپاڵ و دەست درێژیی بەکار بێنن لەگەڵ چاکان و رابەران دا، جا لەبەر ئەوە ئەوا قورئان بەرامبەری یان ئەکات بەم ترساندن و هەڕەشە سامناکە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاراستەیان بکات و پێ یان راگەیەنێ، ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خراپتر لەو بێزاری و خەشم و نیازی خراپەکاری خۆتانە، یان خراپتر لەو داخ و کینەیەی کە لە دڵتان دایە؟ ئەگەر پرسیار ئەکرێ لەو خراپترە لە وەڵام دا بڵێ: ﴿النَّارُ﴾ ئاگری دۆزەخە ﴿وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ خوا بەڵێن و بڕیاری ئەو ئاگرەی داوە بەوانەی کافرن و باوەڕیان نەهێناوە بە ئایینی خوا ﴿وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەو ئاگرە پاشە رۆژێکی خراپە بۆ ئەو بێ باوەڕانە، ئینجا جاڕێکی گشتی ئەدات بەسەر ئادەمی دا لە هەموو جیهان دا، جاڕێ کە بە شێوەی گشتی دەنگ ئەداتەوە، جاڕێك بێ نرخی و بێ کاری ئەو بت و پەرستراوانەی کە کراون بە هاوبەشی خوا لە هەموو چین و چەرخێك دا و لە هەموو جۆر و بابەتێك، جاڕی ئەم بێ نرخی و بێ کاری یە ئەدات لە شێوەی وێنەیەك دا کە ئەخرێتە بەر چاو و گوێی هەمووان،

يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا

وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ

(٧٣) مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ (٧٤) اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ

رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ (٧٥)

---

ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ﴾ ئەی کرۆی ئادەمی وێنەیەکی نایاب هێنراوەتەوە و باس کراوە، ئینجا ئێوەش گوێ ی بۆ بگرن، ئەم وێنەیە یاسایەك دائەنێ و شتێکی راست و رێك دەرئەخات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ بەڕاستی هەموو ئەوانەی ئێوە بانگ و هاواریان لێ ئەکەن و ئەیان پەرستن جگە لە خوا هەموو ئەوانە ﴿لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا﴾ هەرگیز مێشێك دروست ناکەن و توانای ئەوەیان نییە. ﴿وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ﴾ با هەموو کۆ ببنەوە بۆی، دروست کردنی مێش بە هیچ کلۆج ناگونجێ بۆ هیچ کەس جگە لە خوا، چونکە گیانی ئەوێ و گیانیش شتێکە کە هەموو دروست کراوەکانی خوا لە ئاستی دەستە پاچە و بێ دەسەلاَتن و هیچ کەس جگە لە خوا نازانێ گیان لە چی فەراهەم دێت، چۆن دێت و لە کوێوە دێت؟ بێگومان مێش یەکسانە لەگەڵ حوشتر و فیل و کەرکەدەن لەمەدا کە هەموو وەك یەك دروست کردنیان دەست نادات و ناگونجێ بۆ خوا نەبێ، بەلاَم قورئان هەر مێشێکی گرت بە دەستەوە، چونکە دەستە پاچەیی لە ئاستی مێش باشتر بێ هێزی و بێ نرخی بتەکان پیشان ئەدات و ئەیخاتە دڵ و دەروونەوە تا ئەو گیان لەبەرە گەورانە، ئینجا هەنگاوێکی گرنگ تر ئەنێت لە پیشان دانی لاوازی و بێ نرخی ئەو بتانەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ﴾ ئەگەر مێش شتێکیان لێ بستێنێ و دای رنێ لێ یان بە هەموو لێ ی ناسێننەوە و قوتاری ناکەن لێ ی، بەڵێ ئەو بت و پەرستراوانە توانای قوتار کردنی شتێکیان نی یە کە مێش لێ یان داڕنێ و بیبات، چونکە ئەو پەرستراوانە ئەگەر دار و بەرد و شتی بێ گیانن ئەوە ئاشکرایە کە هیچ جۆرە توانین و دەسەلاَتێکیان نی یە و ئەگەر ئادەمی و گیان لەبەریش بن ئەوانیش هەر ناتوانن شتێك کە مێش لێ یان داڕنێ قوتاری بکەن لێ ی!! مێش چەند شتی شاراوەی گرنگ لە ئادەمی دائەڕنێ وەکو تام و بۆنی خۆش و هەروەها تەندروستی و چەند شتی شاراوەی تر،

تەندروستی چاو و ئەندامەکان دائەڕنیٚ لە خاوەنەکەی و بۆشی ناگەڕیٚتەوە ئەوەتا پیسترین میکرۆبی سیل و تیفۆئید و نەخۆشی یە سامناکەکانی تری پیٚ یەو بەهۆی ئەوەوە چەند شتی گرنگی خۆشەویست دائەڕنیٚ لە ئادەمی و تازە ئەوەی کە بردی لیٚ ی ناسەنریٚتەوە بەهیچ رەنگ، بەڵیٚ بە پزیشك و داو دەرمان تەندروستی پەیدا ئەبیٚتەوە بەلاًم ئەوەی پەیدا ئەبیٚتەوە شتیٚکی تازەیە و نەفسی ئەوە نی یە کە میٚشەکە دایڕنی، ئینجا لە کۆتایی ویٚنەکەدا ئەم رستەیە ئەهیٚنیٚ کە مەبەستی ویٚنەکە دامەزراوتر ئەکات.

﴿ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ﴾ داوا کەر کە بت پەرستەکانە و داوا لیٚ کراو کە بتەکانە لەڕ و لاواز و بیٚ دەسەلاًتن، یان داوا کەر کە میٚشە و شت دائەڕنیٚ لە بتەکان و داوا لیٚ کراو کە بتەکانە، یان داواکەر کە بتەکانن دەستە پاچەن لە گیٚڕانەوەی ئەوەی میٚشیٚ لیٚ ی دائەڕنیٚ وەکو بۆنی خۆش و ویٚنەی کە میٚش پیٚ یانەوە ئەنیشن و ئەیبەن، بە هەرکام لەم سیٚ بارە ئەگونجیٚ و ریٚکە لەگەلٚ مەبەستی ویٚنەکەدا. ئینجا لەم کاتەدا هەست و دەروون پڕ بووە لە بیٚ نرخی و بیٚ دەسەلاًتی بتەکان، لەم کاتە زۆر ریٚکەدا بیٚزاری دەر ئەبڕیٚ لە نەفامی بت پەرستەکان و خوانەناسی یان، توانا و هیٚز و دەسەلاًتی خوا ئەخاتە پیٚش چاو، ئەفەرمویٚ:

﴿مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾ ئەوانە خوایان نەناسیوە، بە ناسینیٚ شایانی ئەوە، ئەوەتا هاوبەشیان بۆ رەوا داوە، شتیٚکیان کردووە بە هاو ناوی کە بە هیچ کلۆجیٚك ئەم ناوەی بۆ ناگونجیٚ و ریٚزی خوایان نەگرتووە بەو ریٚزەی کە شایانە بۆی، ئەوەتا خەڵکیان لەگەلٚ پەرستووە، خەڵکیٚ کە بیٚ دەسەلاًت و دەستە پاچەیە تا رادەیەك میٚشیٚك لیٚ ی داڕنیٚ توانای لیٚ سەندنەوەی نی یە لەو میٚشە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ بەڕاستی خوا بەهیٚز و توانایە و زاڵە بەسەر هەموو شتیٚك دا، هیچ شتیٚك ناتوانیٚ سەرپیٚچی لیٚ بکات، لەپاش باسی تاك و تەنیایی خوا بە بیٚ ویٚنە و هاوبەش باسی پیٚغەمبەریٚتی ئەکات، ئەفەرمویٚ: ﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا﴾ خوا کە ناوی ﴿الله﴾ یە لە تیرەی مەلائیکە چەند فروستادەیەك هەڵئەبژیٚریٚ بۆ نیٚوان خۆی و پیٚغەمبەران، فەرمان و سروش بیٚنن بۆیان، ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ لە تیرەی ئادەمیش چەند فروستادە و پیٚغەمبەریٚك هەڵئەبژیٚریٚت بۆ ئەمەی بانگی خەڵکی بکەن بۆ لای ئایین و بەرنامەی خوا و ئەوەی لە لایەن خواوە بۆیان هاتووە پیٚ یان رایگەیەنیٚ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾ بەڕاستی خوابیسەندەوبینایەئەزانیٚ کیٚ شایانی ئەو فروستادەیی یە،

يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٧٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾

﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۚ﴾ ئەزانێ و ئاگادارە بە هەموو شتی ئێستا و لەمەو بەریان و هەموو شتی لەمەو پاشیان و بە هەموو شتێ پێش بوونیان و بە هەموو شتێك پاش نەمان و مردنیان، بە کورتی زانینێکی گشتی و تێر و تەواو بە بێ هیچ جۆرە کەم و کوڕی یەك، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ هەموو کاروباری تەنیا بۆلای خوا ئەگەڕێتەوە، کەواتە حوکمڕان و کار بەدەست تەنیا خوایە، تەنیا ئەو خاوەنی زۆر دەسەڵاتی راستەقینەیە و تەگبیری هەموو شتێك بەدەستی ئەوە و پرسیار لە هیچ کردەوەیەکی ناکرێ.

لەپاش روون کردنەوەی پڕوو پووچی و لاری و خێچی بەرنامە و ئایینێ کە بت پەرستەکانی لەسەرن، ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە ئەم میللەتە موسڵمانانە بو ئەمەی هەڵسن بە ئەرکی ئەو ئایین و بەرنامە راستەی کە بۆیان هاتووە لە لایەن خواوە، رێك و راست و دامەزراو بن لەسەری، لەم فەرمودەی دوایی یەدا کە دوو ئایەتە ئەو شەقامە پانە راستەی کە دای ناوە بۆ ئەم میللەتە ئەو بەرنامە شیرینە کە نەخشەی کێشاوە بۆی بە کورتی روونی ئەکاتەوە لەگەڵ ئەو ئەرکەی کە خستوویەتی یە سەر شانی لەم رووەوە جێ و شوێن و رادە و پلەی بەرزی بۆ دیاریی ئەکات، هەروەها روونی ئەکاتەوە کە ریشەی کوتاوە بەناو هەموو گەل و چەرخەکانی جیهان دا لەسەرەتا و بنەڕەتی ئادەمی یەوە تا ئێستا و لەمەو پاشیش تا دنیا دنیایە، هەموو خواناس و خواپەرستەکانیش بە درێژایی تەمەنی ئادەمی هەموو یەك کۆمەڵ و یەك تاقم و یەك میللەتن. لە یەکەم جارەوە فەرمان ئەدات بە رکوع و سوژدە بردن بۆ خوا کە مەبەست پێ یان لێرەدا و لە چەند شوێنی تردا نوێژ کردنە، لەبەر ئەوە ئەم دوانە دوو بەش و پارچەی گرنگن لە نوێژدا و شێوەی بەندەیی و مل کەچی بۆ خوا لەم دوانەدا ئاشکرا ترە بێگومان باسی ئەم دوانە و فەرمان دان پێ یان بەهێز ترە و بەرهەمی بەتین ترە لە دەروون دا و باشتر سۆز ئەخاتە دەروون و هەست ئەخاتە بزووتنەوە و جۆش، ئەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ﴾ ئەی كەسانێ كە بڕواتان هێناوە نوێژ بەجێ بێنن بۆ خوا و ركوع و سوژدەی بۆ بەرن، ئینجا بەشێوەی گشتی فەرمان ئەدات بە خوا پەرستی ئەفەرموێ. ﴿وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ﴾ خوای خۆتان بپەرستن بە هەموو جۆرە پەرستنەكانی تر كە بە گوێرەی ئایینی خوا بێ. ئەم فەرمانە گشتی یە هەموو فەرزەكان ئەگرێتەوە، هەروەها هەموو كردەوەو هەموو جوڵانەوە و هەموو نیاز و مەبەستێكی كە بەندە لەبەر خوا بیكات و بە گوێرەی بەرنامەی خوا بێت، كەواتە خەو و خواردن و پۆشین و هەموو خۆشی و لەزەتی بەندە لەم جیهانەدا تەنانەت مامەڵەی ژن و مێردی ئەبن بە عیبادەت و خواپەرستی و پاداشت ئەدرێتەوە لەسەریان بە مەرجێ ئەمانە بێ شەرعی نەبن و بە نیازی ئەوەوە بكرێن كە توانا و هێز پەیدا ببێ بەسەر گوێ رایەڵی و خوا پەرستی دا ئەو كاتە ئەبن بە عیبادەت و خواپەرستی یەكی گەورە، لە لوتف و بەزەیی خوا بە زیاد بن. ئینجا فەرمان ئەدات بە كردەوەی چاك بە شێوەی گشتی لەگەڵ خەڵكی دا لەپاش رەفتار و كردەوە لەگەڵ خوادا بە نوێژ و خواپەرستی تر، ئەفەرموێ: ﴿وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ﴾ كردەوەی خێر و چاك بكەن وەكو ئەو شتانەی كە سوننەتن، سیلەی رەحم و هەموو شتێك كە چاكە بێت و خێری تێدا بێت، ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ ئەوانە هەموو بكەن و بەجێ یان بێنن بە ئومێد و چاوەڕوانی ئەوەی رزگار بن و بگەن بە ئامانج، نەك خۆتان لێ بگۆڕێ و لاتان وابێ هیچیتان نەهێشتووەتەوە، هەركەس خوا پەرستی بەو هەستە بكات مایە سوتاوە و كردەوەكانی وەرناگیرێ، بەڵام ئەگەر هەموو كات خۆی بە ناتەواو سەیر كرد و هەر كردەوەیەكی چاكی كرد بە دڵە لەرزەوە بیكات ئەو كاتە بێگومان خوا پاداشتی ئەداتەوە و كردەوەی زایە ناكات. بە پێی بەڵێنی خوا ئەو كردەوە چاكانە هۆی رزگارین، عیبادەت و خواپەرستی خاوەنەكەی ئەگەیەنێ بە خوا و یادی خوا لە دڵی دا جێگیر ئەكات، كەواتە ژیانی رائەوەستێ لەسەر بنەڕەتێكی دامەزراو و لەسەر رێگایەكی گەیەنەر بە ئامانج و مەبەست، كردەوەی چاكیش هۆی دامەزراوی و بەردەوامی ژیانە لەسەر ئەو بنەڕەتە رێك و راستە، كەواتە هەركاتێك میللەت خۆی چەكدار كرد بەم دوو چەكە گرنگە ئەو كاتە دەروون ژیانی رێك و راست و دامەزراو ئەبێت، ئەو كاتە ئەتوانێ هەڵسێ بەو ئەركە گرانەی كە لەسەر شانی یەتی،

﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ﴾

ئەركی تێكۆشان لە ڕێگای خوادا وەكو فەرمانمان پیا ئەدات بەم فەرمودەیە: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ﴾ تێكۆشان و بەربەرەكانێ بكەن بۆ خوا و لەبەر خوا، بە تێكۆشانێك كە ڕاست و پاك و خاوێن بێت، تەنیا لەبەر فەرمان و ڕەزامەندی خوا بێت، تێكۆشان و بەربەرەكانێ ی دوژمن و هەوای ناڕەوایی نەفس و هەموو شەڕ و خراپەیەك، ئینجا پاڵپێوەنەر بۆ ئەم كارە گرنگە ئەوەیە كە ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ﴾ خوا ئێوەی هەڵبژاردووە بۆ ئەم كارە گرنگە و ئەم سپاردە گەورەیە، بێگومان ئەم سپاردە گەورەیە لەخۆڕایی نی یە، ئەبێ ئەم ئوممەتە شایان بن بۆ هەڵگرتنی ئەم سپاردەیە و هەڵسن پێ ی، ئەم هەڵبژاردنە ڕێز گرتنە بۆیان، كەواتە ئەبێ بەرامبەریی ئەم لوتف و ڕێز گرتنە بكەن بە سوپاس و گوێ ڕایەڵی و هەڵسان بە فرمانەكەیان بە ڕێك و ڕاستی، ئەم ئەركەش كە خستوویەتی یە سەرشان لە سنووری تواناداییە و هیچ تەنگە تاوی تێدا نی یە چونكە ئایین و شەریعەتەكەی بە شێوەی گشتی هەر بەو جۆرە هێناوە وەكو ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ﴾ خوا لە كاروباری ئەم ئایینەدا هیچ جۆرە زەحمەت و تەنگی دانە ناوە، هەرگیز بەندەكانی تەنگەتاو ناكات بەم ڕەنگە داوای شتێكتان لێ بكات كە نەتوانن پێ ی هەڵسن، ئەوەتا لە هەموو كاتێكی تەنگی و زەحمەت دا ڕوخسەتێكی داناوە، كەواتە وەكو زانراوە ڕێگای سەرپێچی نی یە و هیچ كەس بەهانەی نی یە، بەڵكو لە هەموو كاروبارێك دا بە گوێرەی سروشتی ئادەمی یە و ئەیەوێ ئادەمی هەموو هێز و وزەی بخاتە كار لە ڕادەیەكی ڕاست و میانەدا، نە دەستیان بەسەرا بگیرێ و پیش بخۆنەوە لەناو خۆیان دا، نە بەرەڵاش بكرێن بە وێنەی ئاژەڵ و جڕ و جانەوەر ئەم ئایینە شتێكی تازەگی نی یە، بەڵكو لە كۆنەوە هاتووە، وەكو لەم فەرمودەیەشەوە ڕوون دەبێتەوە.

﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ﴾ مەبەستم بەم ئایینەتان کە زەحمەت و تەنگی تێدا نی یە ئایینەکەی ئیبراهیمی باوکتانە، یان خوا ئایینەکەی ئێوەی پان و پۆڕ و فراوان داناوە بە بێ تەنگە تاوی بە وێنەی ئایینەکەی باوکتان کە ئیبراهیمە، ئایینی ئیبراهیم ئایینی گوێ رایەڵی خوا و پەرستنی یەتی بە تەنیا و بێ وێنە و هاوبەش، ئەم ئایینە راستەی ئیبراهیمە لەو کاتە بەدواوە تا ئێستا و لەمەو پاشیش هەر مایەوە لەم جیهانەدا و هەرگیز لێ ی نەبڕاوە و لێشی نابڕێ تا ئەم جیهانە هەیە، ئەوەتا درەختی بەفەڕی ئیبراهیم دوو لقی لێ بوویەوە: ئیسماعیل و ئیسحاق، هەرچەند لە لقی ئیسماعیلەوە ماوەی دوور و درێژ ئایینەکەی پچڕابوو بە بت پەرستی تا کاتی رەوانە کردنی پێغەمبەرمان(ﷺ) هەرچەند لەم لقەوە ئەوەی بەسەرهات بەڵام لە لقی ئیسحاقەوە ئایینە راستەکە هەر بەردەوام بوو تا گەیشتە عیسا و لەوێشەوە مایەوە تا رەوانەکردنی پێغەمبەرمان – سەلامی خوا لە هەموویان بێت – ئینجا درا بەم و بە جۆرێکی ئێجگاری پێ ی درا تا رۆژی دوایی، وەکو هەموو دەزانین ئێمەی باوەڕدار، لە ئیبراهیم بەدواوە بەم جۆرە بوو، بەڵام لەپێش ئەو زنجیرەکانی ئایینی خوا جار بەجارێ ئەپچڕان لە یەك، واتە وا ئەبوو پێغەمبەرێك رەوانە ئەکرا لە پاش ئەو ئەو ئایینە تێك ئەدرا بە جۆرێ نیشانە و دروشمی نەئەما، ئینجا خوا پێغەمبەرێکی تازەی رەوانە ئەکرد و ئایینەکەی خۆی دووبارە تازە ئەکردەوە سەر لە نوێ. ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ﴾ خوا ئێوەی ناو بردووە بە موسڵمان و ئەوەی کردووە بە ناوتان لە کتێبەکانی پێش ئەم قورئانەدا ﴿وَفِي هَٰذَا﴾ لەم قورئانەیش دا ئەم ناوەشی لێ نان و بەم ناوەی ناوی بردن ﴿لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ﴾ بۆ ئەمەی پێغەمبەر لە رۆژی دوایی دا شایەت بێت لەسەر ئێوە کە ئایینی خوای پێ راگەیاندن،

وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾

---

﴿وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ ئێوەش شایەت بن لەسەر خەڵکی شایەتی بدەن کە پێغەمبەران – دروودی خوایان لەسەر بێت – هەموو ئایینی خوایان ڕاگەیاند بە گەل و ئوممەتەکانیان، واتە ناونانتان بە موسڵمان بڕیار دانە لەلایەن خواوە کە ئێوە موسڵمانن مل کەچ و گوێ ڕایەڵن بۆ خوا، ئەو بڕیارەش ئەبێتە هۆی ئەوە پێغەمبەر ببێتە شایەت بەسەرتانەوە کە ئایینی خوای بە تەواوەتی پێ ڕاگەیاندوون و ڕاگەیاندنی ئەم ئایینەش کە ئێوە گرتووتانەتە گەردن و باوەڕتان پێی هەیە، ئەبێتە هۆی ئەوە کە ئێوەش شایەتی بدەن لەسەر ڕاگەیاندنی پێغەمبەرەکانی تر، چونکە ئەو ڕاگەیاندنە لە قورئان دا هەیە، بێگومان ئەم ئوممەتە هەرچۆنێ لە ڕۆژی دوایی دا شایەتە لەسەر خەڵکی تر، پاشەڕۆژ و تۆڵە و پاداشتیشیان بە پێی شایەتی ئەم ئوممەتیە، هەرچۆنێ لە ڕۆژی دوایی دا قسە قسەی ئەم ئوممەتەیە، هەروەها لەم جیهانەیش دا بۆ ئەمە نێرراون کە ببنە مامۆستای هەموو ئادەمی، ڕابەر و ڕێگا پیشان دەربێت، کار بەدەست و چاودێر بێت، جڵەوی جیهان و ژیان بگرێتە دەست. واتە هەرچۆنێ پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوا و ڕابەر و فێر کەر و کاربەدەست و چاودێر بوو بەسەر ئەو گەلە باوەڕ دارە موسڵمانەوە، هەروەها ئەمانیش لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسان بەو کار و فرمان و پیشەی خۆیانە بێ کەم و کوڕی – خوا لێ یان ڕازی بێت – و پاداشتی خۆیانیان بداتەوە، لە پاش ئەو تاقمە هەروا هات دەست بەدەست هەرچەند ئەندازەیەک کەمو کوڕی ڕووی تێ کردن، تا بە تەواوی لایان دا لە قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی ڕامیاری و حوکمڕانی و زۆربەی کاروباری تریان، ئەو کاتە بوون بە ژێر دەستە و شوێن کەوتوو، خۆیان و وڵات و هەموو خێر و بێریان داگیر کرا و جڵەویان کەوتە دەست دوژمنی ستەمکاری بێ بەزەیی یان، هەروایش ئەبن تا بیری نەکەنەوە و نەگەڕێنەوە بۆلای ئایینەکەیان بە وێنەی تاقم و چینە خوا پێ داوەکانی پێشیان. بێگومان ئەم کارو فرمانە

گرنگەی کە خراوەتە سەرشانی ئەم ئوممەتە بە شەرەفە خۆ ئامادەکردن و خۆ کۆ کردنەوەی ئەویێ، ئەم دادە و پلە بەرزە و ئەم چاکە و بەهرە گەورەیە کە دراوە بەم ئوممەتە شوکر و سوپاسی زۆر گەورەی ئەویێ، رێگای ئەمانەش هەموو ئەوەیە کە ئەفەرمویێ: ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ﴾ کەواتە ئەی باوەڕدارەکان بە رێکی نوێژ بەجێ بێنن و زەکات بدەن و پشت بەخوا ببەستن و داوای کۆمەکی و یارمەتی لەو بکەن، دڵتان بەو بەهێز بێت لە هەموو کار و بارتان دا. نوێژی راستەقینە هۆی پەیوەندی بەندەی بێ هێزی لاوازە بە سەرچاوەی هێز و توێشووەوە، زەکات هۆی یەکێتی و پەیوەندی و بەسترانەوەی ئەندامەکانی گەل و کۆمەڵە، هۆی نەهێشتنی پێویستی و تێ گیرانیانە و بەرگری کەری خراپە و ئاژاوە و ناڵەباری یانە، پشت بەستن بە خوا و دڵ بەهێز کردن بەخوا هۆی پەیوەندی یەکی نەپچڕاوە لەگەڵ خوادا کە ئەوەش مایەی هەموو پیت و فەڕێکە لە هەردوو جیهان دا، بەم سیفەت و کردەوە گرنگانە، بەم چەکە بەهێزانە گەل دەتوانن هەڵسن بە ئەرکی رابەری و مامۆستایی و کاربەدەستی و چاودێری خۆیان بۆ گرۆی ئادەمی و ئەتوانن سوود وەرگرن لەم هەموو هێز و وزە و خێر و بێرەی خوا، کە لەم زەوی یەدا دروستی کردوون، خوای گەورە فەرمانی دا کە ئەم ئوممەتە پشت بە خوا ببەستن و یارمەتی و کۆمەکی لەخوا داوا بکەن و هۆی ئەم فەرمانەش ئەوەیە کە ئەفەرمویێ ﴿هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡ﴾ خوا یارمەتی دەرو کار بە دەستتانە و هەموو کاروبارتان لە دەست ئەودایە، ئینجا ئەفەرمویێ: ﴿فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ ئینجا خوا کار بەدەست و خاوەنی چاکە و خوا یارمەتی دەری چاکە و لەڕاستی دا هیچ شتێك هیچ بەدەست نی یە و هیچی پێ فەراهەم نایەت.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله و صحبة.

# سورەتی(المؤمنین)
## مەككەیی یە و(١١٨) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) ناونراوە بە(المؤمنون) و ئەم ناوە دەست نیشان ئەكات بۆ مەبەستەكانی و باسەكانی دیاریی ئەكات كە ئەبێ پەیوەندی بە ئیماندارانەوە هەبێ، ئەوەتا هەر لە یەكەم جارەوە سیفەت و نیشانەكانیان دیاریی ئەكات، وەك باسیان دەكەین. ئەم سورەتە ئەبێ بە چوار وەجبە:

١- موژدە و بڕیاری گەیشتن بە ئامانج ئەدات بەو ئیماندارانەی كە خاوەنی ئەو سیفەت و نیشانانەن، ئینجا چەند بەڵگە و نیشانەی ئیمان ئەخاتە بەرچاو، بەڵگە و نیشانە بوونەوەری یەكان و دەروونی یەكان، جا بەو بۆنەیەوە ئەو قۆناغانەی بەسەر ئادەمی دا دێت دەست نیشانی بۆ ئەكات.

٢- حەقیقەتی ئیمان روون ئەكاتەوە، ئەو حەقیقەتەی كە هەموو پێغەمبەرانی پێ هاتووە – سەلامی خوایان لەسەر بێت –، ئەو بۆنەیەوە هەڵوێستی بەدەی بێ باوەڕ و سەركێشەكانی ئەو گەلانە باس ئەكات، رەخنە و قسەی بێ جێ و نەفامی یان كە دنمە دەمێ یان پێ ئەكرد لەگەڵ پێغەمبەرەكانیان دا بە یەك جۆر و بە یەك شێوە وەك هەموو لە یەك چەرخ دا بووبن و ئیتفاقیان لەسەر كردبێت.

٣- باسی ئاژاوە و دووبەرەكی خەڵكی ئەكات كە هەڵسان پێی لە پاش پێغەمبەرەكانیان بەهۆی خەریك بوونیان بەو خۆشی و ناز و نیعمەتەی كە سەریان تێ كردبوو و بێ ئاگای كردن لە ژیانی راستەقینە و لایدان لە رێگەی راست.

٤- رووی فەرمودە ئەكاتە پێغەمبەر(ﷺ) و ئامۆژگاری ئەكات بەمەی بەردەوام بێت لەسەر فروستادەیی یەكەی خۆی و پەنا بگرێ بە خوا لە شەڕی سەركێشەكان و غەمبار و دڵ تەنگ نەبێ بەو هەڵوێست و كردەوەی بەدیان.

ئەمە بوو بە كورتی مەبەستەكانی ئەم سورەتە و پێناسەكەی. ئینجا با گوێ شل كەین بۆ ئایەتە پیرۆزەكان تا دڵ و رۆحمان پاراو بكەینەوە بە فەڕ و بەرەكەتیان بە یارمەتی خوا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾
وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ﴿٤﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان باوەڕ داران ئەگەن بە ئامانج. ئامانج لە دنیا و لەرۆژی دوایی دا. وتەی ﴿افلح﴾ بۆ رابوردووە و بە پێی ئەوە ئەبێ بڵێین گەیشتن. بەڵام لەبەر ئەوەی بەڵێنی خوایە و ئەبێ بەدی بێت، وەك لەمەوپێش بەدی هاتبێ وایە، لەبەر ئەوە بە وتەی رابوردوو فەرموی. جا لەبەر ئەوەی گەیشتنەکەی نەبەست بە بارێکەوە ئەبێ ئێمەیش نەیبەستین و ئەڵێین بێگومان باوەڕ داران ئەگەن بە ئامانج لە ژیانی دنیا و لە رۆژی دوایی دا. بە تاکە ئەگەن و بە کۆمەڵ ئەگەن. ئینجا با بزانین ئەو باوەڕ دارە بەختەوەرانە کێن و سیفەت و نیشانەکانیان چی یە؟ ئەوا بۆمان دیاریی ئەکات:

١- ئەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ ئەوانەی کە لە نوێژەکانیان دا لە خواترس و مل کەچن و سام و بیمی جەلال و گەورەیی خوا کاری کردووە لە دڵەکانیان دا، دڵی خەریك کردوون بە یادی ئەو و فەرمانبەری ئەو و گەڕان بەدوای رەزامەندی ئەودا لە هەموو بار و رووبەکەوە مەبەست ئەوە نی یە واز لە هەموو شتێك بێنن لە خۆشی ژیانی ئەم دنیایە، نەخێر، نەخێر بەڵکو بەکار هێنان و بەجێ هێنانی ئەو هۆی ژیان و ئارەزووانەش بەو هەست و هۆشانەوە هەر عیبادەت و خواپەرستی یە و ئەجر و پاداشتی رۆژبی دوایی لەسەر وەرئەگرێ، تەنانەت وەرزش و تیر ئەندازی و مەلەوانی و هەموو پیشەسازی و هەرشتێکی تر بە مەرجێ نیازی خوای لەگەڵ بێت.

٢- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ ئەو بەڵێن پێ دراوانە واز هێنەر و روو وەرگێڕن لە شتی بێ نرخ و کار و کردەوەی بێ سوود، جا وتار بێت یان کردار یان بە مەبەست و بە گرنگ گرتن، بە کورتی هەر شتێ سوودی هەبێ لە ژیانی ئەم جیهانەدا، ئیتر سوودی دەروونی یان کۆمەڵایەتی یا هەرچی تر ئەوە چاکە و بەڵکو زۆر لەو شتانە فەرزن لە ئیسلام دا و واز لێ هێنانیان گوناهە، ئەجر و پاداشتیان هەیە لای خوا بە مەرجی نیازی فەرمانبەری خوایان لێ بکرێ.

٢- ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَـٰعِلُونَ﴾ ئەوانەن كە بەجێ هێنەری زەکاتن و زەکات دەرکەرن لە ماڵ و سامانیان بۆ ئەو کەسانەی کە قورئان دیاریی کردوون. زەکات هۆی پاك و خاوێن کردنی دەروون و ماڵ و سامانە. هۆی پاك و خاوێن کردنی دڵ و دەروونە لە چرووکی و خەتەرە و وەسوەسەی شەیتان کە ئەیترسێنێ لە فەقیری، هۆی زاڵ بوونە بەسەر خۆپەسەندی و بێ رەحمی و هۆی ئارامی و دڵنیایی یە بەو ئەجرو پاداشتەی کە بەڵێنی پێ دراوە. زەکات هۆی پاك و خاوێن کردنی ماڵ و سامانە لە پاش دەکردنی زەکاتەکە ماڵی خالیسی خۆیەتی و پەیوەندی کەسی پێوە نامێنێ، مەگەر لە هێندێ کاتی تایبەتی دا، زەکات هۆی بەرگری کردنی حیقد و حەسەدە و پەیدا کردنی سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی یە لە نێوان زەکات دەر و زەکات وەرگرەکان دا، بەرگری کەرێکی بەهێزە بۆ نەخۆشی یەکی کوشندەی کۆمەڵایەتی کە بریتی یە لە بێ بەشی و بەش براوی دەستەیەك و کۆبوونەوە بە لێشاو لای دەستەیەکی تر کە ئەوەش هۆی ئاژاوە و دووبەرەکی یە لە نێوان کۆمەڵ دا، جا لەبەر ئەوە دوژمنانی ئیسلام هەمیشە بە کردەوە و بە یاسا ئەو دەردە کوشندە فەراهەم دێنن، زەکات چارەسەرێکی تێر و تەواوە بۆ هێندێ پەك کەوتوو، وەك ئەوانەی کە سەفەریی و داماون، ئەوانە ئەبێ بە خۆڕایی پارەیان پێ بدرێ تا ئەگەنەوە جێ و شوێنی خۆیان، هەروەها کەسانێك کە بەسەرهاتی خراپیان بەسەر بێت وەك بە ئاگر و بە لافاو ماڵ و سامانیان ئەڕوا، زەکات هۆی بەهێز بوون و راگیر بوونی دەوڵەتی ئیسلام و گەل و کۆمەڵی موسڵمانانە کە ئەبێ یەك لەسەر هەشتی هەموو موسڵمانان بەخت بکرێ بۆ موجاهیدان و چەك و پێویستی یان، ئینجا ئیسلام ئەیەوێ ئەوانەی کە سنعەتکار و کاسبن هۆی سنعەت و کەسابەتەکەیان فەراهەم بهێنرێ بۆیان لەو بەشە زەکاتە. ئینجا مەسەلەی زەکات خێرو پیاوەتی نی یە، بەڵکو ئەوانەی کە زەکات نادەن کاربەدەستی موسڵمانان ئەبێ بە زۆر بسێنێ و کوشتاریان لەگەڵ بکات تا مل کەچ ئەکرێن بۆ حوکمی خوا و خاوەن ماڵ نابێ ئەو بەشە زەکاتە بە ماڵی خۆی بزانێ و بە بێ دەرکردنی زەکات دروست نی یە کفنی بۆ بکرێ لەو ماڵەی کە زەکاتی دەرنەکراوە. پێویست بوو روون کردنەوەی ئەو مەسەلانە بۆ نەشارەزاکان.

وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴿٧﴾

---

**٤- ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ * إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ﴾ ئەوانە کە پارێزەری بەجێ هێنانی ئارەزووی ژن و مێردیین لە هەموو کەس و هەموو شتێك بێجگە لە ژن و حەڵاڵ و هاوسەرەکانیان و ئەو ئافرەتانەی کە موڵکیانن، واتە ئەگەر بەکاریان هێنا هەر لەم دوو جۆرەدا بەکاریان بێنن. ﴿فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ﴾ چونکە ئەو ئیماندارانە لە بەکارهێنانی ئارەزوویان لەو دوو جۆرە ئافرەتەدا هیچ لۆمە لێ کراو نین و رەخنە لێ گیراو نین ﴿فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ﴾ کەواتە ئەو کەسانەی کە نیازی غەیری ئەو دوو جۆرە ئافرەتە ئەکەن و بە دوایی دا ئەگەڕێن هەر ئەوانە دەست درێژیی کەرن لەبارەی کاری ژن و مێردیی یەوە، چونکە تۆمەی ژیان زایە ئەکەن و ئەیڕێژنە شوێنێکی پیس و ناشایستە.**

**مەسەلەی ژن و هاوسەر بە نیکاح و خواستن هیچ جێگەی قسە و باس نی یە و جێگەی رەزامەندی یە، بەڵام مەسەلەی گیرانی ئافرەت بە موڵك و بەکارهێنانی بە موڵکایەتی ئەمە جێگەی رەخنە و قسە و باسە لەلایەن دوژمنانی ئیسلام و ناشارەزاکانەوە، کەواتە پێویستی هەیە بەباس و روون کردنەوەیەك و لە چەند شوێنێك لەم تەفسیرەدا بە جوانی روونم کردووەتەوە و هیچ رێگەیەك نەماوە بۆ نەفام و نەزان کە دەمبازی بکات، یەکێ لەو شوێنانە سەرەتای سورەتی(محمد) ە کە لە پێش ئێرەدا تەفسیرم کردووە، با سەنج بدرێ، حەز ئەکەم لێرەش دا هێندێ باس و لێکۆڵینەوە بکەم: مەسەلەی رژێمی بۆگەنی عەبدایەتی و گیرانی ستەمکار و ژێر دەستە و بێ دەسەڵات بە بەندەی ئەڵقە لە گوێ، ئەو رژێمە بەدە لە کۆنەوە هەر بووە بە پیس ترین شێوە تا گەڕا بە رژێمێکی جیهانی و بە بێ سەر لێ کردنەوە و بێزاری لێ دەربڕین. ئینجا کە ئیسلام هات هەر لە یەکەمجاری یەوە دەستی کرد بە هەوڵدان**

بۆ نەهێشتنی بە ئامۆژگاری و هاندان و ترساندن لە خوا، ئینجا چەند ڕێگەیەکی دانا بۆ ئازاد کردن، یەکێ لەوانە بەخت کردنی یەك لەسەر هەشتی زەکاتی هەموو موسڵمانان و تەرخان کردنی بۆ کڕین و ئازاد کردنی بەندەیان و داگیر کراوەکان. تەنها تەرخان کردنی ئەوە بەس بوو بۆ نەهێشتنی کۆیلەیی و ژێر دەستەیی ئەگەر بەجێ بهێنرایە و بەجێ بهێنرێ. بەڵام ئایا بۆچی لە ڕێوە قەدەغەی نەکرد با بە چەند قۆناغیش بوایە وەك عەرەق و قومار؟ ئەوە بە تەنیا بە ئیسلام نەئەکرا، بەڵکو پێویست بوو دوژمن و تەرەفی بەرامبەریش یەك بکەوێ و دان بنێ بەو شتە هەق و ڕاستەدا، ئەگینا چۆن ئەبێ ئەم دیلی دوژمن بەرەڵا بکات و دوژمن دیلەکانی ئەم بەرەڵا نەکات و هەر بە بەندەیی بیهێڵێتەوە؟! ئینجا دیلەکان ئافرەتیشیان تێدایە دەی ئەو ئافرەتانە لەبارەی مامەڵەی جنسی یەوە ئایا بەر مەرەخەس بکرێ بۆ هەر کەس مەیلی هەبێ وەك باوە لەلایەن دوژمنانەوە کە ئەوە ئەکەن بە وێنەی ئاو دەست خانە میزەکەیان تێ بکرێ، کە ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەیە ئافرەت کە نیوەی ئادەمی یە و کارگەیە بۆ ئادەمی بەو جۆرەی لێ بکرێ، ئایا چ ویژدانێك ئەوە ڕەوا ئەدات؟! ئیسلام کە ئایینی عەدل و دادپەروەری یە دیلە ئافرەتەکان بە ڕێز و خۆشی یەوە ناموسیان ئەپارێزێ و ئەیانـدات بە شـوو و بـە موڵکایـەتی حـەڵاڵی کـردووە بـۆ پیـاوی تایبـەتی و چارەسەری خۆیشی و منداڵەکانیشی کردووە وەك بە درێژیی لە کتێبەکانی ئیسلام دا بڵاو کراوەتەوە. لە پێشەوە گوتمان ئیسلام بەندەیی دانەمێناوە و هەر لە یەکەمجاری هاتنی یەوە هەوڵی داوە بۆ بەرگری کردنی و هەر لەبەر ئەوە بۆ ڕێك خستنی یاسایەکی هەمیشەیی داناوە کە بۆ هەموو چەرخ و وڵاتێك دەست بدات هەتا هەتایە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾ یان پیاوەتی یان لەگەڵ بکەن و بە خۆڕایی بەرەڵایان بکەن یان بە بریتی بەرەڵایان بکەن، بریتی بە پارە و ماڵ یان بە گۆڕینەوەی دیل – تبادل الأسراء –. بە کورتی ئەوەیە مەسەلەی عەبدایەتی. با دوژمنان تێ بگەن و لە خۆیانەوە دەمە دەمێ و قسەی بێ جێ نەکەن.

٥- ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ﴾ ئەوانەی کە پارێزەری سپاردە و پەیمانەکانیانن، سپاردە و پەیمان لە گەردنی بەندەکان دا زۆرە و نابێ بیبڕین بەسەر هێندێ شتی تایبەتی دا، چونکە رووکەش و رواڵەتەکەی نەبەستراوە بە هیچ شتێکەوە ﴿لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ﴾ کەواتە ئەبێ بهێڵرێتەوە بە شێوەکەی خۆی کە زۆرن: سپاردە و پەیمانی فیترەت کە ئادەمی بە شێوەیەك دروست کراوە ئەبێ باوەڕی ببێ بە بوونی خوای پەروەردگار، هێزی ژیریی و بیر و بیستن و بینینی پێ دراوە و ئەگەر ئەو هێزانەی لە کار نەکەوتبێ ئەبێ بزانێ خۆی و ئەم بوونەوەرە نایابە لەخۆیەوە نەهاتووە بەڵکو پەروەردگاری حەکیمی زانای دەسەڵات دار هێناویەتی. دەی ئیمانداری راستەقینە ئەو سپاردە و پەیمانە گەورەیە ئەپارێزێ تا بەهۆی ئەوەوە هەموو سپاردە و پەیمانەکانی تریش ئەپارێزێ، وەك بینراوە بە شایەتی مێژوو پاراستنی ئەو هەموو سپاردە و پەیمانە جۆر بە جۆرانە لە پەروەردگاکەی قورئان و پێغەمبەری ئازیزدا(ﷺ).

٦- ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ ئەوانەی کە پارێزەرن لەسەر نوێژەکانیان و هەوڵ ئەدەن بەجێ یان بێنن بەو جۆر و شێوەی کە مایەی رەزامەندی خوایە و لەسەرەتاوە دەست نیشانی فەرمو بە وتەی ﴿خَٰشِعُونَ﴾ نوێژی راستەقینە ئەو نوێژەیە کە بە خشوع و بیم و ترسەوە بکرێ لە هەیبەت و جەلالی خوا، ئەو نوێژە کار ئەکات لەدڵ و دەروونی نوێژ کەران دا بەجۆرێ بتوانن هەڵسن بە ئەرکی بەندەیی بۆ خوای خۆیان بە پێی توانا، ئەگینا هیچ کەس نەیتوانیوە و ناتوانێ هەڵسێ بە ئەرکی بەندەیی. بێگومان لە ژیانی ئەم جیهانەدا ناگات بە بەدی هێنانی ئەو کەمال و تێر و تەواوی یەی کە خوا ویستوویەتی بۆ ئادەمی، لەبەر ئەوە خوای میهرەبان ویستی تا رۆژی دوایی ئەو باوەڕ دارانەی کە خاوەنی ئەم سیفەتانەن لەم جیهانەدا،

أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا
ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴿١٢﴾

---

ویستی دواڕۆژیان فیردەوس بێت بە بێ بڕانەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ * ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ ئا ئەوانە كە خاوەنی ئەوسیفەتانەن هەر ئەوانە شایستە ترن كە فیردەوس، واتە بەهەشت وەرگرن و بە كەلەپوور ببێ بۆیان لە ڕۆژی دوایی دا لە كاتێك دا ئەمێننەوە تیای دا بە هەمیشەیی و بەبێ دوا هاتن، ئەگەر مەبەست لە فیردەوس بەهەشت بێت بە شێوەی گشتی بەو جۆرە ئەڵێین. ئەگەر مەبەست بەرزترین تەبەقەكانی بەهەشت بێت ئەڵێین: هەر ئەوانەن كە بە كەلەپوور فیردەوس وەرئەگرن. لەسەر هەر بار ئەوە ئەوپەڕی گەیشتن بە ئامانجە خوا بە نسیبمان بكات. لەپاش باسی ئیمان و مژدە دان بە بەرهەمی ئەو ئیمانە، ئینجا باسی چەند بەڵگەیەكی بەهێز ئەكات و ئەیخاتە بەرچاو بۆ پتەو كردنی و بەهێز كردنی ئەو ئیمانە، بەڵگە ئەهێنێ لە خودی ئادەمی و ئەو چەند گۆڕانكاری یە كە بەسەری دێت، لە پەیدا بوونی یەوە دەست پێ ئەكات تا مراندن، دیارە كە لە یەكەمجارەوە لە هیچ دروستی كردووە و دووبارە كردنەوەی ئەبێ جێگای سەرسوڕمان نەبێت، ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴾ بێگومان ئینسانمان دروست كردووە لە خولاسە و پاڵفتەیەك لە قوڕ، قورئان بە چەند جۆرێ باسی دروست كردنی ئینسان دەكات، لە ئایەتێك دا ئەفەرموێ: ﴿مِن تُرَابٖ﴾ لەخاك و خۆڵ، لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێ: ﴿مِّن طِينٖ﴾ لە قوڕ. لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێ: ﴿مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ﴾ لە قوڕێكی مچ. لێرەش دا ئەفەرموێ: ﴿مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ﴾ ئەمانە هەموو هەر ڕاستن و یەك مەبەستن و جیاوازی وتەكان بە پێی ڕێك و پێكی و داخوازی ئەو شوێنانەیە كە ئایەتەكانی تێدا هاتووە. خوا كە ویستی ئەم گیان لەبەرە دروست بكات فەرمانی دا بە مەلائیكە لە جۆر و بەشەكانی ئەم زەوی یە خۆڵ بێنن، ئینجا ئەو خۆڵە ئاوی تێ بكەن تا ئەبێ بە قوڕ، ئینجا ئەو قوڕە ئەوەندە بشێلن تا

ئەبێ بە قوڕێکی مچ، ئینجا لەم قوڕە مچە هەیکەلی ئەم گیان لەبەرە تایبەتی دروست بکەن، ئینجا خوا ئەم گیانە تایبەتی یەی پێ داو کردی بە بەریدا تا بوو بەم ئینسانە بێجگە لە خوا هیچ کەس ئاگای لێ نەبوو و باس نەئەکرد، ئینجا بۆ پەرەسەندن و زۆر بوونی هەر لە یەکەم جارەوە هاوسەرێکی بۆ دروست کرد تا بە زاوزێ و بەم جۆرەی کە ئەزانین پەرە بسێنێ، ئینجا نابێ سەر سوڕ بمێنێ لەمەی چۆن لەخۆی ئەمەی دروست کرد با سەرنجی ئەو هەموو دار و درەختە بدەین کە لە خۆی بەر و میوە پەیدا ئەبێ وەك خۆی و بنەی خۆی، لە هەموو بارو رووەکەوە دروست دەکات، کەواتە هەموو ئادەمی ئەچێتەوە سەر یەك کەس و لە بنەڕەت دا یەك کەسە، ئەبوایە هیچ تەفرەقە و رەگەزایەتی یەك پەیدا نەبوایە لەناو ئادەمی یەکان دا، بەڵام بە داخەوە بیریان لەوە نەکردەوە و هەر لە یەکەم جارەوە و لە یەکەم چین دا برا برای خۆی کوشت!! پاش ئەوە هەموو رەگەزایەتی و دوو بەرەکێتی و کوشتار هات وەك بە چاو ئەبینین، ئەبوایە ئەم ئادەمی یە بیری بکردایەتەوە لە بەرنامە و رێنموونی یەکانی خوای میهرەبانی و رێگە راستەکەی ئەویان بدایەتە بەر، بەڵام بەداخەوە بە مەیل و ئارەزووی خۆیان زۆربەیان لایان دا لە رێ ی راست. خوای پەروەردگار هەواڵی پێدانی لێرەدا کە ئینسانی دروست کرد لە خولاسە و پاڵفتەیەك لە قوڕ، ئیتر نەزەریاتی خەڵکی چی ئەڵێ با بیڵێ و نابێ ئێمە بکەوینە شوێن قسە و بڕیاری کەسێکی تر، هەرکام لەو نەزەریات و بۆچوونانە ئەگەر راست دەرچوو، ئێمە ئەبێ بە راستی بزانین، چونکە لەگەڵ بڕیاری ئیسلام دا ئەگونجێ. نەزەریات جیاوازە لەگەڵ حەقایق، بۆ وێنە مەسەلەی چۆنیەتی پەیدا بوونی باران و بەفر و تەرزە و هەور شتێکی راستی وایە دەست نادات بۆ هەڵە و وەری ئەگرین. باسی پەیدا بوونی ئینسانمان کرد لە یەکەم جارەوە، ئینجا با گوێ بگرین لە قورئان لەبارەی زۆربوون و پەرەسەندنی ئەو گۆڕانکاری یانەی بە چەند قۆناغێك کە بەسەری هات کە هەرکام لەو گۆڕانکاری یانە جێگەی سەرسوڕمانە و مایەی بەهێز بوونی ئیمانە لای هەرکەسێك کە بێ بەش نەبێت لە فام و ژیریی،

ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾

**فەرموی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾ لەپاش ئەوە ئینسانمان دروست کردووە و گێڕاوە بە دڵۆپە ئاوێك لەناو ئارامگا و قەرارگایەکی دامەزراودا کە بە هەڵس و کەوت و باز بردنی زیانی پیٚ نەگەیەنیٚ و لە خشەی پیٚ نەکات، ئەمە شتێکی راستە کە ئەم ئینسانە لەو دڵۆپە ئاوە پەیدا ئەبێت و کۆ ئەکرێتەوە لەو دڵۆپە ئاوەدا بە هەموو بەش و پارچەکانی و نیشانە و دروشمەکانی و بەو شتەی کە پیٚی ئەگوترێ(کرۆمۆسۆمات) و پارێزەر و دامەزراوی و نەگۆڕانیەتی بە گیان لەبەرێکی تر، بەڵکو نەگۆڕانی بە تیرە و بەرەیەکی تر. لە بەشێك دا کە بە چاو نابینریٚ و بەشێکە لە چەند هەزار بەشی ئەو دڵۆپە ئاوە وەك لە زانیاریی تازەدا دەرکەوتووە!! ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾ لەپاش ئەو ئینجا ئەو دڵۆپە ئاوەمان دروست کرد بە خوێنا و و گێڕامان بە خوێن پارە، واتە خوێنێکی خەست وەکو جگەر، ئەوە لە کاتێك دا سێڵەی نێر تێکەڵ ئەبێت لەگەڵ هێلکەی دایك دا لە منداڵ دان دا و ئەلکێن بە دیواری منداڵ دانەوە و خۆراك لە خوێنی دایك وەرئەگریٚ، لە یەکەم جارەوە نوختەیەکی بچووکە و بەرە بەرە گەورە ئەبێت و ئەبێت بە گۆشت پارە بە ئەندازەی تیکەیەك کە بجوریٚ لەدەم دا، ئینجا لە قۆناغێکی تردا ئەبێت بە قەبارەیەکی ئێسکی وەك ئەفەرمویٚ: ﴿فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا﴾ ئینجا گۆشت پارەکەش ئەگێڕین بە ئێسك و قەبارەیەکی ئێسکی! بەڕاستی زانینی ئەمە موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە و بەدڵی کەس دا نەهاتووە لەمەو پێش تا لەم دوایی یەدا لە رێگەی زانیاری یەوە دەرکەوت.**

**ئەو قەبارەیە پێك ئەهێنیٚ و ئینجا ئەفەرمویٚ: ﴿فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا﴾ ئینجا گۆشت ئەکەین بە بەری ئێسکەکان دا و ئەیهێنین بەسەریان دا. هەموو مەڕ و ماڵات و گیان لەبەرەکانی تریش بەم قۆناغەدا تێپەڕ ئەکەن و قەبارەی لەشیان فەراهەم دیٚت بە ئیرادە و دەستی قودرەتی خوا جل جلالە، بەڵام ئینسان کە بەڕێزترین دروست کراوە لە گیانەکەی دا**

جیاوازه، ئەم ئەو رۆحەیشی پێ درا کە لە عالەمی ئەمره و هەر خوا خۆی ئەزانێ چی یەو بەو رۆحە بەرز و بەرێز تر بووه و شیاوی ئەوە بووە کە ببێ بە گەورەی ئەم بوونەوەرە و خوا کردی بە جێنشین و زانای کرد بە زۆر لە ئەسرار و شتە نهێنی یەکان کە خوا لەم بوونەوەرەدا دایناوە، ئەو هەموو هێز و وزە گرنگانە بەکار بێنین کە ئاگادارین پێ ی و بەرە بەرە دەست کەوتی زۆر تر ئەبێت، ئەم ئینسانە خوا ئەو نیعمەتی رۆحەی پێ بەخشیوە و بووە بە جۆرە گیان لەبەرێکی تر وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ﴾ ئینجا ئینسانمان فەراهەم هێنا و دروست کرد بە دروستی کردن و دروست کراوێکی تری جیاواز لەگیان لەبەرەکانی تر، کردی بە گیان لەبەرێکی ژیری زانای بیسەری بینا، وتەی ﴿ثم﴾ بۆ گەیاندنی جیاوازی زۆرە لە نێوان ئەو دوو جۆرە گیان لەبەرەدا ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾ کەواتە بەرز و پایە بەرز و پاکە لە هەموو رەخنە و لەکەیەك خوا کە ناوی ﴿الله﴾ یە و چاك ترین و جوانترینی هەموو بڕیار دەرانە و هەر دروست کردنەکەی ئەو جوان و شیرینە. بەڕاستی بیر کردنەوە لە تەنیا شایەتێکی وا ئەبوو بەس بێ بۆ باوەڕی بەهێز بە پەروەردگار. ئایا کێ ئەو هەموو گۆڕان و گۆڕانکاری یە ئەهێنێ بەسەر ئەو دڵۆپە ئاوەدا؟ ئایا کێ هەڵئەستێ بە ناردنی مەلایین سێڵ بۆ پێك هێنانی چاو و هەموو ئەندامەکانی؟!! ئایا کێ مێشکی کرد بە شریتی تەسجیل بۆ ئەو هەموو تام و بۆن و شێوە ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾ نازانین باسی چی بکەین – سبحان الله – ئایا شەیتانەکانی جنۆکە و ئادەمی چۆن خەڵکی ئەخەڵەتێنن و چەواشەی ئەکەن بە بینینی ئەم شتە روونانە، خوا پەنامان بدات دوژمنانی ئەم ئادەمی یە ناوەستن و کۆڵ نەدەرن. هەمیشە خەریکن بۆ سەر تێك دان و چەواشە کردن، هەرجارێ بە جۆرێك، وەك لە سەردەمێك دا بە کاوێژی داروین و بەچکەکانی بۆچوونی بەدی(نشوء ارتقاء) یان داهێنا هەر لە رێگەی زانیاری یەوە بە درۆ خرایەوە و ئیعلانی درۆ بە درۆخستنەوەکەی بڵاو کرایەوە، لە میهرەبانی خوا بە زیاد بێت. بێگومان ژیانی ئەم ئینسانە نایابە نابێ لەم زەوی یەدا دوایی بێت، بەڵکو ئەبێ ژیانێکی تری نەبڕاوەی بەدی بێت کە بەرو بەرهەمی کردەوەکانی دەست کەوتی خاوەن کردەوەکان ببێ، داد و دادپەروەری خوا داخوازە بۆی،

ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ
سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ ﴿١٧﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَىٰ
ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِ جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا
تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ
لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا

---

لەبەر ئەوە رووی فەرموده ئەکاتە هەمووان و ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ * ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە ئێوە هەمووتان ئەمرن، ئەم گیانەتان لێ دەسێنینەوە، ئینجا لەپاش مردن هەمووتان زیندوو ئەکرێنەوە. لەپاش هێنانەوەی ئەو هەموو بەڵگە دەروونی یانە، ئینجا بەڵگەی بوونەوەری ئەخاتە بەرچاو، چەند بەڵگەیەکی بوونەوەری ئەهێنێ کە هەموو بەستراو و پەیوەستن پێکەوە، لەم بارەوە کە نیشانە و بەرهەمی قودرەتی خوان، هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی بە حیکمەت و تەگبیر پەیدا بوون. هەموو کۆمەکی یەك هەیە لە نێوانیان دا، هەموو بۆ سوود و خزمەتی ئەم ئینسانەن، کەواتە لەم بارەیشەوە ماڵ خۆیەتی کە ئەیهێنێ بەدوای پەیدا بوونی ئینسان دا و ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ﴾ بێگومان دروستمان کردووە بەلای سەروتانەوە حەوت تەبەقی یەك لەسەر یەك، یان یەك لەدوای یەك، ئیتر مەبەست حەوت کۆمەڵە بێت کە یەکێکیان ئەم کۆمەڵەی خۆری ئێمەیە یان هەرچی ئێمە باوەڕمان بە و حەوتە بەلای سەرومانەوە و بەرزن لەم زەوی ئێمەیە ئەخولێنەوە لەم بۆشایی یەدا و خوا راگیری کردوون بە حیکمەت و لێزانی و کاردروستی خۆی و لەژێر زانین و پارێزگاری خۆی دا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ﴾ ئێمە بێ ئاگا نین لە دروست کردن و دروست کراوەکان، ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ﴾ هێناومانەتە خوارەوە لای سەروتانەوە ئاو بە ئەندازەیەکی دیاریی کراو بە حیکمەت و بە تەگبیرێکی زانراو، نە ئەوەندە زۆر کە داپۆشێ و نە ئەوەندە کەمە کە قات و قڕی روو بدات، نیشتەجێمان کردووە و دامانناوە لە زەوی دا و بە پێی کاردروستی خۆی هات و چۆی پێ ئەکات لەم لا بۆ ئەو لا و ئەو ئەندازەی کە

دروستی کردووە لە زیاد ئەکات و نە کەم ئەکات، ئێمە وەك لە نەبوون دروستمان کردووە هەروەها توانا و دەسەلآت داریشین بەسەر نەهێشتن و لەناو بردنیشی دا، کەواتە ئێمە ئەبێت هەمیشە چاومان لە دەستی قودرەتی خوا بێت و بترسین لە نەهێشتن و سەندنەوەی لێمان، ئیتر بەمەی پرژ و بلآوی بکاتەوە نوقمی بکات بەناو تەبەقەکانی زەوی دا یان بەمەی بیخاتە نەبوون وەك یەکەمجار نەبوو، لە چەرخەکانی کۆن دا گومان وابوو کە پەیوەندی نی یە لە نێوان ئاوی ناو زەوی و ئاوی سەر زەوی، بەلآم قورئان پێش هەزار و چوارسەد ساڵ دەست نیشانی کرد کە هەر ئاوەکەی ناو زەوی یە ئەبێت بە هەڵم و بەرز ئەبێتەوە و دێتەوە خوارەوە. شتێکی ئاشکرایە کە ژیانی ئەم زەوی یە بەستراوە بە ئاوەوە، چ ژیانی گیان لەبەران، چ ژیانی درەخت و کشت و کاڵ وەك ئەفەرموێ: ﴿فَأَنشَأۡنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ﴾ ئینجا دروستمان کردووە و ئەیکەین بۆتان بەهەشت و باغات لە خورما و ترێ. ناوی ئەم دووانە ئەبات کە دوو نموونەی سەرەکین و زۆر نزیکن لەدڵ و هەستی یەکەم چینەوە کە یەکەم جار ئەم قورئانە چوو بە گوێچکەیان دا، هەموو خۆراکەکانی تریش مەبەستە وەك ئەفەرموێ: ﴿لَّكُمۡ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٞ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾ بۆتان هەیە لەو باخاتانەدا میوەجاتی زۆر و بەر و بەرهەمی ئەو باخاتانە ئەخۆن. ئینجا بە تایبەتی زەیتونیش باس ئەکات کە سوود و خێری زۆری هەیە بەر و دارەکەی و نزیك ترین شوێن لە ولآتی حیجازدا کە ئەو درەختەی لێ ئەروێ(توری سینا) یە کە قورئان باسی ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَشَجَرَةٗ تَخۡرُجُ مِن طُورِ سَيۡنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ﴾ دروستی کردووە درەختێك کە ئەروێ و سەوز ئەبێت لە(توری سینا) کە سەوز ئەبێ بە رۆنەوە بۆ چرا و بە پێخۆریشەوە بۆ بخۆران، واتە ئەو درەختە دوو شت فەراهەم ئەهێنێ: رۆن بۆ چرا و رووناکی و پێخۆریشە، ئینجا دێتە سەر باسی ئەو چاکە و نیعمەتانە کە پێی بەخشیوین بەهۆی مەڕ و مالآت و ولآخو حوشترەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗ﴾ بەڕاستی لە دروست کردن و ژێر باری کردنی ئەو حەیوانانەدا بۆتان بەو هەموو خێرو بێرەوە عیبرەت و تەمێ یەکی گرنگتان بۆ هەیە کە ببێتە هۆی ناسین و پەرستنی خوا و چاو لەبەریی چاکە و نیعمەتەکانی، بەکورتی باسی خێرو چاکەی کردن، ئینجا بە درێژیی باسی هێندێ لە بەهرە و چاکەکانی ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا﴾ ئەرخواردتان ئەدەین لەو شیرە ساف و پاك و خاوێنەی کەوا لە سکیان دا

وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ
قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ
مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً

---

﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ بۆتان هەیە لەوانەدا سوود و بەرهەمی زۆر بێجگە لەوەی باس کرا وەکو موو و خوری یەکەی کە لەوانە چاکترین پۆشاک و ئەسبابی ماڵ و خێوەت و دەوار دروست ئەکەن و لێشیان ئەخۆن. ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾ هەڵئەگرین بەسەر پشتی ئەوان و بەسەر پشتی کەشتی یەوە و هات و چۆمان پێ ئەکرێ بە خۆتان و بار و شت و مەکتانەوە، هەر کەسێك چاوی دڵی نابینا نەبووبێت بیر لە هەر شتێ بکاتەوە لەم بوونەوەرەدا دەستی میهرەبانی و قودرەتی خوا ئەبینێ، بۆ نموونە مەسەلەی کەشتی بە تایبەتی لەو چەرخەدا کە بەهۆی باوە کەشتی ئەگەڕا ئەو کەشتی یە قورسانە کە چۆن خوا کارێکی وای کردووە بەو هەموو قورسی یە نانیشێ و نقوم نابێ لەگەڵ ئەوەدا هەر بەردێ یان هەر شتێکی زۆر ورد و تا رادەیەك نەبینرێ لەبەر بچووکی نقوم ئەبێ، هەروەها ﴿ففی کل شیء له آیة یدل علی انه الواحد﴾ بەڵام لەبەر دەق و ئولفەت پێوەگرتن ئەو شتە روون و ئاشکرایانە بیریان لێ ناکرێتەوە ئینجا دێتە سەر داستانی هێندێك لە پێغەمبەران – سەلامی خوایان لەسەر بێت – کە عیبرەت و ئامۆژگاری یان تێدا هەیە و لێرەدا باسی باوکی دووەمی هەمووان ئەکات کە یەکەمجار لەسەر دەستی ئەودا کەشتی دروست کرا و بینرا،

کەواتە زۆر پەیوەستە بەم ئایەتی پێشووەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ بێگومان نوحمان رەوانە کرد بۆلای گەلەکەی ﴿فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ ئینجا نوح فەرمانێکی پێدان و وتەیەکی پێ ڕاگەیاندن کە ڕاست و ڕێك و ڕوونە و دەست نادات بۆ گۆڕان و بوون و بوونەوەر شایەتە لەسەری، پێی گوتن ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا ناترسن، واتە بترسن و خۆتان بپارێزن لە خەشمی خوا، ئەم وتە پیرۆزە وتەی هەموو پێغەمبەرانە لەوەوە، وتەی پێغەمبەرانە لە ئادەم تا خاتەم – سەلامی خوا لە هەموویان بێت –. هەرچۆنێ ئەمان هەر ئەوەیان ڕاگەیاند و بەرامبەر ئەوانیش تاغوت و خۆ بەزل زانەکانی هەموو گەلێکیش سەرپێچی یان کردووە بە چەند جۆر و شێوەیەك و ڕەخنە و بیانووەکانیان نزیکن لەیەکەوە و بەڵکو هەریەکن وەك لەیەك چەرخ و زەمان دا بووبن و ئیتفاقیان لەسەر کردبێت، ئەوانە لەباتی بیر بکەنەوە لە ئامۆژگاری یەکەی و بیر بکەنەوە لەو قسە ڕاستە، لەباتی ئەوە ڕەخنەیان لەخۆی ئەگرت بەوەی ئادەمی یەکە وێنەی خۆیان و ئەگەر خوا پێغەمبەر ڕەوانە بکات ئەبێ مەلائیکە ڕەوانە بکات وەك ئەفەرموێ: ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾ پیاو ماقوڵی گەلەکەی کە باوەڕیان نەهێنا بوو، ئەیان گوت ئەمە – واتە نوح – هەر پیاوێکە وەك ئێوە ئەیەوێ خۆی زل بکات بەسەرتانەوە، ئەگەر خوا بیویستایە پێغەمبەر ڕەوانە بکات مەلائیکەی ئەهێنایە خوارەوە

مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٢٥﴾ قَالَ
رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا
وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡ

---

﴿مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئێمە شتی وامان نەبیستوە لە باوك و باپیرە پێشووەكانمانەوە ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ﴾ ئەمە هەر پیاوێكە شێتە و شێتی سەری لێداوە كە لاف وا لێ ئەدات، كەواتە لێ ی گەڕێن هەتا ماوەیەك بەڵكو چاك ببێتەوەو ئەم حاڵەتەی لەسەر لاچێ، یان تا ئەمرێ و لەناو نەچێ، ئینجا كاتێ نائومێد بوو لێ یان: ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾ ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە و زاڵم بكە بەسەریان دا بەهۆی باوەڕ نەهێنانیان پێم و بە درۆزنیان دانام، نوح یەكەم رەسول بوو پێش ئەو پێغەمبەرانی تر هاتوون بۆ بەهێز كردنی كمالانی خۆیان، ئەوا ئەم لە یەكەم جار و سەرەتای ئادەمی دا رێگەی لێ گیرا، كەواتە ئەبێ خوای میهرەبان رێگرەكە لەناو ببات، خوایش چارەسەری كرد بەم جۆرە زەوی پاك بكاتەوە لەو تۆمە پیسانە و كۆمەڵێكی ئیماندار بێتە كایەوە، بەم جۆرە كە ئەفەرموێ: ﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا﴾ بەهۆی ئەوەوە وەحیمان كرد بۆلای نوح بەمەی كەشتی دروست بكات لەژێر چاودێریی ئێمە و وەحی ئێمەدا و خوا ویستی نوح بە دەستی خۆی كەشتی دروست بكات، چونكە ئێمەی ئادەمی ئەبێ كردەوەی خۆمان بەكار بێنین و ئەوەی پێمان دەكرێ بەكاری بێنین تا شیاوی ئەوە ئەبین خوا یارمەتیمان بدات، ئینجا نیشانەی دیاریی كرد بۆ كاتی چوونە ناو كەشتی یەكە و رزگار بوونیان، بەم رەنگە فەرموی ﴿فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡ﴾ واتە كاتێ فرمانی ئێمە هات بۆ لەناوبردن و ئاو لە تەنوورەكانەوە دەرچوو و هەڵقوڵا لە هەموو گیان لەبەرێك نێر و مێ یەك بخەرە ناوی یەوە بۆ ئەوەی ئەو جۆر و نەوعانە بنەبڕ نەبن و لەرێگەی زاو زێوە پەرە بسێننەوە و كەس و كارەكەت و بنەماڵەكەت بێجگە لەوەی كە بڕیار دەرچوو لەسەر سزادان و لەناوبردنی، وەك كەنعانی كوڕی و ژنەكەی و ئەوانەی كە ئیمانیان نەهێنا

وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِذَا ٱسۡتَوَيۡتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلۡفُلۡكِ فَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ
لِلَّهِ ٱلَّذِي نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ وَإِن كُنَّا لَمُبۡتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِمۡ قَرۡنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾

---

﴿وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ﴾ قسەم لەگەڵ نەکەیت لەبارەی ئەوانەوە، واتە تکایان بۆ نەکەیت ﴿إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ﴾ بەڕاستی خنکێنراو ئەبن و پەیوەندی نەماوە لە نێوانتان دا و تکات وەرناگیرێ. ئینجا فەرمان بە نوح کە سوپاسی خوا بکات لەسەر ئەو چاکە گەورەیەی کە کردی و زەوی پاك کردەوە لەو تۆمە پیسە و خۆی و کۆمەڵە ئیمان دارەکان لەوان لەگەڵی نیشتەجێ یان بکات لە شوێنێکی پیرۆزدا، فەرموی بە نوح(علیه السلام): ﴿فَإِذَا ٱسۡتَوَيۡتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلۡفُلۡكِ﴾ کاتێ تۆ و ئەوانەی لەگەڵتن دامەزران بەسەر کەشتی یەوە ﴿فَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بڵێ هەموو سەنا بۆ ئەو خوایە کە ناوی ﴿الله﴾ یە کە رزگاری کردین لەو کەلە زاڵمانە ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ﴾ بڵێ پەروەردگارم نیشتەجێم بکە لە جێ و مەنزڵێکی پیرۆز کراودا، تۆ ئەی خوایە باشترین نیشتەجێ کارانی. نزای پێغەمبەران بە تایبەتی کە نزا کردنەکەیان لەسەر مافی خوا بێت بێگومان وەرگیراوە و نیشتەجێی کرد بەسەر شاخی(جودی) یەوە کە خوای میهرەبان گێڕای بە خاکی کوردستان و کوردەکانی تیا جێگیر کرد کە خۆشترین و پیت و فەڕ دار ترینە لە هەموو بارو روویەکەوە. کورد میللەتێك بوون ئاگر پەرست بوون و زێر دەستە، خەلیفەی دووەم عومەری فاروق ئازادی کردن و سەربەستی پێدان تا رادەیەك مەنعی کرد تێك دانی عیبادەتگاکانیان، لەپاشان ئەو گەلە موسڵمان بوون و بوون بە سەربازێکی مخلص بۆ ئیسلام، ئەو هەموو ئیمام و پێشەوایان لێ هەڵکەوت لە ئەولیا و علەما و موجتەهیدینی گەورە کە بوون بە ئەستێرەیەکی رووناك بە ئاسمانی ئیسلام و بە تایبەتی ئاسمانی کوردستان، لەم چەرخی دوایی یەدا صلاح الدینی ئەیوبی یان لێ هەڵکەوت کە لە چەرخی عەبباسی یەکان دا و لە خەلافەتی ئەوان دا گەورەترین دەوڵەتی دروست کرد و پێك هاتبوو لە میسر و سوریە و فەلەستین و بەشێك لە عێراق و ناوچەی دیار بەکر. ئەو دەوڵەتە ٢٢ ساڵ بە رێك و پێکی و بە عەدالەتی ئیسلامی حوکمڕانی کرد، ئینجا لەپاش ئەوە کافر هات و بەرە بەرە وڵاتی داگیر کرد و بەش بەشیان

کرد و کوردستانیشیان کرد بە پێنج بەش لەناو چەند حکومەتێکی جیاوازدا، ئەمەی گوتمان حەقیقەتێکی مێژوویی یە و مەبەست - خوا نەخواستە - رەگەزایەتی نی یە، چونکە هەرکەس موسڵمان بێت هەرگیز رەگەزایەتی بەکار ناهێنێ، تەنانەت لەگەڵ دوژمنیش دا، ئێستا چارەسەر بۆ موشکیلەی کورد لەو حکومەتانەی کە کوردیان تێدا هەیە نیزامی ئەقالیم بەکار هێنانە کە عومەری کوڕی عبد العزیز بەکاری هێنا لە دەوڵەتەکەی دا کە لە موحیطی هادی یەوە تا محیطی ئەتلەسی و لە ئەوپەڕی شیمال بۆ ئەوپەڕی جنوب درێژەی کێشا و ئەو هەموو گەل و تیرە جیاوازەی تێدا پەیدا بوو بێ هیچ گرێ و موشکیلەیەك، زۆر زۆر بەداخەوە ئەوە بوو مێژووی کورد و کوردستان کە بە ئیسلام رزگار کرا و بە ئیسلام سەرکەوت و بەهۆی کوفر و دوژمنی ئیسلامەوە نوشست و نەکسە رووی تێ کرد، لەگەڵ ئەوەدا نەفام و نەزان دەڵێن ئیسلام دوای خستین!!

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ ژێر سایەی ئایەتەکان کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ﴾ بەڕاستی لەو بەسەرهات و سەر گوزەشتەی نوحەوە چەند بەڵگە و نیشانە هەیە و بە راستی ئێمە تاقی کەرەوەین لە چەند بار و روویەکەوە. بە راستی و بێگومان تاقی کەرەوەیان، تاقی کەرەوەی بەندەکانمانین بە بوون و نەبوون و بە موسیبەت و خۆشی، بەڵێ لەو داستانەدا چەند بەڵگە و نیشانە هەیە لەسەر حیکمەت و دەسەڵات و چاودێریی خوا و تاقی کردنەوەی خوا بە سەبر و خۆگری و بەڵگە هەیە لەسەر راستی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) کە ئەم هەواڵانەی نەزانیوە، نە خۆی و نە گەلەکەی وەك لە ئایەتی تردا لە ئاخری داستانەکەوە ئەفەرموێ: ﴿مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا﴾. ئینجا دێتە سەر داستانێکی تر و ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ﴾ ئینجا لەپاش نوح و گەلەکەی گەل و کۆمەڵێکی ترمان هێنا. ناوی نەبردن و خیلاف هەیە لەمەدا کە ئەوانە کێن، بەڵام رای بەهێز ئەوەیە کە مەبەست گەلی(عاد) ە. لەم سورەتەدا درێژە نادات بە سەرگوزەشتەی ئەو گەل و پێغەمبەرانە کە هێناونی، چونکە مەبەست ئەوەیە ئەو پەیام و پێغەمبەرانە بۆ گەیاندن و دامەزراندنی یەك شت هاتوون کە بریتی یە لە پەرستنی خوا بە بێ هیچ هاوبەشێك، سەرکێش و خۆ بەزل زان و ساماندارەکانی ئەو گەلە جیاوازانە لە چەرخ و لە وڵات دا، ئەوانە وەك لە یەك کات و چەرخ دا بووبن و بە یەك شێوە بەرەنگاری پەیام و پێغەمبەرەکان وەستان، جا لەبەر ئەوە دەست پێ ئەکات بە نوح کە یەکەم رەسولە کۆتایی ئەهێنێ بە موسا و عیسا کە دواترین بوون لە پێش پەیام و پێغەمبەریی خاتەم دا - سەلامی خوا لە هەموویان بێت -

فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا
تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ
أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا
حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾

---

﴿فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾ لەخۆیان پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانە کردوون ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ بەمەی پێی گوتون خوا بپەرستن و هیچ خوایەکی ترتان نی یە بێجگە لەو ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ناترسن لەو خوایە، واتە باوەڕ بێنن و بترسن با دووچاری سزا و تۆڵەی خوا نەبن، پەیام و وتەی نوح هەر ئەمە بوو کە ئەم پێغەمبەرەش ڕایگەیاند، وتە و هەڵوێستی ئەمانیش ئەمە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ پیاو ماقوڵان لە گەلەکەی کە باوەڕیان نەهێنا بە زیندوو بوونەوە و گەیشتنیان بە حیساب و پرسیاری ڕۆژی دوایی و ئێمەش ناز و نیعمەتمان پێدا بوون بە لێشاو لەژیانی دنیادا، ئەوانە ئەیانگوت ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ ئەمە کە لاف پێغەمبەرێتی لێ ئەدات هەر ئادەمی یەکە بە وێنەی ئێوە ﴿يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ﴾ خواردن ئەخوات لە وێنەی ئەو خۆراکانەی کە ئێوە لێ ی ئەخۆن و ئەخواتەوە لەو ئاوەی ئێوە لێ ی ئەخۆنەوە، کەواتە بەشەرێکە وەك ئێوە ﴿وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ ئەگەر فەرمانبەریی و گوێ ڕایەڵی بەشەرێك بن وەك خۆتان بێگومان ئەو کاتە زیانبار و خەسارەتمەند ئەبن، ئەوانە لەبارەی پێغەمبەرەوە ئەو ڕەخنەیان ئەگرت، لەبارەی زیندوو بوونەوە و حیساب و پرسیارەوە ئەیان گوت: ﴿أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ﴾ ئایا هەڕەشەتان لێ ئەکات بەمەی کە کاتێ ئێوە بمرن و بگەڕێن بە خۆڵ و ئێسکە ڕزیوە تازە ئێوە لە گۆڕەکانتان بە زیندوویی دەرئەهێنرێنەوە ﴿هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ﴾ زۆر دوورە ئەوەی کە ئێوەی پێ ترسێنراون و هەڕەشەتان لێ کراوە پێی، ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ هیچ ژیانێکی تر نی یە بێجگە لەو ژیانەی ئەم دنیا و بێگومان ئێمە زیندوو کراوە نابین،

إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ
عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَادِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ بِالْحَقِّ فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٤١﴾
ثُمَّ أَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قُرُونًا آخَرِينَ ﴿٤٢﴾ مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ ﴿٤٣﴾

---

**﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوەی کە لاف پێغەمبەرێتی لێ ئەدات، هەر پیاوێکە درۆ ئەکات بەدەم خواوە و ئێمە هەرگیز بە قسەی ئەو و لەبەر ئەو باوەڕ هێنەر نین و باوەڕ ناهێنین، ئینجا کە کار گەیشتە ئەوە پێغەمبەرەکە نائومێد بوو لێ یان پەنای بردە بەر خوا کە یارمەتی بدات وەکو نوح پەنای پێ برد و ئەویش هات بە هاواری یەوە و نزای کرد، ﴿قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾ گوتی: ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە بەهۆی باوەڕ نەهێنانیان پێم و بە درۆزن دانانم. خوای میهرەبان نزاکەی وەرگرت ﴿قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَادِمِينَ﴾ فەرموی لە ماوەیەکی زۆر کەم دا پەشیمان ئەبنەوە، بەڵام تازە کاتەکەی تێپەڕی کرد و سوودی نەما پەشیمان بوونەوەکەیان ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ بِالْحَقِّ فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً﴾ ئینجا سەیحە و پیا هەڵشاخانەکە گرتی. راگیری کردن بە حەقیانەت و بە عەدل و داد، پیا هەڵشاخانی جوبرەئیل(عليه السلام) بەهۆی ئەوەوە گێرامانن بە شتێکی بێ نرخ بە وێنەی پوش و چڵك و چەپەڵی یەك کە لافاو ئەیهێنێ، ئەوانە وازیان هێنا لەو رێزی ئادەمی یەتەی کە خوا پێ ی بەخشین و نەیانزانی بۆچی دروست کراون و پەیوەندی خۆیان پچڕی بە خواوە هیچ نرخێکیان بۆ خۆیان نەهێشتەوە خوایش ئەوەی بەسەر هێنان و نرخی بۆ نەهێشتن و زیاد لەوە دەری کردن لە رەحم و رەحمەتی خۆی وەك ئەفەرموێ: ﴿فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ ئینجا خوا دووری خستنەوە لە رەحم و بەزەیی خۆی و دەرکردن و دووری بۆیان، لەبەر ئەوە گەلێکی ستەمکار بوون، وتەی ﴿بعدا﴾ هەڵئەگرێ بۆ هەواڵدان بێت وەك گوتمان بەو شێوە تەفسیرمان کردەوە و هەڵئەگرێ نزای شەڕ بێت لێ یان، واتە یاخود دوور بن لە رەحم و بەزەیی کە ئەوە سەخت تر و بەهێز ترە، چونکە خوا داوا ئەکات لە زاتی پاکی خۆی کە ئەوەیان بەسەر بێنێ. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند گەل و ئوممەتێکی تر ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قُرُونًا آخَرِينَ﴾ لەپاش ئەوان چەند گەل و ئوممەتێکی ترمان دروست کرد و هێنایە کایەو و ئەوانیشمان لەکات و ماوەی دیاریی کراویان دا لەناوبردن ﴿مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ﴾ هیچ کام لەو گەل و ئوممەتانە پێش نەکەوتوون و ناکەون لە ئەجەل و ماوەی دیاریی کراوی خۆیان و دوایش نەکەوتوون و ناکەون،**

ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا تَتۡرَاۖ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةٗ رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُۖ فَأَتۡبَعۡنَا بَعۡضَهُم بَعۡضٗا وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَۚ فَبُعۡدٗا
لِّقَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ
وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾

---

**﴿ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا تَتۡرَا﴾ ئینجا لەپاش ئەوانە پێغەمبەرەکانی خۆمانمان رەوانە کرد یەک لەدوای یەک ﴿كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةٗ رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ﴾ هەر جارێ هەر ئوممەتێک پێغەمبەرەکەی بۆ هاتبێ باوەڕیان پێ نەهێنا و بە درۆزنیان داناوە هەرکاتێ ئەوان بەو جۆرەیان کردبێ عادەت و باوی خوایش لە کەمین دا بووە بۆ تۆڵە سەندن و لەناو بردن وەک ئەفەرموێ: ﴿فَأَتۡبَعۡنَا بَعۡضَهُم بَعۡضٗا﴾ بەهۆی ئەوەوە ئێمەش یەک لە دوای یەک هێناومانن و لەناومان بردن، ﴿وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ﴾ گێڕامانن بە قسە و دەنگ و بگێڕڕێنرێنەوە لەپاش خۆیان ﴿فَبُعۡدٗا لِّقَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ﴾ لێرەش دا ئایا مەبەست هەواڵدانە، یان نزای شەڕ هەردوو ئەگونجێ، لەسەر هەر بار ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن بە بەرنامە و بە پەیامی خوا نەفرین لێ کراون و بێ بەشن لە رەحم و بەزەیی خوا.**

**ئینجا بە کورتی باسی سەرگوزەشتەی موسا ئەخاتە بەر لەبارەی پەیامەکەی و باوەڕ نەهێنانی ستەمکارەکان ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ * إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمًا عَالِينَ﴾ ئینجا موسا و هارونی برایمان رەوانە کرد بە موعجیزەکانمان، ئەو نۆیە کە بەناوبانگن و لە سورەتەکانی تردا باس کراون، بە موعجیزە گەورەکەوە دەسەڵاتی ئاشکرای هەیە و خەڵکی ناچار کەرەو دەم کوت کەری بێ باوەڕەکان بوو(ئەوەش بریتی بوو لە دار دەستەکەی) رەوانەمان کرد بۆلای فیرعەون و کۆمەڵەکەی، ئینجا لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزەدا ئەوان خۆیان بە زل زانی و گەل و کۆمەڵێکی بەرز و دەسەڵات دار بوون ﴿فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ﴾ گوتیان ئایا باوەڕ بێنین بە دوو ئادەمی وێنەی خۆمان و لەبەر قسەی ئەوان لە کاتێک دا گەلەکەیان ئێمە دەپەرستن؟ واتە شتی وا ناڕاست و ناڕەوایە. ئەو هەموو موعجیزە گەورانە کار ناکەن لەو جۆرە دڵە کوێرانەدا،**

فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴿٥٠﴾

---

﴿فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە باوەڕیان پێ نەهێنان و بە درۆزنیان دانان، کەواتە ئەمانیش بە وێنەی گەلە سەرکێشەکانی تر لەناو بران و لە ڕیشە هێنران و خنکێنران لە دەریادا وەك بە درێژیی باس کرا لە چەند سورەتێك دا.

ئینجا بە کورتی باسێکی حەزرەتی عیسا و دایکی ئەکات، ئەو موعجیزە گەورەی کە لە دروست کردنی عیسادا هەبوو لەگەڵ ئەو هەموو موعجیزانەی کە خوا پێی داو لەسەر دەستی ئەودا هیچ کاری نەکرد لەبێ باوەڕەکانی گەلەکەی بە وێنەی بێ باوەڕەکانی گەلەکەی موسا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ کتێبمان – واتە تەوراتمان – دا بە موسا – سەلامی خوای لێ بێت – بەڵکو ببێتە ڕێ نیشاندەریان و مایەی ڕێنموونیان. ﴿وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً﴾ کوڕەکەی مەریەم و دایکیمان گێڕا بە بەڵگەیەکی ڕوون و موعجیزەیەکی ئاشکرا لەسەر دەسەڵاتی بێ سنوورمان، واتە هەرکام لەم دووانە بەڵگەن. عیسا بەڵگەیە لەم بارەیەوە کە بە بێ باوك پەیدا بوو و لە بێشکە قسەی کرد و حاڵ و سیفەتی خۆی ڕوون کردەوە و دایکیشی بەڵگەیەکە بەبێ مێرد ئەو کوڕەی بوو و هاتەزمان وەك باس کرا. یان بە هەردووکیانەوە بەڵگەن و بە هەردووکیانەوە بەڵگەکە ڕوون ئەبێتەوە ﴿وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ ئەو دووانەمان گێڕا بە جۆری نیشتەجێ بوون لای تەپ و تەپۆلکەیەك کە خۆی بەرزە بەبێ ئەوەی کە کێو و شاخ بێت، خاوەنی جێگیر بوون و دامەزران و کانیاوە، ئیتر ئایا ئەو شوێنە میسرە یان دیمەشق یان فەلەستین، وەك هەرکەسێك لە ڕیوایەت دا هاتووە و مەبەست ئەوەیە لە جێ و شوێنێکی پاك و خاوێن کە درەخت و شینایی و کانیاوی تێدایە و لەژێر چاودێریی و میهرەبانی خوادان.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٥١ ﴾

لەپاش نیشان دانی ئەو چەند ئەڵقەیە لە زنجیرەی پەیام و پێغەمبەرەکان – سەلامی خوایان لێ بێت – پاشان رووی فەرموده ئەکاتە پێغەمبەرەکان و ئوممەتەکانیان بە شێوەیەك وەك هەموو کۆ بووبێنەوە لە یەك کات و لەیەك وڵات دا و ئەو جیاوازی و دووری کات و شوێنەی کە بووە هیچ نرخێکی نی یە بەرامبەر ئەو ئایین و حەقیقەتەی کە هەمووی پەیوەست کردون پێکەوە. لە یەکەمجارەوە بانگ و قسە ئاراستەی پێغەمبەرەکان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ ﴾ ئەی هەموو پێغەمبەر و رەوانە کراوەکان ﴿ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ ﴾ بخۆن لە خۆراکە پاك و خاوێنەکان، کردەوەی چاك بکەن، نەفامەکان لەناو هەموو ئوممەتەکان دا لایان وابوو کە پێغەمبەران نابێت ئادەمی بن و بەڵکو ئەبێ فریشتە بن، خوایش ئەفەرموێ: بخۆن کە خواردن پێویستە بۆ ئادەمی و بە بێ خواردن ناژی، ئیتر هەر جۆرە خۆراکێك، بەڵام پێغەمبەران ئەبێ هەر پاك و خاوێن بخۆن کە هەر خواردنی پاك و خاوێن ئادەمی جیا ئەکاتەوە و بەرزی ئەکاتەوە و پەیوەستی ئەکاتەوە و ئەیگەیەنێ بە کۆمەڵی هەرە بەرز، هەروەها کردەوە کار و پیشەی ئادەمی یە ئیتر کردەوەی چاك یان بەد، بەڵام کردەوەی چاك ئەبێ کار و پیشەی چاکان بێت بە سەرۆکایەتی پێغەمبەران و بە پێ ی پەیام و بەرنامەی ئەوان. کەواتە کردەوەی چاك ئەوەیە کە خوا دیاریی کردووە و ناساندوویەتی بە پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان، هەروەها داوا نەکراوە لە پێغەمبەرەکان واز بێنن لە ئادەمی یەتی یەکەیان، بەڵکو داوا کراوە لێ یان بەرزی بکەنەوە بۆ ئەو رادە و پلە بەرزەی کە خوا رازی یە و پێ ی خۆشە، خوا خۆی رادە و پلەی کردەوەکان ئەزانێ وەك ئەفەرموێ: ﴿ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴾ بەڕاستی من ئاگادار و زانام بە هەموو کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن. هەرچەند چەرخ و شوێنی ئەو گەل و ئوممەتانە دوور و جیاواز بن هەموو یەکن لەبارەی ئەوەی هەموو هەر یەك حەقیقەتیان پێ یە و هەموو هەر بۆ لای یەك خوا ئەگەڕێنەوە و ئەبێ فەرمانبەری ئەو تەنیا خوایە بن.

وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرۡهُمۡ فِي غَمۡرَتِهِمۡ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٨﴾

---

هەموو كۆ ئەبنەوە پێكەوە لەبەردەم ئەودا و دەست نیشان ئەكات و ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ﴾ ڕووی فەرمودەكە ئەكاتە هەمووان و ئەفەرموێ: ئەم ئوممەت و میللەتی خواپەرستی یە یەك ئوممەت و ئایینی تاك و تەنیایە و منیش خوا و پەروەردگارتانم، كەواتە بترسن لێم و خۆتان بپارێزن لە تەفرەقە و دووبەرەكی. ئینجا لەم ئایەتانی داهاتووەدا تا ئایەتی ٩٩ چەند شتێكی گرنگ ئەخاتە بەر چاو وەك بە ئیزنی خوا خۆمان ئەخەینە بەر تیشك و فەرەكانی، لە یەكەم جارەوە دەست پێ ئەكات بە باسی هەڵوێست و چۆنێتی حاڵی خەڵكی سەبارەت بە ئایین و بەرنامەكەی كە دەست بە دەست هات لە پێغەمبەرانی پێشوو تا گەیشتە خاتەمی هەمووان و جێگری هەمووان. وەك بۆمان دەركەوت ئاژاوە و دووبەرەكیان پەیدا كرد و لایان دا لەو شتە هەق و ڕاستە و بێ ئاگا و بێ هۆش بوون لە دوا ڕۆژی خۆیان، لە هەمان كات دا ئەوانەی كە ژێر بوون ڕوویان كردە قاپی خوای خۆیان بە پەرستن و گوێ ڕایەڵی یە ئەو پەڕی مل كەچی و سام و بیم وەك فەرموی: ﴿فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ﴾ ئەوانە لەباتی ببن بە یەك ڕیز و یەك بەرنامە و بۆچوون كەچی وایان نەكرد، بەڵكو بوون بە چەند حیزب و ئایینە پاك و خاوێنەكەی خوایان بەش بەش و پارە پارە كرد، هەركام بار و بەشێكیان بۆخۆیان دانا، تەعبیرە كەس نەدیدەكەی قورئان حاڵ و باری خەڵكی و دووبەرەكی یان لە تەنیا ئایینەكەی خوادا گێڕای بە شتێكی ماددی و بینراو و فەرموی: ئایینەكەی خوایان پچڕ پچڕ كرد و كردیان بە چەند پارچەیەك ﴿كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ﴾ هەر حیزب و كۆمەڵێك خۆشنود و شادمانن بە بەش و پارچەكەی خۆی. بۆ ڕێنە ئەم حەدیسە بەناوبانگە ئەمێنین كە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرموی: ﴿وافترقت امة اليهود على إحدى و سبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، وافترقت امة

عيسى او النصارى على اثنتين و سبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، و سفترق امتي على ثلاثة و سبعين كلها في النار إلا واحدة، قيل من هم يا رسول الله: قال هم على ما انا عليه و اصحابي﴾ سيرەتی پاكی خۆی و هاوەڵەكانی روون و ئاشكران تەنانەت زۆر لە بێگانەكانیش دەزانن كە چۆن ئەم ئایینە هات و چۆن لەلایەن شەیتانەكانی جین و ئینسەوە بەرگری كراو چەند بیر و باوەڕی بۆگەن داهێنرا و بە هەموو جۆر تەقەلایان دا و بەڵام هەر هەق سەركەوت و تا زانین و زانیاری سەركەوێ گەورەیی و پاكی و بێگەردی ئایینەكەی روونتر ئەبێتەوە ئەم ئایینەی كە هەر لە یەكەمجاری هاتنی یەوە جاڕی دا كە ئەم ئایینە بۆ هەموو جیهان و جیهانی یانە تا دنیا دنیایە. ئەو حیزب و فیرقەیانە لەو دوو ئوممەتەی پێشوو هەموو كافرن بێجگە لەو تەنیا فیرقەیەی كە لایان نەداوە لە عەقیدە و باوەڕەكەی خوا، چونكە هینەكانی موسا باوەڕیان نەبوو بە عیسا و محمد – سەلامی خوایان لێ بێت – هینەكانی عیسا باوەڕیان نەبوو بە محمد، بەڵام فیرقە و حیزبەكان ئەم ئوممەتە ماتوڵ باوەڕیان هەیە بە ﴿بالله و ملائكته و كتبه و رسله و اليوم الآخر و القدر خير و شره﴾ ئەمانە بە ئەهلی قیبلە دائەنرێن هەرچەند سزا ئەدرێن لەسەر ئەو بۆچوون و بیدعەتە بەدانەی كە دایان هێنا، فیرقە و حیزبەكانی ئەم ئوممەتە قورئانەكە پارێزگاری كردن لەوەی بە تەواوی لە دین دەرچن، هەر بیر و باوەڕ و بیدعەیەكیان هێنابێ بە تأویل و پینە و پەڕۆ رێكیان خستووە لەگەڵ ئایینەكەی خوادا، بەڵام فیرقە بەدەكانی ئەو دوو ئوممەتە دەستگیرێكی وەك قورئانیان نەبوو بەهۆی ئەوەوە كافر بوون و لە ئایینی خوا بێ بەش بوون. ئەم فیرقە بەدانەی ئەم ئوممەتە ئەمانە نین كە لە ئەمڕۆ لەناو موسڵمانان دا هەن وەك ماركسی و ماسۆنی... هتد، ئەوانە پەیوەندی یان بە ئیسلامەوە نی یە و بە ئیماندار دانانرێن، چونكە بە بێ خیلاف و دووبەرەكی ئیمان بریتی یە لە باوەڕی راست و یەقین بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی و مل كەچی و گەردن كەچی بۆی لە هەموو بار و روویەكی ژیانەوە، ئیتر كۆمەڵایەتی، ئابووری، ئاشتی و جەنگی... هتد. زۆر زۆر بەداخەوە هێندێ لە زانایان و بەناو زانایان ئەم ئەحزابە ئیسلامی یانە دائەنێن بەو ئەحزابە بەدانەی كە حەدیسەكە باسی فەرموو و ئەو حەفتا فیرقەیە، نەخێر ئەوانە هەڵەن و خوا موحاسەبەیان ئەكات، چونكە ئەم ئەحزابە ئیسلامی یانە داوای شەریعەت و حاكمێتی خوا ئەكەن، كەواتە ئەمانە موسڵمانن، خوا

ڕێگەی ڕاستی خۆییان نیشان بدات و کۆیان بکاتەوە لەسەری. ئەو حەفتا و سێ فیرقەی کە لە حەدیسەکەدا فەرموی: زانایان ناویان بردوون یەک بە یەک یەکێك لەوانە شێخی گەیلانی لە کتێبی خۆی دا بە ﴿غنیة الطالبین﴾ هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای بکات. یەکەم لەو حیزبانە(خوارج) بوون کە هەڵگەڕانەوە لە ئیمامی عەلی ئەوان ئەوەندە نەفام بوون ئیمامی عەلی یان بە کافر دائەنا!! بەڵام پرسیاریان کرد لە ئیمامی عەلی لەبارەیەوە فەرموی: ﴿إخواننا بغوا علینا﴾ فەرموی نە کافرن و نە مونافیقن، ئەمانە کۆمەڵێکن سەریان لێ تێك چووە. دووەم حیزب کە لەم ئوممەتە پەیدا بوون(معتزلة) بوون لە چەرخی عەبباسی یەکان دا پەرەیان سەند لە خیلافەتی(مأمون) موە تا(متوکل) و لە خەلافەتی ئەودا کوژایەوە سوپاس بۆ خوا زانایەك کە لەسەر ئەو مەزهەبە بوو شیخ ابو الحسن ئەشعەری بوو و قوتابی ابو علی جبائی بوو تا خوا ڕێگەی نیشان دا و مامۆستاکەی دەم کوت کرد و ئیلزامی دا هەرکەس ئەیەوێ با تەماشای کتێبە کەلامی یەکان بکات یەکێك لەوانە(شرح العقائد النسفیة) و ئینجا شێخی ئەشعەری قوڵی لێ هەڵکرد و ئەو مەزهەبە ناڕاستەی بەتاڵ کردەوە و بوو بە یەکەم ئیمامی ئەهلی سوننەت، خوا پاداشتی بداتەوە، بەڵام بەداخەوە هێندێ لە گەنجەکان ئەمڕۆ بێ ئاگان لە کارەکە و زۆر بە سووك و ریسوا ناوی ئەو زانا ئەبەن و کوێرانە دەم لە تاریکی ئەکوتن و نایەن تەماشای کتێبەکان بکەن کە یەکێکیان کە دواترین کتێبی ئەوە(الإبانة) یە. لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەم ئەندازەیە درێژەم پێدا، ئینجا ئەگەڕێمەوە بۆ سەر ئایەتەکان. لە پاش ئەوەی نەخشەی ڕێگە ڕاستەکەی خوای کێشا ڕێگە لارەکانی تری ئادەمی پووچەڵ کردەوە، ینجا لەپاش ئەوە رووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەمەی گوێ نەدا بەو بێ هۆش و نەفامانە و لێ یان گەڕێ تا دووچاری سزای خۆیان دەبن و ئەفەرموێ: ﴿ فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ﴾ لێ یان گەڕێ لەناو چاڵی بێ هۆشی خۆیان دا با بژین هەتا ماوەیەك. ئەو ماوە کە خوا دیاریی کردووە بۆ ژیانیان. بێگومان خوا بە پێی پێویست و لێزانی و کاردروستی خۆی ڕۆزی و ناز و نیعمەت و سامان و ئەولاد ئەدات بەچاك و چاكان و باوەڕ داران، چونکە تا یارمەتی یەکەی زۆرتر بێت زیاتر سوپاس گوزار و بەندەیی خوا بەکار ئەهێنن، بەڵام بۆ بێ بڕوا و خراپەکاران زۆرتر بەرەڵایی و تاوان زیاد ئەکات و ئەو یارمەتی دانە رووکەشە لە زمانی شەرع دا پێی ئەوتری:

﴿استدراج﴾ جا به پێی باو و عادەتی پیسی ئەوان قورئان لێرەدا دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ * نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾ ئایا ئەوانە وا گومان ئەبەن ئەوەی یارمەتیمان داون پێی لەماڵ و ئەولاد و چەسپانیمان کردووە بۆیان لە خێرو خۆشی یەکان دا؟ ﴿بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾ نەخێر ئەوانە هەست ناکەن و بێ ئاگان، ئەگەر بزانن ئەو چاکە و خۆشی یانە سەریان ئەکات بە ئاگری دۆزەخ دا بەش براویان ئەکات لە خێرو خۆشی راستەقینەی رۆژی دوایی دا، ئەگەر یەکەم جار بیانزانی یایە بە ئاگر و ژەهری مار سەیر ئەکرد. بۆ روون کردنەوە کەسێك سێدارەی بۆ هەڵخرێ و هەرچی بڵێ و نیعمەتی دنیای بۆ بهێنرێ هۆشی بەلایەوە نامێنێ و نایان بینێ. ئەو حەیوانە دابەستانە کە بە دیمەن وان لە خۆشی دا ئەگەر بزانن هۆی سەربڕینە دەمی بۆ نابەن و تا بێت لەڕ ئەبێت، ئینجا بەرامبەر خۆشی یەکەی ئەمان کە مایەی سزا و بەش براوی یانە، بەرامبەر ئەوە بۆ باوەڕ داران ئەم کردەوە شیرینانە ئەمێنێ کە مایەی گەیشتنن بە نازو رێزی نەبڕاوە و کەس نەدیدەی بەهەشت، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە لەبەر ترسان و سام و بیمی سزای پەروەردگاریان دڵە لەرزەیانە و خۆپارێزن لەو شتانەی کە هۆی ئەو سزایەن ﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾ ئیمان و باوەڕیان هەیە بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان چ ئایەتە خوێنراوەکان و چ ئایەتە بینراوەکان، خوای میهرەبان دوو جۆر بەڵگەی روونی بەخشیوە به بەندەکانی، یەکەم ئایەتەکانی ئەم قورئانە کە گەورەترین موعجیزەن و جن و ئینسی سەرسام و سەرگەردانە و چەند جار بەریان لێ بڕایەوە و بە دەستە پاچەیی مانەوە و هەموو کەس داماوە لە ئاستی. دووەم ئەو هەموو نیشانە و بەڵگە روونە بوونەوەری یانەیە کە هەرکەس بێ بەش نەبێت لە ژیریی بە خوێندەوار و نەخوێندەوار ئەبێ ئیمانیان پێ بێنێ و سەری بەندەیی داخات بۆ داهێنەرەکەیان جل جلالە، جا لەبەر ئەوە قورئان هەمیشە سەرنجیان رائەکێشێ بۆیان. جا ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕیان هەیە بەو دوو جۆرە ئایەتانە،

وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾

﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ﴾ ئەو كەسانەی هیچ جۆرە هاوبەشێك بڕیار نادەن بۆ پەروەردگاریان، نە هاوبەشی گەورە و نە هاوبەشی بچووك، ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ﴾ ئەو كەسانەن كە ئەیكەن ئەوەی كە ئەیكەن، واتە كردەوەكانیان ئەكەن لە كاتێك دا دڵە لەرزەیانە و دڵیان لە سام و بیم دا ئەلەرزێ لەبەر ئەوەی بۆلای خوا ئەگەڕێنەوە، واتە چونكە دەزانێ لە ڕۆژی دوایی دا ئەچنە بەر دادگای خوا و بیر ئەكەنەوە لە حەیبەت دا دڵیان ئەلەرزێ. دایكی عائشة – خوا لێ ی رازی بێت – عەرزی پێغەمبەری كرد(ﷺ) ئەوانە ئەو كەسانەن دزی ئەكەن و زینا و گوناهی گەورە ئەكەن لەبەر ئەوە دەترسن لە سزا و تۆڵەی خوا، ئەویش فەرموی: ﴿یا بنت الصدیق﴾ نەخێر كچەكەی صدیق بەڵكو ئەوانە كەسانێكن ئەو كردەوە گەورانە بەجێ ئەهێنن، نوێژ دەكەن و زەكات و خێر و سەدەقە ئەكەن و لە هەمان كات دا مەترسی دەكەن لە ناتەواوی و كەم و كوڕی یان و دەترسن كردەوە چاكەكانیان وەرنەگیرێ. برا موسڵمانەكان ئەم بۆچوون و چۆنی یەتی یە قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) نیشانمان ئەدەن. جا با ئێمە بیرێ بكەینەوە لەم هەموو گوناهانەی كە دەیكەین بە بێ بیم و ترس و بیر لێ كردنەوە!! ئیمانی راستەقینە ئەو هەست و هۆشە فەراهەم ئەهێنێ لەدڵ و دەروونی خاوەنەكەی دا، بەو ئیمانە راستەقینە یەكەم كۆمەڵی هەژاری رەش و رووت توانی یان ئەوشۆڕشە گەورە و گشتی یە لە جیهان دا فەراهەم بێنن، ڕۆژی دوایی هەر دەستە و كۆمەڵێك ئەو رێگە راستە بداتە بەر ئەو لوتف و یارمەتی یەی خوا ئامادەیە، ئەو یارمەتی یە رواڵەتی یانەی كە نەفامان بە خێرو فەڕی تەماشا دەكەن شتێكی بێ نرخ و مایەی بەد بەختی یە و پێش بڕكێ و هەوڵدان لەوانەدا كارێكی بەدە، بەڵكو پێش بڕكێ و تێكۆشان لەو كردەوە چاكانەدا كە لەم ئایەتانەدا خەریكین پێ یەوە هەر ئەوە شتە و بەكارە و دەست نیشان ئەكات كە دەفەرموێ دەربارەیان:

أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ
بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾
حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ إِذَا هُمۡ يَجۡـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدۡ
كَانَتۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ﴿٦٧﴾

---

﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ﴾ ئا ئەوانەن کە پێش برکێ و تێکۆشان ئەکەن لە خێرو خۆشی یەکان دا بەمۆی ئەوەوە دەگەن پێی، بە ئیزنی خوا، خوا بەشدارمان بکات تێیدا، آمین. لەپاش ئەوەی ئەم رێز و مۆژدە خۆشەی ئاراستەی ئەم ئیماندارانە کرد کە خاوەنی ئەم هەست و هۆش و کردەوە چاکانەن، ئینجا هەموو ئیمانداران هان ئەدات لەسەر ئەم بار و حاڵە پەسەندەی ئەوان، بەوەی ئەم حاڵ و باری ئەوانە شتێك نی یە لە تاقەت و توانادا نەبێ، بەڵکو ئەوەی کە خوا پێویستی کردوە لەسەر بەندە کردەوەیەکی نەکردووە لە تاقەت و توانادا نەبێت وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ﴾ داوا و تەکلیف ناکەین لە هیچ کەس بێجگە لەوەی لە تاقەت و توانای دا نەبێت، هەر کردەوەیەکی کردبێ زایە نابێ و ون نابێت و لە دەفتەری کردەوەکانی دا نووسراوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ لای ئێمە هەیە نامەیەك کە بەراستی و حەقیانەت قسە دەکات و ئەوانەی کە کردەوە دەکەن ستەمیان لێ ناکرێ، بە گوێ پێ نەدان یان بە کەم و کورِی، یان بە داوای شتێك لەتوانادا نەبێت، لە لوتفی بەزیاد بێت. ئینجا لێرەدا واز ئەهێنێ لە قسە و باسێك کە کردی دەربارەی گشتی، واز لەوە ئەهێنێ فەرمودەیەك ئەهێنێ و ئاراستەی بێ باوەڕەکانی دەکات، ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا﴾ دڵەکانی بێ باوەڕەکان لە بێ هۆشی و بێ ئاگایی دایە و نازانن کە هیچ کردەوەیەك ون نابێ و زایە نابێ و ستەم لە هیچ کەس ناکرێ. ﴿وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ﴾ ئەوانە چەند کردەوەیەکی تریان هەیە جیاواز لەوە کردەوە و هەوڵ بۆ ئەوانە دەدەن و

نازانن سەری لە زیان و سزاوە دەرئەچێ. ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ إِذَا هُمۡ يَجۡـَٔرُونَ ﴾ [redacted] کاتێک کە ناز و نیعمەت دارەکانیان کە بە زۆری و بە لێشاو و خاوەنی ماڵ و سامان و خۆشین، تا کاتێ ئەوانە ئەگرین بەسزا و عەزاب کە لە دنیادا پاکیان لە هیچ شتێک نەبوو، ئەو سزا و عەزابەیان بەدڵ دا نەدەهات، لەو کاتەدا هاواریان لێ هەڵئەستێ و ئەپاڕێنەوە، بەڵام کاتی ئەوە نەماوە لەلایەن خواوە پێ یان دەگوترێ: ﴿ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَ ﴾ لاڵە و پاڕانەوە مەکەن ئەمڕۆ هیچ سوودێك وەرناگرن، چونکە ﴿ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴾ بەڕاستی لە لایەن ئێمەوە هیچ یارمەتی یەک نادرێن و رزگار نابن، ئێوە بەدەستی خۆتان ئەوەتان بەسەر خۆتان هێنا ﴿ قَدۡ كَانَتۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ﴾ چونکە کاتی خۆی ئایەتەکانی ئێمە دەخوێنرایەوە بەسەرتان دا لە دنیادا کەچی ئێوە پاشەڵپاش ئەگەڕانەوە و رووتان وەردەگێڕا لە بیستنیان ﴿ مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ ﴾ لەکاتێك دا خۆ بە زل زان بوون و خۆتان بە لاوە گەورەتر بوو لەوەی مل کەچ بکەن و فەرمان بەریی ئەو ئایەتانەبن، خراپتر لەو روو وەرگێڕانە ﴿ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ﴾ بە دەم درێژیی و تانە و تەشەر دان و لاقرتی کردنتان بەکار ئەهێنا. ئەو بێ باوەڕانە کە لە دنیادا خۆ بە زل زان بوون و کەشخەیان دەکرد لەگەڵ مردن و دووچاری سزای خوا بوون و هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە و ئەکەونە هاوار و پەنا بردن بەڵام نائومێد ئەکرێن و بە ریسوا کردن و تانە و تەشەردان لێ یان، ئینجا سزای دەروونیش ئەدرێن بەوەی بە دەستی خۆیان و بە کردەوەی خۆیان ئەوەیان بەسەرهات، ئەم هەڕەشانەی کە لە دنیادا ئاراستەیان دەکات بە شێوەیەك ئەیفەرموێ وەك ئێستا رۆژی دوایی بێت و ئەو کاتە بێت، ئەوەش یەکێکە لە یاسای رەوانبێژیی یە کەس نەدیدەکانی قورئان!! شەهید سید قطب – رحمە الله – لە کتێبی (التصویر الفنی فی القرآن) ئەم جۆرە شتانەی خستووەتە بەرچاو. لەپاش ئەو سزا و بێ ئابروو کردن و نائومێد کردنە ئینجا ئەیانگێڕێتەوە بۆ ئەم دنیایە و ئەکەوێتە پرسیار و وت و وێژ دەربارەیان کە ئایا چ پاڵدەر و هۆیەك بوو بۆ ئەمانە کە لە رێگە راستەکەی خوا لایان دا، بەشێ زیاتر سزای دەروونی یان ئەدات،

أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ أَمۡ جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾

---

له یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ﴾ ئایا ئەوانە تێ نەفکران و بیریان نەکردەوە لە قورئان، واتە ئەبوایە بیریان بکردایەتەوە لەم قورئانە تا بۆیان دەرکەوتایە ئەم قورئانە موعجیزەیەکی ئاشکرایە لەهەر بارێکەوە تەماشایان بکەن، لەبارەی هۆنینەوەی وتەو وشەکانی یەوە کە چەند جار بەری بڕی یەوە لێ یان و نەیانتوانی بە ئەندازەی کەمترین سورەتی بڵێن بە تایبەتی بە زمانی عەرەب هات و یەکەم چین لە رەوانبێژیی و فەصاحەت و بەلاغەت دا بەناوبانگ بوون و خاوەنی(معلقات السبع) بوون لەبارەی هەواڵە غەیبی یەکانەوە، یان لەبارەی زانینی بەسەرهات و مێژووی گەل و ئوممەتە پێشووەکانەوە کە ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) نەیخوێند بوو و پێگەیشت لە وڵاتێکی نەخوێندەواردا، یان لەبارەی کاروباری کۆمەڵایەتی و ئابووری و نیزامی و جەنگ و ئاشتی... هتد. ئینجا واز ئەهێنێ لەوە و پرسیارێکی تر ئاراستە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ئایا ئایین و پێغەمبەرێکیان بۆ هاتووە کە شتی وا نەهاتووە بۆ باوك و باپیرە پێشووەکانیان؟ واتە نەخێر باش دەزانن کە باوك و باپیریان پێغەمبەر و نامەی خوایان بۆ هاتووە، بە تایبەتی یەکەم چین کە خۆیان بە نەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل دائەنا و هەواڵی عاد و سەمود و باقی گەلەکانی تر بەناوبانگ بوون، کەواتە دەزانن پێغەمبەران هاتوون، دەی ئەمیش وەك پێغەمبەرانی ترە – سەلامی خوایان لێ بێت – ئینجا ئەم پێغەمبەرە کەسێکی نەناسراو بوو یان بەهەرحاڵ خۆ ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) خۆی و نەسەب و نەژادی ناسراو و بەناوبانگ بوون لەپێش داوای پێغەمبەرێتی دا لەناو خۆیان دا هەر بە گەنجی ناونرا بە(محمد الأمين) دەکرا بە حەکەم بۆ دانانی(حجر الأسود)، کەواتە بەمەش دەم کوتیان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ دەی ئایا پێغەمبەرەکەی خۆیان – واتە محمد(ﷺ) – نەدەناسی تا بەهۆی ئەوەوە دانی پێدا نەنێن؟ ئینجا لە هەموو بارێکەوە بەریان لێ دەبڕێتەوە ئایا ئەوانە دەڵێن شێتە؟ دووچاری شێتی بووە؟

أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ

---

**وەك ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢ﴾ بێگومان ئەوانیش و خەڵكی تریش دەزانن كە ژیر تیرینی خەڵكە تا ئەو رادەیە ئەیانگوت جادو بازەو بە لێزانی خۆی چار ناكرێ، ئینجا واز ئەمێنێ لەوە و هۆی لادان و باوەڕ نەمێنانەكەیان روون تر ئەكاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾ نەخێر هۆی باوەڕ نەمێنانەكەیان ئەمەیە هەقی بۆ هێناون و ئەوانەش زۆربەیان هەقیان ناوێ و بێزارن، مەسەلی فارسی راستە: ﴿طبع ناسازى جعل را بوى گل درد سرست﴾ دەی هەقیان ئەوێ و بێزار بن لێ ی ئایا ئەگونجێ حەق شوێنی ئەوانە بكەوێ ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ ئەگەر هەق شوێنی ئارەزووی ئەو نەفامانە بكەوێ، بێگومان ئاسمانەكان و زەوی و هەرچی وا لە نێوانیان دا تێك ئەچێت بە مل یەك دا، بێگومان هەق دامەزراوە و ئارەزووەكانی ئەو نەفامانە زۆر و دانەمەزراوە و دەگۆڕێ هەردەمە و بە بارێك دا، جا هەرچۆنێ ئەم بوونەوەرە نیزامێكی تێرو تەواو و دامەزراوی هەیە، هەروەها ئەم ئاین و شەریعەتەش دامەزراوە لەم بوونەوەرە، داهێنەری ئەم بوونەوەرە ئاین و شەریعەتێكی دایە كە رێك و گونجاوە لەگەڵ ئەم بوونەوەر و دانیشتوانی ئەم بوونەوەرەدا، ئەم ئادەمی یە بێجگە لەم شەریعەتە هەر یاسا و رژێمێكی تری بۆ بهێنرێ تێك ئەچێ و دووچاری هەموو ناڕەوایی و جەور و ستەم ئەبێت.**

بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ
وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ
ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾

---

خوای میهرەبان ئەو شەریعەتە ڕێك و ڕاست و گونجاوەی بۆ ناردووە بێ باوەڕان خۆیان کوێر ئەکەن و لا ئەدەن لێ ی وەك ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ﴾ واتە ئەم ئوممەتە شایستە ترە بە شوێن کەوتنی ئەم قورئانە و مل کەچی بۆی کەچی خۆیان ڕوو وەرگێڕن لەمەی کە مایەی فەخرو شانازی یانە و هۆی شەرەف و ناوبانگی یانە. بەڕاستی بەڵاو ڕیسوا کردنێکی زۆر گەورەیە لەوانەی کە ڕوو وەر ئەگێڕن لەم قورئانە و ...... فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەری ئازیز ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا﴾ ئایا داوای کرێ و پارە و پوول ئەکەیت لەوانە لەسەر ڕاگەیاندنی ئەم ئایین و قورئانە، نەخێر ئەو بە تەمای ئەجرو پاداشتی خوا بووە و خوایش ئەفەرموێ: ﴿فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ جەزا و پاداشتی پەروەردگارت چاکە و باشترینی ڕۆزی دەرانە، ئەم جاڕی داوا نەکردنە لەسەر ڕاگەیاندنی ئایین هەموو پێغەمبەران فەرمویانە. جا کەواتە زۆر خەتەرە لەلایەن زۆر لە موسڵمانەکان کە لەسەر ڕاگەیاندن پول و پارە وەرئەگرن. هەرچەند زانایان ئەفەرمون دروستە. ئەوەی کە پێغەمبەری ئازیز داوای کردبێ و ویستبێتی لێ یان ئەوەیە بێنە سەر ڕێگا ڕاستەکەی خوا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ بێگومان بانگی ئەوانە ئەکەیت بۆ ڕێگەی ڕاست، ئەوانە ناساز و بەدن و ڕوو وەرگێڕن لەو ڕێگە ڕاستە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان نی یە بە ڕۆژی دوایی لادەرن لە ڕێگەی ڕاستی خوا یان لەڕێگە بە شێوەی گشتی بەم شێوەی دوەم پلار و تەشەر دانەکە بەهێز ترە. ئەوانەی کە باوەڕیان لە دنیادا بە ڕۆژی دوایی نی یە و لائەدەن لە ڕێگەی ڕاست هیچ شتێك سوودیان پێ ناگەیەنێ ئەگەر تاقی بکرێنەوە بە نیعمەت و خۆشی لەخۆیان بایی ئەبن و مل هوڕی بەکار ئەهێنن، ئەگەر تاقی بکرێنەوە بە سزا و ناخۆشی دڵیان نەرم نابێ و خەبەریان نابێتەوە لە خەوی بێ ئاگایی و ناگەڕێنەوە بە تۆبە و پاڕانەوە، لەسەر ئەو باری بەدی خۆیانە ئەمێننەوە هەتا سزای سەختی ڕۆژی دوایی ئەچەژن و لەوێدا پەشیمان ئەبنەوەو تازە هیچ سوودێك وەرناگرن،

﴿ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم
بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ
مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾

---

ئـەوەتا ئـەمجارەیان ئەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ ئەگەر میهرەبانیمان بکردایە بەوانە و سزامان لەسەر لابردنایە هەر درێژەیان ئەدا و هەر بەردەوام ئەبوون لەسەرکێشی و لاری خۆیان دا، لە دوژمنایەتی پێغەمبەر و ئیمانداران دا بە کوێریی و نابینایی دڵیان. ئینجا بەڵگە ئەمێنێتەوە لەسەر ئەوە بەمەی ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ بێگومان ئەوانەمان گرت و سزامان دان بە کوشتن و زەلیل کردن وەك لە رۆژی بەدردا، کەچی نەگۆڕان و مل کەچ نەبوون بۆ خوا و پاڕە و لالآنەوەیان نەکرد. لەم کردەوانەش دا ئەمانباتەوە رۆژی دوایی هەرچەندە بەو تاقی کردنەوەی خوا تەمێ خوار نەبوون وەك لاری بێ باوەڕەکان لەم دنیادا بووە. ئەوەش بە پێی تەعبیرە کەس نەدیدەکەی قورئانە!! وەك ئەمەش کە ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ ئەمانە هەر بەردەوام بوون لەسەر بەدی و بێ باوەڕیی خۆیان کاتێ قاپی یەکی خاوەن سزای زۆر بەهێز و بەتینمان کردەوە لەسەریان ئەوەش لە رۆژی دوایی دا، کەواتە ئەفەرموێ: قاپییەکی وایان لەسەر دەکەینەوە و بەشێوەی رابوردوو نیشانی ئەدات هەرچەندە ﴿إذ﴾ بۆ داهاتووە. کاتێ ئەو قاپی یەیان لەسەر دەکەینەوە ﴿شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ ئیتر دەست بەجێ لەوێدا سەرگەردان و نائومێد ئەبن لە هەموو خێرو خۆشی یەك، بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە بەڵام لە دڵ دا زۆر بە دوور دائەنرێ.

ئینجا بە پێی باوی خۆی قورئان سەرنج رادەکێشێ بۆ بیر کردنەوە لە چەند بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکرا بە بەڵگەکانی دەروونی هەموان کە هۆی باوەڕی بەتینن بە پەروەردگار جل جلالە، ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾ خوا ئەو کەسەیە کە دروستی کردووە بۆتان گوێچکە و چاو و دڵەکانتان، هەرکام لە ئێوە هۆی بیستن و بینین و ژیریی پێداون کە ئەمانە هۆی ژیانن و بێ ئەوانە ژیانێکی ئادەمی یانە فەراهەم نایەت و لە

لایەکی ترەوە ئەمانە هۆی باوەڕی بەهێزن و سوپاس گوزاری بۆ خوای دادێنەر، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ زۆر کەم سوپاس دەکەن. بەڵێ زۆر کەم سوپاسی ئەکەن، چونکە زۆربەی ئادەمی سپڵە و بێ باوەڕە، ئەوەشیان کە باوەڕدار و سوپاس گوزارن ناتوانن هەڵسن بە سوپاسی راستەقینە، چونکە ناز و نیعمەتی خوا نایەتە ژمارە، هیچ کەس ناگات بە سوپاسی دا، ئەوەتا لە هەناسەدان دا دوو نیعمەت هەیە، ئیتر برۆ خەیاڵ بهاوێژە، خوا یارمەتیمان بدات بۆ ئەندازەیەك کە روو زەرد نەبین بەرامبەر چاکەکانی خوا، واتە ئەندازەیەك کە بە میهرەبانی خۆی بیکات بەهۆی سەرشۆڕی و روو زەرد نەبوونمان آمین. هەرکەس بێ بەش نەبێ لە فام و ژیریی هەر بە تەنها بیر کردنەوە لە خۆی و دروست بوونی بەم شێوە و وێنە شیرینە تایبەتی یەی بەم هەموو هێز و وزە جۆر بەجۆرە، تەنها بیر کردنەوە لەوە بەسە بۆ ئەوەی دڵی پڕ ببێ لە ئیمان و باوەڕ بەو دەستە قودرەت و میهرەبانەی کە لە نەبوون ئەم گیان لەبەرەی هێنایە کایە، چونکە هیچ کەس نەخۆی و نە باوك و دایك و هیچ ئادەمی یەکی تر ئاگای نی یە لە پەیدا بوون و هێنانە کایەی، کەواتە کەسێك هێنابێتی کە وێنەی کەس نی یە و باڵا دەستی هەموانە و پەروەردگاری هەموو جیهانە، زانایانی تازە رێ یان کەوتووە لە زۆر سیڕ و نهێنی یەکانی هەمو بەش و پارچەکانی ئەم ئادەمی یە و بەرە بەرە تا زانین و زانیاری پێش بکەوێ زانینی ئەو نهێنی و شتە غەیبی یانە فراوانتر دەبێ، بۆ نموونە بە پێی قسەی ئەوانە بەشی ناوەڕاستی گوێچکە پێك هاتووە لە سەد و سی ملیۆن خانە، ئەو خەلییانە کەم و کوڕی یان تێ کەوێ کەم و کوڕی روو دەکاتە هێزی بیستن و هەروەها هەموو لەش تا سەرە پەنجەکان – سبحان الله –.

ئینجا ئەو هێزانە چین و چۆن پەیدا ئەبن؟!! نازانین لە چ بارێکەوە قسە بکەین؟ ئایا سەرنجی شریتەکەی مێشك بدەین کە بە درێژایی تەمەن ئەو هەموو تام و بۆن و رەنگ و وتەی جۆر بەجۆرە تەسجیل دەکات هیچ کام ئەوی تر ناسڕێتەوە!! ئایا بیر نەکەینەوە بە هەموو سەرسامی یەکەوە لەو تەنها سێڵ و خانەیە کە لە مندالْ دان دا پێوەن ئەبن و لەبەرەوە بە ملیۆن و ملیارەها سێڵ و خەلیە ئەبینرێن بۆ پێك هێنانی هەر پارچە و بەشێ لەم ئادەمی یە!! ئەم باسە بە چەند کتێب و پەراوێك تەواو نابێت هەر شتێك بڵێین بۆ وریا کردنەوە و دەست نیشانە بۆ نایابی و عەجایەبی ئەم سیفەتەی جل جلالە.

وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ
وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا
تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ

---

یەکێکی تر لەو شتە سەرنج ڕاکێشەی ئەم ئادەمی یە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ خوا ئەوەیە کە ئێوە زۆر ئەکات و پەرەتان پێ ئەسێنێ لە زەوی دا، بێگومان ئەبێ بزانرێ ئەم ئادەمی یە نایابە ژیانەکەی هەر ئەم ماوە کورتە نی یە، بەڵکو ئەم ماوە کورتە بۆ ئەوەیە هەڵسێ بە کاروباری جێنشینی یەکەی، ئینجا ئەبێ بمرێ و لە پاش ئەوە دووبارە بکرێتەوە بە شێوەیەکی تایبەتی کە دەست ئەدات بۆ مردن و نەمان و ئەبێ لە زیندوو بوونەوەی دووەم دا موحاسەبە و پرسیاری لێ بکرێ لە کار و کردەوەکانی و بە پێ ی داد پەروەریی خوا پاداشت و تۆڵە وەرگری، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ هەر بۆلای ئەو ئەگێڕێنرێنەوە، دیارە ئەو کەسەی کە لە نەبوون هێنایە کایەوە هەر ئەو دووبارەی ئەکاتەوە، دەبێ هەموو کەس بزانێ ئەگەر بێ بەش نەبێ لە ژیریی گیان دان و گیان سەندن هەر بە دەست ئەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ﴾ هەر خوا گیان ئەدات و زیندوو ئەکات بە زیندووەوە، هەر ئەو زیندوو ئەکات بە مردوو و گیانەکەی لێ دەسێنێتەوە ئەو کەسەی ئادەمی داهێنا و هەموو بەسەرهاتەکانی بەدی ئەهێنێ هەر بەدەست ئەوە گۆڕانکاری ئەو ڕۆژە، ئەمانە شتێکن ئەبێ هەر خوا ئەنجامیان بدات وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ هەر بۆ ئەوە و بە دەستی ئەوە گۆڕانکاری شەو و ڕۆژ هێنانیان بەدوای یەك دا، دەی ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ کەواتە ئێوە ژیر نین تا ئەوانە بزانن، واتە ژیر بن و ئەو شتە ئاشکرایانە بزانن.

ئینجا بە وتەی ﴿بَلْ﴾ کە لێرەدا بۆ وازهێنانە لە لێکۆڵینەوە و قسە لەگەڵ کردنیان و دەست ئەکات بە گێڕانەوەی دەمبازی و قسە بەدەکانیان لەبارەی زیندوو بوونەوە و حیساب و پرسیاریان لە ڕۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ﴾ ئەوانە ئەڵێن بە وێنەی پێشووە نەفامەکان، واتە ئەمانیش قسەکەی ئەوانی پێشوو دەم بازی پێ ئەکەن و دەڵێن: ﴿قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ ئایا کاتێ ئێمە بمرین و بگەڕێین بە خاك و خۆڵ و ئێمە زیندوو کراوە ئەبین ئەم بەڵێن و هەڕەشەی دەیکەن لێمان قسەی ڕووتە و هەر کراوە وەك ئەفەرموێ لە لایەنیانەوە: ﴿لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ﴾ ئێمە و باوباپیرانمان ئەم هەڕەشەیەمان لێ کراوە لەمەو پێش،

إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾
سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾
سَيَقُولُونَ لِلَّهِ

---

**﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ئەمە هیچ نی یە بێجگە لە قسەی پڕو پووچی کۆنی پێشووەکان. بەڕاستی ئەم وتە بۆگەنەی ئەوان زۆر زۆر بێ نرخە لەپاش ئەو هەموو بەڵگە و دەلیلە بەمێزانەی کە باسمان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەوا هەمیتر سەرنجیان ڕائەکێشی بۆ ئەم بیرنەوەرە و چەند بەڵگەی ئاشکرا، بەڵکو هۆشێك بکەنەوە. ئەو یەکەم چینە کە بت پەرستەکانی عەرەب بوون بیر و باوەڕێکی زۆر سەیریان هەبوو، بە ڕێکی دانیان [redacted] بە بوونی خوا و مالیکی ئاسمانەکان و زەوی و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك دا لەگەڵ ئەوەدا چەند شتێکیان دەکرد بە هاوبەشی و دەیانگوت دەیان پەرستین تا نزیکمان بخەنەوە لە خواوە و مەلائیکەیان دائەنا بە کچی خوا، جا ئەوا قورئان قسەیان لەگەڵ دەکات و ئەکۆڵێتەوە لەگەڵیان هەر بە قسەی خۆیان دەم کوتیان ئەکات و ئەفەرموێ بە پێغەمبەری خۆشەویست(ص): ﴿ قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان: ﴿لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئایا زەوی و هەرچی وا لە ناوی دا هینی کێ یە و موڵکی کێ یە؟ بێگومان وەك خۆیان گوتویانە و دەڵێن: ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ بێگومان هینی خوان و موڵکی خوان ئەگەر ئێوە ژیر و زانان. واتە ناچارن ئەبێ ئەوە بڵێن: ﴿قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ بڵێ کەواتە ئێوە بیرێك ناکەنەوە، واتە بیر بکەنەوە کەسێ خاوەنی ئەم زەوی و ئاسمانە بێت چۆن هیچ شت و هیچ کەسێك ئەکرێ بە هاوبەشی، واتە ڕاو بۆچوونەکەتان زۆر نەفامی یە و هۆی سەرسوڕمانە، چۆن گومانتان هەیە لە زیندو کردنەوە و دەسەڵاتی خوا بەسەر زیندوو کردنەوەدا ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾ بڵێ پێ یان کێ یە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکە و کێ یە پەروەردگاری عەرشی گەورە ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ لە وەڵام دا بێگومان دەڵێن: هینی خوان و موڵکی خوان،**

قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنْ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن
كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ
﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ

---

﴿قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ له وەڵام دا پێ یان بڵێ: ئەو حەوت ئاسمانە ئێمەش ئەبێ ئیمانمان پێ ی هەبێ ئیتر چۆن خوا ئەیەوێ هەروەها عەرش کە گەورەترین دروست کراوی خوایە، دەی ماتوڵ لاڵ ئیمان و باوەڕ لێ ئەدەن کەواتە بڵێ ئەی ئایا لەخوا ناترسن و چۆن لە خۆتانەوە بۆچوون و قسەی ناڕەوا و بێ جێ ئەکەن؟ چۆن ناترسن لەو داهێنەر و خاوەنە؟ ﴿قُلْ مَنْ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ بڵێ ئایا کە بە دەستی ئەوە پادشایەتی و خاوەنی هەموو شتێ و ئەو پەنا ئەدا و یارمەتی هەرکەسێک ئەدات و پەنای هیچ کەس نادرێ لەو، واتە هیچ کەس ناتوانێ یارمەتی هیچ کەسێک بدات و رزگاری بکات لەهەر شتێ کە خوا مەیلی ببێ، ئەگەر ئێوە زانان ئەبێ گومانتان نەبێ، بترسن لە خوا و مل کەچ بن بۆ فەرمانەکانی، شتێک نەڵێن کە نەگونجێ لەگەڵ تاک و تەنیایی خوادا ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ﴾ پێ یان بڵێ: دەی چۆن جادوتان لێ کراوە و شتێ دەڵێن کە پێچەوانەی قسەکەی خۆتانە. واتە چۆن ژیریتان تێک چوو بە وێنەی جادو لێ کراو! بەڵێ بەڕاستی ئەوە ئەوپەڕی تێک چوون و سەر لێ شێواوی یە.

لەپاش ئەو هەموو بەڵگە هێنانەوە و ئەو دەم کوت کردنی نەفامانە ئینجا کاتی ئەوەیە بە روونی چاکەی ئەم بڕیار و حەقیقەتانە بدات بە وتەی ﴿بلا﴾ کۆتایی بێنن لە قسە و باسی پێشوو، فەرموی: ﴿بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾ ئێمە هەق و راستیمان هێناوە بۆیان و بەڕاستی هەموو نەفامەکان درۆ ئەکەن و هەرچی بۆچوون و بڕیاریان هەیە ناڕەوا و ناڕاستە کە هاوبەش بڕیار ئەدەن و باوەڕیان بە زیندوو بوونەوە نی یە ﴿مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ﴾ خوا هیچ جۆرە نەولادێکی بۆخۆی رەوا نەداوە وەک نەسرانی یەکان ئەڵێن و ئەوانەی کە دەڵێن مەلائیکە کچی خوان، پاک و بێگەردی بۆ خوا،

وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا
يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا
يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ
لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ

---

**﴿وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍۚ﴾** خوا تاك و تەنيايە و هيچ خوايەكى لەگەڵ نەبووە و ناگونجىٚ ببىٚ **﴿إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ﴾** چونكە ئەو كاتە هەر خوايەك بەشە دروست كراوى خۆى ئەبرد و ئەيخستە ژێر چنگى خۆى و ديارە ئەو كاتە ئاژاوە و تىٚ گژان رووى ئەدا و هێنديكيان زاڵ ئەبوون بەسەر هێنديٚكى تريان دا، كەواتە وتەى راست و رەوا هەر ئەمەيە كە خوا ئەفەرمووىٚ: **﴿سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾** خوا پاك و بێگەردە لەوەى كە ئەو نەفامانە دەيڵێن **﴿عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾** ئەو خوايەى كە ئاگادار و زانايە بە هەموو نهێنى و ناديارىى و ئاشكرايەك **﴿فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾** كەواتە بەرز و بڵندە و پاكە لە هاوبەش و رەوادان، ئەم مەسەلەى تاك و تەنيايى خوا زانا كەلامى يەكان زۆر بە درێژيى لىٚ ى دواون و رەد و بەدەلى زۆريان كردووە كە ئەمە دەليل و بەڵگەيەكى قەتعى نى يە، چونكە ئەڵێگرىٚ عەقڵەن ئەو دووانە ئيتيفاق بكەن و بە ئاشتى كاروبارى بەرن بەرێوە، وەڵامى ئەوەش دراوەتەوە بە جۆرىٚ رێگە وبۆ نەفامان نەماوەتەوە، بەلاٚم بەراستى ئەو گێرە و كێشەيەى ناوىٚ و هەموو كەس ئەوە ئەسەلمێنىٚ كە دوو پادشا لەيەك ولاٚت دا ناگونجىٚ. با بيرێك بكەينەوە لەوە كە نەفامانى كۆن و پێش هاتنى ئايينەكانى خوا و قورئان هيچ كەسيان نەبووە باوەڕى نەبووبىٚ بە بوونى خوا و خاوەنێك بۆ ئەم جيهانە ئەوەتا بىٚ باوەڕانى كۆن بەربەرەكانىٚ ى پێغەمبەرەكانيان نەكردووە لەبارەى نەبوونى خوا و پەرستراوێكەوە، بەلاٚم نەفامانى چەرخى تازە ئەوەتا ئەبينين كاوێژ ئەكەن و ئەوە ئەكەن و ئەڵێن كە هيچ كەس لە رووى نايە بيڵىٚ؟!! هەركەس بىٚ بەش نەبىٚ چۆن لە رووى دێت قسەى وا بۆگەن بە دەمى دا بێت سبحان الله!! بۆ نموونەش دەڵێين ئەو نەفامەى

که قسەی وابکات پێی دەڵێن ئەی نەفام تۆ کە بەناو ئادەمیت لەچی پەیدا بوویت و چۆن پەیدا بوویت؟ تۆ خۆیشت دەزانی پەیدا بوویت لەو دڵۆپە ئاوە بۆگەنە و ئاوەکەش لە خۆراك پەیدا بووە و خۆراکەکەش لەم خاك و خۆڵە پەیدا بووە، دەی ئایا کێ ئەو خاك و خۆڵەی گێڕا بە تۆ!! ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، فەرمانی پێ ئەدات کە پەنا بگرێ بە پەروەردگاری کە نەیخاتە ریزی ئەو نەفامانە، هەروەها پەنای پێ بهێنێ لە خەتەرەو وەسوەسەی شەیاتین و بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) کە گەورەترینی هەموو پێغەمبەرانە و هەموو معصومن، بەڵام عەبدن و ئەبێ لە هەموو کات و مەجالێك دا عەبدایەتی و مل کەچی خۆیان دەربڕن، هەم ئەمە فێرکردنە بۆ هەموو ئوممەت کە وریای خۆیان بن و شەیتانەکان نەیانخەڵەتێنن و بیر بکەنەوە لە پەنا هێنانەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، هەرگیز هیچ کەس بێ باك نەبێ و بترسن لە بێ باکی خوا، ئینجا با ئایەتە پیرۆزەکان بچێ بە گوێچکەمان دا، ﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ * رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ بڵێ ئەی پەروەردگارم ئەگەر پیشانم ئەدەیت ئەو سزایە کە هەڕەشە کراوە لێ یان پێی، ئەگەر ئەوە ئەکەیت، واتە عەزابی لە ریشە هێنانی تاوانباران مەخەرە ریزی ئەو گەلە ستەم کارو زاڵمە، لە وەڵامی ئەو نزادا ئەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە توانا و دەسەڵات دارین کە ئەو سزای ئەوانەت نیشان بدەین، بەڵام دوای ئەخەین لەبەر ئەو حیکمەت و کاردروستی یەی کە خۆمان دەزانین، بەڵێ هێندێ لەو بەرژەوەندی و کاردروستی یە ئاشکرایە لامان، چونکە زۆر لەوانە موسڵمان بوون لە دوایی دا یان نەوە و رۆڵەکانیان، بۆ وێنە لە عاص عەمر پەیدا بوو لە وەلید خالید هاتە کایەوە لە ئەبو جەهل عیکریمە هات کە بوو بە پاڵەوانێکی گەورە، کەواتە خۆگر بە و چاوەڕوانی کاری خوا بە لە باتی ئەوەدا خەریك بوون بەو ﴿ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾ بەکار و کردەوەی زۆر شیرین و گەورە بەرگری تاوان و خراپەی ئەو تاوان بارانە بکە، ئەو کاتانە کاتی چەرخی مەککە بووە و فەرمان نەدرا بوو بە جیهاد، بێگومان ئەو فەرمان نەدانە وەك میهرەبانی بوو بەمانەوە و لەناو نەچوونی ئەوانەی کە موسڵمان بوون لە دوایی دا، هەروەها بەرژەوەندی ئاشکرای تێدا بوو، ئیسلام ناسرا بە خێر خواز و ئاشتی خواز و خاوەنی کردەوەی شیرین.

نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن
يَحۡضُرُونِ ﴿٩٨﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ

---

ماتولێ كارەكان بە دەست خوایە و لەژێر زانین و چاودێری خوایە وەك ئەفەرموێ: ﴿نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ ئێمە زاناترین و ئاگادار ترین بەوەی كە دەڵێن دەربارەی تۆ و ئاینەكەت، كەواتە پەلە مەكە و ﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ بڵێ پەروەردگارم پەنات پێ ئەگرم لە هاندان و وەسوەسەكانی شەیتانەكان – هەمز لە زمانی عەرەب دا بریتی یە لە تێ كوتان و راونان و پەلە پێ كردن –، جا بە كۆ ئەیفەرموێ یان لەبەر جۆری خەتەرە و وەسوەسەكان، یان بە پێی زۆری شەیتانەكانە، فەرماندان بەو پەنا گرتنە زیادە خۆپارێزیی تێدایە و فێركردن و دەست دانە بۆ ئوممەت كە لە هەموو كاتێك دا پەنا بگرن. لە پێشەوە فەرمانی دا بە پەنا گرتن، ئینجا فەرمان ئەدات بەوەی پەنا بگرێ لە ئامادە بوونیان بە دەوری دا، ئەفەرموێ: ﴿وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحۡضُرُونِ﴾ پەنات پێ ئەگرم لەوەی ئەوانە ئامادە بن لام. ئیتر ئەم پەنا گرتنە بۆ هەموو كاتێكە وەك رواڵەتەكە وا نیشان ئەدات، یان مەبەست كاتی نوێژ و قورئان خوێندنە وەك لە ئبن و عەباسەوە ریوایەت كراوە، یان لەكاتی مردن دا وەك لە عیكریمەوە هاتووە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ * لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ﴾ ﴿حتی﴾ لێرەدا پێی دەگوترێ ابتدائی ئەوەی بەدوای داد دێت جملەیەكی شەرتی یە و حاڵی بەد و دوا رۆژی سەختی ئەو بێ باوەڕانە دەردەخات لەكاتی گیان كەنشتیان دا كە هاوار و داوای گەڕانەوە دەكەن بەڵكو بگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەفەرموێ كاتێ مردن دێت و ئامادەیان ئەبێت دەڵێن ئەی پەروەردگارم بمگێڕەوە بۆ ژیانی دونیا، بەڵكو كردەوەی چاك بكەم لەو كردەوە چاكانەی كە لە ژیان و تەمەنی خۆم دا ئەم كرد و وازم لێ هێنا، رای بەهێز لەسەر ئەم رایە، رای تریش هەن كە وتەی ﴿حتی﴾ پەیوەستە بە ﴿یصفون﴾ ەوە یان ﴿كاذبون﴾ ئینجا بە زەجر و تێ خوڕین ئەدا لە داوا و ئاواتەكانیان،

كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾

ئەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ ئینجا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا﴾ بەڕاستی ئەو وتەیە وتەیەکە ئەیڵێ و ناچارە و لەڕاستی و ئیخلاسەوە نەهاتووە، کەواتە نرخی نی یە و وەرناگیرێ ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾ لەبەر دەمیان دا بەربەست هەیە بۆ گەڕانەوەیان بۆ ژیان تا ئەو ڕۆژەی زیندوو ئەبنەوە، هەرکەس لە دنیادا بمرێ تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە ئەو ماوەیە ژیانێکی میانەی هەیە نەوەك ژیانی ئێستای ئەم دنیایە نەوەك زیندوویی ڕۆژیی دوایی، بەم ڕەنگە جۆرێ لە زیندوویی هەیە کە هەست بە خۆشی و ناخۆشی ئەکات بەهۆی پەیوەندی ڕۆحەکەی بەو لەشەوە ئیتر با ئەو لەشە بڕزێ و بسوتێنرێ و زانایانی ئەهلی سوننەت ئەفەرمون: ئەو هەست کردنەش هەر بۆ هەست کردنی ڕۆحەکەیە بە خۆشی و ناخۆشی بەو شێوەی کە حەدیس بۆی باس کردووین، مەبەست ئەوەیە ئەگەر لە پاش مردن ئێمە زامی لێ بکەین هەستی پێ ئەکات تەنانەت شەهیدیش ئەگەر لەلایەن ئێمەوە زامداری بکەین هەست بە ئازار ناکات، لەم بارەوە درۆ و دەلەسەی زۆر کراوە کە جێگەی سەرسوڕمانە باوەڕ کردن بەو شتانە، بۆ وێنە ئەگێڕنەوە قەبرێك دەرکەوت کابرا خەریکی خورما خواردن بوو!! یان ئەڵێن قەبرێك هەڵدرایەوە کابرا گوتی حەشرە گوتیان نەخێر ئەویش ڕاکشایەوە، ئەمانە ئیسرائیلی یاتن و بلاو بوونەتەوە بۆ ئەوەی عەقیدەی خەڵکی تێك بدەن و موسڵمانی ئێمەیش ئەو دەلەسانە بگێڕنەوە تا کافر بڵێ موسڵمان خورافین!! ئینجا ئایا لەشی شەهید ئەڕزێ یان نە ، لەو بارەیشەوە دەلەسەی زۆر ئەگێڕنەوە دەربارەی نەڕزانی شەهید کە دەڵێن قەبرێ دەرکەوت و سەری شەهیدەکە تەماشای ئەکرد و دەستمان بۆ چاوی برد چاوی پرتاند!! مەبەستم لەم درێژە پێدانە ئەوەیە ئێمەی موسڵمان ئەبێ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە قسە بکەین و ڕێ نەدەین با نەبینە جێگەی تانە تەشەری دوژمن، بۆ شەهید بەو جۆرە دەڵێن، بەڵام لەبارەی پێغەمبەرانەوە حەدیسی بوخاری ئەفەرموێ: ﴿إن الله حرم على الأرض ان تأكل اجساد الأنبياء﴾ ئەوەش ڕێز و ئیکرامێکی تایبەتی یە بۆ ئەوان – سەلامی خوایان لێ بێت – ئینجا بە بۆنەی مردن و زیندوو بوونەوەوە هێندێ بەسەرهات و ڕوداو باس ئەکات لەدوای زیندوو کردنەوە،

فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ
﴿١٠٣﴾ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا
تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا

---

**ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ کاتێ فوو ئەکرێ بە سووردا ئیتر نەسەب و خزمایەتی نامێنێ لەو کاتەدا بەسەرهات و رووداوە کە ئەوەندە سەختە کەس ناپەرژێتە سەر کەسی ترو هیچ پرسیار ناکەن لە یەکتر، کەواتە ئەمە رێك و گونجاوە لەگەڵ ئایەتی تردا کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ﴾ ئینجا تەرازووی دادپەروەری دائەنرێ بۆ کێشانەی کردەوەکان، ئەفەرموێ: ﴿فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ هەرکەس کێشراوەکانی قورس بێت هەر ئەوانەن گەیشتوون بە ئامانج و رزگاربوون لە سزا و ناڕەحەتی ﴿وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾ هەرکەس کێشراوەکانی سووك بێت هەر ئەوانەن زیانباری خۆیان بوون و خۆیان لەدەست دەرچووان لە دۆزەخ دا بە هەمیشەیی و بێ بڕانەوە، خوا پەنامان بدات. مەسەلەی کێشانەی کردەوەکان زانایانی ئەهلی حەق دوو جۆریان بۆ باس فەرمووە، یەکەم: دەفتەری کردەوەکانیان دەکێشرێ، دووەم: چاکەکان ئەکرێ بە لەش و قەبارەی نوورانی و خراپەکانیش بەلەش و قەبارەیەکی رەش و تاریك هەردوو هەر ئەگونجێ و بەهەرحاڵ ئەبێ ئێمە ئیمانمان هەبێ بەوە، دەلیل و بەڵگەی هەموو ئەم کار و بارانەی رۆژی دوایی شتێکی گونجاو و مومکینن و خواو پێغەمبەر(ص) هەواڵیان پێ داوین. ئیتر تێ ئەگەین یان نە ، هەرکەسێك بیر بکاتەوە لە کێشانەی دوور و نزیکی و قورسی و سووکی و بەرزی و نزمی کە بە ترازووی بەندەیانی خوا فەراهەم دێت و خوا خەڵکی فێری ئەوە کردووە، هەرکەس بیرێ لەوانە بکاتەوە هەرگیز ئەبێ سەر نەکاتەوە لەوەی کردەوەکانمان دەکێشرێن، ئەم حیساب و پرسیار و کێشانە و پێوانەیە لەبەر داد و دادپەروەریی خوایە ئەگینا خوا هەموو شت دەزانێ و هەر زانیویەتی وەك زانایان**

لە کتێبی عەقائید دا فەرمویانە و چەند شیعری شاعیری بەرز مەولەوی لە عەقیدەی مرضیەکەیدا بە شیعر فەرموویەتی رەحمەتی خوای لێ بێت:

﴿منها المجازاة﴾ حساب و کتاب — ئەو دەکەی طەلەب حیکمەتی حیساب

تا بزانن گشت ئەهلی عەرصات — فەضلی موتتەقین، فەضیحەی عوصات

تەمیم بێ لە بۆ مەسەررەی ئەوان — بۆ تەئەسسوف و حەسرەتی ئەمان

وەرنە ﴿عالم الإشياء بالمرة — لا یعزب عنه مثقال ذرة﴾

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆلای سیاچارەکان هێندێ لە شێوە و شکڵی سامناکیان بهێنینە بەرچاو کە ئەسوتێن لە دۆزەخ دا و ﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَـٰلِحُونَ﴾ ئاگر دەم و چاو و لچ و لێویان دەسوتێنێ، ئەو لچ و لێوە رەش و گەورە کە هەڵقرچاوە و دانەکانیان دەرکەوتوون و لە کاتێك دا هەموو لەشیان هەڵقرچاوە لەناو ئەو ئاگرەدا، خوا پەنامان بدات. ئەو لەشە گەورەیان کە حەدیسی سەحیح ئەندازەی گەورەیی یەکەیان نیشان ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿ضرسه في النار مثل احد﴾ دانەکەیان لەناو ئاگردا بە ئەندازەی کێوی ئوحودە! جا وەرە بیر بکەرەوە لە گەورەیی ئەو کەسە کە هەر دانێکی بەقەدەر ئەو شاخە بێت!! لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە ئەتوێتەوە و خوا وەك خۆیانی لێ دەکاتەوە، خوا بە میهرەبانی خۆت بمانپارێزە لەو ئاگرە، آمین، ئینجا داخی سەخت تر ئەمەیە کە ئەم تەشەرە سەختەیان لێ ئەدرێ کە ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَـٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ ئایا ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەخوێنرایەوە؟ واتە هیچ بیانوویەکتان نی یە و خۆتان بەدەستی خۆتان خۆتان خستە ئەو سزا و بەد بەختی یە، ئایەتەکانی منتان بەسەردا خوێنرایەوە و ئەبوو بترسانایە بەو هەڕەشانە کەچی لە باتی ترسان و باوەڕهێنان باوەڕتان پێ نەهێنان و بە درۆتان دائەنان، لە وەڵامی ئەم پرسیارە دڵ تەزێنەدا ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ﴾ دەڵێن ئەی پەروەردگارمان شەقاوەت و بەدیی خۆمان زاڵ بوو بەسەرمان دا و ئێمە خۆمان گەل و کۆمەڵێکی بەدبووین و گومڕا و لادەر بووین لە ڕێگەی خوا، واتە خەتای خۆمان بوو و هیچ بیانوویەکمان نی یە ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا﴾ ئەی پەروەردگارمان دەرمان بێنە لەم دۆزەخە و بمان خەرە دنیا،

فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي
يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ
ذِكۡرِي وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾

---

**﴿فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ﴾ ئەگەر گەڕاینەوە سەر بێ باوەڕیی و تاوانەکانی لەوە و پێش بێگومان ئێمە ستەمکار و لە سنوور دەرچوو ئەبین لە تاوان و خراپەکاری دا، بێگومان ئەوە هاوار و نزای ناچاری یە و خوا ئەزانێ درۆ ئەکەن وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ ئەگەر بگێڕێنرێنەوە بێگومان دووبارە ئەبنەوە بۆ کردنی ئەوەی کە جڵەوگیریی کران لێ ی و بێگومان ئەوانە درۆزنن، ئەم وەڵامە سەخت و تیژو دڵ تەزێنەیان ئەداتەوە و ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ بێ دەنگ بن بە زەلیلی و ریسوایی و هیچ قسەم لەگەڵ مەکەن، ئەم تێ خوڕینە ئەوەیە بە پێ ی زمانی عەرەب بفەرموێ پێ یان: چەغە، خوا پەنامان بدات، ئێوە شایستەی ئەوەن لەو سزا و ئاگرەدا بمێننەوە و هۆکەشی ئەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ بەڕاستی دەستەیەك لە بەندەکانم لە دنیادا دەیان گوت ئەی خوای ئێمە ئێمە باوەڕمان هێناوە بە تۆ، کەواتە تۆش ببورە لێمان و گوناهەکانمان بسڕەوە و تۆ لە هەمووان میهرەبان و بەزەیی دار تری، ئەو دەستەیە بەو جۆرە لاڵە و پاڕەیان ئەکرد ﴿فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ﴾ کەچی ئێوە ئەوانتان ئەگێڕا بە جێگەی لاقرتی و گاڵتەتان پێ ئەکردن و پێ یان پێ دەکەنین و خەریك بوون بەوەوە، هەتا ئەمە یادی من و باوەڕ هێنان بە منی لەبیر بردنەوە واتە تاوانەکەی ئێوە هەر ئەوە نەبوو کە خۆتان باوەڕتان نەدەهێنا، بەڵکو لاقرتیتان ئەکرد پێ یان، ئەوانە داوای لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهەکانی خۆیانیان دەکرد و ئێوەش پێ یان پێ ئەکەنین و خەریك بوونتان بەوەوە خەریکی کردن لەوەی بیری بکەنەوە لەو هەموو بەڵگە و نیشانانە کە ئەخرایە پێش چاوتان، جا بەرامبەر بەو تاوان و کردەوە بەدانە ﴿إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾ بەڕاستی من ئەمڕۆ پاداشتیان ئەدەمەوە بەهۆی ئەوەی خۆگر بوون لە دنیادا، یان پاداشتم دانەوە بەوەی کە هەر ئەوان گەیشتوون بە ئاوات و ئامانج.**

قَـٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَـٰلَ إِن
لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَـٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا
تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ
مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ
ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾

---

لەپاش دەم کوت کردن و بەرپەرچ دانەوە ئینجا ئەم پرسیارەشیان ئاراستە ئەکات: ﴿قَـٰلَ﴾ فەرمووی: ﴿كَمْ لَبِثْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ﴾ ئایا چەند ساڵ مانەوە لە دنیادا و لەسەر زەوی دا؟ دیارە خوا لە هەموو کەس زاناترە بە هەموو شتێك کە یەکێك لەوانە ژمارەی مانەوەی ئەوانە لە دنیادا، بەڵام ئەمە پرسیاری کەم و کورتی و بێ نرخی مانەوەکەیانە لە دنیادا، ئەوانیش لەو کاتەدا دەزانن و هۆش ئەکەنەوە بە کەم و کورتی ماوەی مانەوەکەیان وەك لە وەڵامەکەشیان دا دەرئەکەوێ کە ﴿قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ﴾ دەڵێن ماینەوە رۆژێك یان بەشێك لە رۆژێ، وەڵامەکەیان دڵتەنگی و نائومێدی نیشان ئەدات لە وەڵامیان دا ئەفەرموێ: ﴿قَـٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ نەمانەوە لە دنیادا مەگەر بەشێکی کەم نەبێ، راستە ماوەکەیان زۆر کەمە و هەرچەند تەمەن درێژ بووبن، هیچ نرخی نی یە و کە دوایی هات وەك هەر نەبووبێ، ئینجا لە کۆتایی سورەتەکەدا ئەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَـٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ ئایا واتان دەزانی و گومانتان وا دەبرد کە ئێمە ئێوەمان لەخۆڕایی و بێ هودە دروست کردووە، ئێوە ناگێڕدرێنەوە بۆلای ئێمە، نەخێر بۆچوونەکەیان زۆر هەڵە و ناڕاست بوو، ئەم ئادەمی یە گەورە و گرنگە لە خۆڕایی دروست نەکراوە، بەڵکو بۆ ئەوە دروست کراوە کە لەم دنیادا هەڵسێ بەکاری جێنشینی یەکەی و ئینجا نابێ بەم ماوە کورتەی دنیایە ژیان دوایی بێت، بەڵکو ئەمەی دنیا زنجیرەیەکە و سەرەتایە بۆ ژیانە نەبڕاوەکەی کە لە جیهانی نەبڕاوەی رۆژی دوایی دا پێك دێت، حیکمەت و دادپەروەری خوا داخوازە بۆ بەدی هاتنی ئەو جیهانە تا هەموو کەس بگات بە سەرەنجام و بەرهەمی کردەوەی خۆی، خوا بێگەرد و بەرز و بڵندە لەوە وەك

دەفەرموێ: ﴿ فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ﴾ بەرز و بڵند و پاك و بێ لەكەیە خوایە كە ناوی ﴿الله﴾ یە و هەر ئەو پادشا و خاوەنی راستەقینەیە و هەر ئەو حەق و راست و شیاوە بۆ خوایەتی و پادشایەتی ﴿لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴾ هیچ پەرستراوێك بەڕاستی نی یە بێجگە لەو پەروەردگاری عەرشە كە بەرز و بەڕێزە. عەرش لە چەند شوێنێك دا گوتمان كە گەورەترین و بەڕێز ترینە و لای سەرووی هەموو ئاسمانەكان و خوا لە نەبوونی ئەویشی دروست كردووە و كردوویەتی بە نیشانەی دەسەڵاتی بێ سنووری و هەموو بڕیارێك لەوێوە دەرئەچێ و خوا لەسەر عەرشە بەو جۆرەی كە خۆی دەزانێ وەك هەموو پێشەواكان دەفەرمون: ﴿الأستواء معلوم و الكيفية مجهولة و الإيمان به واجب و السؤال عنه بدعة﴾ هەركەس ئەیەوێ بە چاوێكی قورئانی سەرنج بدا ئەبێ خۆی بناسێ و بزانێ سنووری زانینی خۆی و هەموو عالەم كەمە لە كاتێك دا خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ نابێ هەر شتێك لەبارەی شئوونی خواوە كە لە قورئان و حەدیس دا هاتبێ و ئەم تێی نەگات و باوەڕی پێ ی هەبێ و لە خۆیەوە بە بۆچوون و ژیریی كەم و كورتی دەم بكوتێ و هەرچی لەو بارەیەوە تێ ی نەئەگەیشت قسەی لێ نەكات زۆر زۆر بەداخەوە ئەمڕۆ كەلێ نەزان دەڵێن: خوا لەسەر عەرشە و وای نیشان ئەدات وەك پادشاكانی دنیا دانیشتووە بەسەر عەرشەوە ﴿تعالى عن ذلك علوا كبيرا﴾ خوا ئەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴾ بەم نەفی یە قاطیعە هەرچی ئایەت و حەدیسە متشابهە بگەڕێتەوە بۆ لای ئەم ئایەتە محكمە، هەركەس وا نەكات تێدا ئەچێت، ئەو كەسانە با بیر بكەنەوە لەوە ئەبێ هەموو ئیماندارێك یەقینی هەبێ بە ئەوە كە عەرش دروست كراوە، واتە نەبوو خوا دروستی كرد و هێنایە كایەوە، دەی لە پێش بوونی عەرش دا خوا لە كوێ بوو؟ لە كاتێك دا نە زەمان و نە مەكان نەبوون، ئەمەی كە گوتم رای هەموو ئیمامان و پێشەواكانی ئیسلام بوو حەزم كرد بیخەمە بەرچاو خوا لەسەر ئەم بۆچوون و عەقیدە پاكە دامەزراومان بكات آمين.

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆلای ئایەتەكانی و بیر و بۆچوونی خۆمان بەهێز بكەین بە تاك و تەنیایی خوا ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ﴾ هەركەسێك بپەرستێ، هەر خوایەكی تر بە تەنها یان لەگەڵ خوادا كە هیچ دەلیل و بەڵگەیەك نەبێ لەسەر ئەوە، ئەو كەسە حیساب و پرسیاری هەر لای پەروەردگاری یەتی، هەركەس بێجگە لە خوای تاك و تەنیا كەسێك یان هەر شتێكی تر بپەرستێ، ئەو كەسە كافرە و پەیوەندی بە خوای تاك و تەنیا و

پەرستنی ئەوەوە نی یە و ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ بێگومان باس و قسەش ئەمەیە کافران ناگەن بە ئامانج و بەشیان هەر دۆزەخە و بێبەشن لە بەزەیی خوا، خوا بمانپارێزێ آمین.

وتەی ﴿لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ﴾ پێی دەڵێن سیفەتی لازمە، واتە هەرکەس بێجگە لە ﴿الله﴾ هەر خوایەکی تر بپەرستێ کە هیچ بەڵگە و دەلیلیشی نی یە لەسەر ئەوە، کەواتە ئەمە نیشان ئەدات ئەگەر بەڵگە بوو ئەو قەی ناکات بێجگە لەوە ئەوە سیفەتێکی لازمە و هەمیشەیی یە، ئەو فەرمودەیە پلار وەشاندنی تێدایە بۆ بت پەرستان و هاوبەش رەوا دەران کە بە بێ بەڵگە و دەلیل دەمبازی دەکەن و هەم ئەمیش نیشان ئەدات کە عەقیدە و ئیمان لەسەر ئەساس و بنەڕەتی بەهێز بێت.

ئینجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە فەرماندان بە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بلاًلێتەوە لە خوا و بلێ: ﴿وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ بلێ ببورە لێمان و رەحم و میهرەبانی بەکار بێنە لەگەڵمان، ئێمەی موسڵمان هەزار جار نزاکەی ئەو دەڵێینەوە و دەڵێین: ﴿رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ تۆ باشترینی هەموو میهرەبان و بەزەیی دارانیت، یەکێ لە کارە گەورە و پەسەندەکانی ئەم سورەتە ئەمەیە دەستی پێ کرد بە ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ لەدوا دوایی یەکەش دا فەرموی: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ هەر لەدەست قورئان دێت ئەم کارە کەس نەدیدانە.

سوپاس بۆ پەروەردگارم جل جلاله، کە یارمەتی دام لێ بوومەوە لە تەفسیر کردنی ئەم سورەتەبەفەڕە، چونکەدەست نووسی یەکەم ون بوو بوو، ئەمەش لە ١٢ ی ذی القعدة ١٤١٧ بەئیزنی خواهەرلەم رۆژەدادەستم کردبەتەفسیری سورەتی(النور)کەدەستنووسی ئەویش ونبووە.

وصلى الله و سلم على سيدنا محمد وعلى اله و صحبه و أزواجه و أمهاتنا و أولاده وكل تابع بإحسان.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾

---

## سورەتی(النور)

## مەدینەیی یە و(٦٤) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە ناوی سورەتی(النور) ە پەیوەستە لە ئایەتێك دا بە زاتی پاكی خواوە وەك بە خزمەتی دەگەین – إن شاء الله – لە ئایەتی ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لەڕاستی دا نوور و ڕووناكی یە بۆ ڕۆح و دڵ و ژیریی و بەرهەمەكەی ڕەنگ ئەداتەوە لە كردەوە و دەروون دا، چەند ئاداب و ڕەوشتێكی دەروونی و خێزانی و كۆمەڵایەتی كە دڵ و دەروون و ژیان ڕووناك ئەكەنەوە. لەپاش ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ دەست پێ ئەكات بەم ئایەتە: ﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ ئەمە سورەتێكە هێناومانەتە خوارەوە و فەرز و پێویستمان كردووە گوێ ڕایەڵی و بەجێ هێنانی بڕیارەكانی، هێناومانەتە لەناو بەناوی ئەم سورەتەدا هێناومانەتەوە خوارەوە چەند ئایەتێك كە ڕوون و ئاشكران و ئاشكران مەبەستەكانیان، دووبارە كردنەوەی وتەی ﴿انزلنا﴾ زیاتە گرنگی و بە گرنگ گرتنی نیشان ئەدات، بەڕاستی سەرەتایەكی زۆر بەهێزە و دڵ و دەروون دائەچڵەكێنێ بەرامبەر باس و بڕیارەكانی، ئەمەشمان كرد ﴿لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بەڵكو بیر بكەنەوە و ڕەفتار بكەن بەوەی پێویست كراوە لەسەرتان و سستی نەكەن تێ یان دا. لە پێشەوە بە كورتی دەست نیشانی كرد بۆ ئەو حوكم و بڕیارانە، ئینجا درێژەی پێ ئەدات،

ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ
وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ

ئەفەرموێ: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ﴾ ئافرەتی زیناکەر و پیاوی زیناکەر سەد دار و جەڵدەیان لێ بدەن بە باشی ﴿وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ﴾ با بەزەیی هاتنەوەتان نەتان گرێ لە بەجێ هێنانی فەرمانی دینی خوا ﴿إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، واتە سستی و تەمەڵی لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوادا ناڕێکە و ناگونجێ لەگەڵ ئیمان و باوەڕەکەتان دا، ﴿وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ با دەستەیەك لە ئیمانداران ئامادەی ئەو سزادانە بن بۆ ئابڕوو بردن و عیبرەت گرتن و ترساندنی کەسانی تر. بێگومان سەد جەڵدە تۆڵەی ئەوانەی کە لە نیکاحی شەرعی دا مامەڵەی ژن و مێردی نەکردبێ، هەرکەس بە شەرعی ئەوەی کردبێ با یەك جاریش بێت، ئیتر ئەگەر زینا بکات حوکمەکەی ئەمەیە ڕەجم بکرێ، ئەو حوکم و تۆڵەیە سوننەتی موتەواتیرە و سابیتە و وەك حوکمی قورئان وایە، ئینجا با بزانرێ کە تۆڵەی زینا بە هەردوو جۆرەکەیەوە ئەبێ ئیسپات ببێ بە قەتعی بەم جۆرە خۆیان بەڕێکی ئیعتیراف بکەن بە بێ داوا لێ کردن، بەڵکو هێشتا ئەبێ پێت خۆش نەبێ ئیعتیراف بکات، ئەوەش بەو بەڵگەیە کە ئافرەتەکە یان ماعیز کە ئیعترافیان کرد هێشتا پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد کە ئایا عەرەقی خواردووە، یان پێی فەرمو: ﴿لعلك فاخذت﴾ بەڵکو تۆ هەر چوویتە ناو لنگی، ئەمەش وا دەرئەکەوێ لەبەر ئەوەبوو کە ئەو جەریمە ئەوەندە پیس و بۆگەنە بڵاو نەبێتەوە با خەڵکی بترسێ و خۆی دوور بخاتەوە، ئینجا لەبارەی شایەتەوە ئەبێ چوار شایەتی عادل شتەکە بەچاو ببینن، وەك دەڵێن خەنجەر لە کێلان دا ببینن، بێجگە لەمانەش کاتێ دەوڵەتی ئیسلام لەکاردا بێت ئەبێ هەمیشە ئامۆژگاری خەڵکی بکرێ و بترسێنرێن لە تۆڵەی خوا و ئەو شتانەی کە هۆی زۆر بوون و هەڵسانی ئارەزووە بەرگری بکرێ. ئینجا زیاتر ئەو کردەوە بەدە ناشیرین ئەکات بەمەی کە دەفەرموێ: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ﴾ پیاوی زیناکەر هەر ژینی زیناکەر یان ئافرەتی بت پەرست و هاوبەش ڕەوا دەر مارە ئەکات،

﴿وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌۚ﴾ ئافرەتی زیناکەر هەر پیاوی زیناکەر یان هاوبەش رەوا دەر دەیخوازێ و شووی پێ دەکات، واتە سروشتی زیناکەر، چ پیاو و چ ئافرەت ئەمەیە و وەك مەسەل دەڵێ: ﴿الجنس إلى الجنس يميل﴾ هەرکەس لەگەڵ وێنەی خۆی گونجاوە و مەیلی دەکات. ئەم تۆڵەی کە لێرەدا دانرا ئەوەیە کە لە سورەتی(النساء) دا دەست نیشانی بۆ کرد و فەرموی ﴿أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾. ئەم بڕیارە بۆ پیاو و ئافرەتانە و دەربارەی نێر بازی ئافرەت بۆ ئافرەت ئەوە خیلاف تێدایە لەلایەن زانایانەوە هێندێ زۆر توندی بەکار ئەهێنن تا رادەی کوشتنی هەردووکیان، هێندێ وەك زیناکەری پیاو و ئافرەت دایان ئەنێن وەك لە سەرەتای(النساء) دا باسمان کرد. لەبارەی ئەم دوو رستەوە ﴿الزاني و الزانية﴾ گوتراوە، ئایا چ جیاوازی هەیە لەناو ئەم رستەیەدا بۆچوون وا دەڕوا کە بیفەرموایە: ﴿والزانية لا تنكح إلا زانيا ام مشركا﴾. بەڵێ بە دیمەن و رواڵەت ئەوە دەچێتە دڵەوە بەڵام دیارە قسە هەر قسەی قورئانە، یەکەم ئەم دوو رستەیە جیاوازن لە یەکتر، رستەی یەکەم وەك گوتمان پیاوی زیناکەر مەیلی نی یە لە خواستنی هیچ ئافرەتێك بێجگە لە ئافرەتی زیناکەر یان هاوبەش رەوا دەر، دووەم ئافرەتی زیناکەر هەر پیاوی زیناکەر یان موشریك دەیخوازێ و مارەی دەکات. دەی لە رستەی یەکەمەوە دەرناکەوێ و موناف نی یە لەمەی پیاوی داوێن پاك مەیلی ببێ لە خواستنی ئافرەتی زیناکەر، کەواتە هەر دوو رستەکە جیاوازن و بە هەردووکیانەوە مەبەستەکە تەواو ئەبێت، خوا و پێغەمبەری خوا باش دەزانن، ﴿وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەو شوو کردن و خواستنەی کە باس کرا قەدەغە و حەرام کراوە لەسەر ئیماندارانی داوێن پاك، هێندێ ئەفەرمون مەبەست ئەوەیە زینا حەرام کراوەو ﴿ذلك﴾ دەست نیشانە بۆ ئەوە و مەبەست بەم رستەیەش ناشیرین کردنی ئەو کردەوە پیسەیە، چونکە شتی قەدەغە کراو بوغزێنراوە لای خواو هەرچیش وابێ ئەبێ ئیمانداران بێزی لێ بکەنەوە، ئینجا ئەوە پێویستی هەیە بە لێکۆڵینەوە و خیلاف هەیە تیای دا لەلایەن زانایانەوە هەروەها لەبارەی کاری جینسی لەگەڵ حەیوانات دا خیلاف هەیە لە تۆڵەی ئەو کەسانەی کە ئەو بارە بەدە ئەکەن، هێندێ بە سەخت ئەیگرن کە ئینسانەکە وەك زیناکەر تەماشا دەکرێ و هێندێ لەسەر ئەوەن کە حەیوانەکەش بکوژرێ، چونکە ئەو کارە بەدەی لەگەڵ کراوە بەڵێ بێگومان ئەو کارە بەدە حەرام و قەدەغەیە، بەڵام رای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە نابێ نە جەلدەی لێ بدرێ و نە رەجم بکرێ، بەڵکو ئەگەر پێی زانرا ئەوا نابود ئەکرێ بەهەر جۆرێ سوڵتەی حاکم دەزانێ، ئەگەریش پێی نەزانرا تۆبەی شەرعی بکات و ئینجا ئەکەوێتە بازاڕی خوا، ئینجا سەبارەت بەوەی کە دروستە مارە

کردنی ئافرەتی شەروالْ پیس، ئیمامی ئەحمەد لەسەر ئەوەیە کە دروست نی یە مەگەر تۆبەیەکی سەحیح بکات کە پاکی بکاتەوە لە چەپەڵی ئەو کارە بەدە، بەلاّم لەموّی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا ئەم حەدیسە هاتووە کەوا ئەگەیەنیّ نیکاحەکە دائەمەزریّ بەلاّم مەکروهە و حەرام نەکراوە بە قەتعی، ئەم حەدیسەش ئەبو داود و ترمزی و نەسائی هێناویانە لە مرتدی کوڕی ئەبو مرتدەوە کە ئەفەرمویّ کە ئەچووم بۆ مەککە ئەو موسڵمانە بیّ دەسەلاّتانەم ئەهێنا بۆ مەدینە، کاتیّ ئافرەتی بە عناق بە پیّی باوی چەرخی پێش ئیسلام دۆستم بوو، ئینجا جاریّ رۆیشتم مانگە شەو بوو دەڵیّ عیناق سێبەری تارمایی یەکی بینی و نزیک بوویەوە و ناسیمی و گوتی مرتدی، گوتم بەڵیّ، گوتی [redacted] و سهلا وەرە با ئەم شەو پێکەوە بین، گوتم عناق خوا زینای حەرام کردووە، لەگەلْ وام گوت بۆی دەرکەوت کە موسڵمانم، جاڕی دا ئەم پیاوە هاتووە کە ئەسیرەکان ببات، منیش چوومە ناو باغێك غار و ئەشکەوتێکم دەست کەوت چوومە ناوی یەوە هەشت کەس هاتن و خوا کوێری کردن لێم ئەیان بینیم تەنانەت بەلای سەرمەوە بوون و میزیان ئەکرد بەسەرما و گەڕانەوە منیش چووم بۆ هەڵگرتنی ئەو پیاوە و هێنام تا گەیشتمە شوێنیّ بە باشم ئەزانی پەت و گوریسەکەم لیّ کردەوە و هاتین هەتا گەیشتینە مەدینە و چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) عەرزم کرد کە عناق مارە بکەم، ئەویش لە وەلاّم دا فەرموی: مرتد: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً﴾ کەواتە مارەی مەکە. ئیمامی ئەحمەد ئەم حەدیسە ئەکات بە بەڵگە لەسەر قەدەغە کردنەکە. بەلاّم شێوەی فەرمودەکەی بۆ ارشادە، بۆ وێنە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری(ﷺ) کرد و گوتی: ﴿إن امراتي لا ترید لامس﴾ ئەویش فەرموی تەلاّقی بدە، ئینجا عەرزی کردەوە، فەرموی: راگیری کەو وریای بە، خەڵکی تازە لە نەفامی یەوە هاتبوون بۆ ئیسلام شتی وایان تێدا هەبوو، لە نەفامی تازەش دا ئەوە رووی دا بۆ وێنە ترکیا کە بە پاکی و داوێن پاکی پێنج چەرخ مایەوە، کاتیّ ئەو پیلانە گەورەی ئەتاتورکی مەلعون هات یەك بەندی حکومەتەکەی ئەوەبوو زینای بەرەلاّ کرد بە جۆرێك هیچ زاتیّ نەبیّ هیچ جۆرە بەرگری یەك بکات، بە بۆنەی باسەکەوە درێژەم دا بۆ ئەمەی بیر بکرێتەوە لەو پاك و خاوێنی یەی کە ئیسلام هێنای و گەل ۆ کۆمەڵی پاك کردەوە کارێکی وای کرد کە خەڵکی بزانن و وریا بن نەسەب و نەژاد پارێزگاری بکریّ!! کەواتە ئەم تۆڵە سەختە جەڵدە و کوشتن و بەردەباران کردن هەرچەند نەزان بە سەختی سەیر بکات لە واقیع دا رەحمە و بەزەیی یە لەگەلْ گەل و ئەندامی گەل دا، ئیسلام ئەو توند و تیژیی یە بەکار دەهێنیّ بۆ پاك کردنەوەی گەل و کۆمەلْ، ئینجا بە توندی دەست دەگریّ بەسەر دەمی خەڵکی دا و رێگە نادات هیچ کەس بەبیّ بەڵگەیەکی شەرعی موسڵمانان تاوانبار بکات لەو کارە بەدە، ئەوەتا بەدوای حوکمی ئەو کردەوە پیسەدا،

وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾

---

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ ئەو کەسانەی کە بوختانی زینا ئەکەن بۆ ئافرەتە موسڵمانە داوێن پاکەکان، ئینجا چوار شایەت ناهێنن لەسەر راستی قسەکەیان، ئەوانە هەشتا جەڵدەیان لێ بدەن و ئیتر هیچ شایەتی یەکیان لێ وەرمەگرن. واتە ئەوانە لەناو گەل دا رادە و پلەیان ئەوەندە پەست ئەبێ گوێ نادرێ بە شایەتی دانیان کە ئەو تۆڵەیەی زۆر سەختە، ئەوانە فاسقن و لە سنووری شەرع دەرچوون ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بێجگە لەوانەی تۆبەیان کردبێ لەپاش مل کەچ کردنەکە بۆ تۆڵەکەیان و داوای لێ بووردن لە بوختان بۆ کراوەکان، ئەگەر ئەوەیان کرد چاوەڕوانی سڕینەوەی گوناهەکانیان بکەن، چونکە خوا لێ بووردەی میهرەبانە. بە بێ خیلاف فاسقی یەکەیان ناهێڵێ، بەس خیلاف هەیە لە وەرنەگرتنی شایەتی دا. بێ خیلاف و بەلای هەمووانەوە ئەو تۆبە و چاکەکاری یە تۆڵەی حەدەکەی لەسەر لانابات، ئینجا بۆ ئەم دوو تۆڵەکەی تریان: وەرنەگرتنی شایەتی لێ یان و نەمانی فاسقی یەکەیان، ئیمامی مالیک و شافیعی و ئەحمەد ئەفەرمون: هەردووکیانی لەسەر لائەبات و ئیمامی ئەبوحەنیفەش ئەفەرموێ: هەر فاسقی یەکەی لەسەر لائەبات. شعبی و ضحاك ئەفەرمون: فاسقی یەکەش بە مەرجێ شایەتی یەکەی وەرئەگیرێ کە بەباش دان بنێ و بڵێ من بوختانم کرد و ئەمەش رای هێندی لە زانایانی تریشە. ئەمەی باس کرا تۆڵەی ئەو بوختان کەرانەیە بە شێوەی گشتی، بێجگە لەو مێردانەی کە ژنەکانیان تاوانبار ئەکەن بە زینا و بێجگە لە خۆیان شایەتانی تریان نی یە، واتە بێجگە لەخۆی چوار شایەتی تر وەك هێندێ ئەفەرمون، یان سێ شایەتی ترو بە خۆیشی یەوە ئەبن بە چوار وەك هێندێکی تر ئەفەرمون. ئەو کەسەی کە بوختانەکەی بۆ دەکرێ ئەگەر داوای هەق سەندن نەکات تۆڵە ناسێنرێ بۆی، چونکە وەك زینا کەرێ کە دوای ئیسپات بوون حاکمی شەرع تۆڵەی بۆ ئەسێنێ، چونکە جانبی(حق الله) ی بەهێز ترە، بەلام بوختان جانبی(حق الناس) ی بەهێز ترە، کەواتە ئەگەر داوای نەکرد هەقی بۆ ناسێنرێ،

وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ
أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾

---

﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ﴾ **ئینجا با بێینەوە سەر حوکمە شەرعی یەکە دەربارەی ئەو کەسانەی کە ئافرەتەکانیان تاوانبار ئەکەن و چوار شایەتیان دەست ناکەوێ ﴿فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ شایەتی دانی هەرکام لەوانە چوار شایەتی دان بێت بە خوا کە لە راست گۆیانە. واتە چوار جار بڵێت: اشهد بالله من راست ئەکەن لەوەی کە گوتوومە و ئەم ئافرەتە زینای کردووە ﴿وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ پێنجەم ئەمەیە بڵێ نەفرینی خوا لەسەرم بێت ئەگەر لە درۆزنان بم لەم قسەی کە کردوومە دەربارەی ئەو ژنەم، بەم پێنج شایەتی دانە حەددی بوختان لە کۆڵی پیاوەکە ئەخات، ماوەتەوە ژنەکە ئەویش ئەگەر بێ دەنگ بێت یان ئیعتیراف بکات ئەوا گوناهەکەی لەسەر ئیسپات ئەبێ و ئەگەر ئینکاری کرد ئەوا ئەویش پێنج شایەتی بدات بەم شێوەی کە دێت. ئەگەر ئەوەی کرد ئەوا تۆڵەی دنیای لەسەر نامێنێ و ئەکەوێتە بازاڕی خوا لە رۆژی دوایی دا هەرکام لەو پیاو و ئافرەتە خوا خۆی ئەزانێ چی یان لەگەڵ ئەکات. دەربارەی ئافرەتەکە ئەفەرموێ: ﴿وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ * وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ بەرگری سزای دنیایی دەکات لەو ئافرەتەی کە مێردەکەی بە زیناکەری داناوە، بەرگری ئەو سزایەی دەکات کاتێ پێنج جار شایەتی لەسەر پاکی خۆی بدات بەم جۆرە چوار جار بڵێ: اشهد بالله ئەو پیاوەم لە درۆزنانە لەو بوختانەی کە کردوویەتی و درۆی کردووە. جاری پێنجەم بڵێ غەزەبی خوام لەسەر بێت ئەگەر ئەو لە راست گۆیان بێت و راست بکات لەو قسەی کە کردوویەتی دەربارەی من، بەڵێ وا دەرئەکەوێ مێردەکە راست بکات ئەو تاوانبار کردنە بەشی خۆی تێدایە و نامووسی پیاوەکە زیاتر ئەشکێ. خوای میهرەبان بەو جۆرە ئەو گرێ کوێرەی کردەوە بۆ بەندەکانی،**

ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ﴾ ئەگەر لوتف و فەزڵی خوا نەبوایە ئەوەتا خوا تۆبە وەرگر و میهرەبان و بەزەیی دارە واتە ئەگەر خوای میهرەبان بەو جۆرەی نەکردایە ئێوە ئەی پیاو و ئافرەتەکان دووچاری موشکیلەی گەورە ئەبوون دووچاری رەجم و جەڵدە ئەبوون و ناوبانگی ناشیرین ئەکەوتە شوێنتان، بەڵام کارەکەی کوژاندەوە و هیچ کام بە تایبەتی و دیاریی نازانرێ و ناناسرێ، وەڵامی وتەی ﴿لولا﴾ دیاریی نەکرد بۆ گەیاندنی گەورەیی ئەوەی رووی ئەدا. ئینجا بەم شایەتی دانە لەلایەن پیاو و ئافرەتەکەوە ئیتر حەرام ئەبن لە یەکتر لە بەستراویی و کەوتنەوە یەکیان بەلای زۆر لە زانایانەوە یەکێ لەوانە ئیمامی شافیعی یە رەحمەتی خوا لە هەمووان. رووداوێکی ئاوا رووی دا داوا کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش تا ئەم ئایەتە نەهاتە خوارەوە چارەسەری دانەنا هەتا ئەم ئایەتی ملاعنة هاتە خوارەوە.

ئینجا دێتە سەر رووداوێکی زۆر دڵتەزێن، رووداوی بوختان دەربارەی پاکترین ماڵ و ئازاردان بەدڵی گەورەترین ئادەمی و لەپاش ئەو پاك ترین ماڵە دەربارەی صدیقە ی کچی صدیق لەپاش ئەوانە دەربارەی کەسێ کە پێغەمبەر(ﷺ) بە پاکی داناوە، هاوەڵی بەرێز صفوان. ئینجا با گوێ بگرین دایکی ئیمان داران عائشة خوا لێ ی رازی بێت کە ئەفەرموێ پێغەمبەر(ﷺ) باوی وابوو بچوایە بۆ سەفەرێك قورعەی دائەنا لەناو حەرەمەکانی دا هەرکام قورعەی دەرچووایە لەگەڵ خۆی ئەیبرد لەو سەفەرەدا قورعەی من دەرچوو و لە کەژاوەدا هەڵگیرام ئینجا رۆیشتین هەتا پێغەمبەر(ﷺ) لێ بوویەوە لەو غەزایە و گەڕایەوە و نزیك بووینەوە لە مەدینە لەو جێدا لە شەوێك دا فەرمانی بەڕێ کەوتن درا منیش کاری دەست نوێژم بوو هاتمەوە بۆ شوێنی خۆم دەزانم ملوانکەیەکم هەبوو داکەوتووە و چووم بەدوای دا بۆ جێ ی دەست نوێژگرتنەکە، ئەو گەڕانەوە بەدوای ملوانکەکەدا خەریکی کردم، لەو ماوەیەدا دەست کرابوو بە گەڕانەوە بۆ مەدینە و ئەوانەی کە منیان دەگرت لە کەژاوەکەدا و منیان خستبووە سەر پشتی حوشترەکە لەو کاتانەدا ئافرەتان هەموو سوك بوون و لەر و لاوازیان تێدا بوون وایان زانی بوو کە منیشی تێدام، منیش ملوانکەکەم دۆزی یەوە و کە گەڕامەوە خەڵکەکە رۆیشتبوون و منیش کە گەڕامەوە کەس نەمابوو منیش چوومە شوێنەکەی خۆم و گوتم دەزانن

من جێماوم و دەگەڕێنەوە بەدوام دا و لەپاش ماوەیەك خەو بردمی یەوە،(صفوان) كە لە دوای لەشكرەكەوە بوو كە هاتبووە ئەو شوێنە تارمایی زەلامێكی دیبوو و منی ناسیبوو، چونكە لە پێش هاتنە خوارەوەی ئایەتی حیجاب دا منی دیبوو، ئینجا منی ناسی گوتی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ منیش بەو وتەیە خەبەرم بووەوە و خێرا خۆم داپۆشت واللە هیچ وتەیەكی لەگەڵ نەكردم و حوشترەكەی خۆی خوس دا و منیش سواری حوشترەكە بووم، ئینجا گەڕاینەوە هەتا گەیشتینەوە ناو لەشكرەكە، ئەفەرموێ ئینجا لەوێ دا بە هیلاك دا چوو ئەوەی بە هیلاك دا چوو و ئەوەی كە زۆربەی كارەكەی گرتە دەست عبدالله ی كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول بوو ئینجا گەیشتینەوە مەدینە و مانگێك تووشی نەخۆشی بووم نەمزانی لەو ماوەدا خەڵكی قسەو باس ئەكەن و ڕۆچوونەتە خوارەوە لە قسە و باسەكەی بوختان كەرەكان دا و منیش بێ ئاگام، ئەكەوتمە گومانەوە كە ئەم بینی پێغەمبەر(ﷺ) لوتفەكەی جارانی نەماوە لەگەڵم، بەڵكو ئەهاتە ماڵەوە سەلامی دەكرد و دەیفەرموو چۆنن و ئینجا ئەڕۆیشت و نەم زانی بەو قسە و باسە هەتا خۆش بوومەوە لە نەخۆشی یەكە، ئینجا من و أم مسطح ڕۆیشتین بۆ جێگەی دەست بە ئاو گەیاندن و شەو ئەچووین هێشتا لەو كاتەدا جێگەی دەست بە ئاو گەیاندنمان پێك نەهێنابوو بە پێی باوی عەرەبی لەوەو پێش. جا أم مسطح كە پورزای باوكم بوو گوتی: مسطح داوەشێ و بەد بەخت بێت، گوتم بۆچی وا دەڵێیت قسە بە كەسێك دەڵێیت كە ئامادەی بەدر بووە، ئەویش وتی ئایا نەت بیستووە چی گوتووە؟ گوتم: چی وتووە؟ ئەویش هەواڵی پێدام ئینجا نەخۆشی یەكەم دووبارە بوویەوە، ئینجا كە گەڕامەوە بۆ ماڵ پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی هاتە ماڵ و فەرمون چۆنن؟ گوتم ئیزنم بدە بچم بۆلای باوك و دایكم، چوومەوە و گوتم بە دایكم دایكە ئایا خەڵكی چی ئەڵێن؟ ئەویش گوتی كچی خۆم دڵ غەمبار مەكە، واللە كەم ئافرەت هەیە كە جوان بێت و لای پیاوێك بێت كە خۆشی بوێ و چەند هەوێ یەكی هەبێ، كەم ئافرەتی وا هەیە كە قسەی ئاوای دەربارە نەكرابێ، منیش گوتم: سبحان الله! خەڵكی قسی وایان گوتووە؟ ئەفەرموێ: دەستم كرد بە گریان ئەو شەوە هەتا بەیانی و خەو نەچووە چاوم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بانگ ئەكاتە علي و أسامة خوایان لێ رازی بێت و پرس و رایان پێ ئەكات لەبارەی تەڵاق دانی منەوە، ئەفەرموێ بە ئوسامە و ئەوەی كە زانیبێتی لەبارەی پاكی منەوە ئەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا خێزانی خۆتە و واللە بێجگە لە خێرو چاكە هیچی تر نازانین، بەڵام عەرزی ئەكات دنیات لەسەر تەنگ نەبووە و ئافرەتی زۆر هەیە كێت ئەوێ مارەی بكە و پرسیار

بکە لە کارەکەرەکەی ماڵتان بزانی چی دەزانێ لە بارەی خێزانەکەتەوە، ئینجا کە پرسیاری لێ دەکات هیچ کارێکت لێ دیوە بکەوێتە گومان لێ ی؟ ئەویش ئەڵێ نەخێر سوێند بەو کەسەی کە تۆی رەوانە کردووە هیچ شتێکم لێ نەدیوە کە خراپ بێت و ناپەسەند بێت بەلامەوە.

ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەچێتە سەر مینەر و سکالآ ئەکات لە عبدالله ی کوڕی ئوبەی و ئینجا ئەفەرموێ: ئایا کێ بەرگریم لێ دەکات لەو کەسەی کە ئازاری گەیاندووە پێم دەربارەی خێزانەمەوە، والله بێجگە لە چاکە هیچم لە نەدیوە و باسی پیاوێکیان – واتە صفوان – کە بێجگە لە خێرو چاکە هیچی لێ نەدیوە و سەری نەکردووە بە ماڵی من دا لەگەڵ خۆم نەبێ، ئەفەرموێ ئینجا لەوێدا ئەسیدی کوڕی خضیر ئەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا چارەسەری بۆ کردووی، ئەگەر ئەو کەسە لە بەنی ئەوسە ئێمە ئەدەین لە گەردنی، ئەگەر لە برا خەزرەجی یەکانمانە فەرمانمان پێ بدە جێ بەجێ ی دەکەین، ئینجا سەعدی کوڕی عبادە خوا لێ ی رازی بێت و پیاوی چاکیش بوو بەلام غیرەتەکەی دەیگرێ و دەڵێ بە ئەسید سوێند بە خوا درۆ دەکەیت و ناتوانی، ئەویش گوتی تۆ درۆ ئەکەیت و سوێند بەخوا دەیکوژین و تۆ مونافیقی و بەرگری لە مونافیقان دەکەیت، بەهۆی ئەوەوە هەر دوو خێڵەکە خەریک بوو بکەونە جەنگ و کوشتار و پێغەمبەریش(ﷺ) هەر بەسەر مینبەرەوە هێواشیان دەکاتەوە و منیش ئەو رۆژە هەر دەگریام و چاوم وشك نەدەبووەوە و خەو نەدەچووە چاوم دوو شەو و دوو رۆژی رەبەق هەر لە گریان دا بوو هەتا لام وا بوو گریان جگەری بریوم، ئینجا لەو کاتەدا ئافرەتێکی ئەنساری ئیزنی خواست و هاتەلام ئەویش هەر دەستی بە گریان کرد لەگەڵم. لەوکاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی هات و دانیشت لەو کاتەدا نەهاتووە دابنیشێ لام، شایەتومانی هێنا ئینجا فەرموی پێم گەیشتووە ئەو قسە و باسە جا ئەگەر تۆ پاکیت خا پاکی یەکەت دەرئەخات و ئەگەر کارێکی بەدت کردووە ئەوا تۆبە بکە و بگەڕێرەوە بۆلای خوا، چونکە بەندە هەرکاتێ دان بنێ بە گوناهی خۆی دا و بگەڕێتەوە بۆلای خوا تۆبەی لێ وەردەگرێ. ئینجا کاتێ لێ بوویەوە غیرەت گرتمی و گریانەکەم وەستایەوە و ئینجا گوتم بە باوك و دایکم لەباتی من وەڵامی پێغەمبەر(ﷺ) بدەنەوە ئەوانیش گوتیان والله نازانین چی بڵێین: ئینجا ئەفەرموێ: من ئافرەتێکی گەنج بووم قورئانی زۆرم نەخوێندەوە و گوتم سوێند بەخوا دەزانم قسە و باسێکتان بیستووە لەبارەی منەوە و لە دڵتان دا جێگیر بووە و باوەڕتان پێ ی هەیە، جا ئەگەر من بڵێم بەریم و خوایش دەزانێ کە بەریم و باوەڕم پێ ناکەن، ئەگەر دان بنێم بە شتێك دا کە

خوا دەزانێ بەریم لێ ی بەوە باوەڕ دەکەن، سوێند بە خوا هیچ شتێ ناکەم بێجگە لەوەی باوکی یوسف پێی هەستا و گوتی، ئەمەش ئەمە بوو کە گوتی: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ ئینجا باری خۆمم گۆڕی و راکشام لەسەر جێگەی خۆم، سوێند بەخوا ئەمزانی کە من بەریم و خوایش دەری ئەخات ئەو پاکی یەی من، من لام وا نەبوو لەبارەی منەوە خوا وەحی بنێرێ خۆم لەو قەدە نەدەگرت و چاوەڕوانی ئەوە بووم پێغەمبەر(ﷺ) خەوێك ببینێ لە بارەی پاکی یەکەمەوە ئینجا و الله ئەو مەجلیسە تێك نەچوو بوو کەس لە ماڵەکە دەرنەچووبوو شێوەی هاتنی وەحی هات بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) ئینجا کە ئەو شێوە نەما پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی عائشە خوا بەری کردی و ئەو دە ئایەتە هاتە خوارەوە، دایکم پێی گوتم هەستە لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) و سوپاسی بکە منیش گوتم هەر سوپاسی خوا ئەکەم تەنها ئەو منی بەری کرد. بەڕاستی گەلێ جار ئینسان گریان دەیگرێ کاتێ بیر ئەکرێتەوە لەو رووداو و بەسەرهاتە دڵ تەزێنە چۆن ئەبێ گومانی وا ببرێ بە یەکێکی وەك دایکی ئیمانداران یان بە یەکێ لە هاوەڵان، لەناو خەڵکی ئاسایش دا کەسێك زۆر پیس و بۆگەن بێت شتی وای نایەت بە خەیاڵ دا!! چۆن ئەبێ بیر نەکرێتەوە لەوەی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە خۆشەویستی خوایە و چۆن رێگە ئەدات لەکەی ئاوا رووی تێ بکات؟!! یەکێ لە سیفەت و مەرجەکانی پێغەمبەرێتی ئەوەیە کە پاك کرابێت لەو شتانەی کە زیان ئەگەیەنن بە ناموس و شەرەف و ئەو جۆرە کردەوانە پیس ترین لەکەیە بۆ هەموو پیاوێکی ئاسایی؟!! دروستە و گونجاوە خێزانی پێغەمبەران کافر بن وەك ژنەکەی نوح و لوط – سەلامی خوایان لێ بێت – چونکە ئەمە لەناو خەڵکی دا لەکەیەك نی یە کە دژی ناموس و شەرەف بێت، بەڵام ئەم لەکە بۆگەنە ناگونجێ و نابێ. بەخوا من خۆم کە بیرم کردووەتەوە لەو رووداوە دڵ تەزێنە گریاوم، بەڵام کاری خوا هەمووی خێرو بەرەکەتە ئەوەتا ئەم بەهرە و نیعمەتە کە خوا رشتی بەسەر دڵی دایکمان دا مەگەر هەر بەسەری ئەودا رشتبێتی، خوا جاڕی پاکی یەکەی گێڕا بە چەند ئایەتێك لە قورئان هەتا دنیا دنیایە و خوێندنەوەی کرد بە عیبادەت و پەرستنی خوا و ئەوانەی کە دەخلیان لەو بووختانەدا بوو بێ ئابڕووی کردن لە دنیادا وەك ئیبن و سەلول کە ئەو ئاگرەی هەڵگیرساند ناردی بۆ دەرکی ئەسفەل بە بێ برانەوە والحمد الله أولا واخرا، ئینجا با گوێ شل بکەین بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزانە،

إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ
مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١﴾ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ
بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ
فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ
أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾

---

که خوا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ﴾ بێگومان ئەوانەی کە هەڵسان بە گوتن و هێنانی ئەو بوختان و درۆیە زۆر گەورە لە خۆیانەوە، وتەی ﴿إفك﴾ لە زمانی عەرەب دا بریتی یە لەوە. ئەفەرموێ: ئەوانە دەستەیەکن لە خۆتان، ئیبن و ئەوبەی هەرچەند کافر بوو لە دڵەوە بەڵام بە رواڵەت موسڵمانێتی دەرئەبڕی لەبەر ئەوە خستی یە ریزی موسڵمانان، ﴿لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ﴾ دای مەنێن و وا گومان مەبەن کە ئەوە بۆ ئێوە شەڕ و خراپە، نەخێر وا نی یە بەڵکو ئەوە خێرو چاکەیە بۆتان، واتە ئەی پێغەمبەر و عائشة و ئەبوبەکر و صفوان دڵ گران و غەمبار مەبن پێی، بەڵێ بەڕاستی خێر بو وەك دەست نیشانمان بۆ کرد، بۆ ئێوە خێرە بەڵام بۆ بوختان کەرەکان شەڕ و خراپ بوو، ئەوەتا ﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ﴾ بۆ هەرکام لەوانە هەیە گوناهو تاوان بە ئەندازەی خەریك بوون و هەوڵدانیان لەو درۆ و بوختانەدا، ﴿وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ ئەو کەسەی زۆربەی گرتە لای خۆی و هەڵسا پێی بڵاوی کردەوە ئەو مونافیقە بوو بۆ ئەو هەیە سزایەکی گەورە لە رۆژی دوایی دا، واتە بێجگە لە سزای دنیایی بە ئابڕوو بردن و جەڵدە لێدان، سزای گەورەشی بۆ هەیە لە رۆژی دوایی دا کە سزایە بە ئاگری دۆزەخ، خوا پەنامان بدات لێی، ئینجا دەست ئەکات بە سەرزەنشت و لەکەدار کردنی گوێ گران بە شێوەیەکی قورئانی کە بکرێ بە بەرنامە بۆ هەر جۆرە درۆ و بوختانێکی ئاوا، ئەفەرموێ: ﴿لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا﴾ با کاتێ ئەو بوختانەتان بیست لەخۆتانەوە وەرتان نەگرتایە، بەڵکو ئیمانداران چ پیاو و چ ئافرەتان گومانی خێریان ببردایە بە

خۆیان، واتە لەکەدار کردنی هەرکام لە ئیمانداران لەکەدار کردنە بۆ خۆیشیان، چونکە ئیمانداران هەموو برا و خوشکی یەکن.

ئەم باسی پاکی یەی بە جۆرێك هێنا کردی بە بەرنامە بۆ دەم کوت کردنی ئەو کەسانەی کە دەم بەرەڵا ئەکەن لەبارەی بوختان کردن بۆ ئیمانداران، ئەوەتا فەرموی: ئەگەر شتی وا رووی دا نابێ لە رێوە گوێ ی لێ بگیرێ، ﴿وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ﴾ بەڵکو ئیمانداران بەد گومان ئەبن لەناو خۆیان دا و لەکەو تانەی هەرکام بە هینی خۆیان سەیر بکەن و بڵێن ئەمە دەلەسەیەکی روون و ئاشکرایە، دەربارەی هەموو برواداریك هەڵوێستیان وابێت چ جای دەربارەی صدیقەی کچی صدیق – خوایان لێ رازی بێت –.

ئینجا هەنگاوی دووەم ئەفەرموێ: ﴿لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ﴾ با ئەو بوختان کەرانە بە بێ بەڵگە دەمیان بەرەڵا نەکردایە، بەڵکو چوار شایەتیان لەسەر بهێنایە، کەواتە ماتوڵ چوار شایەتیان نەهێناوە لەسەری ئەوانە لای خوا هەر درۆزنن و ئەوپەڕیان گرتووە لە درۆزنی دا، موسڵمانان لەو رووداوە سەختەدا بەو جۆرەیان نەکرد و وازیان هێنا لە دەم بەتاڵ تا بەو شێوە ئەو هەواڵە پەرەی سەند لەناو خەڵکیدا، جا لەبەر ئەوە خوا ئەیانترسێنێ بەمەی ئەگەر خوا لوتف و میهرەبانی بەکار نەهێنایە هەموو دووچاری سزای گەورە ئەبوون وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ ئەگەر لوتف و میهرەبانی خوا نەبوایە پێتان لە دنیا و لە رۆژی دوایی دا، ئەگەر ئەوە نەبوایە دووچارتان دەبوو لەبەرئەوەی رۆچوونە خوارەوە تێیدا سزایەکی گەورە، واتە بەهۆی شوومی و بەدیی ئەو کارە بەدە سزای گەورە دووچاری هەمووتان دەبوو، چونکە گوناە بە ئاشکرا سزاکەی هەمووان ئەگرێتەوە چ ئەوانەی کە هەڵساون بە گوناهەکە و چ ئەوانەی کە بێ دەنگ بوون و بەرگری یان نەکردووە، ئەگەر موسڵمانان بە پێ ی ئەم تەمێ و تەوجیهە رەفتاریان بکردایە تاوان و خراپەکاریی بەربەست ئەبوو، قورئان لەم بارەیەوە بە روونی ئەمەی باس فەرمووە، ئەوەتا فەرموێ: ﴿واتقوا فتنة لا تصيبن الذين ظلموا منكم خاصة﴾ خۆتان بپارێزن لە سزایەك کە هات تەنها دووچاری ئەو کەسانە نابێت کە گوناهو تاوانەکەیان کردووە.

إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ
(١٥) وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ (١٦) يَعِظُكُمُ
ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (١٧) وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١٨)

ئینجا پلای دڵتەزێنیان لێ ئەدات بەمەی بە بێ بیر کردنەوە ئەو بوختانەتان لە دەمی یەکترەوە وەردەگرت بە بێ عیلم و زانین و لە کاتێک دا بە شتێکی سووک و ئاسانتان دانا و لای خوایش شتێکی گەورەیە وەک ئەفەرموێ: ﴿إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ﴾ سزا هەمووتانی ئەگرتەوە لە کاتێک دا ئەو بوختانەتان بەدەما و دەم لە یەکترەوە وەردەگرت بە بێ زانین و واتان دەزانی شتێکی سووکە و لای خوایش زۆر گەورەیە، بەڵێ بەڕاستی تا بیر بکرێتەوە گەورەیی ئەو تاوانە باشتر دەردەکەوێ. بەڕاستی هەق وابوو بە بیستنی ئەو بوختانە بۆگەنە دڵ بکەوتایەتە لەرزە و دڵی نەهاتایە گوێ ی لێ بگرێ چ جای ئەوە بڵێ. چۆن ئەبێ گومان ببرێ بۆ ئەوەی خوا مارە و مەجال بدا کە پێغەمبەر و ماڵ و خێزانەکەی شتی ئاوا رووی تێ بکات، ئەبوو هەموو موسڵمانان هەڵوێستیان بەم جۆرە بوایە کە قورئان ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ﴾ با کاتێ ئەو قسە بەدەتان بیست بتانگوتایە بە هیچ رەنگ و شیاو و شایستە نی یە بۆ ئێمە و نەئەبوو شتی وا بە دەممان دا بێت و سەرمان سوڕ ئەمێنێ ئەی خوایە لە روودانی شتی وا پاک و بێگەردی ئەی خوایە تۆ پاک و بێگەردی لەوەی شتی وا روویدات لە پێغەمبەرەکەت و ئەمەی کە گوتراوە بوختانێکی گەورەیە. ئینجا پەند و ئامۆژگاری موسڵمانان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ خوا پەند و ئامۆژگاریتان ئەکات لەوەی جارێکی تر و هەرگیز بگەڕێنەوە بۆ وێنەی ئەمەی کە رووی دا و ئەگەر ئێوە باوەڕ دارن، واتە ئیمان و باوەڕەکەتان دژی ئەوەیە کە کردتان. ﴿وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ﴾ خوا ئایەتەکان باس ئەکات بۆتان بە روونی ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خوا زانای کاردروستە و هەموو کاری بەجێ یە، کەواتە هەر ئەبێ پەیڕەوی ئەو بکرێت. ئینجا هەر ئەڕوات لەبارەی بەدیی و خراپی ئەم بوختانە بۆگەنەوە:

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾

**ئەفـــــەرموێ:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ و پێ یان خۆشە کار و کردەوەی پیس و ناشیرین لەناو باوەڕداران بڵاو بێتەوە و لەکەداریان بکەن بەوە و ناوبانگی بەد بکەوێتە شوێنیان، بۆ ئەو بوختان کەرانە هەیە سزای سەخت و ئازار دەر لە دنیا و لە ڕۆژی دوایی دا، سزای سەختیان لە دنیادا بە ئابڕوو بردن و جەڵدە لێدان و لە ڕۆژی دواییش دا بە سزای ئاگری دۆزەخ ئەگەر پێش مردن نەگەڕێنەوە و تۆبەی شەرعی نەکەن. ئەمە بڕیارێك بوو بۆ هەموو بوختان کەران دەربارەی ئەم بوختانە دڵ داچڵەکێنەرەی، غەیری ئیبن و ئوبەی بەو جەڵدە و ئابڕوو بردنە ڕزگار ئەبن، بەڵام ئەو مونافیق بوو بە مونافیقی چووە دەرکی ئەسفەلی دۆزەخ. خوا پەنامان بدات، آمین. ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ خوا زانایە بە هەموو شتێك و ئێوە نازانن. ئەو ئاگای لە هەموو نهێنی و ئاشکرا هەیە، ئایا کێ ئاگا و زانایە بەکار وباری دڵ و دەروونی ئەم ئادەمی یە بێجگە لەو خوایە کە دروستی کردووە؟ ئینجا جارێکی تر موسڵمانان ئاگادار ئەکاتەوە بە فەزڵ و میهرەبانی خوا بەسەریانەوە کە بەو میهرەبانی یە هەمووانی دووچار نەکرد، چونکە تاوانەکە ئێجگار بەد و گەورە بوو، ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەگەر فەزڵ و لوتفی خوا نەئەبوو بەسەرتانەوە،ئەگەر ئەوە نەئەبوو کە خوا ﴿رؤف رحيم﴾ .. نافەرموێ ئەگەر ئەوە نەئەبوو چی ڕووی ئەدا، لەبەر زیادە ترساندنیان و دەربڕینی سامناکی تۆڵەکەیان ئەگەر خوا لوتف و میهرەبانی بەکار نەهێنایە. هەموو سوپاسێ بۆ خوا. ئینجا هەمیتر موسڵمانان وریا ئەکاتەوە بەوەی وریای خۆیان بن و نەکەونە شوێن شەیتان و ئەو تاوانە گەورەیە بە هۆی شوێن کەوتنی وەسوەسە و خەتەرەی شەیتانەوە بوو،

۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ
بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ
وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ
وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾

---

**﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ ئـەی ئەوانەی باوەڕتـان هێنـاوە شوێن هـەنگاوەکانی شـەیتان مەکـەون، واتـە شـوێنی خەتـەرە و وەسوەسـەی شـەیتان، هەرکـەس شـوێنی خەتـەرە و وەسوەسـەی شـەیتان بکـەوێ، بێگومـان دووچاری گوناهو تاوانی بەد و خراپ ئەبێ، چونکە شەیتان هەر فەرمان بەکار و کردەوەی زۆر بەد و خراپ ئەدات. یەکێ لەو کارە زۆر بەدانە ئەو بوختانە دڵتەزێنە بوو. ئەم ئادەمی یە لاوازە و شـەیتان دەیخەڵـەتێنێ ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا﴾ ئەگـەر لوتـف و میهرەبانی خوا نەئەبوو بەسەرتانەوە هەرگیز هیچ کەس لە ئێوە پاك و خاوێن نەدەبوونەوە ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ﴾ بەڵام خـوا مـەیلی کەسێك بکـات پـاك و خـاوێنی دەکاتـەوە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بیسەری زانایـە و ئـەزانێ کـێ شایـستەی ئەوەیـە و دەسـتی میهرەبـانی و لـێ بـوردن ئەهێنێ بەسەر بەندە شیاوەکانی دا و پاك و خاوێنی ئەکاتەوە، خوا بە لوتفی خۆی بێبەشمان نـەکات، آمـین. ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوانەی خاوەن ماڵ و سەروەت و سامانن و پلە و پایەیان هەیە با سوێند نەخۆن بەوەی کە هیچی لێ نەدەن بە خزمەکانیان و نەداران و موهاجیرانی ڕێگەی خوا، با لێ یان ببورن و چاوپۆشی لە گوناهەکانیان بکەن، ئایا پێتان خۆش نی یە کە خوا چاوپۆشیتان لێ بکات لەسەر چاوپۆشیتان لە خەڵکی، خوا خاوەن بەخشین و بە بەزەیی یە بە بەندەکانی. ئەو لوتف و لێ بوردنەی کە سەرنجی ئیماندارانی بۆ ڕائەکێشێ بۆ هەموو کەس نابێ، بەڵکو بۆ ئەوانەیە کە تۆبە ئەکەن لە گوناهی بوختان کردن بۆ ئافرەتە پاك و خاوێنە بێ ئاگاکان کە بە دڵیان دا نەهاتووە کاری بەد و پیس. ئەوانەی کە بە نیازی پیسەوە ئەو بوختانە دەکەن و هەر سوورن لەسەری وەك ئیبن و ئوبەی چاوپۆشی و لێ بوردن نی یە بۆی، ئەوانە قوتار بوونیان نابێ لە سزای تاوانەکەیان لە ڕۆژی دوایی دا و لەو ڕۆژەدا خۆیان شایەتن لەسەر خۆیان وەك ئەفەرموێ:**

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾
يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ
وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ
لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ

---

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ * يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ **بە راستی ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتە پاکەکان کە بێ ئاگان لە کاری پیس و باوەڕداران نەفرینیان لێ کراو لە دنیا و لە رۆژی دوایی دا و سزای گەورەیان بۆ ئەبێ لە رۆژێک دا کە شایەتی ئەدات لەسەریان زمان و دەستیان و لاقەکانیان بەو کردەوە بەدانەی کە لە دنیادا کردیان، کەواتە هیچ پێویست نابێ بە شایەت.**

﴿يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ﴾ **ئینجا قەزا و بڕیاری دەرئەچێ دەربارەیان و تۆڵەیەکی راست و رەوای خۆیان ئەبینن و وەری ئەگرن، ئەو کاتە دەزانن کە هەر خوا هەق و راستە و دەرخەر و روون کەرەوەی هەموو هەق و ناهەقێکە، ئەو تاوان و خراپەی کە کرا لەو رووداوەدا، ئەوەندە گەورە بوو پێویست بوو بەو چەند قۆناغ و هەڵوێستانە بە درۆ بخرێتەوە، لەپاش ئەوە ئینجا بەڵگەی بەهێز دێنێتەوە لەسەر دەلەسەیی ئەو بوختانە پیسە کە ئەفەرموێ:**

﴿ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ﴾ **ئافرەتە پیسەکان بۆ پیاوە پیسەکانە و پیاوە پیسەکان بۆ ئافرەتە پیسەکانە و ئافرەتە پاکەکان بۆ پیاوە پاکەکانە و پیاوە پاکەکان بۆ ئافرەتە پاکەکانە، بەڕاستی بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە، چونکە پاکترین مخلوقی خوا پێغەمبەری ئازیزە، کەواتە دایکی بەڕێزمان عائشة – خوا لێی رازی بێت – ئەبێ**

پاك و خاوێن بێت بە شایەتی قورئان. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ ئەوانە واتە پێغەمبەری ئازیز و هاوسەری بەڕێزی عائشە خاتوون و باوك و دایکی و هاوەڵی بەڕێزی صفوان – خوا لە هەمووان ڕازی بێت – ئەو پاکانە بەرین و بەری کراون لەوەی پیسەکان دەیڵێن و گوتیان دەربارەی پاکەکان و بۆیان هەیە سڕینەوەی هەر گوناهو کەم و کوڕی یەك کە بەسەریان هاتبێ و بۆیان هەیە بەش و ڕۆزی یەکی پیرۆز کە بەهەشتە. ئا بەو شێوە گرنگە دوایی هات مەسەلەی ئەو بوختانە پیسە و گەورەیی و پاکی داکی بەڕێزمان عائشە خاتوون – خوا لیّ ی ڕازی بێت – و خوای میهرەبان پاکی یەکەی گێڕا بە قورئان و ئەخوێنرێتەوە بەسەر بوونەوەر و جیهان و جیهانی یان دا، قوڕ بەسەری ئەوانەی ئەو دایکە بەڕێزەی ناوێ، هەرکەس ڕێزی ئەوی بەلاوە نەبێ نابێ بە تەمای تکا و شەفاعەتی پێغەمبەربێت(ﷺ) والحمد لله رب العالمين.

شتێکی ڕوونە ئیسلام کە دینی حەیاتە و گەل و کۆمەڵی پاك و خاوێن ئەمێنێتە کایە و زەخت و زۆر بەکار ناهێنێ و نایەوێ بە زەخت و زۆر و بە قامچی کارەکە فەراهەم بێنێ، بەڵکو ئەیەوێ بە تەمێ و ئامۆژگاری و پاراستنی لەو شتانەی کە هۆی چەپەڵ بوونی مەردومە، لەبارەی ئارەزووی جنسی یەوە کە شتێکی سروشتی یە دانی پێدا دەنێ و هەستی زامدار ناکات، بەڵکو لە هەمان کات دا ڕێگەی بەرەڵایی تەنگ و تروسك ئەکاتەوە. جا لەبەر ئەوە ڕێزی تایبەتی داناوە بۆ ماڵ و خێزان و خانەوادە و ڕێگە نادات هەرکەس بە ئارەزووی خۆی سەر بکات بە ماڵان دا بە بێ پرس و ئیزن، بەڵکو بەم شێوە ڕەفتار دەکات ئەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە و باوەڕتان هەیە ئەچنە ناو ماڵانێك کە ماڵی خۆتان نی یە، ئەچن هەتا پرس دەکەن بە خاوەنەکەیان و ئینجا سەلام بکەن.

ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٢٧ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن
قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٢٨ لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن
تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ٢٩

ئینجا بەم جۆرە شیرینە سەرنجمان ڕادەکێشێ: ﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ ئەو جۆرە چوونە چاکە بۆتان کە پرس و سەلام بکەن. بەو جۆرە فەرمانتان پێ درا، بەڵکو بیر بکەنەوە و ئامۆژگاریی وەرگرن ﴿فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ﴾ ئینجا ئەگەر کەستان دەست نەکەوت مەچنە ناو ئەو ماڵانە هەتا ئیزن نەدرێن، واتە لەپاش ئیزن خواستن و سەلام کردن، یان کەستان دەست ئەکەوێ لە خاوەن ماڵەکان یان نە، ئەگەر دەستتان نەکەوت نەچن، ئەگەر کەستان دست نەکەوت نابێ هەر لە خۆتانەو مل بنێن و بچن، بەڵکو چاوەڕوانی بکەن ئەگەر ئیزن درا بچن ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ﴾ ئەگەر پێتان گوترا بگەڕێنەوە و وەختمان نی یە ئەوا بگەڕێنەوە و بە بێ دڵگرانی ئەوە پاك و خاوێن ترە بۆتان ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ خوا زانا و ئاگایە بە هەموو کردەوەیەك کە ئەیکەن و وریای خۆتان بن بە پێ فەرمانی خوا کار بکەن. ئەمە یاسایە بۆ ماڵە تایبەتی یەکان.

بە نیسبەت ماڵە گشتی یەکانەوە وەك ئوتێل و میوان خانە و بازاڕەوە ئەوە بەم جۆرەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡۚ﴾ هیچ قەدەغە و ڕەخنەیەکتان لەسەر نی یە لە چوونتان بۆ ناو ئەو ماڵانەی کە جێگەی نیشتەجێی نین و شت و مەکتان هەیە تێ یان دا، ئینجا فەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ﴾ خوا ئاگا و زانایە بەوەی کە دەری ئەبڕن و ئەوەی ئەیشارنەوە. واتە خوا چاودێر و ڕەقیبە بەسەرتانەوە. ئا بەو جۆرە هەموو کار و فرمانەکانمان پەیوەست ئەکات بە زانین و ڕەقابەی خواوە تا بەندەکان سەرپێچی نەکەن.

ئیسلام کە بەرنامەی ژیانە ئەبێ ئەم شتە جزئی و تایبەتی یانەش کە باس کران بە گرنگ بیانگرێ. یەکەم چین کە ئەم قورئانە چوو بە گوێچکەیان دا بە تێرو تەواوی، ئەم فەرمان و

جلەوگیریی یانەیان بەجیٚ هیٚنا و زاتی پیٚغەمبەری خۆشەویست فەرمانبەریی پیٚ کرد. لەم بارەیەوە ئەبو داود و نەسائی ئەم حەدیسە ئەهیٚنن لە ئیبن و عبادەوە کە ئەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) تەشریفی هیٚنا بۆ ماڵمان و فەرموی: السلام علیكم و رحمة الله ئەمیش بە نەرم و ناسکی وەڵامی دایەوە و گوتم ئایا ئیزن نادەن بە پیٚغەمبەر(ﷺ)؟ ئینجا هەمیتر فەرموی: السلام علیكم و رحمة الله، منیش گوتم لیٚ ی گەڕیٚ با سەلامی زۆرمان لیٚ بکات، ئینجا کە وەڵاممان نەدایەوە بە جۆریٚ بیستبیٚتی، ئینجا گەڕایەوە سەعد کەوتە شویٚنی و عەرزی کرد ئەی پیٚغەمبەر من گویٚم لە سەلام کردنەکەت بوو و بە نهیٚنی وەڵامم ئەدایتەوە لەبەر ئەوە سەلامی زۆرمان لیٚ بکەیت، ئینجا تەشریفی هات و سەعد عەرزی کرد خۆی بشۆریٚ و خۆی شۆرد و ئینجا پۆشاکی بۆ هیٚنا کە زەعفەرانی پیٚوە بوو پیٚچای لە خۆی و دەیفەرمو خوایە سەڵات و رەحمەتت بڕیٚژە بەسەر ئالی سەعدی کوڕی عبادەدا. ئینجا ئەدەبیٚکی ترمان نیشان ئەدات، عبدالله ی کوڕی بیشر کە ئەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) کە بڕۆشتایە بۆ ماڵیٚك بەرەو رووی قاپی یەکە نە ئەرۆیشت، بەڵکو لەلای چەپ یان راستەوە ئەوەستا، چونکە لەو کاتەدا پەردە نەبوو بەسەر قاپیەکانەوە بەو جۆرە ئەوەستا تا چاوی نەکەویٚ بە ئەهلی ماڵەکە. هەروەها ئەبو داود ئەم فەرمودە ئەهیٚنیٚ کە پیاویٚك وەستا بەرامبەر قاپی ماڵی پیٚغەمبەر(ﷺ)، پیٚغەمبەریش پیٚی فەرمو یان لای راست یان لای چەپ بوەستە، چونکە پرس و ئیزن خواستن لەبەر نەزەر نەکردنە. لە حەدیسی بوخاری و موسلیم دا هەیە ئەگەر یەکیٚك بە بیٚ ئیزن تەماشای ماڵت بکات ئینجا تۆیش بەردیٚکی تیٚ بگری چاوی کویٚر بکەیت هیچ گوناهیٚکت لەسەر نی یە. ئا بەو جۆرە ئەو گەل و کۆمەڵە پاك و خاویٚنە پیٚك هیٚنرا کە تاقانەیە لە میٚژوودا و بەدی هیٚنانی ئەم ئادابە لە گەلٚ ماڵی برا و خزم و کەسەکانیش دا ئەبیٚ بەکار بهیٚنریٚ، حەدیس و هەواڵی تریش هەیە و بە پیٚویستم نەزانی هیٚنانیان، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ ئیٚمە زۆر دوور کەوتووینەتەوە لەو ئادابە شیرینانە، تەنانەت دەربارەی بیٚگانە بیٚ شەرمەکانیشەوە بە بیٚ لیٚپرسینەوە و جیاوازی سەر ئەکریٚ بە ماڵان دا، زۆر بە داخەوە!! ئیتر با باسی ئەوە نەکەین کە ئەگەر یەکیٚ با پرسیش بکات و پیٚی بڵیٚت وەختمان نی یە ئەوە هەر نایبڕنەوە و ئەبیٚ بەهۆی رق و کینە، خوا بە میهرەبانی خۆی روومان بکە ئەو شتانەی کە هۆی رەزامەندی تۆن آمین.

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾

---

ئینجا لەپاش لێ بوونەوە لەو باو و ئەدەبە شیرینانە کە بۆ پاراستنی روودانی نەزەر و تەماشا کردنی ناشەرعی یە لە و کاتە تایبەتی یانەدا، لەپاش ئەوە ئینجا بە شێوەی گشتی تەماشا کردنی بێ شەرعی قەدەغە ئەکات و ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بە پیاوە ئیماندارەکان چاو داخەن لە نامەحرەم و نافەرموێ چاوتان بنوقێنن لێ یان، چونکە ئەتوانین لەناو نامەحرەمەکان دا دانیشین و هیچ تەماشاشیان نەکەین. چاو داخەن و گیان و عەورەتیان بپارێزن لەکاری بێ شەرعی، ئینجا بەپێی باوی شیرینی خۆی سەرنج رائەکێشێ بۆ فەرمانبەریی و دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ﴾ ئەو سەرنج نەدان و خۆپارێزی یە چاکە بۆیان و سوودی بۆ خۆیان هەیە، ئینجا ئەیانترسێنێ بە رەقابە و چاودێریی خوا بەسەریانەوە و ئاگاداریی خوا پێ یان، کەواتە با شەرم بکەن لە خوا و بترسن لە سزا و تۆڵەی، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ بێگومان خوا بە خەبەر و ئاگایە بە هەر کارو کردەوەیەك کە دەیکەن و ئەنجامی دەدەن. بەو جۆرە فەرمانی دا لەبارەی پیاوەکانەوە، ئینجا دەربارەی ئافرەتەکانیش دەفەرموێ: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بە ئافرەتە باوەڕدارەکانیش چاویان داخەن لە تەماشا کردنی نامەحرەمان و ناموس و عەورەتیان بپارێزن لە داوێن پیسی و زینا و خۆیان بپارێزن و قەدەغەی بکەن. بێجگە لە رێگە شەرعی یەکە کە ئارەزووە سروشتی یەکەیان جێ

بەجێ ئەکات و هیچ لەکە و تانەیەکیش ڕوویان تێ ناکات و منداڵی ڕاستەقینەی خۆیان بەخێو دەکەن. هەرکارێکی سروشتی ئیسلام هەرگیز قەدەغەی نەکردووە و نایکات بەڵکو فەرمان ئەدات بە بەجێ هێنان و ئەنجام دانی، بەڵام بەپێی ئەو بەرنامە شیرینە کە دیاریی کردووە. کاری ژن و مێردیی بە تایبەتی زۆر زاڵە لە ئیسلام فەرمانی پێ ئەدات و بەڵێن ئەدات کە عیبادەتە و ئەجرو پاداشتی لەسەر وەرئەگیرێ ئەگەر لەسەر ئەم بەرنامەیە ئەنجام بدرێ کە دەست نیشانی بۆ کرا. ئەگەر لەسەر ئەو بەرنامە بێت ڕووخێنەری ئادەمی نی یە. هەرکەس شارەزا بێت لەبار و حاڵی ئەو وڵاتانەی کە ڕووتی و بەرەڵایی ڕەوا دراوە و بە وێنەی کەر و گا و ئاژەڵ ڕێ یان لێ نەگیراوە، هەرکەس ئەو وڵاتانە ببینێ باش بۆی دەرئەکەوێ ئەو بەرەڵا کردنە تا بێت بۆگەن تر چەپەڵ تر بووە و چڵێسی بەتین تر بووە، لەو وڵاتانەدا زوڵمی گەورە لە ئافرەت کراوە، چونکە تا بەکار هاتووە بەکاریان هێناوە و لەپاش ئەوە کەس نایەوێ و ناچارە بە ئاشکرا شەگ ئەنێ لە خۆی و بەوە ئارەزووی ژن و مێردیی یەکەی چارەسەر ئەکات!! ئای هاوار بۆ ئافرەتی بەش براو کە کارگەی مرۆڤە!!

﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ﴾

---

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سایەی ئایەتەکان کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ با زینەتی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ ئەوەی کە لە کاتی کار و فرمانی ئاسایی وەك نان خواردن و ئیش و کاری ناوماڵ و بەجێ هێنان بۆ ئەوە دەرخستنی قەدەغە نی یە، شتێکی روونە کە ئافرەت بە سروشت حەز لە جوانی دەکات و پێی خۆشە جوان بێت، جا لەبارەی ئەو زینەتەوە رای زانایان دوو جۆرە هێندێ ئەفەرمون مەبەست خشڵ و زێوەرکەیە وەك ئەنگوسیلە و بازن کە دەرئەکەون. هێندێ ئەفەرمون مەبەست جێگای زینەتەکەیەوە هەردوو دەست تا جومگە و قاچ و قولە پێ‌ی، بەهەرحاڵ رواڵەتی ئایەتەکە وا نیشان ئەدات مەبەست خشڵەکانە و بەهەرحاڵ لەسەر هەر بار سەرنج دانەکە قەدەغەیە و نابێ نامەحرەم سەیریان بکات، واتە هەر خشڵ و جێگە خشڵێك کە دروست بێت ئافرەت دەری بخات نامەحرەم دروستە سەیری بکات ئەگەر ئەمین بێت لە فیتنە و سەرکێشان بۆ کاری ناڕەوا و بی 'شەرعی. بە بەڵگەی ئەوە حیجاب تایبەتی یە بە دایکی ئیماندارانەوە ئەبێ ئافرەتانی تر دروست بێت دەرخستن و نەشاردنەوەی دەم و چاو و هەردوو لەپی دەست، بۆ ئافرەتان دروستە دەرخستنیان بەڵام پیاوە نامەحرەمەکان ئەبێ چاو داخەن وەك لە تەفسیری ئایەتەکەدا وتمان. پۆشاك زینەت و جوانی یە و خوای میهرەبان منەتمان بەسەردا دادەنێ بەوەی پۆشاکی بۆ دانایین ئەوەتا ئەفەرموێ ﴿لقد انزلنا إليكم لباسا يواري سوآتكم وريشا﴾ ئەوەتا هۆی پۆشاکی کردووە بە دوو هۆ یەکەم داشاردنی عەیب و عەورەت، دووەم: ئارایشت کردن و زینەت دار کردن، کەواتە بە شایەتی دانی خوا پۆشاك هۆی جوانی ئارایشتە و رووتی و بەرەڵایی هۆی ناشیرینی یە و هەرکەس رووتی و بەرەڵایی بە جوان و شیرین دابنێ ئەوە نەخۆشە و فیترەتی تێك چووە بە

وێنەی کەسێکی سەفراوی کە تاڵ بە شیرین دائەنێ و شیرین بە تاڵ. خوا بە میهرەبانی خۆی سروشتە ئادەمی یەکەمان دامەزراو بکات، ئای چەندە جوان و شیرینە ئەم پۆشاکە شیرینەی کە ئەمڕۆ ئافرەتە ئیماندارەکان دەی پۆشن و بەناویانگە بە حیجاب!! یاخوا ئەو ئافرەتە ئیماندارانە زۆرتر و دامەزراو تر بکات، واجبی سەرشانی ئەو خوشکانە ئەمەیە هەوڵ بدەن بە حیکمەت و ئامۆژگاری شیرین رۆڵە و کچەکانی موسڵمانانی کوردستان رزگار بکەن لە ناشیرینی و بە دوادا گەڕانی ناشیرینی و دوور خستنەوەیان لە ئاگری دۆزەخ و فێری ئادەمێتی یان بکەن. چونکە ئێمەی موسڵمان ئەبێ خۆیشمان چاك بکەین و خەڵکی تریش.

ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکە کە بە لامەوە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەو حیجابەی کە فەرز بووە لەسەر دایکی ئیمانداران فەرز نی یە لەسەر ئافرەتە موسڵمانەکانی تر کە فەرمانی گشتی ئەدات، ئەفەرموێ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ با چارشێوەکانیان دادەنەوە بەسەر قەد و ملیان دا، کەواتە بێجگە لە قەد و ملیان دەم و چاویان دانەپۆشن قەی ناکات و خەڵکی نامەحرەم واجبە سەرنجیان نەدەن. بێجگە لەوە دەقی فەرمودەی پێغەمبەری ئازیز(ص) هەیە کە فەرموی بە أسماءی کچی أبوبکر – خوا لێ یان رازی بێت – هەرکاتێك ئافرەت باڵغ بوو نابێ بێجگە لە دەست و دەم و چاو ببینرێ. بە تەواوی ئەو کەسانە دیاریی ئەکات کە حەلاڵە بۆ ئافرەت سەرنجیان بدات ئەوانەش نابێ زیاد لە بەینی ناوك و ئەژنۆ سەیر بکات بێجگە لە مێرد کە دروستە تەماشای هەموو لەشی بکات تەنانەت عەورەتیشی، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ با زینەتەکەیان دەرنەخەن مەگەر بۆ مێردەکانیان بەو جۆرەی کە باسمان کرد کە ئەمان هەموو لەشیان دروست و بۆ باقی تر مابەینی ناوك و ئەژنۆ نەبێت قەیناکات ﴿أَوْ ءَابَآئِهِنَّ﴾ یان بۆ باوکیان ﴿أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یان باوکی مێردەکانیان ﴿أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ﴾ یان کوڕەکانیان ﴿أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یان کوڕی مێردەکانیان ﴿أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾ یان براکانیان ﴿أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾ یان کوڕی براکانیان ﴿أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ﴾ یان کوڕی خوشکەکانیان ﴿أَوْ نِسَآئِهِنَّ﴾ یان ئافرەتانی خۆیان، واتە موسڵمانان، نەك ئافرەتی ناموسڵمان کە لەوانەی باسیان بکەن لای پیاوە ناموسڵمانەکان و ببن بەهۆی فەساد و خراپە،

أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّـٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟
عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ

---

﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُنَّ﴾ یان ئەو كەنیزەكانە كە موڵكیانن نەك عەبدەكان كە بەلای زۆربەوە وەك بێگانە وان. بەڵێ هێندێ ئەفەرمون: عەبدەكانیش قەی ناكات لەبەر ئەو حەدیسەی كە ئەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی چوو بۆ ماڵی فاطمة – سەلامی خوای لێ بێت – لەگەڵ عەبدێك كە پێی بەخشی بوو، فاطمة پۆشاكێكی لەبەردا بوو ئەگەر سەری داپۆشی بایە قاچی دەرئەكەوت و ئەگەر قاچی داپۆشی بایە سەری دەرئەكەوت، پێغەمبەریش پێی فەرمو قەیناكات لێرەدا هەر باوكت و عەبدەكەت هەن. بە پێی ئەم حەدیسە كەنیزەك و عەبد فەرقیان نی یە و مەحرەمن. ﴿أَوِ ٱلتَّـٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ﴾ یان ئەو پیاوانەی كە پێویستی یان بە ئافرەت نی یە و شوێن كەوتوون وەك ئەو پیاوە پیر و پەك كەوتووانە یان ئەو پیاوە گێلانە كە هیچ نازانن و بەدوای خۆراكێك دا ئەگەرێن ﴿أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ﴾ یان ئەو منداڵە ساوایانەی كە بێ ئاگان لە عەورەتی ئافرەتەكان و هەرچی یان بینی نازانن باسی بكەن. ئەوا لەم ئایەتەدا بە روونی ئەوانەی كە حەلاڵ بێت سەرنج دانیان باسی فەرمو و كورتی هەڵهێنان هەر لەوانەدا كە باس كران. هەزار جار قوڕ بەسەر موسڵمانانی ئەمڕۆ كە سەرنجی ئافرەتان ئەدەن یەكسان و بە بێ جیاوازی مەحرەم و نامەحرەم، فلا حول ولا قوة إلا بالله. نەك سەرنج دان بەڵكو ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾ با ئافرەتان پێ یان نەكوتن بە زەوی دا بە توندی و تا بەهۆی ئەوەوە بزانرێ بەو خشڵ و پارانەی كە ئافرەتان ئەیپۆشن و بەهۆی ئەوەوە مەیلی دڵ پەیدا ئەبێت بۆیان، واتە خشڵ و زێوەرەكەیان كە دایانشاردوون و نین بە دەرەوە با كارێكی وا نەكەن بەهۆی ئەو پێ كوتان بە زەوی یەدا پێ یان بزانرێ. بێگومان عەتر و شتی بۆن خۆشیش هەیە سەرنج راكێشە و هەروەها هێندێ پۆشاكی زرق و بریقەدار هەر بەو جۆرەیە. با بڵێین هەزار جار قوڕ بەسەر موسڵمانانی ئەمڕۆ. ئینجا لە كۆتایی دا فەرمان ئەدات بە گەڕانەوە و تۆبە كردن،

وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ
وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾

**ئەفەرموێ:** ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ **ئیماندارەکان تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا هەمووتان بەڵکو بگەن بە ئامانج و خۆش بەختی لە هەردوو جیهان دا، خوای میهرەبان رووی دڵمان بکەرە قاپی یەکەت آمین.**

**لەپاش ئەوەی بە توندی شەڕوالْ پیسی و ئەو شتانەی کە هۆی ئەوەن و راکێشەرن بۆی، ئەو شتانەی قەدەغە کرد، ئینجا فەرمان ئەدات بە نیکاح و خواستن و شوو کردن کە چارەسەری پاك و خاوێنن بۆ بەجێ هێنانی ئەو کارە سروشتی یە، ئەفەرموێ:** ﴿وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ﴾ **ژن بدەن بە پیاوە بێ ژنەکانتان و ژنە بێ مێردەکانتان بدەن بە شوو ئەی حوڕ و ئازادەکان، ژن بدەن بە عەبدە ساڵحەکانتان و کەنیزەکە ساڵحەکانتان بدەن بە شوو ئەوانەیان کە ساڵح نین کە زۆربەیان بەو جۆرەن شایستەی ئەوە نین بە گرنگ بگیرێن لەبەر ئەوەی فەقیرن لەوانەیە ببێ بەهۆی ژن پێ نەدان یان نەخواستن و نەهێنانیان. لەبەر ئەوە فەرمان ئەدات کە گوێ یان نەبێ لەو فەقیری و نەبوونی یە، چونکە** ﴿إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ **ئەگەر ئەوانە فەقیر و بێ نەوا بن بە لوتفی خۆی بێ پێویستی یان دەکات** ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ **خوا فراوانە و دەسەڵاتی هەیە هەموو کەس بێ پێویست بکات و زانایە بە فراوان کردنی ماڵ و رۆزی بە هەرکەسێك کە شیاوی ئەوە بێت بە پێی حیکمەت و کاردروستی خۆی، ئینجا فەرمان ئەدات بە کۆمەکی بێ نەوایان بۆ بە شوو دان و ژن هێنان بە فەرز دانانرێ، بەلأم لە راستی دا ئەبێ فەرز بێت، چونکە ئەوانەی کە پێویستن بەکاری ژن و مێردی ئەگەر چارەسەر نەکرێن دووچاری زینا و داوێن پیسی ئەبن و پێویستە موسڵمانان بەرگری ئەوە بکەن، بێجگە لەوە ئیسلام نیزامێکی تێرو تەواوی متکاملە نابێ واز لە خەڵکی بێنێ داماو پەك کەوتە بن.**

﴿وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغۡنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ﴾

بەڵێ ئیسلام لەو بارەیەوە بەو جۆرە فەرمان ئەدات کە موسڵمانان هەڵسن بەو برایەتی و دەستەبەرەیی یە و ئەگەر هەڵنسان بەو ئەبێ بێ نەواکان خۆیان بپارێزن لەکاری بێ شەرعی وەك دەفەرموێ: ﴿وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغۡنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ ئەوانەی کە ئەرکی ژن هێنانیان نییە بە دوای پاك و خاوێنی دا بگەڕێن و خۆیان بپارێزن لە داوێن پیسی تا خوا بێ پێویستیان دەکات بە لوتف و میهرەبانی خۆی، بێگومان مێژوو شایەتە کە هەر لە کۆنەوە مەسەلەی عەبدایەتی بە پیس ترین شێوە و پەیوەندی بووە بە کۆمەلآیەتی و ئابووری یەوە و هیچ کەس نەبووە ڕەخنەی بووبێ دەربارەی، ئیسلام کە هات نەئەگونجا لە ڕێوە و یەکسەر قەدەغەی بکات، چونکە بە ئەم ئەوە پێك نەدەهات و تەرەفی بەرامبەر ڕەوای نەدایە، جا لەبەر ئەوە چەند وەسائیلی دانا بۆ نەهێشتنی وەك لە چەند شوێنێك دا بە درێژیی باسمان کرد. یەکێ لە هۆی ئازاد کردن ئەمە بوو لەگەڵ بەندەکەدا مامەڵەیان دەکرد لەسەر ئازاد کردنی بە ئەندازەیە پارە و پول کە بەرە بەرە بیدات بە خاوەنەکەی لەپا ش تەواو بوونی ئەو ئەندازەیە ئازاد ئەبوو و پەشیمان بوونەوە نەبوو لەو مامەڵەیە، ئەویش پێی ئەگوترا: مکاتبة و وەجبەکان پێ یان ئەگوترا نجومی کتابەت. جا لێرەدا بە بۆنەی ئازاد کردنەوە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗا﴾ ئەوانەی لە عەبد و کەنیزەکانتان داوای ئازاد کردن بەو جۆرەی کە باس کرا مامەڵەیان لەگەڵ بکەن ئەگەر لاتان وابوو خێریان تێدا هەیە، بەم ڕەنگە موسڵمان بن و لەپاش ئازاد بوونەکە بتوانن خۆیان بژێنن بە کەسابەت نەك ببن بە ئەرك بەسەر خەڵکی یەوە، ئینجا ﴿وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ﴾ لەو ماڵەی کە خوا پێی داون بەشیان بدەن، ئەوەش ئەوەیە یەك لەسەر هەشتی زەکات تەرخان بکەن بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە کە تەنها تەرخان کردنی ئەوە بەس بۆ ئازاد کردنی هەموو بەندەکان و بەوە بەندایەتی نامێنێ، چونکە یەك لەسەر هەشتی هەموو زەکات تەرخان بکرێ بۆ ئەوە بە هەر قیمەتێ بێ خاوەنەکانیان ڕازی ئەبوون!!

﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ پیس ترین شێوەی بێ شەرەفی و بێ ناموسی ئەوە بوو کە زۆریان ئەکرد لە کەنیزەکەکان لەسەر زینا کردن لەگەڵ خەڵکی دا و کرێ یەکەی خاوەنەکەی وەری ئەگرت. لەو بارەیەوە سەرۆکی موونافیقەکان ئیبن و سەلول شەش کەنیزەکی هەبوو بە زۆر ئەیدان بە خەڵکی زینایان لەگەڵ بکەن و کرێکەیان بدەن بەو موونافیقە. ئینجا لێرەدا پرسیارێکە ئایا ئەگەر زۆریان لێ نەکەن و بە ئارەزووی خۆیان بێ قەیناکات؟ بێگومان بەهەر حاڵ هەر کارێکی پیسە و زینایە، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: مەبەست لە وتەی ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ بێزاری دەربڕین و پلار دانە لەو کەسانەی ئەو کارە بێ ناموسی یە دەکەن، واتە ئافرەت بە سروشت ئارەزووی کاری جنسی بەهێزترە و بە تایبەت کەنیزەکان کە بە دیل گیراون و لەناو کۆمەڵ و گەلی بێ بڕوادا پەروەردەیەکی نەفامی کراون، ئەوانە بیانەوێ و بەدوای داوێن پاکی دا بگەڕێن بەڕاستی ئەوپەڕی بێ ناموسی و بێ شەرەفی یە بۆ خاوەنەکانیان کە بیانەوێ ئەو کارەیان پێ بکەن. وێنەی ئەم ئایەتە لە قورئان دا زۆرە بۆ نموونە: ﴿أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ﴾ دەی نابێ ئەمە مەبەست بێت رەوایە بڕیاردانی بت پەرستی لەگەڵ خوا پەرستی دا، نموونەیەکی تر ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ﴾ بێگومان وتەی ﴿لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ﴾ بۆ بێزاری دەربڕین و پلار دانە لە نەفامەکان کە چۆن بە بێ بەڵگە بت پەرستی رەوا ئەدەن؟! مەبەست ئەوە نی یە ئەگەر دەلیل و بەڵگەیان هەبێت قەیناکات. وەڵامی تریش دراوەتەوە بەڵام ئەم وەڵامە بەهێزە و پێویست نی یە بە وەڵامی تر.

لِيَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ
إِلَيْكُمْ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾

---

ئینجا تەشەرێکی تریان لێ ئەدات کە ئەفەرموێ: ﴿لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ زۆریان پێ مەهێنن بۆ ئەوە و بە نیازی ئەوە شتێکی کەمی دەست کەوتی ژیانی ئەم دنیایە، بەڕاستی هەرکەس بێ بەش نەبێ لە قام و ژیریی خۆی بێ بەش ناکات لە ناز و ڕێزی بێ وێنەی نەبڕاوە لە پێناوی دەست کەوتێکی کەم کە بە زویی نامێنێ و لەناو دەچێ. ﴿وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەرکەس زۆر لەوانە بکات و بە زۆر ئەو کارە بەدەیان پێ بکات بێگومان لەپاش خوا ئەو زۆر پێ هێنانە لێ بوردەی میهرەبانە لەو داماوە زۆر پێ هێنراوانە.

لەپاش ئەو ئاداب و ئەحکامانەی کە تێپەڕیان کرد لە سەرەتای سورەتەکەوە تا ئێرە ئەو ئاداب و ئەحکامانەی تر لە پاشی دێن، لەپاش ئەوانە ئەم ئایەتە سەر بەخۆ ئەمێنین بۆ روون کردنەوەی راستی و گرنگی ئەوەی کە لەو ئایەتانەدا هات و دێت تا سەرنج راکێشێ بۆ فەرمانبەریی و رەفتار پێ کردنیان و لەسەرەتای ئایەتەکەوە سوێند دەخوات و ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾سوێندبەخوا هێناومانەتە خوارەوە چەند ئایەتێك کە روون و روون کەرەوەیە بۆ ئەوەی ئێوە پێویستتن پێ ی و هێناومانەتە خوارەوە چەند وێنە و نموونەیەك لە وێنەی ئەوانەی کە پێش ئێوە هاتن و تێپەڕیان کرد، کەواتە بەسەرهات و ڕووداوی دایکمان عائشة – خوا لێ ی رازی بێت – وێنە و نموونەیە بۆ بەسەرهاتی یوسف و مەریەم، هەروەها هێنامانە خوارەوە پەند و ئامۆژگاری بۆ لەخوا ترس و خۆپارێزەرەکان کە بیکەن بە چرایەك بۆ خۆیان تا بەهۆی ئەوەوە خۆیان بپارێزن لەهەر شتێ پێویستە خۆپاراستن لێ ی، بۆ وێنە لە بەجێ هێنانی ئەحکام و بڕیارەکانی خوادا سستی نەکەن وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ﴾ یان لەبارەی بوختانە پیسەکەوە لە خۆیانەوە نەکەونە شوێنی هەر شتێ کە بیبیستێ، بەڵکو بەو جۆرە رەفتار بکەن کە لە ئایەتەکان دا فەرموی: ﴿لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ﴾ بەڵێ ئایەتەکانی قورئان لە هەموو بارێکەوە وەك ئێرە رێك و پێك و پەیوەستن و ئەو سیفەت و بەرهەمانە هەر هەن بەڵام پەیوەست کردن لە هەموو شوێنێك دا بە مەبەستی شوێنە تایبەتی یەکەوە زۆر شیرینە نسأل الله الهداية و التوفيق آمين.

﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ (٣٥) فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ

---

وەك بەدوای ئەم ئایەتانەدا ئەم وێنە و چیرۆکە ئەهێنێ و ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەم فەرموودەیە بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە و لەناو ئەوانەدا فەرموودەی ئیبن و عەباس لەدڵ دا جێگیر ترە کە ئەفەرموێ: ﴿هادی أهل السموات و الأرض﴾ ڕێنموونی کەری ئەهلی ئاسمان و زەوی یە، چونکە هەموو بە نورەکەی ئەو ڕێنموونی وەرئەگرن و بە هیدایەتەکەی ئەو ڕزگار ئەبن لەسەرگەردانی و گومڕایی. چیرۆك و وێنەی زۆر بەهێز بۆ حاڵی بوون لە چۆنێتی ئەو شتانە کە بە ژیریی ئەزانرێن و بەچاو نابینرێن، جا لەبەر ئەوە لە قورئان دا چیرۆك و وێنە زۆرە، جا لێرەدا ئەم چیرۆکە ئەهێنێ کە بەهێزی و گرنگی ئەو هیدایەت و ڕێنموونی یەمان حاڵی ئەکات، لەپاش ئەوە تاریکی و سەرگەردانی ئەخاتە بەرچاومان، ئەفەرموێ لێرەدا: ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ﴾ سیفەت و ڕێنموونی و هیدایەتە کە ﴿كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ﴾ وەك ڕووناکی چرایەکی گەورە وایە کە لە تاقێك دا دیوە دەر نەبێ، کەواتە هەموو ڕووناکی یەکە کۆ ئەبێتەوە ئینجا ﴿ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ﴾ چراکەش لەناو شوشەیەك دا بێت، ئینجا ﴿ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ﴾ ئەو شوشەش وەك ئەستێرەیەکی درەخشانە، ئینجا ئەو چرایەش ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ﴾ ڕۆن و سووتەمەنی یەکەی لە ڕۆنی درەختێکی زەیتونی پیرۆزە و ئەو درەختەش، ﴿لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾ نە بەرەو ڕۆژهەڵات بێت کە خۆری ئێوارەی لێ ناکەوێ و نە بەرەو ڕۆژئاوایش بێت کە خۆری بەیانی لێ ناکەوێ، بەڵکو هەمیشە بە ڕۆژدا تیشکی خۆری لێ ئەکەوێ، کەواتە زەیتەکەی خالص و بەهێزە تا ئەو ڕادەیە ﴿يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ﴾ نزیکە ڕۆنەکەی

ڕووناکی بدات با ئاگریشی لێ نەکەوتبێ ﴿نُورٌ عَلَىٰ نُورٍ﴾ ئەو هیدایەت و ڕێنموونی یە کە قورئانەکەی پێ ناردووە نوور و ڕووناکی یەکی گەورە و گرنگە کە لەسەر نوورێکی گرنگ بە چەند چەندانە، بەڵام هەرچەند بەو جۆرەیە دەست کەوتی هەموو کەس نابێت، بەڵکو دەست کەوتی کەسێ ئەبێت کە شایستە بێت بۆی، ئەوەش بە پێی کاردروستی و لێزانی خوا وەك ئەفەرموێ: ﴿يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ﴾ خوا ڕێنموونی ئەکات بۆ ئەو نووری خۆیە هەرکەسێك کە خوا خۆی بیەوێ، کەواتە ئەبێ بەندەکانی خوا هەر چاوەڕوانی دەستە میهرەبانی یەکەی خوا بن، خوا بەشدارمان بکات لەم نورەدا، ﴿وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ﴾ خوا چیرۆك و وێنە نایابەکان باس ئەکات لەبارەی هیدایەت و ڕێنموونی یەکانی یەوە بۆ خەڵکی ئەوەتا شتێکی کە ژیریی ئەیزانێ لە شێوەی شتی هەست پێ کراودا بینرا و دەری ئەخات تا تێ بگەن، جا لەبەر ئەوە هیدایەت و ڕێنموونی یەکەی بۆ دەرخستین کە قورئانی پێ هاتووە و بۆی دەرخستین بە نوور و ڕووناکی چرای تاقەکەدا کە باس کرا، ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ خوا زانا و ئاگادارە بە هەموو شتێك و زانینی ئەگات بە هەموو شتێك دا. لەپاش ئەوەی بەو شێوە گرنگ و نایابە باسی نوور و هیدایەتی خۆی کرد و ئەو نوور و هیدایەتە هەرچەند ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام دەست کەوتی هەموو کەس نابێت، بەڵکو هەر دەست کەوتی شیاو و شایستەکان دەبێت، ئەوا لەپێشەوە باسی شایستە خوا پێداوەکان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ﴾ لە چەند ماڵێك دا کە خوا ئیزنی داوە بەرز بکرێتەوە و زیکری خوایان تێدا بکرێ، ئیتر ئەو ماڵانە دیاریی کراون وەك کەعبە لەسەر دەستی ئیبراهیم و ئیسماعیل دا کران یان قودس کە لەسەر دەستی داود و سولەیمان دا کران، هەروەها مزگەوتی قوبا و مەدینە کە لەسەر دەستی پێغەمبەردا دروست کران. مەبەست ئەو مزگەوتە تایبەتی یانە بێت، یان مەبەست هەموو مزگەوتەکان بێت وەك لە ئیبن و عەباسەوە هاتووە بە هەر جۆر مەبەست بێت،

يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ
وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟
وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ

---

﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ * رِجَالٌ﴾ چەند پیاوان عیبادەت و تەسبیحی خوا ئەکەن تیٚ یان دا بە بەیانیان و ئێواران دا کە ﴿لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ کە هیچ کڕین و فرۆشتن و بازرگانی یەك خەریکیان ناکات لە یاد و زیکری خوا و ﴿وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ﴾ بەجیٚ هێنانی نوێژ بە رێك و راستی و زەکات دان لە ماڵەکانیان بە پیٚی ئەمری شەرع. بێگومان ئیسلام کە دینی ژیان و جیهانە رەوای هەموو کار و کردەوەیەکی چاك ئەدات و فەرمانی پیٚ ئەدات، بەلاٚم ئەبێت ئەو کەسابەت و بازرگانی یە خەریکیان نەکات لە عیبادەتی خوا، چونکە خوا ئەم بوونەوەرەی بۆ بەندەکانی دروست کردووە ئەبیٚ ئێمە بە شەرعی هەوڵ بدەین بۆ دەست کەوتنی هەموو خێرو بێرەکانی و ئەوەشمان بە عیبادەت بۆ حیساب دەکریٚ. ئینجا ئەو کردەوەو عیبادەتانە کە ئەیکەین ئەبیٚ بەم نیاز و مەستەوە بێت کە ئەفەرمویٚ: ﴿يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ﴾ مەترسی ئەکەن لە هاتنی رۆژیٚ کە لەو رۆژەدا دڵەکان ئەکەونە دڵە تەپە و چاوەکان لە ترسان حەوارە ئەبن و گلێنەکانیان ئەوەستن، ئەو ئیماندارانە ئەو کردەوە چاکانە دەکەن ﴿لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ لەبەر ئەوە و بە ئومێدی ئەوە خوا پاداشتیان بداتەوە بە چاکترین پاداشتی کردەوەکانیان کە پاداشتی ئەولای خوارووەکەی بە دە قاتە تا حەفتا و تا حەوت سەد و هەروەها، بە بیٚ حیساب، بێجگە لەوە بە لوتف و فەزڵی خۆی بە چەند شت کە بەدڵیان دا گوزەری نەکردوە چۆنێتی و چەندێتی،

وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾

---

﴿وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ خوا مەیلی هەرکەس بکات بە بیٚ حیساب و ژمارە، واتە بێجگە لە ئەجرو پاداشتی و کردەوەکانیان ئەو لوتف و میهرەبانی یانەشیان لەگەڵ ئەکات، لەڕاستی دا ئەجرو پاداشتی کردەوەکانیشیان هەر لوتفە، چونکە هەموو کردەوە چاکەکانیان بە رێنموونی و تەوفیقی ئەوە و هەمووی بەهۆی ئەو نوور و رووناکی یەیە کە قورئانەکەی سەرچاوەیە بۆی. چاکان و پاکان بەرهەمی کردەوەکانیان بەو جۆرەیە، بەڵام بیٚ باوەڕان هەر کردەوەیەك بکەن کە بە رواڵەت چاك بێت وەك دەست گیرۆیی هەژاران و هەر کارێکی تر هیچ سوودێکی لیٚ وەرناگرن، بەڵکو بە چیرۆك بیٚ نرخی و بیٚ سوودی یەکەیان ئەخاتە بەرچاو کە ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً﴾ ئەوانەی کە بیٚ باوەڕن کردەوەکانیان کە بە چاك سەیر ئەکریٚ بە وێنەی سەرابێکە لە دەشت و بیابانێك دا کە تینوو بە ئاوی دەزانیٚ بەهۆی تیشکی خۆرەوە لە کاتی گەرمادا لە پێش چاوی وەك ئاوی جاری دەبینیٚ و هەر ئەڕوا و نایگاتیٚ. ئەم یەکەم چینە کە ئەم قورئانەی چوو بە گوێچکەدا لە دەشت و سەحرای گەرمی عەرەبستان دا ئەژیان و ئەوەیان دیبوو و ئەیانناسی، جا ئەو بیٚ باوەڕانە بیٚ بەشن لە ئەجرو پاداشت بە وێنەی بیٚ بەشی ئەو تینوانە و بەدوای دا ئەڕۆن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا﴾ هەتا دێتە لای ئەوەی کە بە ئاوی دائەنیٚ یان شوێنەکەی دەست ناکەویٚ، بەهیچ شتیٚ و بۆی دەرئەکەویٚ کە هیچ نی یە و هەر هیچە، ﴿وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ﴾ ئینجا ئەو بیٚ باوەڕە کە بە تەمای ئەوەیە کاتیٚ زیندوو ئەکرێتەوە لە رۆژی دوایی دا لەوێدا خوای دەست ئەکەویٚ و حوکم و بڕیاری ئەو دەبینیٚ ﴿فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ ئینجا خوا بڕیار و حیسابی بە تەواوی جیٚ بەجیٚ دەکات و بەجیٚی ئەهێنیٚ، کەواتە ئەو سیاچارانە زیانبارن، هەر ئەوە نی یە کە ئەجرو پاداشتیان نی یە، بەڵکو تۆڵە و سزاشیان هەیە، سزای دۆزەخ – خوا پەنامان بدات – آمین. پاشەرۆژی ئەوانە بەو جۆرە ئەبیٚ، یان بەرامبەر نوور و رووناکی چاکان و خوا پێداوان کردەوەکانی ئەمان

أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا

---

**﴿أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ﴾ یان بە وێنەی تاریكایی یانێكە لەناو دەریایەكی قوڵ دا كە شەپۆل دابێتی بەسەری دا لەسەر ئەو شەپۆلەوە شەپۆلی تر هاتبێ بەسەری دا و لەسەر ئەوەیشەوە هەور بەسەری یەوە بێت كە ئیتر لەوە تاریكتر نی یە، چونكە ﴿ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ﴾ ئەوانە چەند تاریكی یەكن چین چین و تەبەق لەسەر تەبەق تاڕادەیەك ﴿إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ﴾ ئەگەر دەست دەربێنێ كە پەیوەستە بە خۆیەوە نزیك نی یە لەوەی ببیبینێ!! ئینجا بەدوای ئەو چیرۆكەدا ئەم رستەیە ئەهێنێ ﴿وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾ هەركەس خوا رووناكی بۆ بڕیار نەدابێ بەهیچ جۆر رووناكی نابێ، واتە بێ بەش ئەبێت لە رێنموونی قورئان. ئینجا رووی فەرموده ئەكاتە پێغەمبەر(ﷺ) كە خوا رشتوویەتی بەسەری دا بەرز ترین رادەی نور و بەدوای شێوەی كوفر و گومڕایی و تاریكی لە جیهانی ئادەمی دا بە دوای ئەوەدا شێوەی ئیمان و رێنموونی و نوور نیشان ئەدات لە هەموو بوونەوەردا بە گیاندارو بێ گیان و مەلائیكە، بەجارێ هەموو تەسبیح و زیكر ئەسێننەوە، كاتێ كە بیر لەوە دەكرێتەوە دەروون و ویژدانی ئاگادار ئەكەوێتە دڵە لەرزە و ئەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ﴾ ئایا نەتزانیوە بە زانینی دیتن هەركەس وا لە ئاسمانەكان و زەوی داو پەلەوەر لە كاتێك دا باڵەكانیان ریز دەكەن، پەلەوەر هەرچەند لە شێوە گشتی یەكەدا هەیە بە تایبەتیش ئەیهێنێ، چونكە پەلەوەر نیشانەیەكی گرنگی تێدایە كە بەو قەبارە قورسەوە بەرز ئەبێتەوە و چۆن ئارەزوو بكات ئەفڕێ، هەركام لەمانە زانا و ئاگایە بە نوێژ و تەسبیحاتەكەی. لە چەند شوێنێك لەم تەفسیرەدا گوتمان ئەم بوونەوەرە بە شێوەی گشتی بەڵگە و نیشانەیە لەو بارەیەوە خوایەتی خوا ئەگەیەنێ هەروەها ئەوانەی كە ئێمە**

بەزمان زانی دانانێین خۆیان گیانی تایبەتی یان هەیە و بە زمانی تایبەتی خۆیان عیبادەتی خوای خۆیان ئەکەن؟ بێگومان من باوەڕم وایە کە گیان و زمانی تایبەتی خۆیان هەیە و خوای خۆیان دەناسن بەو زمانە تایبەتی یە زیکر و عیبادەتی پەروەردگار دەکەن، باوەڕم وایە لەبەر ئەو هەموو دەقە قورئانی و حەدیسانە و بێگومان ئەوانە نابێ لە دیمەن و رواڵەتەکەیان لایانـدەین بە بێ بەڵگەیەکی بەهێز و بەڵگەش نی یە، چونکە تابێت شتە نهێنی یەکان دەرئەکەون کە بە خەیاڵ دا نەدەهاتن و کەچی بەچاو بینران و بە گوێ بیستران! ئەم تەسجیل و رادیۆ زۆر بەڵگەیەکی بەهێزن با بەباشی بیریان لێ بکرێتەوە؛ بەڵگەیەکی تر ئەوەیە هێندێ جار بە موعجیزە دەرکەوتوون، بۆ وێنە وەك لە حەدیس دا هاتووە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە دەفەرموێ لەبیرمە لە مەککە بەردێ هەبوو کە بەمدایە بەلای دا دەی گوت: السلام عليك يا رسول الله.، کەواتە با بزانین ئێمەی موسڵمان لەم بوونەوەرەدا تەنیا نین، بەڵکو بە دەورمان دا و لە هەموو لایەکەوە هاوڕێی خواناسمان زۆرە و وێنە و سروشتی جیاوازیان هەیە و ئێمە بە باشی نازانین، ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ خوا زانایە بە ئەوپەڕی زانین بە هەرچی خەڵکەکان دەیکەن لەوانەی کە باس کران، هێندێ ئەفەرمون مەبەست پەلەوەرەکان و بە کردەوە ناوی دەبات وەك ئەوانە ژیر بن، چونکە کار و کردەوەکانیان زۆر وردە بۆ نموونە ژیژك لەگەڵ ئەوەدا زۆر بە دوور سەیر ئەکرێ دەڵێن هەست دەکات بە هاتنی بای جنوب و شمال جا پێش هاتنەکەی باری خۆی ئەگۆڕێ لە کون و هێلانەکەی دا، تەنانەت دەگێڕنەوە لە ئەستەمبوڵ دا لە پێش فەتحی ئیسلامی دا پیاوێکی زۆر خاوەن سامان هەبوو بەهۆی ئەو ژیژکەوە هەموو خەڵکی ئەترساند بە هاتنی با و فریای خۆیان ئەکەوتن چارەسەری کەشتی یەکانیان ئەکەوتن و خەڵکی لایان وابوو غەیب زانە و پارە و ماڵیان بۆ ئەبرد. ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ تەنها و هەر بۆ خوایە پادشایەتی و خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچۆنێ لە یەکەمجارەوە هەموو شتێك هەر ئەو دروستی ئەکات و ئەیهێنێتە کایەوە، هەروەها ﴿وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ هەر بۆلای ئەو پاشە رۆژی هەموو شتێك و هەر ئەو لە پاش نەمان دووبارەیان ئەکاتەوە. ئینجا سەرنج رائەکێشێ بۆ چەند بەڵگە و نیشانەی روون لەم بوونەوەرەدا و ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا﴾ نەتزانیوە خوا هەور لەسەر خۆ و بە ئاهیستە ئەهێنێ؛

ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ ۖ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ ۚ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ۚ

---

﴿ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ﴾ ئینجا بەشەکانی یەکانگیر ئەکات و نزیکیان ئەخاتەوە لە یەکتر ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا﴾ ئینجا ئەیگێڕێ بە جۆرێ تەپەی ئەدات چین لەسەر چین ﴿فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ﴾ ئینجا دەبینێ بارانی لێ دەردەچێ لەناو بەناوی دا ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ﴾ ئەمێنێتە خوارەوە لە چەند شاخێك لە تەرزە كە تیایەتی ﴿فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ﴾ ئینجا بەو تەرزەیە ئەدات لە هەندێك كەس كە خوا ئیرادەی كردبێ و لای ئەدات لە هەركەسێك كە خوا بیەوێ و ئیرادەی بكات، زۆر جار بینراوە و دەبینرێ كە دوو پەڵە خەڵە و كشت و كاڵ وان لە پاڵی یەك دا یەكێكیان وێران ئەكات و ئەویتر ئەپارێزێ و بێ زیان ئەمێنێتەوە، چونكە هەموو شتێك ژێر بارە بۆ مەیلی خوا و ئیرادەی خوا، ئینجا ئەو هەورە ئەیكات بە شاخە و شریخە و هەورە تریشقەیەك ﴿يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ﴾ كە خەریكە ڕووناكی چەخماخەكەی ئاوی چاو ببات و بینایی یەكەی نەهێڵێ، ئەو هەموو شتە نایابە سەرسوڕهێنەرە بەچاو دەبینرێ بەڵام لەبەر ئولفەت و دەق پێوە گرتن بیریان لێ ناكرێتەوە، جا قورئان ناو بەناو خەڵكی خەبەر دەكاتەوە لەو خەوی بێ ئاگایی یە. لە پێشەوە فەرموی ئەمێنێتە خوارەوە لە شاخی تەرزە و لەلای سەروویەوە، بەڵێ شتێكی حەقیقەتە ئەو هەورانەی كە تەرزەیان لێ دەبارێ لە ڕاستی دا شاخ و كێون بەڵام دەستی قودرەت كردوونی بە هەور و هەڵم لەبەر ئەوە سووكن و هەوا هەڵیان دەگرێ هەركەسێك سواری تەیارە ببێ ئەو هەورانە وەك كێو و شاخ دەبینێ سبحان الله.

ئینجا بەڵگە و نیشانەیەکی گرنگی هەمیشەیی دەخاتە بەرچاو و دەفەرموێ: ﴿يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ﴾ خوا گۆڕانکاری ئەکات لە نێوان شەو و ڕۆژدا بەمەی ئەیانهێنێ بەدوای یەک دا بەمەی لە شەو کەم ئەکاتەوە و ئەیخاتە سەر ڕۆژ و لە ڕۆژ کەم ئەکاتەوە و ئەیخاتە سەر شەو، هەروەها بە گەرما ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾ بەڕاستی لەم شتە گەورە و گرنگانەدا عیبرەت و پەند هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی چاوەکانن، واتە ئەوەندە ئاشکران هەق وایە تەنها بینینیان بەس بێ بۆ باوەڕ بە خوای تاک و تەنیا و هەرکەس هەست بەوە نەکات لەڕاستی دا کوێر و نابینایە.

ئینجا بەڵگە و دەلیلی روون و رەوانمان ئەخاتە بەرچاو نازانین بڵێین کام بەهێز تر و ئاشکرا ترە، لێرەدا یەکێتی هەموو گیان لەبەران نیشان ئەدات کە لە بنەڕەت دا لە یەک سەرچاوەوە هاتوون لە پاشان ئەو هەموو جۆرە جیاوازانە پەیدا بووە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖ﴾ خوا هەموو گیان لەبەرێکی لەئاو فەراهەم هێناوە، ئەو گیان لەبەرانەی کە بە زەوی دا ئەگەڕێن و لە زەوی پەیدا بوون، کەواتە مەلائیکە و جن و شەیاتین هەرچەندە گیانلەبەرن بەڵام لە زەوی فەراهەم نەهاتوون، کەواتە ئەوان لێرەدا مەبەست نین، چونکە جن و شەیاتین لەئاگر پەیدا بوون مەلائیکەش لە نوور، خوا بێجگە لەوانی دروست کردووە لە ئاو، واتە ئاو بەشێکە لێ ی، ئینجا ئەم یەک ئەسڵە خوا جۆر جۆر و نەوع نەوعی کردووە وەک ئەفەرموێ: ﴿فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ﴾ ئینجا هێندێکیان لەسەر سک ئەڕوا وەک مار ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ﴾ هێندێکیان لەسەر دوو پێ ئەڕۆن وەک ئادەمی و پەلەوەر. ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖ﴾ هێندێکیشیان لەسەر چوار پێ وەک حەیوانات، باسی ئەو گیان لەبەرانەی نەکرد کە ئەڕۆن لەسەر زیاد لە چوار پێ وەک هەزار پێ، چونکە ئەوانە شتێکی لەبەرچاو نین ﴿يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ﴾ خوا هەر شتێکی بوێ ئیرادەی بکات دروستی ئەکات،

إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ لَّقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٦﴾

---

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئیرادەی هەرشتێك بكات دروستی ئەكات، چونكە خوا توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێك دا كە ئیرادەی بكات و لەسەر هەر باو و شێوەیەك دروستی ئەكات بە پێی حیكمەت و لێزانی خۆی. قورئان ئەیەوێ بەندەكانی خوا پەروەردە بكات لەسەر باوەڕی راستەقینە لەبەر ئەوە هەموو شتێك ئەگێڕێتەوە بۆلای خوا و زانین و دەسەڵاتی خوا. بەڕاستی بیركردنەوە لەو هەموو گیان لەبەر و زیندووانە كە جیاوازن لە شێوە و قەبارەی لەشیان دا هەموو دڵ و هەست و دەروون پڕ ئەكات لە باوەڕی بەهێز و هەست كردن بەو دەستە قودرەتە لێزانەی كە ئەو كارانە ئەكات. خوا بە میهرەبانی خۆی دڵ و دەروونمان ئاوەدان بكاتەوە بەو باوەڕە بەهێزانەی لەپاش ئەو هەموو گەردش و خولانەوەی كە كردی بە دڵ و دەروون، حاڵ و باری چاكانی روون كردەوە لە بەهرەمەند بوون بە رێنموونی و روناكی قورئان و بەرامبەر ئەو حاڵ و باری بێ باوەڕ و بەش براوە، كاتێ كە بێ بەشن لە نوور و روناكی و لە تاریكی دا بە سەرگەردانی دەژین. لەپاش ئەوە باسی دەستە و تاقمی سێ یەم ئەكات كە دەستەی ناپاك و مونافیقەكانە كە وان لە بەین دا، هێندێ لە حاڵ و باری ئەوانیش روون ئەكاتەوە و هەركەس ژیر بێت ئەبێ دوور كەوێتەوە لە سیفەت و كار و كردەوەی ئەم دوو دەستە بەدە و هەوڵ بدات سیفەت و كردەوەی پاكی پاكان وەرگرێ و خۆی پێ برازێنێتەوە. لە پێشەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەدات بە گوێچكەی گوێ گران دا تا هیچ كەس بڕ و بیانووی نەمێنێ، ئەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ﴾ سوێند بەخوا ئێمە هێناومانەتە خوارەوە چەند ئایەتێك كە روون و روون كەرەوەی هەر شتێكە كە خەڵكی پێویستی ببێ ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ خوا رێنموونی هەر كەسێك كە بیەوێ و ئیرادەی كردبێ، رێنموونی ئەكات بۆلای رێگەی راست كە هەر ئەو رێگەیە راستە، رێنموونی هەركەس نەكات، ئەو كەسە خۆی تاوانبارە، چونكە بە هەڵبژاردن و ئارەزووی خۆی ئەو رێگەیە ئەداتە بەر.

وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ
﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ
مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ

---

**ئینجا لەگەڵ ئەوەدا دەستەیەك هەیە كە بەدەم لاف موسڵمانێتی لێ دەدەن و بەڵام بە پێچەوانەی كردەوە و ئادابی ئیسلام دەجوڵێتەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا﴾ بەدەم دەڵێن باوەڕمان هێناوە و باوەڕمان هەیە بەخوا و بە پێغەمبەر(ﷺ) و گوێ ڕایەڵین، ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ ئینجا هەر حوكم و بڕیارێك كە بدرێ بەسەریدا ئەگەر قازانجی بێت ئەوا ئامادەیی دەردەبڕێ و ئەگەر قازانجی نەبێ ڕووی لێ وەردەگێڕێ، بەڕاستی زۆر كەس كە لاف موسڵمانێتی لێ دەدەن ڕێك ئەم سیفەتەی تێدا كاتێ كە زانی قازانجی یەتی ئەڵێ: ئەمە سەری من و ئامادەم بۆ تێغی شەرعی، كاتێ بەو جۆرە نەبوو بەهەر جۆرێكی تر بۆی بكرێ ئەكەوێتە ملە جەڕێ و هەوڵ ئەدات خۆی قوتار بكات لەو حوكمە شەرعی یە، هەركەسیش وا ئەم ئایەتانە بەسەردا جاری یە قورئان بە موسڵمان و باوەڕداری دانانێ، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان ئەوانە ئیماندار نین. ﴿وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ﴾ كاتێ بانگ بكرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەكەی بۆ ئەوەی حوكم و بڕیار بدات لە نێوانیان دا دەستەیەكیان ڕوو وەرگێڕن لەو حوكم و بڕیارە، واتە ئەگەر قازانجی نەبوو و شەرع پێ ی نەئەدا، ﴿وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ﴾ كاتێ حەقەكە بۆ ئەوان بوو و شەرع ئەیدانێ ئەوا دێن بۆ لای حوكم و بڕیارەكەی بە مل كەچی یەوە، ئەوانە مل كەچ نین بۆ حوكمی خوا، بەڵكو مل كەچی مەبەستەكەی خۆیانن، ئینجا قورئان بێزاری دەردەبڕێ لێ یان و هۆی هەڵوێستەكەیان باس ئەكات و ئەفەرموێ: ﴿أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئایا لە دڵیان دا نەخۆشی هەیە، نەخۆشی بێ باوەڕیی و ناپاكی؟ واتە بەڵێ ﴿أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟﴾ یا گومانیان هەیە لە پێغەمبەرێتی پێغەمبەردا؟! ﴿أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ﴾ یان مەترسی ئەكەن كە خوا و پێغەمبەر زوڵمیان لێ بكەن؟**

بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّۖ قُل لَّا تُقْسِمُواْۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ

---

هەرسێکیان بەرپەرچ ئەداتەوە و ئەفەرموێ: ﴿بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ واتە نەخێر لەبەر هیچ کام نی یە، بەڵکو ئەوانە خۆیان هەر زاڵم و ستەمکارن و ئەیانەوێ زوڵم بکەن لە خەڵکی. ئینجا هەڵوێستی ئیمانداران دیاریی ئەکات کە بێجگە لەو نابێ هیچ هەڵوێستێکیان هەبێ، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ قسە و وتەی ئیمانداران کاتێ بانگ بکرێن بۆلای خوا و پێغەمبەرەکەی کە حوکم بکات لە نێوانیان دا هەر ئەمەیە کە بڵێن ئەوا بیستمان و گوێ رایەڵین، ئیتر نابێ هیچ وتە و قسەیەکی تریان هەبێ، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ هەر ئەوانە گەیشتوون بە ئامانج. ئینجا راستی و رەوایی بارو حاڵی ئیمانداران روون ئەکاتەوە و هانی خەڵکی تریش ئەدات کە رێگەی ئەمانە بدەنە بەر، بەم فەرمودەیە: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ هەرکەس گوێ رایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت و لەخوا بترسێ وخۆی بپارێزێ لە نافەرمانی هەر ئەوانە بەختەوەر ئەبن بە ناز و نیعمەت و خۆشی راستەقینە. ئینجا هێندێ تر لە درۆو ناڕاستی ناپاکەکان باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ﴾ سوێندیان خوارد بە ئەوپەڕی سوێند ئەگەر تۆ فەرمانیان پێ بدەیت بە دەرچوون بۆ غەزا بێگومان دەردەچن و پێچەوانەی رەفتار ناکەن ﴿قُل لَّا تُقْسِمُواْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێ یان سوێند مەخۆن، چونکە ﴿طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ﴾ گوێ رایەڵی ئێوە گوێ رایەڵی یەکی ناسراو و بەناوبانگە، هەنکی دەزانی درۆ دەکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ بێگومان خوا بە خەبەر و ئاگایە بە کردەوەکانتان و بەوەی دەیکەن. ئینجا بۆ دەرخستن و بە گرنگ گرتنی وتەکەی ﴿قُلْ﴾ دووبارە ئەکاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەری بڵێ پێ یان: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ گوێ رایەڵی خوابن و گوێ رایەڵی پێغەمبەر بن. ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە هەمووان کە پێویستە لەسەریان گوێ رایەڵی،

وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ
فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ
ٱلۡمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا
ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ

---

ئەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئەگەر ئێوە گوێ رایەڵ نابن و سەرپێچی دەکەن ﴿عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡ﴾ بزانن پێغەمبەر هەر ئەوەی لەسەرە کە خراوەتە سەر شانی کە راگەیاندنی پەیامەکەیەتی بەو جۆرەی کە خوا داوای کردووە لێ ی، لەسەر ئێوەیشە ئەوەی کە داواتان لێ کراوە و خراوەتە سەر شانتان کە بریتی یە لە باوەڕ هێنان و گوێ رایەڵی تەواو، واتە کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە واجبی سەر شانی خۆی سەرپێچی ئێوە هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێ و زیانبار هەر ئێوەن، ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْ﴾ ئەگەر ئێوە گوێ رایەڵی بکەن ئەوا رێنموونی وەردەگرن و رێگای راست دەدەنە بەر ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ پێغەمبەر هیچی لەسەر نی یە بێجگە لە راگەیاندنێکی روون و راست، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ﴿رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ ە بەزەیی دێتەوە بە خەڵکی دا ئەگینا ئەگەر هیچ کەس ئیمانی پێ نەهێنێ پایەو پلەی ئەو کەم و کوڕی رووی تێ ناکات.

لێرەدا بەو ئەندازەیە دوایی هێنا بە بارو حاڵی ناپاکەکان، ئینجا لێ یان بێ دەنگ ئەبێ و رووی فەرموده ئەکاتە ئیماندارە گوێ رایەڵەکان و بەڵێنیان پێ ئەدات بە پاداشت دانەوەیان کە دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ خوا بەڵێنی داوە و بەڵێن دەدات بەوانەتان کە ئیمانی هێناوە و ئیمان دەهێنێ و کردەوە چاکەکان دەکات، بەڵێنیشیان پێ ئەدات و دڵنیایان ئەکات بە سوێند و(ل) ی تاکید و(ن) ی تاکید!! کە ئەوە ئەوپەڕی لوتف و میهرەبانی یە و هەر لە دەریای بێ پەیی رەحم و بەزەیی ئەو دێت لەگەڵ بەندەکانی بەو جۆرە دڵشاد و خۆشنوود کردنیان و ئەفەرموێ:

١- ﴿لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ دەیانکات بە خەلیفە و کاربەدەست لە وڵات دا هەرچۆنێ ئیماندار و خاوەن کردەوە چاکەکانی پێش ئێوەی کرد بە جێنشین و کاربەدەست وەك ئیسرائیلی یەکان کە لە پاش فیرعەون و ستەمکارەکان، یان بە شێوەی گشتی هەموو ئیماندارەکانی هەموو گەلەکانی رابوردوو.

٢- ﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ﴾ ئەو ئایینەی کە بۆی دیاریی کردوون و هەڵی بژاردووە بۆیان و ڕەزامەندی هەیە پێی. ئەو ئایینە دامەزراو ئەکات بۆیان و ئەیکات بە خاوەن بۆیان.

٣- ﴿وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًاۚ﴾ ئەو بیم و ترسەی کە هەیانە ئەیگۆڕێ بە ئاسایش و بێ باکی، خەبابی کوڕی ئەرەت عەرزی پێغەمبەری کرد(ﷺ) لەو کاتە سەخت و ناڕەحەتی یەدا ئایا هاوارێکمان بۆ ناکەیت کە خوا بێت بە هاوارمانەوە لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) پاڵی دابووەوە بە کەعبەوە و ڕاست بووەوە و ڕووی پیرۆزی سوور بوویەوە و فەرموی ئوممەتە پێشووەکان بە مشار دایان ئەهێنان خۆیان ئەگرت و لایان نەئەدا لە دینەکەیان، سوێند بەخوا کار وای لێ دێ لێرە تا صنعاء هیچ کەس مەترسی هیچ ناکات مەگەر ترس لە خواو ترسی لەگورگ و لە ماڵاتەکەی، بەڵام ئێوەیە پەلە دەکەن سوپاس بۆ خوا زۆری پێ نەچوو ئارامی و ئاشتی زاڵ بوویەوە لەو شوێنانەی کە ئیسلام حاکم بوو تیایان دا، لە نیوە دورگەی عەرەب، ئینجا هەر ئەوە پەرەی سەند لە خیلافەتی سێ خەلیفەکەدا تا خەلافەتی خەلیفەی چوارەم - خوا لێ یان ڕازی بێت - هەتا کەوتنە ئەو تەفرەقە دڵ تەزێنەی کە سەری لە جەنگ دەرچوو لەناو هاوەڵەکان دا!! إنا لله و إنا إليه راجعون. ئەو ترس و بیمە هەر مایەوە، چونکە کەم و کوڕی پەیدا بوو لە گوێ ڕایەڵی و دەست گرتن بە بەرنامەکەی خواوە تا سەری ساڵی سەدەی یەکەم خوا گەنجێکی ڕێک خست • عمری کوڕی عبدالعزیز - خوای لێ ڕازی بێت. بە تەواوی ڕاوەستا لەسەر بەرنامەکەی خوا و گەورەترین دەوڵەتی پێک هێنا لە خۆرهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا و لە ئەوپەڕی شماڵەوە بۆ ئەوپەڕی جنوب. هیچ کەس لە هیچ بارێکەوە گلەیی نەما و هەموو کەس و هەموو تیرەیەک ماڵ شەرعی خۆی وەرگرت و سامان ئەوەندە زۆر بوو زەکات و خێرات وەرنەدەگیرا و ماڵ و سامان لە جادە و پرد و پێویستیاتی وڵات دا سەرف دەکرا.

يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُواْ
ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعۡجِزِينَ
فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ
أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ
وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ

---

خوا ئەو بەڵێنەیان بۆ پێك ئەهێنێ لە کاتێك دا ئەفەرموێ: ﴿يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ﴾ من دەپەرستن و هیچ شتێك ناکەن بە هاوبەشم، واتە پەرستنەکەم پاك و خاوێن دەکەن لە هەموو جۆرە هاوبەشێك. خوا ئەو بەڵێنەی دا و بەدی هێنا، ئینجا دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ هەرکەس لە پاش بەدی هاتنی ئەو بەڵێنانە سپڵەیی بەکار بێنێ ڕێگەی خوا نەداتە بەر بەڕاستی هەر ئەوانەن دەرچوو لە ڕێگەی خوا، ئەوانەن ئەوپەڕی ڕادەیان گرتووە لە لادان و دەرچوون لە ڕێگەی خوا. ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەڵێن پێ دراوانە کە ئەبێ چۆن بن؟ بێگومان ئیمان وتەیەکی دەمی نی یە، بەڵکو ئیمان مل کەچی یە بۆ هەرچی پێغەمبەر(ﷺ) پێی هاتووە و ئەبێ ئەو ئیمانە ڕەنگ بداتەوە لە هەموو بڕیار و بۆچوون دا هەموو خواست و مەبەستی شوێنی ئەو بەرنامەی خوا بکەوێ ئەگەر بەو جۆرە نەبێ ئەو ئیمانە نی یە کە خوا ئەیەوێ، یا الله ئەو ئیمانەمان پێ ببەخشە و دامەزراومان بکە لەسەری آمین. ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ نوێژ بەجێ بێنن و زەکات بدەن و فەرمان بەرداری پێغەمبەر(ﷺ) بن بەو شێوەی کە خوا دەیەوێ لێتان، بەڵکو بەزەییتان پێ بکرێ لەلایەن خواوە. ﴿لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ پێتان وا نەبێ کە ئەوانەی بێ بڕوا بوون و بە درۆزنت دەزانن ئەی محمد لەگەڵ ئیمانداران، دەتوانن دەستی خوا

له خۆیان بگێڕنەوە و خوا بێ توانا پیشان بدەن و لە ژێر دەسەلآتی دەرچن لەسەر زەوی دا و لەو ژیانەدا، بەڵکو خوا توانایە بەسەریان دا لە هەموو کات لە ڕۆژی دوایيش دا جێگە و داوایان دۆزەخە و خراپترین چارەنووس و دوا ڕۆژیانە. بێگومان ئیسلام بەرنامەیەکی تێرو تەواوە لە هەموو بار و ڕوویەکەوە، کەواتە ژیانی ئادەمی ڕێك و پێك دەکات لە هەموو قۆناغەکانی دا و لە پەیوەندی و پەیوەستی یەکانیدا و هەموو ئاداب و بڕیارەکانی پەیوەست ئەکات پێکەوە بە هەمووی ئیسلام پێك دێت. لەم سورەتەدا نموونەیەك هەیە لەو ڕێك خستن و ڕێك و پێکی یە، جا لە پێشەوە هێندێکی تر لە بارەی ئیزن خواستن و پرس کردن بۆ ئامۆشۆی مالآن باس ئەکات، جا لێرەدا هێندێ ئاداب باس ئەکات کە لە پێشەوە نەگوتراوە لەبارەی هات و چۆی خزمەت کار و کەنیزەك و منداڵەوە، ئەو کەنیزەك و خزمەت کارانەی کە کاتی خۆی بوون و مولك بوون، سوپاس بۆ خوا ئەمڕۆ ئەو ڕژێمە نەما، کەواتە خزمەت کار و کارەکەری ئەمڕۆ بەری ئەم ئایەتە ناکەون، ئەمانە نامەحرەمن، کەواتە ئەم بڕیارە لێرەدا بۆ منداڵانە، ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە ﴿لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ﴾ با ئەوانەی کە منداڵن و نەگەیشتوونەتە کاتی باڵغ بوون با ئیزنتان لێ خوازن سێ جار، واتە لە سێ کات دا:

١- ﴿مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ﴾ پێش نوێژی بەیانی.

٢- ﴿وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ﴾ کاتێ لیباسەکان دائەکەنن لەکاتی گەرمای نیوەڕۆدا.

٣- ﴿وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ﴾ لەپاش نوێژی عیشا کاتی ئیسراحەتە و کاتی خەوتن.

ئەمانە لەم سێ کاتەدا لە خۆیانەوە بە بێ پرس مل نەنێن و بێنە ژوورەوە نەوەك شتێك ببینن کە پێ یان ناخۆش بێت ﴿ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ﴾ ئەم سێ کاتە کاتی خۆ دەرخستنن بۆتان،

لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ
ٱلْأَيَٰتِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن
قَبْلِهِمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا
يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ

---

**كەواتە بە بێ پرس نەیەن ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ﴾ دوای ئەم سێ کاتە هیچ گوناهێك نی یە نە لەسەر ئێوە و نە لەسەر ئەوان، چونکە ﴿طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ ئێوە زۆر هات و چۆی یەکتر دەکەن هێندێکتان چەرخە ئەکەن بەسەر هێندێکی ترتان دا ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ﴾ ئا بەو جۆرە روونە خوا ئایەتەکانی باس ئەکات بۆتان ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خوا زانای لێزانی کاردروستە ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ﴾ کاتێ منداڵەکانتان گەشتنە کاتی باڵغ بوون نابێ هەروەك جاران پرس نەکەن، بەڵکو لەم کاتەدا ئەبێ پرس بکەن، چونکە بێگانەن ﴿فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ کەواتە با ئێن بخوازن هەرچۆنێ ئەوانەی پێش ئەمان باس کران لەو ئایەتەدا کە فەرموی: ﴿لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا﴾.**

**لە ئایەتە پێشووەکەی ئەم سورەتەدا جڵەوگیریی کرد لە دەرخستنی زینەتی ئافرەتان، ئینجا لەبەر ئەوەی ئافرەتە پیرەکان کە بەتەمای شوو کردن نین ئەبێ جیا بکرێنەوە جا ئەوا لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ﴾ ئافرەتە پیرە پەك کەوتووەکان کە چاوەڕوان نین و بە تەمای شوو کردن نین، ئەوانە هیچ گوناهو حەرەجێکیان لەسەر نی یە کە پۆشاکەکانیان داکەنن، واتە پۆشاکە ئاشکراکانیان کە ئەستوورن لە کاتێ دا دەرخەری زینەتەکانیان نەبن لەوانەی فەرمانیان پێ دراوە بە شاردنەوەی لەگەڵ ئەوەدا،**

وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا
عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ
أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ
عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ
صَدِيقِكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا

---

**﴿وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ﴾ بەدوای پاکی و داوێن پاکی دا بگەڕێن ئەوە چاکترە بۆیان ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خوا بیسەرە بۆ هەموو شتێ لەناو ئەو شتانەدا ئەو چپە چپەی کە ڕوو ئەدات لەنێوان پیاو و ئافرەتان دا، زانا و بە خەبەرە بە هەموو نیازێك، شەرم بکەن لەخوا و شتێ نەکەن کە هۆی خەجاڵەتیتانە لای خوا. ئەم قورئانە هاتووە بۆ ڕاست کردنەوەی هەموولاری و نالەباری یەك و گەل و ئەندامی گەل پاك و خاوێن بکاتەوە لە هەر چڵك و چەپەڵی یەك، جا هێندێ لەولاری و چەپەڵی یە ئەوە بوو ترێزیان ئەکرد لەوەی لەگەڵ کوێر و شەل و نەخۆش دا دابنیشن خۆراك بخۆن و ئەوەش هۆی نەهێشتن و لاواز کردنی پەیوەندی و پەیوەستی نێوان خەڵکی یە بە تایبەت خزم و خوێش، جا ئەوا قورئان ئەو بار و بۆچوونە پووچەڵ ئەکاتەوە و ئەفـــــەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا﴾ لەسەر کوێر و شەل و گۆج و نەخۆش گوناه نی یە کە نەتوانن بێنە جیهاد لەبەر بێ توانایی و لاوازیی یان، لەسەر ئێوەش گوناه نی یە کە لە ماڵەکانی خۆتان نان بخۆن،(بەیضاوی) ئەڵێ ماڵی کوڕیش ئەگرێتەوە، چونکە ماڵی کوڕ ماڵی باوکی یەتی، یان نان بخۆن لە ماڵی باوکتان، دایکتان، براکانتان، خوشکەکانتان، مامەکانتان، پورەکانتان(خوشکی باوکتان)، خاڵەکانتان، پورەکانتان(خوشکی دایکتان) یان ئەو ماڵانەی کە کلیلیان بە دەستی ئێوەیە، یان ماڵی برادەر و هاوڕێکانتان، گوناه نی یە بۆتان بە کۆڕ و کۆمەڵ یان بە تەنیا نان بخۆن. ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕوونی حەڵاڵی کردووە و ڕەوای داوە خواردن لەو ماڵانەدا و لەگەڵ ئەو کەسانەدا بە کۆمەڵ یان بە تەنیا، ئینجا کاتێ لەوە بوویەو،**

فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ

---

**ئینجا ئادابی چوونە ماڵەکان باس ئەفەرموێ:** ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً﴾ **ئینجا کاتێ ویستتان بچنە ماڵان سەلام بکەن لەسەر خۆتان، واتە لەسەر دانیشتوان وەك نەفسی خۆتان وایە، چونکە خزمایەتی دینی و نەسەبیتان هەیە لەگەڵیان، کەواتە وەك خۆتانن، سەلامیان لێ بکەن بە تەحیە و سەلام کردنێ کە لە لایەن خواوە هاتووە و بە فەرمانی ئەوە و پیرۆز و فەڕ دار کراوە، چونکە ئەجرو پاداشتی هەیە، پاك و خاوێنە، چونکە هۆی دڵ پاکی و پاك و خاوێن کردنی دڵ و دەروونە و پەیوەستی و پەیوەندی دڵەکان پتەوتر ئەکات** ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ **ئا بەم جۆرە روون و روون کەرەوەیە خوا ئایەتەکانتان بۆ باس ئەکات، بەڵکو ژیر بن و وەریان بگرن و رەفتاریان پێ بکەن. لە لوتف و میهرەبانی یەکەی بە زیاد بێت.**

**لەپاش ئەو رێك و پێك کردنی پەیوەندی نێوان خزم و خوێش و دۆست و بنەماڵە تایبەتی یەکان، ئینجا دەست ئەکات بە هۆنینەوە و رێك خستنی بنەماڵەی گەورە کە بریتی یە لە بنەماڵەی موسڵمانان لە ژێر سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ص)، ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ **بەڕاستی ئیماندارەکان هەر ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە بە خوا و پێغەمبەرەکەی بە ئیمانێکی راستەقینە کە هۆی رەزامەندی خوایە و پەسەندترینی ئیمان و باوەڕە** ﴿وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ﴾ **کاتێ لەگەڵی بوون لەبارەی کارێکی گرنگ کە کۆکەرەوەیە بۆیان وەك جومعە و جەژن و جەنگ و غەزا و هەروەها هەر کارێکی تر کە پێویستی ئیسلام و موسڵمانانی تێدایە، کاتێ لەگەڵی بوون** ﴿لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ﴾ **نەڕۆن بۆ هیچ لایەکی هەتا ئیزنی لێ ئەخوازن، ئینجا رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) و دەفەرموێ:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ **ئەوانەی کە ئیزنت لێ دەخوازن هەر ئەوانەن کە بەڕاستی ئیمانیان هەیە بە خوا و پێغەمبەرەکەی،**

فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ
رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ
فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾

---

﴿فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾

ئینجا کاتێ ئەوانە ئیزنیان لێ خواستی بۆ هێندێ کاری تایبەتی خۆیان ئیزن بدە بە هەرکام کە مەیلت هەیە و داوای لێ بوردنیان بۆ بکە لە خوا لەهەر جۆرە ناتەواوی یەك کە هەیان بێت. بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە. ئەم تەمێ و پەندانە لە کاتی خۆی دا بەو جۆرە بووە و لەپاش لە دنیا دەرچوونی هەر کاربەدەستێکی موسڵمان لە خولەفای راشیدین و هەر حاکمێکی تر کە فەرمان نەدا بە خیلافی شەرع هەر جۆرەیە کە وەرمان گرت لە ئایەتەکەدا، چ بە نیسبەت حاکمەکە و چ موسڵمانانی تر. ئینجا ئەدەب و ڕێزگرتنی دانا بۆ موسڵمانان کە بەناوی خۆی بانگی نەکەن یان کونیەیە کە پێی خۆش نەبێ، بەڵکو وتەی یا رسول الله، یا نبی الله، بانگی لێ بکەن، ئەفەرموێ: ﴿لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا﴾ بانگ کردنتان و قسە کردنتان لەگەڵی جیا بکەنەوە نەك بە وێنەی بانگ کردنتان لە نێوان خۆتان دا، بەجۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە بەڵام ئەمەی تەفسیرەکە بەهێز ترە لە دڵ دا و جێگیر ترە، بێگومان ناپاکەکان هەمیشە هەوڵیان ئەدا لە پەنای موسڵمانان دا خۆی قوتار بکات و پێی نەزانن کە ناپاکە و خۆی دەشارێتەوە ئەفەرموێ: ﴿قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا﴾ بەڕاستی خوا دەزانێ و ئاگایە بەوانەتان کە بە نهێنی دەردەچن بە بێ ئیزن و لە پەنای ئەوانەی کە بە ئیزن دەردەچن و خۆیان دەپێچن بەوانەوە ئینجا ئەم هەڕەشە سەختە ئاراستەی ئەوانە

دەكات و ئەفەرموێ: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانە كە پێچەوانەی فەرمانی خوا دەجووڵێنەوەو لە فەرمانی ئەو دەردەچن با خۆیان بپارێزن لەوەی بەلاو موصیبەتێكی دنیایی دووچاریان ببێ یان عەزابێكی سەختی ئازار دەری ڕۆژی دوایی دووچاریان ببێت، واتە ئەوانەی كە لە فەرمانی خوا دەردەچن دووچاری یەكێ لەوانە دەبن یان هەردووكیان، خوا پەنامان بدات لە هەردوو خۆیان بپارێزن بە تۆبە و گەڕانەوە بۆلای خوا.

ئینجا كۆتایی ئەم ترساندن و هەڕەشەیە و هەموو سورەتەكە ئەهێنێ بە باسی ئاگاداری و زانینی خوا بە هەموو كردەوەكان، چ چاك و چ خراپ و بەمەی لە ڕۆژی دوایی دا خوا هەواڵیان پێ ئەدات و محاسبەیان ئەكات لەسەر هەر كردەوەیەك كە لە دنیادا كردوویانە، ئەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بێدار ببنەوە بەڕاستی هەرچی وا لە ئاسمانەكان و زەوی موڵك و دروست كراوی خوایە، ﴿قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ﴾ بێگومان ئەزانێ و ئاگادارە بەوەی كە ئێوە دەیكەن و وان لەسەری و ئاگادارە بەو ڕۆژەی كە ئەگێڕێنرێنەوە بۆلای، واتە ڕۆژی دوایی، واتە ناپاك و بێ باوەڕەكان كە باكیان لەو ڕۆژە نی یە با بزانن ئەو ڕۆژە دێت ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟﴾ ئینجا هەواڵیان پێ ئەدات بەهەر كردەوەیەك كە لە دنیادا كردوویانە ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ﴾ لەكاتێك دا كە خوا زانا و ئاگادارە بە هەموو شتێك، داواكارین خوای میهرەبان خەجاڵەت و داماوی ئەو ڕۆژەمان نەكات.

الحمد لله لەڕۆژی یەك شەممە ذی الحجة كە ئازانین ٢١ یان ٢٨ ئەم سورەتی( النور) ە دوایی هات.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ

## سورەتی(الفرقان)
## مەككەیی یە و(٧٧) ئایەتە

### بسم الله الرحمن الرحيم

شێوەی ئەم سورەتە سەر تا بە خواری بریتی یە لە دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) و نەمێشتنی داخ و دوو لە دڵی بەفەڕی و ئارامی پێدان و بەهێزکردنی لەکاتی بەرەنگاری بت پەرستەکانی قورەیش و سەرکێشی و دەم درێژیی و دەمە دەمێ یان بەرامبەری و وەستانیان روو بەڕووی ڕێنموونی و تەمێ کردنەکەی و بەرگری کردنی بڵاو بوونەوەی. ئەم سورەتە لەلایەکەوە بە شێوەیەکی نەرم و ناسك ئەو دڵنەوایی و دڵ ئارام کردنەی پیشان ئەدا و شەماڵی بێگەردی چاودێریی و سەرپەرشتی خوا ئاراستەی پێغەمبەری ئازیز ئەکات، لەلایەکی ترەوە شێوەی ئەو بەربەرەکانێ بەتینە پیشان ئەدات کە دووچاری پێغەمبەر ئەبوو لەلایەن ئەو کۆمەڵە گومڕا و سەرکێش و مل هوڕەوە. ئەم دوو مەبەستە گرنگە فەراهەم ئەهێنێ لەکاتی داڕشتنی باوەڕی بەهێز بە تەنهایی خوا و پێغەمبەرێتی محمد(ﷺ) و هاتنی ڕۆژی دوایی و بەرپەرچ دانەوە و دەم کوت کردنی بێ باوەڕان. لە یەکەم جارەوە دەرگای سورەتەکە ئەخاتە سەر پشت بە ئایەتێ کە گرنگی و گەورەیی قورئان پیشان ئەدات لەگەڵ مەبەست لە ناردنیقورئان و رەوانەکردنی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ﴾ پیت و فەڕ و خێری زۆر فراوانە و پاكە لە هەموو لەكەیەك: کەسێ کە قورئانی ناردە خوارەوە بەرە بەرە و پارچە پارچە بۆ سەر بەندەی خۆی، واتە محمد(ﷺ). قورئانی ناوبرد بە ﴿الفرقان﴾ واتە جیاکەرەوە، چونکە ئەم قورئانە(حەق) لە(بەتاڵ) جیا ئەکاتەوە و ڕاست لە درۆ و لار و چەوت و ڕێنموونی لە گومڕایی، بەڵکو جیاکەرەوەی ڕێگا و بەرنامەیەکی تایبەتی ژیانە کە لە

ئاسمانەوە هاتوە لە هەموو بەرنامە زەمینی یەکان، جیاکەرەوەی چەرخێکی تازەیە بۆ ئادەمی و جیهان لە هەموو چەرخەکانی تریان. بەڵێ بەڕاستی قورئان هات رێگا و بەرنامەیەکی نەخشە کێشا بۆ ژیان لە هەموو بار و روویەکی یەوە بە شێوەیەکی روون و رەوان و دامەزراو لە دەروون دا و بە جۆرێکی راستی بەدی هاتوو لە واقیعی ژیان و جیهان دا، رێگا و بەرنامەیەکە ناگۆڕێ و تێکەڵی هیچ رێگا و بەرنامەیەکی تر نابێ کە ئادەمی دیبێتی، چەرخێکی تازەی هێنایە پێشەوە بۆ ئادەمی، کە روون و ئاشکرایە و جیاوازە لە هەموو چەرخێکی تر کە رابورد بەسەر ئادەمی و جیهان دا، کەواتە قورئان بەم جۆرە گەورە و پان و فراوانە جیا کەرەوەیە، چەرخی منداڵی و هەرزەیی ئادەمی پێ دوایی هات و چەرخی فام و لێزانی و ژیریی دەستی پێ کرد، چەرخی(موعجیزەی) ژیریی پێ هاتە پێشەوە و فەراهەم هات، چەرخی پێغەمبەرێتی و فروستادەیی گشتی و نەبڕاوە و هەتا هەتایی پێ هاتە پێشەوە. لێرەدا و لە سورەتی(الإسراء) و(الكهف) و(الجن) دا پێغەمبەری ناوبرد بە بەندەی خۆی لەبەر رێزگرتن و دەرخستنی خۆشەویستی و رادە و پایە و پلەی بەرزی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هەروەها بۆ روون کردنەوەی بەرزیی پلەی بەندەیی بەندە بۆ خوای خۆی، بۆ ئەمەی دەرکەوێ کە بەرزتر و بەڕێز ترین پلە بۆ هەموو کەس ئەمەیە بگاتە پلەی بەندەیی بۆ خوا و ناو ببرێ بە بەندەی تایبەتی خوا، وەکو لە لایەکی ترەوە دەست نیشانی تیایە بەمە کە بەندە هەرچەند هەر ئەندازە بەرز ببێتەوە لە سنووری بەندەیی دەرناچێ و نابێ نزیک بخرێتەوە لە سنووری خوایەتی یەوە و رادە و پلەی خوایەتی ئەبێ تاک و تەنیا بێت و تایبەتی بێت بە خوای تاک و تەنیاوە بەبێ هاوبەشێک نە لە زاتی دا و نە لە سیفەت و نیشانەی دا و نە لە کردەوەو بڕیاری دا، زۆر زۆر پێویستە جێگیر بوون و دامەزرانی ئەم باوەڕە لە دەروون دا، ئەگینا گومڕایی و سەر لێ شێوان روو ئەدات، ئەوەتا لە شوێن کەوتوویی هەندێ لە پێغەمبەران و پیاوە گەورەکان چەند کۆمەڵێ پەیدا بوون بەهۆی جێگیر نەبوونی ئەم باوەڕە پیرۆزە لە دەروونیان دا زیادە رەوی یان کرد، ئەو پێغەمبەر و پیاوە گەورانەیان لە پلەی بەندەیی دەرکرد و بەرزیان کردنەوە بۆ سنووری خوایەتی تا گومڕا بوون و چوونە ریزی بت پەرستان و هاوبەش رەوا دەرانەوە.

ئەم قورئانەی ناردە خوارەوە بۆ سەر بەندەکەی ﴿لِيَكُونَ لِلْعَـٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾ بۆ ئەمەی ببێ بە ترسێنەر بۆ ئادەمی و جن و هەموو عالەم لە جیهان دا، ئەم ئایەتە مەککەیی یە پێغەمبەرێتی پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – بە شێوەیەکی گشتی روون و ئاشکرا ئەکاتەوە هەر لە یەکەم جارەوە وێنەی ئەم ئایەتە لە گەیاندنی ئەو مەبەستەدا لە چەند سورەتێکی قورئان دا هەیە وەك سورەتی(الأعراف)،(الأنبياء)،(ن)،(تكوير)، کە ئەوانەش هەموو مەککەیین، بەڵکو سورەتی(ن) لەو سورەتانەیە کە لە سەرەتاوە هاتە خوارەوە کەواتە قورئان هەر لە یەکەم جار و لە سەرەتاوە جاڕی دا کە ئەم پێغەمبەرێتی یە گشتی یە و بۆ هەمووانە نەك وەك ئەوەی هەندێ مێژوو نووسی ناموسڵمانی دوژمن بڵاوی ئەکەنەوە کە ئایینی ئیسلام لەیەکەم جارەوە شتێکی(محلی) بوو و تایبەتی بوو بە قورەیش و عەرەبی نیوە دورگەوە، لەپاشان کە زاڵ بوون و بەرە بەرە وڵاتیان داگیر کرد تەماعیان لێ پەیدا بوو تا کردیان بە شتێکی گشتی بۆ هەموو جیهان، ئەم قسە و ئەم وتارە ناڕاستە هەرچەند لەوانەیە جێگای ببێتەوە لای نەشارەزا و نەزان، بەڵام هیچ جۆرە نرخێکی نی یە و بە کەمێ بیر کردنەوە لە مەبەست و ئامانجەکانی ئەم ئایینە بەفەڕە و سەرنج دان و چاوخشان بە هەنگاو و کردەوەکانی دا و بە لێکۆڵینەوەیەکی ئاوا کەم و کورت ئەو جۆرە پیلانانە لە ئاستی خۆیان ئەتوێنەوە و دروشمیشیان نامێنێ، چونکە زۆر روون و ئاشکرایە کە سروشتی ئەم ئایین و پەیامە سروشتێکی گشتی یە و یاساکانی گشتین، مەبەست و ئامانجی گواستنەوەی تیرە و بەرەی ئادەمی یە یەکسەر لە چەرخێکەوە بۆ چەرخێکی تر و لە رێگا و بەرنامەیەکەوە بۆ رێگا و بەرنامەیەکی تر لە رێگای ئەم قورئانەوە کە

ناوی برد بە جیاکەرەوە. ئەم قورئان و پێغەمبەرە هەرچۆنێ ترسێنەرن، موژدە دەریشن وەکو لە شوێنی تردا ئەو سیفەتەیشی بۆ باس کردوون، بەڵکو لە چەند شوێن دا موژدەدانی پێش خستووە، بەڵام لێرەداباس و مەبەستەکەم دەم کوت کردن و بەرپەرچ دانەوەی بێ بڕوا و سەرکێش و مل هوڕەکانە کە شتی ناڕاست و ناڕەوا بۆ خوا بڕیار ئەدەن، دیارە بۆ ئەو جۆرە کەسانە ترساندن شایانە نەك موژدە دان.

ئینجا ئاگاداری ئەکات لەسەر چوار سیفەت و نیشانەی خوایەتی و گەورەیی خۆی:

١- ﴿ٱلَّذِی لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەو خوایەی کە قورئانی جیاکەرەوەی ناردە خوارەوە کەسێکە کە تەنها بۆ ئەوەو تایبەتی یە بەوەوە پاشایەتی و خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی، کەواتە زانین و دەسەڵاتی بێ سنوور بە سەر ئەم بوونەوەرەدا تەنها بۆ خوایە، زاڵی و دەسەڵاتی پاشایەتی و خاوەنێتی و سەرپەرشتی و بەڕێوەبەری هەموو کاروباری، دەسەڵاتی گۆڕین و ئاڵ و گۆڕ کردن.

٢- ﴿وَلَمۡ یَتَّخِذۡ وَلَدࣰا﴾ منداڵی بۆ خۆی بڕیار نەداوە، چونکە فەراهەم هێنانی منداڵ و سك و بەرە بۆ درێژە پێدانی ژیانە، دەی خوا هەر ئەمێنێ و ژیان و بوونی دوایی هاتنی بۆ نی یە و ناگونجێ نەمان رووی تێ بکات. ئەوپەڕی دەسەڵات دار و بە توانایە، کەواتە پێویستی بە هیچ نی یە.

٣- ﴿وَلَمۡ یَكُن لَّهُۥ شَرِیكࣱ فِی ٱلۡمُلۡكِ﴾ لە پاشایەتی و خاوەنداری یەك هەیەتی بۆ هەموو شتێ هیچ هاوڕێ و هاوبەشێکی نەبووە و نی یە، هەرچی وا لە ئاسمانەکان وزەوی دا شایەتن لەسەر ئەوەی کە هەموو یەکن لە داڕشتن دا و لە یاساش دا هەر یەکن، کەواتە ئەبێ یەك داهێنەر و پەروەردگاریان هەبێ.

٤- ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا﴾ ئەو هەموو شتێکی دروست کرد و دای هێنا ئینجا ئەندازەی لە هەموو روویەکەوە دیاریی کرد بە شێوەیەکی رێك و پێك لەگەڵ مەبەست لە دروست کردنەکەی دا، بۆ نموونە: ئادەمی دروست کرد بۆ ئەوەی ببێتە جێنشینی لەم زەوی یەدا، بەهۆی ئەوەوە وای دروست کرد کە بتوانێ ئەو ئەرکە ببات بەڕێوە، بەم رەنگە هەست و هۆش و ژیریی پێدا، توانا داری کرد بە هەستان بەو هەموو جۆرە کردەوە جیاوازانە تا بتوانێ ئەم هەموو پیشەسازی یە فەراهەم بێنێ و سوود وەرگرێ لەو هەموو هێزو وزەیە کە خوا لەم جیهانەدا بۆی فەراهەم هێناوە، بە کورتی وای دروست کردووە کە بتوانێ هەڵسێ بە کارو فرمانی هەردوو جیهانی. خوای گەورە ئەندازەی هەموو شتێکی بڕیار داو دیاریی کرد لە هەموو بار و روویەکی یەوە. قەبارە و شێوەی تایبەتی هەموو شتێکی دیاریی کرد، کات و شوێنی دیاریی کرد، کارو فرمانی بڕیار داو دیاریی کرد، بەڕاستی پێك هێنانی ئەم بوونەوەرە گەورە و فراوانە لەم هەموو شتە جیا جیای جیاوازە و فەراهەم هێنانی هەموو یەکێ لەو شتە جیاوازانە هەریەکە لەو هەموو کەرەسە و بەش و پارچەیە، لە رادەیەکی تایبەتی دا و یەك خستنی ئەو هەمووە کە نایەتە ژمارە و کەس ژمارەیان نازانێ جگە لەخوا، بەڕاستی بیر کردنەوە لەم بوونەوەرە گرنگە هۆی سەر سوڕمان و سەرگەردانی یە و هەرکەس بێ بەش نەبێ لە فام و ژیریی و چاوی دڵی کوێر نەبێ و سەمسای لێ نەبڕابێ هەرگیز خەیاڵی رێکەوت بە دەروونی دا گوزەر ناکات، بەڵکو باوەڕی بەهێزی ئەبێ بە بوونی پەروەردگاری زانای لێزانی خاوەن دەسەڵات و توانای بێ سنوور و هەتا باشتر بیر بکرێتەوە زۆرتر سەر سوڕ ئەمێنێ لە کرداری پەروەردگار لەم دروست کراو و بوونەوەرەدا، کە هەموو ئادەمی دەستە پاچە و پەك کەوتوون لە دۆزینەوەو رێ بردن بە هەموو نهێنی یە نایابەکانی خوا لە تەنیا ناوچە و بەشێکی زۆر بچووك لەم بوونەوەرە گەورەیەدا کە تەنها خوا ئەم پەڕ و پەوپەڕی ئەزانێ. هەتا زانین و زانیاری

پێش بکەویْ باشتر روون ئەبێتەوە ئەم رێك و پێکی یە کە خوا فەراهەمی هێناوە لە نێوان هەموو بەش و پارچەکانی ئەم بوونەوەرەدا، تێرو تەواوی یاسا و رژێمی ئاشکرا تر ئەبێت لە ئادەمی، ئەو کات تێگەیشتنی ئادەمی زۆرتر و فراوانتر ئەبێت لە مەبەست بەم رستەیە: ﴿فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾!! پاکی و بێگەردی بۆ خوایە کە ئەم قورئانەی خەلاتی ئادەمی کرد. خاوەنی کتێبی(العلم يدعو للإيمان) لەم بارەیەوە چەند نموونەیەکی نایابی خستووەتە پێش چاو کە لەم چەرخانی دوایی یەدا رێگایان پێ براوە و زانراون، پێویستە زانین و بیر لێ کردنەوەیان: ئەڵێ بەڕاستی هۆی سەر سوڕمان و سەرسامی یە کە ئەم بوونەوەرە بەم شێوە نایابە دارێژراوە و هۆنراوەتەوە و ئەو هەموو وردەکاری یەی تێدا کراوە. بۆ وێنە توێکلْ و پێستی زەوی ئەگەر لەم باری ئێستا قەڵەو تر بوایە بە ئەندازەی چەند پێ یەك، ئەو کاتە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ئۆکسجینی هەڵئەمژی و بەهۆی ئەوەوە ژیان نەئەبوو و نەئەگونجا بۆ گیا و درەخت و هەموو سەوزەیە. ئەگەر هەوا بەرز تر بوایە لەم رادەی ئێستا ئەو کاتە هێندێ لەو هەموو چەخماخەی کە بە ملیۆنەها ئەسوتێن لە بۆشایی و هەوای دەرەوەدا هەندێ لەو ئاگر و چەخماخانە ئەکەوتن و ئەیان دا لە هەموو کورەی زەوی، لە کاتێك دا کە ئەوەندە تیژ رەو و چەسپان بێت کە لە چرکەیەك دا شەش میل تا چل میل ببڕێ. جا ئەو کاتە لەوانە ئەبوو هەر شتێ کە دەست بدات بۆ سووتان گڕی بگرتایە و بسووتایە، ئەگەر تیژ رەوی یان لە رادەی گوللەی تفەنگ دا بوایە ئەو کاتە هەموو ئەو چەخماخانە ئەکەوتن و ئەیان دا لە زەوی، بێگومان بەرهەمی ئەو لێکەوتنەش شتێکی سامناکی ترسێنەر ئەبوو لەبارەی هەموو زەوی یەوە و لەبارەی هەموو ئادەمی یەوە کاری زۆر سامناك و خراپ رووی ئەدا، چونکە بە لێکەوتنی چەخماخەیەکی بچووك پارە پارە ئەبوو تەنها بەهۆی گەرمی یەکەیەوە، چ جای ئەوە بەری بکەویْ. قەبارە و قلەختی هەوا لە ئەندازە و رادەیەکی تایبەتی دایە کە پێویستە و بەسە بۆ هات و چۆی تیشك و رووناکی یە کە کشت و کالْ پێویستی پێ ی هەیە، بوونی پێویستە بۆ کوشتنی میکرۆب و فەراهەم هێنانی ڤیتامین و بە بێ ئەمەی زیان بگەیەنێ بە ئادەمی، مەگەر

خۆی بداتە بەر ماوەیەکی دوور و درێژ. ئینجا لەگەڵ ئەمەدا بە درێژایی کات و چەرخ هەڵم و غاز بەرز ئەبێتەوە لە زەوی یەوە و زۆربەیش ژاراوی یە، کەچی خوا کارێکی وای کردووە هەوا بە پاکی ئەمێنێتەوە و ژەهر و ژارەکە ناگرێتە خۆی و رادەی ناگۆڕێ، ئەو بار و هاوکێشی یە کە هەیە لە نێوان بەش و کەرەسەکانی دا کە پێویستە بۆ ژیانی ئادەمی بە هیچ جۆر ناگۆڕێ بەهۆی ئەو هەڵم و غازەی کە تێکەڵی ئەبێت.

خاوەنی ئەو کتێبە لە شوێنێکی تردا ئەڵێت: ئەگەر ئۆکسجین لە هەوادا بە ئەندازە و رادەی ٥٠٪ پتر بوایە لە باتی ٢١٪ ئەو کاتە هەر شتێ لەم جیهانەدا دەستی بدایە بۆ سووتان مەترسی داگیرسانی لێ ئەکرا، لەوانە بوو چڕ و دارستانێکی گەورە بە یەك جار گڕی بگرتایە بەهۆی بزیسکەی چەخماخەیەکەوە کە بکەوتایە لە تاکە درەختێکی، ئەگەر ئەندازە و رادەی ئۆکسجین بهاتایەتە خوارەوە لەرادەی ٢١٪ بۆ ١٠٪ یان کەمتر. بەڵێ لەوانەبوو دەقی پێوە بگیرایە لەپاش چەند چەرخێ ژیان بگونجایە، بەلام لەو کاتەدا هۆی ئاوەدانی و شارستانی کەم دەست ئەکەوت، بۆ وێنە ئاگر کەم دەست ئەکەوت کە هۆیەکی یەکەمە لە شارستانی دا. هەروەها لە چەند شوێنێکی تردا چەند شتی سەر سوڕهێنەری تر ئەخاتە پێش چاو بۆ نموونە ئەم ئەندازەیان لێرەدا هێنا و بە بۆنەی وێنەی ئەم ئایەتەوە لە چەند سورەتێکی تردا چەند شتێکی ترمان باس کردووە، با تەماشا بکرێن، لەم چەند ئایەتی رابوردووەدا باسی تاکی خوا و هەندێ لە سیفەتە گرنگەکانی کرد لەگەڵ راستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەردا(ﷺ)، ئنیجا دەم کوت و بەرپەرچی ئەوانە ئەداتەوە کە باوەڕیان نی یە بەو شتە راستانە، بەڵکو بڕوایان دژو پێچەوانەیە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾ ئەوانە چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان بڕیار داوە لە کاتێك دا تێپەڕیان کردووە لە پەرستنی ئەو خوایەی کە هەندێ لە سیفەت و نیشانە و بەرهەمی توانا و دەسەلاتی باس کرا، کە ئەو پەرستراوانەیان چەند سیفەت و نیشانەیەکیان تێدایە دژ و پێچەوانەی خوایەتی یە و ناگونجێ لەگەڵ خوایەتی دا:

لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ

- **﴿لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا﴾ هیچ شتێك دروست ناكەن و پەرستراویش ئەبێ توانا بێت بەسەر دروست كردن و داهێنان دا.**
- **﴿وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ ئەوان خۆیان دروست كراون، ئاشكرایە دروست كراو نابێ و شایان نی یە بۆ پەرستن.**
- **﴿وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ ناتوانن نە بەرگری هیچ زیانێك لە خۆیان بكەن و نە هیچ سوود و قازانجێكیان بۆ راكێشن، و جای بۆ خەڵكی تر، هەرچیش بەو جۆرە بێت پەرستن و مل كەچی بۆی زۆر ناڕەوا و ناڕاستە.**
- **﴿وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا﴾ ناتوانن و دەسەڵاتیان نی یە بەسەر مراندنی هیچ زیندوویەك و گیان پێدانی هیچ كەس لەم جیهانەدا و زیندوو كردنەوەی هیچ مردوویەك لە رۆژی دوایی دا، كەواتە ئەمانە بێ بەشن لە هەموو جۆرە سیفەت و نیشانەیەكی خوایەتی، دەی ئیتر ئەو بت پەرستە سەر لێ تێك چوانە بە چ بەڵگە و هۆیەك ئەم بێ نرخ و بێ كەڵكانە ئەپەرستن؟!!**

**ئینجا دێتە سەر باسی دەم درێژیی یان لەبارەی قورئان و پێغەمبەرەوە(ص) و بەجۆرێ بەرپەرچیان ئەداتەوە و دەم كوتیان ئەكات كە دەلەسە و بێ نرخی یان روون ئەكاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ ئەوانەی كە بێ بڕوا بوون وتیان و ئەڵێن: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ﴾ ئەم قورئانە كە محمد ئەیڵێ هیچ نی یە جگە لە درۆیەكی زل كە خۆی دایهێناوە و هەڵی بەستووە ﴿وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ﴾ گەل و كۆمەڵی تر یارمەتی یان داوە و كۆمەكی یان كردووە لەسەری، مەبەستیان بەو گەلە جوولەكەیە كە گوایە ئەوان هەواڵی گەل و ئوممەتە رابوردووەكانی پێ ئەگەیەنن، ئەویش بە وتە ووتاری خۆی ئەیهۆنێتەوە، یان مەبەستیان سێ**

کەس بوو کە بەندە بوون لە مەککەدا: (عداس و یسار و جبر) کە لەوەو پێش کیتابی بوون و لەپاشان موسڵمان بوون و پێغەمبەر(ﷺ) سەرپەرشتی ئەکردن و سەری لیٚ ئەدان، هەرکام مەبەست بێت درۆ لەمە زل تر نابیٚ ئەو کافرانە ئەیان وت، خۆیان لە دەروونی خۆیان دا باش ئەیانزانی کە ئەوە درۆیەکی بیٚ بنچ و بنەوانە، چونکە ئەو سەرۆکانەی کە ئەو فاك و فیکەیان ئەخستە ناوە و نەفامیان پیٚ ئەخەڵەتاند بێگومان بوون کە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەیخوێنێتەوە بەسەریان دا لە جۆری وتار و هۆنراوەی ئادەمی نی یە و شتێکی تری جیاوازە و خۆیان هەستیان بەوە ئەکرد و خۆیان بۆ نەئەگیرا لە ئاستی و خۆیان لیٚ ئەشاردەوە با کاریان لیٚ نەکات، ئینجا خۆیان شارەزای پێغەمبەر بوون(ﷺ) و ناسراو بوو لە ناویان دا بە راست و راستگۆیی هەر لە منداڵی یەوە، بێگومان بوون کە هەرگیز درۆی لەگەڵ هیچ کەس نەکردووە و بەدەم هیچ کەسەوە درۆی هەڵنەبەستووە چ جای بەدەم خواوە ئەو سەرۆکانە لە دەروونی خۆیان دا بێگومان بوون لە راستی پێغەمبەر(ﷺ)، بەلاّم مل هوڕی و سەرکێشی یان و هەروەها مەترسی یان لە نەمان و لە کیس چوونی سەرۆکی و ئاغایەتی یان پاڵی پێوە نان بۆ فەراهەم هێنانی ئەو هەموو پیلان و فاك و فیکە لەناو کۆڕ و جەماوەردا بۆ دوور خستنەوەیان لەو ئایینە پاکە، تا ئەوان هەر ژێر بار بن و ئەمانیش هەر سوار بن.

بەڕاستی وتەکەیان ئێجگار بیٚ نرخە، ئەبوایە هەر خۆیان شەرمیان بکردایە لەوەی شتی وا بیٚ نرخ بەدەمیان دا بێت، چونکە ئەگەر راستیان ئەکرد دەی ئەوانیش هەوڵیان بدایە و بە کۆمەکی خەڵکی وتاریان هەڵبەستایە و بیان رازانایەتەوە بەرامبەر قورئانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە چەند جار هان و هۆنەی دان و بەرهەڵستیان وەستا و رێگای لیٚ برینەوە کە ئەگەر راست ئەکەن وێنەی بهێنن و بیڵێن کە زۆر تەنگەتاویش بوون هۆنراوەشیان دانا و هیچی سوودیشی نەبوو. بیٚ نرخی و پڕ و پووچی قسە و وتەکانیان ئەوەندە ئاشکرایە پێویست بە لێکۆڵینەوە ناکات، جا لەبەر ئەوە هیچ نەکۆڵی یەوە، بەڵکو لەکەدار و زامداریان ئەکات بەوسیفەت و نیشانە ئاشکرای کە جێگیرە تیٚ یان دا،

فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ

ئەفەرموێ: ﴿فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا﴾ بەڕاستی ئەوانە جەور و ستەم و بوختانێکی گەورەیان کرد، جەور و ستەمیان کرد لەگەڵ حەق و ڕاستی دا و لەگەڵ محمد دا و لەگەڵ خۆیان دا و درۆیەکی زلیان کرد کە ناڕەوایی یەکەی ئاشکرایە. ئینجا وتە و قسەیەکی ناڕەوای تریان ئەهێنێ کە دەم درێژیی یان پێ کرد دەربارەی پێغەمبەر و قورئان، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا﴾ ئەوانە وتیان: ئەمەی کە محمد رای ئەگەیەنێت قسە و شتی پڕ و پووچی نووسراوی گەلە پێشووەکانە، محمد داوای نووسینەوەی کردوون بۆ خۆی و نووسراونەتەوە بۆی ﴿فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ ئینجا ئەو قسە پڕ و پووچانە ئەخوێنرێتەوە بەسەری دا بەیانی و ئێوارە بۆ ئەمەی لەبەری بکات. بە کورتی کاتێ ئەیان بیست قورئان هەواڵی گەلە پێشووەکانی تێدایە و کە ئەوەش بۆ مۆچیاری و تەمێ دادانە و هەمووی دەرسیان لێ وەرئەگیرێت، ئەو کافرە بەد بەختانە ئەو پڕ و پاگەندەیان لێ دروست ئەکات کە جگە لە چەنە بازی و دەم درێژیی هیچی تری تیا بەسەر نەبوو، چونکە هەرکەس کەمێ تێگەیشتنی ببێت ئەو هەواڵ و سەرگوزەشتە ڕاستانەی قورئان جوێ ئەکاتەوە لەو قسە و شتە پڕو پووچانە، کەواتە پێویست بە لێکۆڵینەوە ناکات و وەڵام و دەم کوت کردنیان هەر بەم جۆرە ڕێك و ڕاستە کە ئەفەرموێ: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ بلێ ئەم قورئانە ئەوە نی یە کە ئێوە ئەڵێن، بەڵکو شتێکی ئاسمانی یە و کەسێك ناردوویەتی یە خوارەوە کە ئاگادارە و هەموو نهێنی و شاراوەکانی ئاسمان و زەوی ئەزانێت، کەواتە ئەو هەواڵ و سەرگوزەشتانەی کە لە قورئان دا هەن هەموو ڕاست و بێگەردە و گێڕانەوەی ئەو هەواڵانە موعجیزە و رابەرێکی بەهێزن لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ). بەڵێ بەڕاستی پڕ و پاگەندەکەیان ئێجگار بێ نرخ و بۆشە، چونکە ئەگەر ڕاست ئەکەن بۆچی دەستە پاچە و داماون بەرامبەر قورئان، بێجگە لەوەش ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەم قورئانەی لە خەڵکی وەرگرتووە ئەی ئەو خەڵکە بۆچی خۆیان نایەنە پێشەوە خۆیان داوای پێغەمبەرێتی بکەن و ئەو پلە و پایە بەرزە بۆ خۆیان فەراهەم بێنن؟!! بەندەکانی خوا هەرچەند تاوان و خراپەکاری بکەن ئاپی پان و فراوانی تۆبە و گەڕانەوەلەسەرپشتەبۆیان، هەرکات بەڕاستی بگەڕێنەوەبۆلای پەروەردگاریان وەریان ئەگرێت،

﴿إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ چونکە بەڕاستی خوا زۆر لیّ بوردە و سەرەرەوەی گوناهو تاوانە و زۆر بەزەیی دارە لەئاستی بەندەکانی، رەخنە و دەم دریّژیی لەمە و پیّشیان لە یەکەم جارەوە دەربارەی قورئان بوو، ئینجا باسی چەند رەخنە و دەم دریّژیی یەکیان ئەکات کە لە ریّوە ناراستەی پیّغەمبەریان ئەکرد و لەم بارەیەوە ئەیانویست پیّغەمبەریّتی یەکەی بە ناڕاست و ناڕەوا دەرکەن و رەخنەکانیشیان لیّرە بریتی یە لە پیّنج رەخنە کە لایان وایە دژی پیّغەمبەریّتی یە:

● ئەفەرمویّ: ﴿وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ﴾ ئەو بیّ بڕوایانە وتیان: ئایا چ شتیّك و چ هۆیەك هەیەبۆئەمەی کەخۆی بەپیّغەمبەرنیشان ئەدات ولەکاتیّك داکە خۆراك ئەخوات، واتەهیچ هۆیەك نییەبۆی ونابیّ پیّغەمبەر بیّت، ماتولّ خۆراك بەوێنەی ئیّمەدەخوات.

● ﴿وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ﴾ ئەگەڕیّ و هات و چۆ ئەکات بە بازاڕەکان دا بۆ رۆزی پەیدا کردن، واتە هیچ جیاوازی یەکی نی یە لە ئیّمە و هەروەکو ئیّمە ئەژی، کەواتە چۆن ئەبیّ پیّغەمبەر بیّت، ئەم رەخنە بیّ جیّ یە لە لایەن نەفام و نەزانەوە هەر لە کۆنەوە گیراوە لە پیّغەمبەران – درودی خوایان لەسەر بیّت – ئەو رەخنە گرانە لەبەر تیّنەگەیشتوویی و نەفامی یان سەرسام ئەبوون لەمەی کەسیّ ئادەمی بیّت و ویّنەی خۆیان بیّت لە ژیان دا و لەم زەوی یەدا بژی وەکو ئەوان و لەگەلّ ئەوەدا پەیوەندی ببیّت لەگەلّ ئاسمان و هەوالّی لەویّوە بۆ بیّت و ئەمان هەموو ویّلّ و بیّ بەش بن لەوە. بەلاّم هەرکەس تیّگەیشتوو بیّت هەرگیز سەر لە شتی وا ناکاتەوە، چونکە ئەزانیّت ئەو خوایەی کە ئادەمی جویّ کردووەتەوە لە هەموو گیان لەبەرانی تر توانایە لەناو ئادەمی دا هەندیّکیان جویّ بکاتەوە و هیّز و توانایەکی جیاواز بدات بە هەندیّ لە بەندەیانی تا بتوانن ئەو پەیوەندی یە پەیدا بکەن و بتوانن لە پەروەردگاریانەوە هەوالّ و فەرمان وەرگرن، هەروەها هەرکەس ژیریی و تیّگەیشتنی تەواو بیّت ئەزانیّت ئەو ئادەمی یەی کە خوا کردوویەتی بە جیّنشین لەم زەوی یەدا و کاروباری جیهانی خستووەتە ژیّر دەست پیّویستی بە کۆمەکی و ریّنموونی هەیە ئەگینا کار و فرمانی بەڕیّکی بۆ ناڕوا بەڕیّوە، چونکە زانینی ناتەواوە و ژیریی هەلّە بازە و لە ریّگای راست لائەدات و ئەترازیّت، کەواتە هەرچۆنیّ ئەو ئەرکە گەورەی خستوونەتە سەرشان، یارمەتیشیان ئەدات و ریّنموونی یان ئەکات.

لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾

---

• ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا﴾ با فریشتەیەك بنێررایەتە خوارەوە بۆلای تا لەگەڵیان ببوایە بە ترسێنەر، واتە تا بەهۆی ئەو فریشتەوە بمانزانی یایە و روون ببوایە کە ئەمیش پێغەمبەرە. بەڕاستی ئەم رەخنەشیان زۆر بێ نرخە، چونکە ئەگەر فریشتەی لەگەڵ بهاتایە لەسەر شێوەی فریشتەیی بوایە، ئەمان نەیان ئەبینی، کەواتە بوون و نەبوون یەکسان ئەبوو، مەبەستەکەیان پێك نەئەهات، ئەگەر لە شێوەی ئادەمی دا بهاتایە باوەڕیان بە پێغەمبەرێتی خۆی نەئەبوو، چ جای ببوایە بە شایەت لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) بێجگە لەوەش فریشتە دەست نادات ببێ بە پێغەمبەری ئادەمی، چونکە پێغەمبەر ئەبێت پێشەوا بێت و ئوممەت و گەلەکەی پەیڕەوی بکەن لە خو و رەوشت و کرداری دا، هەروەها پێغەمبەر ئەبێت کەسێ بێت هەست بکات بە خۆشی و ناخۆشی و هەموو کاروباری ئوممەتەکەی تا بتوانێت لەناویان دا بژی و لەگەڵیان هەڵسێ و دانیشێ بەهۆی ئەوەوە بتوانێت پەیامەکەیان پێ راگەیەنێت و بزانێت لە چ رێگایەکەوە لەگەڵیان بدوێ و کاریان لێ بکات؟ دەی ئەگەر فریشتە بێت سروشتی جیاوازە، کەواتە نە ئەوان ئەتوانن پەیڕەوی بکەن و لاسایی بکەنەوە و نە ئەویش ئەتوانێت لەگەڵیان بژی و نە ئەشزانێت لە چ رێگایەکی شیاو و گونجاوەوە لەگەڵیان بدوێ و خەریك ببێت، کەواتە با ئەو رەخنە گرانە بزانن کە ئەوان نەزان و نەفامن، خوا خۆی ئەزانێت و لێزان و کاردروستە کە پێغەمبەرانی لە تیرەی ئادەمی بڕیار دا، لە پێشەوە رەخنەیەکیان ئەوەبوو کە پێغەمبەر پێویستی هەیە و بێ نەوایە بە هۆی ئەوەوە هات چۆی بازاڕ ئەکات و پێك هێنانی رۆزی و هۆی گوزەرانی.

■ ﴿أَوْ يُلْقَىٰ إِلَيْهِ كَنزٌ﴾ ئەگەر ئەمە پێغەمبەرە دەی با لە ئاسمانەوە غەزنەیەك بهێنرایەتە خوارەوە بۆلای تا پێی ببوایە بە پیاوێکی دیاریی و دەسەلات دارو پێویستی نەبوایە بە هەوڵدان بۆ رۆزی پەیدا کردن.

■ ئینجا ئەم پەلپ و رەخنەیە ئەگرن و ئەڵێن: ﴿أَوْ تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا﴾ یان باغێکی ببوایە لێ ی بخواردایە و پێ ی بژیایە، وەکو هەندێ کەس کە دەست رۆیشتوون و شتی وایان هەیە، زەمەخشەری لە(کشاف) دا ئەفەرموێ: لە یەکەم جارەوە داوایان کرد و پەلپیان ئەوەبوو کە پێغەمبەر فریشتە بێت، ئینجا پلەیەك هاتنە خوارەوە بۆ ئەوەی فریشتەی لەگەلْ دا بوایە، ئینجا لەوەش هاتنە خوارەوە پلەیەکی تر بۆ ئەمەی خاوەن غەزنە و سامانی زۆر بوایە، ئینجا هاتنە خوارەوە و بەوە رازی بوون باغێکی ببوایە رۆزی و گوزەرانی پێ بکردایە.

ئەمانە هەرچۆنێ لە دوو پەلپ و رەخنە پێشووەکەیان دا، تێنەگەیشتوو و نەفام بوون وەکو هەندێ روونمان کردەوە هەروەها لەم دوو رەخنەو پەلپەیش دا نەفام و نەزان و تێنەگەیشتوو بوون، نەیان ئەزانی کە خوا نایەوێ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) نە غەزنەی ببێت و نە باغ، چونکە ویستی کە ببێت بە پێشەوا و چاولێکەری ئوممەتەکەی هەڵسێ بە ئەرکی گرنگ و قورسی پەیام و فروستادەیی یەکەی و لە عەینی کات دا، هەوڵ بدات بۆ ژیان و رۆزی بە رێنەی یەکێ لە ئوممەت و گەلەکەی، کەواتە هیچ کەسێك لە ئوممەتەکەی کە خەریك بێت بە ئەرکی پێك هێنانی رۆزی و هۆی ژیانەوە رێگای نی یە بڵێ: پێغەمبەر بێ پێویستە و هیچ سزا و ئەرکێکی لەسەر شان نی یە و خەریك نی یە بە هیچ شتێکی ترەوە، کەواتە ئەتوانێت هەڵسێت بە پێویستی ئایینەکەی و ئەو ئەرکەی پێ ئەبرێت بەرێوە. بەڵام منی داماو بە هیچ جۆر دەستم ناکات و خەریکم بە فەراهەم هێنانی هۆی ژیانەوە چی بکەم چارەم نی یە کەس رێگای ئەو بەهانەی نی یە، چونکە بە چاوی خۆی ئەیدی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە لایەکەوە وەکو ئەوان خەریکە بەهۆی دەست و بازوی خۆی نان و گوزەران پەیدا ئەکات، لەلایەکی ترەوە هەڵئەسێت بە ئەرك و

پێویستی ئایینەکەی خوا بە بێ هیچ کەم و کورِی یەك ئەو ئەرکە زۆر گەورە و گرانە بەجێ ئەهێنێت، دەی هەر کام لە ئوممەتەکەی با هەڵسێت بە ئەرکی خۆی کە لە چاو ئەرکی پێغەمبەردا هەر ئەرك نی یە.

لەپاش ئەو بێ نەوایی و بێ دەستی یە سامان و دارایی داباری بەسەر پێغەمبەردا(ص) بە لێشاو، لەم بارەیشەوە دەستی نەگیرا بەو سامانەوە و خەریکی نەکرد لەو کار و ئەرکە گرانەی کە خوا پێی سپارد بوو، بەڵکو دەستی بەفەرِیتێ خست لە رێگای خوادا پرژ و بڵاوی کردەوە لەناو بەناوی بەندەکانی خوادا، خوا ئەو حاڵەیشی بەسەردا هێنا تا خەڵکی بیکەن بە پێشەوا و بتوانن زاڵ بین بەسەر ماڵ و سامان دا، کەم نرخ ببێ لە دەروونیان دا، با کەس رێگای نەبێ بیانوو بهێنێتەوە بە دەست گیران بە ماڵ و سامانەوە. ئایا ماڵ چییە؟ غەزنە چییە؟ باغات چی یە؟ کاتێ کە دڵی ئادەمی پەیوەندی کرد و بەسترا بە خوای خۆیەوە، هەموو زەوی و هەرچی لەسەریەتی چییە و چ نرخێکی هەیە؟ بەڵکو هەموو ئەم بوونەوەرە چی یە لە پاش پەیوەندی و بەستنەوەی دڵ بە خواوە کە ئەو پەروەردگاری هەمووانە و بەخشندەی هەموو شتێکە، زۆر و کەم؟ بەڵام ئەوانە نەزان و نەفام و تێنەگەیشتوون!! ئەو بێ بروا و سەر لێ تێك چووانە لە هەموو بار و روویەکەوە نەئەوەستان لە پرِ و پاگەندە و هەر دەمە شتێکیان ئەگرت بە دەستەوە لە رەخنەکانی رابوردوو، لەبارەی ژیریی و لێزانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) هیچ قسە و باسێکیان نەبوو، بەڵکو ئەو رەخنە و پەڵپ و بەهانەیان بوو لە پێغەمبەرێتی یەکەی کە بەرپەرچ درانەوەو نەفامی و نەزانی خۆیان لێ روون کرایەوە. ئینجا لێرەدا وشەیەکی تریان لێ ئەگێرێتەوە کە ئێجگار نارِەوا و ناراستە، حەق وابوو شەرم بیگرتنایە لەوەی شتی وا بە دەمیان دا بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسۡحُورًا﴾ ئەو بێ بروا و ستەمکارانە وتیان بە ئیمانداران: ئەو کەسەی کە ئێوە پەیرەوی ئەکەن و شوێنی ئەکەون هیچ نی یە جگە لەوە پیاوێکە جادو لێکراوە و جادو کاری لێکردووە تا ژیریی نەماوە و شێت بووە. ئەم وشە نارەوا لێرە و لە سورەتی(الإسراء) دا ئەگێرێتەوە لەو بێ بروا ستەم کارانەوە، لە هەردوو سورەتەکەدا

به یەك جۆر بەرپەرچ ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ﴾ ئەی پێغەمبەر بە سەرسامی یەوە تەماشاکە کە ئەوانە چۆن دەربارەی تۆ ئەو شتە پڕوپووچانەیان وتووە، چۆن ئەو هەموو لەکە و رەخنە ناڕاستانەیان هەڵبەستووە بۆ تۆ کە ئەوەندە بێ جێ و ناڕەوا و دوورن لە ژیریی یەوە جێگای سەرسوڕمانن و لەوانەن بە وێنەی پەندی پێشینان لەناو خەڵك دا باس بکرێن و بیانگێڕنەوە؟ ﴿فَضَلُّواْ﴾ بەهۆی ئەوەوە گومڕا بوون و مانەوە بە سەرگەردانی و کۆنابنەوە لەسەر بارێ و دامەزراو نابن و هەر دەمە شتێ ئەڵێن و هەر جارێك بە جۆرێ پڕ و پاگەندە ئەکەن، وەکو ئەفەرموێ: ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا﴾ واتە گومڕا بوون بەم رەنگە ناتوانن رێگایەك بدۆزنەوە و بیگرن بە دەستەوە و بڕیاری لەسەر بدەن بۆ تەشەر دان لە پێغەمبەرێتی یەکەت، یان بەهۆی ئەو قسە و وشە پڕو پووچەوە رێگایان ون کرد و لایان دا لە رێگای راست بەهۆی ئەوەوە رێگایان دەست ناکەوێ بیانگەیەنێت بە حەق و راستی. ئەو بێ بڕوا و ستەم کارانە بەو پڕو پاگەندە ئەیان ویست پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لەکەدار بکەن لە پێش چاوی خەڵکی بەمەی جادوی لێ کراوە و هۆشی بەلای خۆیەوە نییە، کەواتە ئەو وتارەی پێتان رائەگەیەنێت وتاری شێتە و بە گوێرەی باو و سروشتی ئادەمی نییە، بەهۆی ئەوەوە خەڵکی بە شتێکی نایابی سەیر ئەکەن و سەریان سوڕ ئەمێنێت لێی، ئەمانە هەرچەند مەبەستیان لەکەدار کردنی ئەو پێغەمبەرە بێگەردە بوو، بەڵام لە هەمان کات دا دەرئەکەوێ کە لە دەروونی خۆیان دا هەستیان ئەکرد کە ئەم قورئانە شتێکە لەباوی ئادەمی بە دەرە و لە توانای ئادەمی دا نییە. ئینجا لێرەدا لێکۆڵینەوەکە دوایی ئەهێنێت بە روون کردنەوەی بێنرخی ئەو غەزنە و باغ و بەهەشتەی کە ئەوان بە نرخ داریان دائەنان و لایان وابوو ئەگەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر راستە ئەبوایە خوا ئەوانەی پێ بدایە،

تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ﴿١٠﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ

---

ئەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ﴾ پیت و فەڕ و بەخشش زۆر و فراوانە خوایەك كە ئەگەر بیەوێ فەراهەم ئەهێنێ بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر لەم جیهانەدا باشتر لەوەی كە ئەو بێ بڕوایانە ئەڵێن و بڕ و بیانووی پێ ئەگرن، باشتر لەوەش ئەوەیە كە بەڵێنی پێداوە بۆ ڕۆژی دوایی وەكو ڕوون ئەبێتەوە لەم فەرمودەیەوە ﴿جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ئەگەر بیەوێ لەم جیهانەدا چەند بەهەشتێكت پێ ئەدات كە ڕووبارەكان دێن و ئەچن لەژێر كۆشكەكانی و لەژێر درەختەكانی دا، ﴿وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا﴾ ئەگەر بیەوێ چەند كۆشكی گرنگت بۆ بڕیار ئەدات و فەراهەمی ئەهێنێ بۆت لەم جیهانەدا، بەڵام ئەوەی نەویست، چونكە ئەم جیهانە و هەرچی لەم جیهانەدایە ئەڕوا و نامێنێتەوە خوایش شتی وا ناكات بە پاداشتی دۆست و خۆشەویستانی. بەڵێ خوا نەیویست ئەو شتە بێ نرخانە بدات بەم پێغەمبەرە خۆشەویستەی لەم جیهانەدا، بەڵكو شتێكی پێدا كە لە هەموو شت گەورەترە و هەرگیز خێرو بێر و بەروبوومی دوایی نایەت كە بریتی یە لەم ئایین و شەریعەتە گشتی یە جیهانی یە كە بەهۆی ئەوەوە بوو بە پێشەوا و سەردار لە هەردوو جیهان و بوو بە گەورەی هەموو ئادەمی لە ڕۆژی دوایی دا بە جۆرێك هەموو كەس ئاواتی لێ ئەخوازێ. لە پاش پیشاندانی ئەو وشە ناڕاست و ناڕەوایانەیان كە باس كران لەگەڵ بەرپەرچ دانەوەیان بە شێوەیەكی كورت، ئینجا لەوەوە كۆتایی ئەهێنێ و ئەگوێزێتەوەبۆ باسی كوفر و بێ بڕوایی یان لەباری ترەوە كە بێ باوەڕی یە بە ڕۆژی دوایی كە بەهۆی ئەو بێ بڕوایی یەوە سەر ناپێچنەوە لە هیچ گوناهو تاوانی تر، ئەفەرموێ: ﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ﴾ ئەوانە بڕوایان نی یە بە ڕۆژی دوایی و هەواڵدان بە هاتنی بە درۆ ئەزانن، جا بەهۆی ئەوەوە چاویان بڕیوەتە تەنها ژیان و شت و مەكی ئەم جیهانە و لایان وایە ڕێز و بەرزی بە سامان و دارایی دەست كەوت ئەبن، كەواتە ڕەخنە و تانە ئەدەن لە پێغەمبەر(ﷺ) بە بێ نەوایی و كەم دارایی. هەروەها بێ بڕوایی بە ڕۆژی دوایی ئەبێتە هۆی باوەڕ نەهێنان بە پێغەمبەر و ئایینەكەی، ئەبێتە هۆی ئەوە گوێ نەگرن بۆ هیچ پەند و مۆچیاری یەك و مژدە و ترساندن كار نەكات لە دەروونی ئەو بێ باوەڕانە، بێ بڕوایی بە ڕۆژی دوایی تا ڕادەیەك خراپ و زیانداره، لێرەدا كۆتایی هێنا لەو هەموو وتار و وشەی كوفرە كە لە پێشەوە باسی كردن، بە تایبەتی ئەم كوفرە گەورەی خستنە پێش چاو و ئەم هەڕەشە سامناكەی ئاراستە كرد بەرامبەر هەركەس بڕوای بەو ڕۆژە نەبێ،

وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾
وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟
ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً
وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾

---

**﴿وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا﴾ ئەوانـەی بڕوایـان نـی یـە بـە ڕۆژی دوایـی، ئێمـەش ئامادەمان كردووە ئاگرێك كە بەتین هەڵگیرسێنراوە - خوا پەنامان بدات لێ ی - بۆ كەسێ كە بڕوای بەو ڕۆژە نەبێ و هاتنی بە درۆ بزانێ. ئینجا ئەو ئاگرە ئامادە كراوە پیشان ئەدات لە شێوەیەكی ئێجگار سامناك و دڵ داچڵەكێنەردا، شێوەی گیان لەبەرێكی بینای زۆر داخ لە دڵ بۆ ئـەو بـێ بڕوایانـە، ئەفـەرموێ: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا﴾ كـاتێ ئـەو ئـاگرە بەتینـە بـێ بڕواكـان چـاو ئـەكات لـە دوورەوە و لـە شـوێنێكی دوورەوە بـێ بڕواكـان دەنگـی چەپۆكان و كوڵانی ئەبیستن كە نیشانەی دەربڕینی ڕق و قینی زۆر بـەتینی یـەتی لـێ یـان، پیشكە و نركە و پرمەی ئەبیستن بۆیان، پەنا ئەگرن بەخوا لەو شێوە كە ئێجگار سامناك و دڵ داچڵەكێنەرە، وەرە بیر بكەرەوە ئەو چارە ڕەشانە بە ڕوو ڕەشی و نائومێدی و بە زنجیر كراوی بدرێنە بەر بەرە و دۆزەخ و دۆزەخیش خوا بەو جۆرەی لـێ بكات و هـەر لـە دوورەوە تـرس و بیمی وا بخاتە دەروونیان، ئینجا بەو هەموو بیم و دڵە لەرزەوە كە گەیشتنە لای بە كۆت و زنجیر كراوی توڕ ئەدرێنە ناو ئەو ئاگرە بەتینە داخ لە دڵە، بەڕاستی زمان و نووسینی ئێمە ناكات بە باس و ڕوون كردنەوەی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتەدا، پـەنا ئـەگرن بـە خـوا تـەنها بـەوەش وازیـان لێ ناهێنن، بەڵكو توڕ ئەدرێنە شوێن و جێگای تەنگ تا سزا و ئازارەكەیان سەخت تر و بەتین تـر بێـت، دیـارە لـەو كاتـەدا هـاوار ئـەكرێ بۆ مـردن و مـردن ئـاوات و ئامانجـە، وەك ئـەفـەرموێ:**

﴿ إِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ ﴾ کاتێك تور ئەدرێنە شوێنێکی تەنگ لە دۆزەخ دا بە جوت کراوی و دەست و قاچ و ملیان لە کۆت و زنجیردا ﴿ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴾ لەوێدا هاوار ئەکەن و داوای مردن ئەکەن، ئەوانە کە خوا خوایانە بۆ مردن و داوای ئەکەن سەرە رای ئەوە داوا و ئاواتەکەیان بەدی ناهێنرێت کاڵتە و لاقرتیشییان پێ ئەکرێت، بەم رەنگە لە وەڵامیان دا ئەفەرموێ: ﴿ لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴾[1] ئەمرۆ داوای تەنیا مردنێك مەکەن و داوای مردنی زۆر بکەن، چونکە مردنێکی تەنیا باس نی یە و چارەسەر ناکات و پێویستی بە مردنی زۆر هەیە، مەبەست نائومێد کردنیانە لە رزگاربوون، بەڵکو سزایان نەبڕاوەیە و بە مردنێك رزگار نابن، مەگەر بە مردنێکی زۆر کە ئەوەش شتێکی نەگونجاوە، چونکە مردن تەنیا مردنێکە. ئینجا لەم کاتەدا کە ئەو شێوە سامناکەی بێ بڕواکانی خستە پێش چاو شێوەی هەندێ لەو ناز و رێزە پیشان ئەدات کە ئامادە کراوە بۆ لە خوا ترسەکان، فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ص) کە بە شێوەی لاقرتی پێ کردن و داخ بردنە دڵی ئەو بێ بڕوایانە ئەم فەرمودەیە رابگەیەنێت: ﴿ قُلْ ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ ئایا ئەوسزا و تۆڵە سەختە کە باس کرا باشترە یان بەهەشتی نەبڕاوەی دوای نەهاتوویە کە بەڵێن دراوە بە لەخوا ترسە خۆپارێزەکان ﴿ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴾ لەکاتێك دا کە لە عیلمی خوادا تێپەڕی کردووە کە ئەو بەهەشتە بۆ ئەوانە پاداشتی کردەوە و چارەنووسیانە[2]،

---

[1] بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیری کراوەتەوە و هەموو ئەگونجێ، بەڵام ئەوەی کە لە تەفسیرەکەدا هەیە بەهێز تر و روونترە. خوا خۆی باشتر ئەزانێت.

[2] بە پێی تەفسیرەکە ئەم رستەیە(حال) ە و دروستە(بدل) بێت لە رستەی(وعد) یان سەربەخۆ بێت و(عیللەت) و هۆی بەڵێنەکە بێت. ئینجا ئەو بەهەشتە تەنها بۆ ئەوان پاداشتە و بۆ خەڵکی تر(لوتف) و بەخششە، یان مەبەست بە خۆپارێزان ئیماندارانە بە سەرجەم و شێوەی گشتی، خوا خۆی زانایە بە راستی.

﴿لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَـٰلِدِينَ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾﴾

﴿ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَـٰلِدِينَ﴾ بۆ ئەوانە هەیە لەو بەهەشتەدا كە هەمیشەیین تێ یان دا و بێ برانەوە و دواهاتن هەر شتێك ئارەزوو بكەن و بیانەوێ. بێگومان وەكو لە حەدیسی سەحیح دا ئەفەرموێ: خستنە بەهەشت تەنها بەهۆی بەزەیی خوایە، ئەگینا هیچ كەس هیچی بەلای خواوە نی یە و خوا قەرزاری كەس نی یە، ئەگەر خوا بكەوێتە مامەڵە و حەق و حیساب كەس لە ئاستی چاكە و بەهرە و بەخششی ئەو دەرناچێ و هیچی بەدەستەوە نی یە، بەڵام لە پاش خستنە بەهەشت بە پیێ كردەوە بەهەشت دابەش ئەكات و رادە و پلەی بەهەشتی یەكان جیاوازە بە گوێرەی جیاوازی كردەوەكانیان، كەواتە ئەبێ خوا هەموو تاقمێ و هەموو كەسێ دڵ ئارام و دڵنیا بكات بە رادە و پلە و ناز و رێزێ شایانە بۆی و ئارەزووی جگە لەوەی شایانە بۆیان نایكەن، جا هەموو كەس و هەموو تاقمێك لە سنوور و رادەی خۆیان دا ئارەزووی هەرچی بكەن و دڵیان حەزی لێ بكات بە بێ ئەرك و دواكەوتن بۆیان فەراهەم دێت و تەنها لە بەهەشت دا دەست ئەدات كە هەموو ئارەزوو و ئامانجێك پێك بێت و دەست كەوت ببێت، لە(لوتف) و بەزەیی یەكەی بەزیاد بێت و هەموو سوپاسێك بۆ ئەو. بەڵێن دان بەوەی كە باس كرا بە شێوەیەك كە: ﴿كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا﴾ ئەو بەڵێنە كە جێگر و بڕیاردراوە لەسەر پەروەردگارت، بەڵێنێكی لێپرسراوی داوا كراوە، واتە هەر چۆنێك ئەو بەڵێنەی داوە بەو بەندە لە خوا ترسانە و بڕیاری داوە لەسەر خۆی هەروەها رێگای داون و مافی ئەوەی پێداون كە لەو بەڵێنە بپرسنەوە و داوای بكەن لە خوای خۆیان. وەكو(ئەبو حازم) ئەفەرموێ – خوای لێ رازی بێت –: كاتێ رۆژی دوایی هات ئیمانداران ئەڵێن: ئەی خوایە گوێ رایەڵیمان كرد و بە گوێرەی فەرمانت رەفتارمان كرد، كەواتە ئەو بەڵێنەی كە پێت داوین بۆمان بەدی بهێنە، ئینجا فەرموی ئەمەیە مەبەست بە وشەی: ﴿وَعْدًا مَّسْـُٔولًا﴾. ئینجا شێوەیەكی تر لە شێوە سامناكەكانی رۆژی دوایی پیشان ئەدات، شێوەی بت پەرستەكان لەگەڵ پەرستراو و بتەكانیان دا كۆ ئەكرێنەوە و هەموو ئەوەستن لەبەر دادگای هەرە گەورە و بەرزی خوادا پرسیاریان لێ ئەكرێت و وەڵام ئەدەنەوە،

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ
ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ

---

ئەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ باسی ڕۆژێك بكە كە خوا بت پەرستەكان و پەرستراوەكانیان كە ئەیانپەرستن لەباتی خوادا هەموو كۆ ئەكاتەوە، ﴿فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ ئەفەرموێ بە پەرستراوەكان: ئایا ئێوە ئەو بەندەیانی منەتان گومڕا كرد؟ ﴿أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴾ یان خۆیان گومڕا بوون و لایان دا لە ڕێگای ڕاستی من؟ بێگومان خوا ئاگادارە بە هەموو شتێك هیچ پرسیارێكی ئەو بۆ هەواڵ پێدان و ئاگادار كردنەوە نی یە، بەڵكو مەبەست بە پرسیارەكانی شتی ترە كە ڕوون كراوەتەوە لە كاتی تەفسیر كردنی پرسیارەكانی دا، لێرەدا مەبەست ئابڕوو بردن و تەشەر لێدانی بت پەرستەكانە لە مەیدانی هەرە گەورەی دادگای ڕۆژی دوایی دا كە ئەوەش سزادانێكی زۆر سامناك و بەتینە. بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە لەو ڕۆژەدا بریتی ئەبێ لە دەربڕینی مل كەچی و گەڕانەوە بۆلای خوا لەلایەن پەرستراوەكانەوە و دان نانیان بە پاكی و بێگەردی خوا لە هەموو هاوبەش و وێنەیە، هەروەها دەربڕینی پاكی و دووری خۆیان لە پەرستنی جگە لە خوا چ جای ئەوە داوای خوایەتی بكەن، وەكو ئەفەرموێ: ﴿ قَالُوا۟﴾ پەرستراوەكان ئەڵێن: ﴿سُبْحَٰنَكَ﴾ ئەی خوایە پاكی بۆ تۆ و پاكیت لە هەموو وێنە و هاوبەشێك و لەوەی كە بت پەرستان ڕەوایان داوە بۆ تۆ. بەسەر سوڕمانەوە ئەڵێن و خۆیان بە زۆر دوور پیشان ئەدەن لەوەی بەندەی خوایان گومڕا كردبێ، ئەوەتا ئەڵێن: ﴿مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ﴾ شایان نی یە و ڕاست نی یە بۆ ئێمە بە هیچ ڕەنگ كە بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێكی تر ڕەوا و بڕیار بدەین بۆ خۆیان، واتە ئیتر چۆن بەندەیانی تۆ گومڕا ئەكەین، لایان ئەدەین لە پەرستنی تۆ؟ نەخێر ئێمە شتی وامان نەكردووە، بەڵكو ئەوان خۆیان لە ڕێگای تۆ لایان دا و گومڕا بوون و گوناهی خۆیان لە ملی خۆیانە، چونكە تۆ ئەوانت ژیاند لە باوك و باپیریانەوە لەناو ناز و نیعمەتی خۆت دا كەچی ئەوان لەباتی چاو لەبەریی و بەندەیی، سەریان كردە ڕابواردن و عەیش و نۆش و شوێنكەوتنی ئارەزووی نەفسی خۆیان، هەتا تۆیان لەبیر چوو.

وَلَٰكِن مَّتَّعۡتَهُمۡ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ نَسُواْ ٱلذِّكۡرَ وَكَانُواْ قَوۡمَۢا بُورٗا ﴿١٨﴾ فَقَدۡ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسۡتَطِيعُونَ صَرۡفٗا وَلَا نَصۡرٗاۚ

---

وەکو روون ئەبێتەوە لەم فەرمودەیەوە ﴿وَلَٰكِن مَّتَّعۡتَهُمۡ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ نَسُواْ ٱلذِّكۡرَ﴾ بەڵام ئەوانە و باوك و باپیریانت ژیاند بێ ئاگا بوون لە تۆ و ئەوانیش سەریان تێ کرد و خەریك بوون پێیەوە هەتا بێ ئاگا بوون لە تۆ و لە یادی تۆ و باوەڕ بە تاك و تەنیایی تۆ و لە بیر کردنەوە لە بەڵگە و نیشانە روونەکانی خوایەتی تۆ، ﴿وَكَانُواْ قَوۡمَۢا بُورٗا﴾ ئەوانە لە زانین و بڕیاری تۆدا تێپەڕیان کرد بوو کە کۆمەڵێکی بە هیلاك دا چوون، دڵیان بێ خێرو بێرە بە وێنەی زەوی یەك کە بەکار نەیەت و هیچ بەر و بوومێکی نەبێت. ئەو پەرستراوانە بەو جۆرە وەڵام ئەدەنەوە و بێ تاوانیی خۆیان دەرئەبڕن، مەبەست پێ یان ئەو پەرستراوانە بێت کە گیان لەبەر نین و بەڵام خوا لە رۆژی دوایی دا ئەیانهێنێتە زمان، یان مەبەست هەموو پەرستراوێك بێت لەم جیهانەدا جگە لە خوا، بەهەر کام باشە. ئینجا لەو کاتەدا خوای گەورە رووی فەرمودە ئەکاتە بەندە نەفامە نەزانەکان کە خوا پەرست نەبوون، ئەفەرموێ: ﴿فَقَدۡ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ﴾ [1] ئەی بت پەرستان بێگومان ئەوا پەرستراوەکانتان بە درۆیان خستنەوە لەوەی کە ئەڵێن: ئەوانە پەرستراون. ﴿فَمَا تَسۡتَطِيعُونَ صَرۡفٗا وَلَا نَصۡرٗاۚ﴾ کەواتە ناتوانن هیچ جۆرە بەرگریی سزایەك لە خۆتان بکەن، نە بە خۆتان و نە بە پەرستراوەکانتان و نە بە هیچ کەسی تر، ناتوانن هیچ جۆرە کۆمەکی و یارمەتی یەك دەستی خۆتان بخەن. ئینجا لەم کاتەدا کە شێوەی رۆژی دوایی هێناوەتە پێش چاو و دڵ و هەست بە جارێك بەستراوە و خەریکە بەو بەسەرهاتەوە بە جۆرێك وەکو ئێستا ئەو رۆژ و کاتە بێت، لەم کاتەدا کت و پڕ فەرمودەکە ئەهێنێتەوە بۆ ئەم جیهان و زەوی یە و هەڕەشەیەکی سامناکی بەهێز ئاراستەی بێ بڕواکان ئەکات. ئەوەش بە گوێرەی باوی قورئان کە تیماری دڵ ئەکات و دەستکاری ئەکات لە کاتی تایبەتی دا، کاتێ ئامادە بوونی بۆ گوێ گرتن و گوێ رایەڵیی، بێگومان هەر دڵێك بە تەواوی نەمردبێت و وشك نەبووبێتەوە لەم کاتەدا کە ئەو شێوە سامناکەی رۆژی دوایی یەی پێشان دا ئەو دڵە نەرم ئەبێت و لەوانەیە تەمێ وەرگرێت،

---

[1] ئەم فیعلە و فیعلی پاش ئەوە لەباتی(ت) بە(ی) خوێنراوەتەوە، بە پێی ئەو خوێندنەوە تەفسیری ئەم ئایەتە جیاوازە، بێجگە لەوەش چەند رایەکی تر هەیە بۆ مەبەست بە راناوی(فاعیل) و(مفعول) لە رستەی(کذبوکم) دا. بەڵام ئەوەی لە تەفسیرەکەدایە بەهێز ترە.

وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ
إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً
أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا﴾ هەركەس لە ئێوە لەم جیهانەدا کافر و بێ باوەڕ بێت پێی ئەچەژێن لە ڕۆژی دوایی دا سزایەکی گەورەی بەتین کە هیچ سزایەکی تر هاوتایی ناکات، ئەوەش سزای ئاگری دۆزەخە، خوا پەنامان بدات لێی. ئینجا لەم کاتەدا پیشان درا ڕۆژی دوایی درۆ هەڵبەستن و بێ بڕوایی و لاقرتی کردن و ڕەخنە گرتن لە ئادەمێتی پێغەمبەر و خۆراك خواردن و گەڕانی بە بازاڕدا، لەم کاتەدا ڕووی فەرمودە ئەکاتەوە پێغەمبەر(ﷺ) و دڵنەوایی ئەکات و دڵ خۆشی ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ﴾ لە پێش تۆوە پێغەمبەرانمان نەناردووە و ڕەوانەمان نەکردووە مەگەر پێغەمبەرانێك کە بێگومان خۆراکیان ئەخوارد و ئەگەڕان بە بازاڕەکان دا، واتە باوی خوا هەر وا بووە، کەواتە ئەو جۆرە ڕەخنەیانە ڕووناکەنە ئەم پێغەمبەرانە، بەڵکو ڕەخنە گرتنە لە باو و سوننەتی خوا ﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً﴾ هەندێکتانمان گێڕاوە بەهۆی تاقی کردنەوە بە هەندێکی ترتان، هەندێ لەو تاقی کردنەوانە تاقی کردنەوەی هەژارانە بە سامان و دارایی زۆر، تاقی کردنەوەی پێغەمبەرانە بە ئوممەت و گەلەکانیان، هۆی ئەو تاقی کردنەوەش ئەمەیە، ﴿أَتَصْبِرُونَ﴾[1] تا دەرکەوێ کامتان خۆگر ئەبێ و کام خۆگر نابێ، کام دامەزراو ئەبێ و لەخشە ناکات و کام دانەمەزراوە و ئەترازێ؟

---

[1] هەندێك ئەفەرمون: ئەم شێوە پرسیارە بۆ هاندانە لەسەر خۆگرتن. ئەمەش هەر ئەبێت و شیرینە، واتە خۆگرین.

﴿وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا﴾ خوای پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر لەمەو بەر و هەمیشە بینایە و هەموو شت ئەبینێ کە هەندێ لەو بینراوانە خۆگرەکانن. بێگومان وشەی(ربك) سێبەر و سەهەند و هەناسە و نەسیمێکی ئێجگار نەرم و ناسکی هەیە بۆ دڵە بەفەڕەکەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەم کاتی دڵخۆشی دانەوە و دڵنەواییدا لە لوتف و بەزەییە بێ سنوورەکەی بەزیاد بێت.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله و صحبة.